# چوارچێوەی یاسایی ئازادیی رۆژنامەگەری لە کوردستانی عێراقدا

توێژینەوەیەکی بەراوردکارییە

لەلایەن

کەمال سەعدی مستەفا

کتێب: چوارچێوەی یاسایی ئازادیی ڕۆژنامەگەری لە کوردستانی عێراقدا
(توێژینەوەیەکی بەراوردکارییە)
دانانی: کەمال سەعدی مستەفا
بڵاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ٤٤٥
دەرهێنانی هونەریی ناوەوە: ئاراس ئەکرەم
هەڵەگری: جەلال ئەلیاس
سەرپەرشتیی چاپ: ئاوڕەحمانی حاجی مەحموود
چاپی یەکەم، هەولێر- ٢٠٠٦
لە کتێبخانەی گشتیی هەولێر ژمارە (٤٧٦)ی ساڵی ٢٠٠٥ی دراوەتێ

# ١- پێشەکی

## ١-١ بابەتی توێژینەوەکە و ئامانجەکانی

بەپێی ئەم پلانەی خوارەوە لە بابەتی «چوارچێوەی یاسایی ئازادیی ڕۆژنامەگەری لە کوردستانی عێراقدا» دەتوێژینەوە:

توێژینەوەیەکی بەراوردکارییە لە نێوان یاسای فەرەنسی و میسری و لوبنانی و عێراقی و هەرێمی کوردستاندا.

بۆیە ئەم یاسایانەمان هەڵبژارد، چونکە هەر یەکێکیان تایبەتمەندیی خۆیان هەیە. بۆ نموونە، فەرەنسا شوێنی سەرهەڵدان و گەشەکردنی ئازادییە گشتییەکانە، کە ئازادیی ڕۆژنامەگەری یەکێکە لەوان. لەوێدا ئازادیی ڕۆژنامەگەری سەری هەڵدا و گەشەی کرد تا گەیشتە ئەو پلە و پایەیەی کە ئەمڕۆ هەیەتی.

یاسادانەری فەرەنسی زیاتر لە هەموو شوێنێ بایەخی بەڕێکخستنی یاسای ئازادیی ڕۆژنامەگەری داوە و یاسای ڕۆژنامەگەریی فەرەنسی ١٨٨١/٧/٢٩ی هەموارکراو یەکێکە لە کۆنترین یاساکانی ڕۆژنامەگەری لە جیهاندا کە بۆچوونی نوێی ئازادیی ڕۆژنامەگەری لە حوکمەکانیدا بەرجەستە کردووە.

هەروەها یاسای میسریمان بۆیە هەڵبژارد، چونکە خاوەنی سیستمێکی یاسایی پێشکەوتووە لە بواری ڕێکخستنی ئازادیی ڕۆژنامەگەریدا ئەگەر بەراوردی بکەین لەگەڵ یاساکانی ڕۆژنامەگەریی وڵاتانی تری عەرەبی، هەروەها لە ڕووی هونەری ڕۆژنامەگەرییەوە پێشەنگە.

بەڵام یاسای لوبنانیمان بۆیە هەڵبژارد، چونکە لوبنان لە ڕووی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی و ڕامیاری و فرەحزبییەوە لە هەرێمی کوردستان دەچێت، ئەمە و وێڕای ئەوەی کە تاکە وڵاتی عەرەبییە گشت حوکمەکانی ڕێکخستنی ڕاگەیاندنی لە کۆدێکدا کۆکردۆتەوە بەناوی «یاسای ڕاگەیاندن» کە یاسایەکی پێشکەوتووە.

لە دوایشدا یاسای عێراقی و یاسای هەرێمی کوردستانی عێراقمان بۆیە هەڵبژارد، تاکو لە ئەنجامی بەراوردکردنیان لەگەڵ یاساکانی ئەو وڵاتانەی ناومان هێنان کە پێش ئێمە لە کاروانی ئازادی و دیموکراسیدا سەرقەتار بوونە، بۆ ئەوەی بتوانین دەستنیشانی

کەموکوڕی و لایەنە بەهێز و لاوازەکانی یاسای خۆمان بکەین و ڕێگا خۆش بکەین بۆ یاسادانەری کوردستانی بۆ دەوڵەمەندکردن و پتەوکردنی سیستەمی یاسایی ئازادیی ڕۆژنامەگەریمان، تاوەکو لە کاروانی ئازادی و دیموکراسی بەجێ نەمێنین و سوود بەگەل و نیشتمانمان بگەیەنین.

## ١-٢ گرنگی توێژینەوەکە

سەرەڕای ئەمە، دەتوانین بڵێین هۆی بایەخەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئەمڕۆکە لە جیهاندا سیستەمێکی نوێ سەری هەڵداوە، کە لەسەر بنەمای مافی مرۆڤ و دیموکراسییەت بنیات نراوە، ئەمەش خۆی لەخۆیدا بەبوون و بەنەبوونەوە لەگەڵ هەڵبژاردن دەخولێتەوە، چونکە گەل لە ڕێگای هەڵبژاردنەوە، نوێنەرانی خۆی هەڵدەبژێرێ و ئازادیی هەڵبژاردنیش وادەخوازێ، گەل بەئازادی گوزارشت لەبیروڕای خۆی بکات. تاکو نوێنەرانی خۆی بەئازادی هەڵبژێرێ، یەکێک لە هۆکارەکانی گوزارشتکردن لە بیروڕاش ڕۆژنامەگەرییە، چونکە ڕۆژنامەگەری کەناڵێکی زیندووە، بەهۆیەوە گەل، گوزارشت لە بیر و ڕای خۆی دەکات، ئەمەش لە دیارەدە هەرە دیارەکانی سیمای کۆمەڵگای دیموکراسی و مەدەنییە.

هەروەها ڕۆژنامەگەری بایەخێکی زۆری هەیە بۆ دروستکردنی ڕای گشتی لەسەر مەسەلە گرنگەکان و چاودێری کردنی کاروبارەکانی دەزگاکانی حکومەت لە وڵاتێکی دیموکراتیدا.

ئەمەش مانای ئەوەیە، کاتێک بەرپرسەکان سەرپێچی لە یاسا دەکەن یان دەستدرێژی دەکەنە سەر ماف و ئازادییەکانی گەل دەبێ ڕۆژنامە و ڕۆژنامەنووسان بەدوای ڕاستیدا بگەڕێن و لێی بکۆڵنەوە. ئەمەش لە ڕێگای دەستنیشانکردنی کەموکوڕی نیش و کارەکانیان و ئاڕاستەکردنیان دەبێ بۆ کاری چاک و بەرژەوەندی گشتیی کۆمەڵ.

ئەمەش خۆی لەخۆیدا، باشترین زامنە بۆ ڕێگاگرتن لە خراپ بەکارهێنانی دەسەڵات لەلایەن حکومەتەوە، هەر لەبەر ئەم هۆیەش ئازادیی ڕۆژنامەگەری بەیەکێک لە ئازادییە بنەڕەتییەکان دادەنرێت لە کۆمەڵگەی شارستانی و دیموکراسیدا و بەشداری دەکات لە چەسپاندن و بەرەو پێشەوە بردنی پرۆسەی دیموکراسییەت لە ڕێگای فراوانکردنی زانیاری و وشیارکردنەوەی هاووڵاتییان.

جا لەبەرئەوەی ڕۆژنامەنووسان ڕۆڵێکی زیندوو و بەرچاویان لە بەخشینی زانیاری و هوشیارکردنی خەڵک هەیە، بۆیە پێویستە کاردکانیان ملکەچ بێت بۆ هەندێک پێوەری

یاسایی و ڕەفتاری پیشەیی، تاکو بتوانن بەشێوەیەکی ڕاست و دروست و بەرپرسانە، کارەکانیان ئەنجام بدەن، بۆیە لێکۆڵینەوەی «چوارچێوەیەکی یاسایی بۆ ئازادیی ڕۆژنامەگەری لە کوردستانی عێراقدا» بەکارێکی پێویست دەزانم، لە کاتێکدا کە ئەمڕۆ ئێمە لە سەردەمی جیهانگیری و شۆڕشی زانیاری و ئینتەرنێت دەژین، پیشەی ڕۆژنامەگەریش لەژێر ئەم کاریگەرییە زۆر چۆتە پێشەوە و ڕۆژنامەی ئەلکترۆنی سەری هەڵداوە و ڕۆژنامەی ئاسایی (تەقلیدی) بەرگی نوێی پۆشیوە و خۆی خزاندۆتە ناو تۆڕی ئینتەرنێتەوە و گشت بەربەستەکان دەبەزێنێت و هەموو سانسۆرێکیش وەلا دەنێت و لە چاوتروکانێکدا و لەیەک کاتدا لە هەموو سوچێکی دنیادا دەبیسترێ و دەبیندرێ و دەخوێندرێتەوە، ئەمەش خۆی لە خۆیدا ڕێکخستنێکی یاسایی نوێی دەوێ.

هەروەها، ئەم ڕۆڵەی کە لە کۆمەڵگەی دیموکراسیدا بەئازادیی ڕۆژنامەگەری دراوە (بەکۆمەڵگەی کوردستانیشەوە) وەک دەسەڵاتێک لەناو کۆمەڵدا، ئەگەر بێت و بەخراپی و بەبێ هەستکردن بەلێپرسینەوە بەکار بهێندرێن، لەوانەیە کۆمەڵ ڕووبەڕووی گەورەترین مەترسی بکاتەوە، کە ئەمەش پێویستی بەڕێگا چارەیەکی یاسایی هەیە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەم مەترسییە.

هەروەها ئازادیی وشە، کە گوزارشتکردنە لە ئازادیی بیرکردنەوە، کە ئازادیی ڕۆژنامەگەری یەکێکە لە سیما هەرەدیارەکانی ئازادیی وشە، دەبێ هەموو گەرەنتییەکی بۆ دەستەبەر بکرێ، بۆیە بەپێویستم زانی «چوارچێوەی یاسایی ئازادیی ڕۆژنامەگەری لە کوردستانی عێراق» بابەتی توێژینەوەکەم بێت. جا لەبەرئەوەی کتێبخانەی کوردی لەڕووی سەرچاوەی یاسایی بەزمانی کوردی هەژارە و سەرچاوە کوردییەکان بەپەنجەی دەست دەژمێردرێن لەچاو سەرچاوەکانی تری یاسایی، هەرچەند، نووسینەوەی تێزێکی یاسایی وا بەزمانی کوردی، بۆ یەکەمجار، ئەرکەکەی زۆرە لەچاو نووسینەوەی بەزمانی عەرەبی، کەچی سەرەڕای ئەمە، ئەنجامدانی ئەم کارەم بەزمانی شیرینی کوردی بەئەرکێکی نیشتمانی و نەتەوەیی زانی، بۆیە سڵم لێ نەکردەوە.

### ٣-١ پاساوەکانی توێژینەوە

دوابەدوای هەرەسهێنانی یەکێتی سۆڤێتی و بلۆکی ڕۆژهەڵات و ناوابوونی خۆری ڕژێمە دیکتاتۆر و داپڵۆسێنەرەکان و نەمانی ئایدیۆلۆژییەکانیان، کە تاکو سەرەتای نەوەتەکانی سەدەی پێشوو بەشێکی سەرەکی ئایدیۆلۆژیای جیهان بوون، ئەمڕۆ کە سیستمێکی نوێی

جیهانی لەسەر بنەمای ڕێزگرتن لە مافی مرۆڤ و دیموکراسییەت سەری هەڵداوە و بارودۆخێکی نوێ هاتۆتە ئاراوە، ئەویش ڕێزگرتنی ماف و ئازادییە گشتییەکانی مرۆڤە بەئازادیی ڕۆژنامەگەرییشەوە.

هەروەها دوابەدوای تەقینەوەی شۆڕشی زانیاری و گەیاندن و بچووکبوونەوەی دنیا و بوونی بەگوندێکی بچکۆلانە لە ڕێگای ئینتەرنێتەوە کۆسپەکان لەبەردەم گواستنەوەی بیروباوەڕ و هزر نەما و سانسۆری دەسەڵاتدارە فاشی و دیکتاتۆرەکان و چەمکەکانی «ئاسایشی نەتەوەیی» و «تیزامی گشتی» و «سەروەریی وڵات» کە ئەوان سوودیان لەم دەستەواژانە وەردەگرت و بۆ مەرامی خۆیان بەکاریان دەهێنا، ئەم چەمکانە باویان نەما و ئاسایشی جیهانی و سەروەریی مرۆڤ جێگای گرتنەوە. بۆیە ئەم بارودۆخە نوێیەی کە هاتۆتە ئاراوە، وا دەخوازێ ژیرانە و بوێرانە و وردبینانە مامەڵەی لەگەڵ بکەین تاوەکو لە کاروانی ئازادی و دیموکراسی و شۆڕشی گەیاندن بەجێ نەمێنین.

هەروەکو دەزانین، ئازادی پێشەکییە بۆ دیموکراسییەت و ئازادیی ڕۆژنامەگەرییش یەکێکە لەو ئازادییانە، بەڵکو بەهێزترینیانە، جا بۆ ئەوەی بتوانین بچینە ناو کرۆکی ئەم پێشکەوتنە، دەبێ یاساکانی ئازادیی ڕۆژنامەگەریی خۆمان بگونجێنین لەگەڵ ئەم سیستمە نوێیەی جیهانییە و ئەم شۆڕشەی زانیاری و گەیاندنەدا. لەبەر ئەم مەبەستەشە من ئەم بابەتەم هەڵبژارد.

## ١-٤ پلانی توێژینەوەکە

دوای پێشەکی، بەشی دووەم، بەشێکی ڕێگا خۆشکەرە، دابەشمان کردووە بۆ پێنج برگە، لە برگەی یەکەمدا باسمان لە چەمکی ئازادیی ڕۆژنامەگەری کردووە. برگەی دووەمیشمان تەرخان کردووە بۆ شێواز و جۆرەکانی ڕۆژنامەگەری و پەیوەندی بەغەیری خۆیەوە. برگەی سێیەمیشمان بۆ مێژووی سەرهەڵدان و پێشکەوتنی ڕۆژنامەگەریی عێراقی تەرخان کردووە. هەروەها برگەی چوارەمیشمان تەرخان کردووە بۆ مێژووی سەرهەڵدان و پێشکەوتنی ڕۆژنامەگەریی کوردی. برگەی پێنجەمیشمان بۆ تیۆرییەکانی ڕۆژنامەگەری تەرخان کردووە.

هەروەها لە بەشی سێیەمدا، باسمان لە ڕێکخستنی یاسایی دەرکردن و بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامە کردووە. ئەم بەشەمان دابەشکردووە بۆ حەوت برگە، لە برگەی یەکەمدا باسمان لە سیستمی ئاگاکاری کردووە و، لە برگەی دووەمیشدا باسمان لە سیستمی مۆڵەت و

مەرجەکانی دەرکردن و بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامە کردووە و لە بڕگەی سێیەمیشدا، باسی سیستمی بارمتەی داراییمان کردووە و لە بڕگەی چوارەمیشدا باسی ئاگاکاری و ڕاگرتن و هەڵوەشاندنەوەمان کردووە و لە بڕگەی پێنجەمیشدا باسی گلدانەوە و دەستبەسەرداگرتنمان کردووە و لە بڕگەی شەشەمیشدا باسی سانسۆرمان کردووە و بڕگەی حەوتەمیشمان بۆ پوختەی ئەم بەشە تەرخان کردووە.

بەشی چوارەمیشمان تەرخان کردووە بۆ سیستم و پرنسیپەکانی ڕۆژنامەگەری و زامنکردنی ئازادیی ڕۆژنامەگەری و دابەشمان کردووە بۆ سێ بڕگە. لە بڕگەی یەکەمدا باسی سیستمەکانی ڕۆژنامەگەریمان کردووە و لە بڕگەی دووەمیشدا باسی پرنسیپەکانی ڕۆژنامەگەریمان کردووە و لە بڕگەی سێیەمیشدا باسی زامنکردنی ئازادیی ڕۆژنامەگەریمان کردووە.

هەروەها لە بەشی پێنجەمدا، باسی ماف و ئەرکەکانی ڕۆژنامەنووس و تاوانەکانی ڕۆژنامەگەری و ئەو بەرپرسیارێتییە تاوانکارییەی لێی دەکەوێتەوەمان لە میانی دوو بڕگەدا کردووە. بڕگەی یەکەممان تەرخان کردووە بۆ ماف و ئەرکەکانی ڕۆژنامەنووس و بڕگەی دووەممان تەرخان کردووە بۆ تاوانەکانی ڕۆژنامەگەری و ئەو بەرپرسیارێتییە تاوانکارییەی لێی دەکەوێتەوە.

دوای ئەوە بەشی شەشەممان تەرخان کردووە بۆ کۆتایی و دابەشمان کردووە بۆ دوو بڕگە، بڕگەی یەکەممان بۆ دەرئەنجام و بڕگەی دووەمیش بۆ ڕاسپاردە تەرخان کردووە.

## ٢- دەستپێک (تمهيد)

### ٢-١ چەمکی ئازادیی ڕۆژنامەگەری

لەبەرئەوەی ڕۆژنامە هۆکارێکە لە هۆکارەکانی گوزارشتکردن لە بیروڕا و لەبەرئەوەش ئازادیی ڕۆژنامەگەری لقێکە لە لقەکانی ئازادییە گشتییەکان و لەو جودا بۆتەوە، بۆیە ئەم بڕگەیە دابەش دەکەین بۆ سێ خاڵ.

لەخاڵی یەکەمیاندا باس لە ڕۆژنامە و تایبەتمەندییەکانی دەکەین و لە خاڵی دووەمیشدا باس لەئازادیی ڕۆژنامەگەری دەکەین و دواییش لەخاڵی سێیەمدا باس لە گرنگیی ئازادیی ڕۆژنامەگەری دەکەین.

#### یەکەم: ڕۆژنامە و تایبەتمەندییەکانی

ڕۆژنامە[١] دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی و ئابوورییە و فاکتەرێکی سەرەکیشە بۆ دروستکردنی ڕای گشتی[٢] و بەتەنها ئامرازێک نییە لە ئامرازەکانی پڕوپاگاندەی کۆمەڵایەتی یان ورووژاندنی کۆمەڵایەتی بەقەد ئەوەی ئامرازێکە بۆ ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی[٣]. بێ گومان، ڕۆژنامە تیغێکی دوو دەمە، ڕێڕەوی ئازادیخوازی دەگرێتەبەر و گوزارشت لە ماف و ڕای گشتیی کۆمەڵ دەکات و ڕێگاخۆشکەریشە بۆ وشیارییەکی زیاتر و پێشکەوتن، ئەگەر ببێتە ئامرازێک بەدەست خەڵکانێکی دڵسۆز و پارتە

---

١- بەکاری دروستکردن و دەرهێنانی ڕۆژنامە دەگوترێ ڕۆژنامەگەری، هەروەها بریتییە لە کۆمەڵێک کاغەزی چاپکراو، هەواڵ و بیروڕا و ڕاپۆرت و شتی بەسوود بەگشت جۆرەکانییەوە لە هەندێ کاتی دیاریکراودا بڵاو دەبێتەوە و لە وڵاتە پێشکەوتووەکانیشدا، کە لە ڕووی شارستانییەوە لە پێشەوەن و لەوێدا ڕژێمی حوکمڕانیی پشت بەگەل دەبەستێت و گەل سەرچاوەی ڕەوایەتییەکەیەتی. ڕۆژنامە هۆکارێکە لە هۆکارەکانی گوزارشتکردن لە بیروڕا و گۆڕینەوەی بیروڕا لە نێوان تاکەکانی کۆمەڵدا. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە (رفائيل بطي، صحافة العراق، اعداد سامي رفائيل بطي، ج ١، بغداد، ١٩٨٥ ص٢٦.

٢- جون. ار. بيتر: مقدمة في الاتصال الجماهيري، ترجمة مركز الكتب الأردني، عمان، ١٩٩٠ ص٣٣.

٣- سعد الدين خضر: الرأي العام وفن التحريك، ط١، مطبعة الجمهورية، الموصل، ١٩٦٨، ص٩٩.

دیموکراسیخواز و سەربەخۆ و دەزگا دەستوورییەکان، هەروەها لەوانەیە جلەوکێشی نیشتمان و کۆمەڵ بکات بۆ نەفامی و نەزانینێکی زیاتر و ون بوون و چەواشەبوون، ئەگەر ئامرازێک بێت بەدەستی دەسەلاتدارە داپڵۆسێنەرەکانەوە[4].

سەبارەت بەرۆڵی رۆژنامە ناپلیۆن دەڵێ: «ئەوەندەی لە سێ رۆژنامە دەترسم ئەوەندە لە سەد هەزار سەربازی شەرکەر ناترسم»[5].

رۆژنامەی راستەقینە بەپێی بۆچوونی نوێ ئەم تایبەتمەندییانەی خوارەوەی هەیە:

١- دەبێ بەشێوەیەکی دەوری بڵاوبکرێتەوە و ماوەکەی لە هەفتەیەک زیاتر نەبێت.

شایەنی ئاماژە بۆ کردنە، لە کوردستاندا هەندێ رۆژنامە هەمرو پانزە رۆژ جارێک یان دوورتر دەردەچن و پێشیان دەگوترێ رۆژنامە وەک رۆژنامەی دەنگی میللەت و رۆژنامەی میدیا و چەندانی تر.

٢- دەبێ بەرێگایەکی میکانیکی بێتە بەرهەم.

لە کوردستانی عێراقدا لە سالانی (١٩٦٤-١٩٧٠) شۆرشی کورد چەندین رۆژنامەی نهێنیی چاپکراو بەئامێری چاپکردنی دەستیی و بەدەست نووسراوی لە شاخ هەبووە، لەوانە رۆژنامەی (خەبات)، رۆژنامەی (صوت کردستان)، رۆژنامەی (سەفین)[6].

هەروەها تا سالی ١٩٩١ و پێش راپەرین لە شاخ رۆژنامە و گۆڤاری نهێنی دیکە زۆر دەرچووە وەک گۆڤاری (تروسەری کوردستان)[7] و (بانگ)[8] و (گزنگ)[9] و (رۆژنامەی بەرەی کوردستانی)[10].

٣- دەبێ ژمارەی لە بازاردا زۆر بێ و نرخیشی گونجاو بێت.

---

٤- جعفر الشیرازي: الصحافة الحرة بین المشروع واللامشروع،
http://www.annabaa.org/nba47/sahafa.htm23/9/2001

٥- بڕوانە محەممەد فەریق حەسەن: دەسەلاتی چوارەم، چ٩، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری، هەولێر، ١٩٩٨، ل٩.

٦- بڕوانە ئەوزاد عەلی ئەحمەد: رابەریی رۆژنامەگەریی نهێنیی کوردی، سلێمانی ٢٠٠١، ل ١١ بەدواوە.

٧- ئەوزاد عەلی ئەحمەد: رابەریی رۆژنامەگەریی نهێنیی کوردی، سەرچاوەی پێشوو، ل٥٢.

٨- ئەوزاد عەلی ئەحمەد: رابەریی رۆژنامەگەریی نهێنیی کوردی، سەرچاوەی پێشوو، ل١١٥.

٩- ئەوزاد عەلی ئەحمەد: رابەریی رۆژنامەگەریی نهێنیی کوردی، سەرچاوەی پێشوو، ل٦٨.

١٠- ئەوزاد عەلی ئەحمەد: رابەریی رۆژنامەگەریی نهێنیی کوردی، سەرچاوەی پێشوو، ل١٠٨.

٤- دەبێ ناوەڕۆکەکەی هەمەڕەنگ بێت و هەمرو بابەتێکی تێدابێت کە مایەی بایەخ پێدانی ڕای گشتی بێت نەک گرووپێکی بچووکی هەڵبژاردە.

٥- دەبێ بەبەردەوامی لەکاتی دیاریکراوی خۆیدا دەربچێت[11].

بەمجۆرە، ڕۆژنامەی چاپکراو[12] لە جیهاندا تا دوای داهێنانی ئامێری چاپەمەنی بەدەرنەکەوت، کە لەلایەن زانای ئەڵمانی گۆتنبەرگ لە ساڵی ١٤٣٦ داهێنرا.

ئەوەبوو، دوابەدوای ئەم داهێنانە مەزنە، یەکەم ڕۆژنامەی چاپکراو لە ئەڵمانیا لە ساڵی (١٥٠٢) بەناوی Neu Zeytung دەرچوو[13]. هەروەها یەکەمین ڕۆژنامە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە شاری قاهیرە بەناوی (التنبیة) بەزمانی عەرەبی دەرچووە[14]. لە ساڵی ١٨٩٨یش یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی بەناوی (کوردستان) لە لایەن (مقداد بەدرخان)ەوە لە قاهیرە دەرچووە.

بەمجۆرە، ڕۆژنامەگەری تاکو ئەمڕۆ لە گەشەسەندن و پێشکەوتن دایە، بەتایبەتی لەوەتەی کۆمپیوتەر و مانگی دەستکرد و سەتەلایت و ئینتەرنێت داهێنراوە و ئێستاکە لەسایەی ئەم پێشکەوتنە تەکنۆلۆژیایەدا کاری دەرکردن و بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامە زۆر ئاسان بووە و جۆر و شێوازەکانیشی لە جاران زیاتربوونە.

## دووەم: ئازادیی ڕۆژنامەگەری

بەدرێژایی مێژوو هەمیشە ئازادی داخوازییەکی مرۆڤایەتی بووە و گشت خەباتە مرۆڤایەتییەکانیش لەژێر دروشمی ئەودا دەکران[15].

---

١١- جون. ار. بینتر: مقدمة الاتصال الجماهیري، سەرچاوەی پێشوو ل٣٢.

١٢- یەکەم گۆڤار لە بەریتانیا بەناوی «ڕیڤیو»ە لەلایەن دانییل دیفو لەساڵی ١٧٠٤ دەرچووە، بڕوانە:جون. ار. بینتر: مقدمة الاتصال الجماهیري، سەرچاوەی پێشوو، ل٨٣.

١٣- محمد عبدالعزیز منصور: صحافة بني اسرائیل.. صحافة بني اسماعیل، ط١، منشورات مکتبة مدبولي القاهرة، بلا سنة نشر، ص١٤. وریا جاف: کاروانی ڕۆژنامەگەری کوردی، چاپی یەکەم، بڵاوکراوەکانی دەزگای گوڵان، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، هەولێر، ١٩٩٨، ل٤-٦.

١٤- وریا جاف: کاروانی ڕۆژنامەگەریی کوردی، چاپی یەکەم، بڵاوکراوەکانی دەزگای گوڵان، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، هەولێر، ١٩٨٨ ل٤-٦.

١٥- عزیز السید جاسم: مبادي الصحافة في عالم المتغیرات، ط١، منشورات دار افاق عربیة، بغداد، ١٩٨٥، ص٥٩.

شایەنی باسە، هەوڵدانی مرۆڤ بۆ ئازادییەکانی لە سەدەکانی کۆن و ناوەڕاست و نوێدا، بۆ دەستەبەرکردنی مافەکانی بەدەسکەوتنی زانیاری دەستی پێکردووە ئینجا دوای ئەوە بیرکردنەوەی بەئازادی دێت و دواتریش داواکردنی مافی بەئازادی گوزارشتکردن لەڕایخۆی دێت[١٦].

هەروەکو دەزانین، ئازادیی ڕۆژنامەگەری مانایەکە لە مانای ئازادییە گشتییەکان جودا بۆتەوە و خەڵک چەند باوەڕی بەمانای ئازادییە گشتییەکان هەبێت هێندەش باوەڕی بەڵقەکانی ئەم مانایە دەبێت[١٧].

هەروەها گشت دەستوور و بەڵگەنامە نیشتمانی و جیهانییەکان ئازادییان لە پێشەوەی دەربڕین و ئایدیۆلۆژیاوە داناوە و مافی ڕادەربڕینیشیان بەمافێکی بنەڕەتی لە مافەکانی مرۆڤ داناوە[١٨]. ئەم بەڵگەنامانە لە سەرەتاوە لە چوارچێوەیەکی نیشتمانیدا و بەویست

---

١٦- سفير محمود شكري: نافذة فكر اعمدة الحريات الخمس وحرية الصحافة.
http://www.ahram.org 14/10/2001

١٧- محمد عبدالعزيز منصور: صحافة بني اسرائيل.. صحافة بني اسماعيل، سەرچاوەی پێشوو، ل١٤.

١٨- شایەنی باسە، وتووێژێکی زۆر لەنێوان هزرمەندان و سیاسەتمەداران و ڕۆژنامەنووسان لە سەرتاپای جیهاندا کراوە بۆ دیارکردنی جۆری ئازادیی ڕۆژنامەگەری، ئایا ئازادییەکی کەسایەتییە یان ڕامیاری!! بەڵام بەدەرچوونی جاڕنامەی گەردوونیی مافی مرۆڤ لە ١٩٤٨/١٢/١٠ و دەقنووسکردنی مافی ئازادیی بیروڕا دەربڕین لە ماددە (١٩)دا و جەختکردنی پەیمانی نێودەوڵەتی ١٩٦٦/١٢/٦ بۆ مافە شارستانی و ڕامیارییەکان لەسەر دانانی ئەم مافە بەمافێکی ڕامیاری، هەروەکو لە دەقی بڕگەی دووەمی ماددە (١٩)ی ئەم پەیماننامەیەدا هاتووە، ئەم وتووێژە یەکلاکرایەوە، کە ئەمەی خوارەوەش دەقەکەیەتی «٢- هەموو کەس مافی ئازادیی دەربڕینی هەیە و ئەم مافە ئازادیی تۆژینەوە لە زانیاری و هزری هەرپایەتێک بێت و وەرگرتن و گواستنەوەی بێ گوێدانە سنوور و ئەویش بەزارێت یان بەنووسین یان بەچاپکردن، لە ئالبێتکی هونەری دابێ یان بەهەر شێوازێکی تر کە خۆی پەسندی بکات».

شایەنی ئاماژە بۆکردنە، مافەمەدەنی و ڕامیارییەکان کە ئەم پەیماننامەیە لەخۆی گرتوونە لە ١٦/١٩٦٦/١٢ پێشکەشی ئەندامانی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان کرا بۆ پەسندکردنی، و دوابەدوای تەواوبوونی ڕێژەی یاسایی لە ١٩٧٦/٣/٢٣ بەرکار بوو، عێراق بەپێی یاسای ژمارە (١٩٣)ی ساڵی ١٩٧٠ پەسندی کردووە، ئەم یاسایە لە ڕۆژنامەی (الوقائع العراقية) ژمارە (١٩٢٧)ی ١٩٧٠/١٠/٧ بڵاوکراوەتەوە و لەو ساوە بە بەشێک لە یاسای نێودەوڵەتی =

و نارەزوییەکی نیشتمانییانەی تەواوەوە دەرچوون و شۆڕشەکان گوزارشتیان لێی کردو دواتر لەنێو دەستووردا نووسران[١٩].

ڕون و ئاشکرایە، ئازادیی بیرکردنەوە و گوزارشتکردن ناوەڕۆکێک و واتایەکی سروشتیی ئازادییە، چونکە مرۆڤ بەپێی سروشتی پێکهاتەکەی بوونەوەرێکە بیردەکاتەوە و مافی ئازادیی گوزارشتکردنیش ڕووی حەقیی بیرکردنەوەیە[٢٠].

مافی ئازادیی ڕۆژنامەگەری واتە پەیداکردنی زانیاری لە هەر سەرچاوەیەک و گواستنەوەی و ئاڵوگۆڕکردنی و مافی بڵاوکردنەوەی بیروڕا و ئاڵوگۆڕکردنی بەبێ کۆت و مافی دەرکردنی ڕۆژنامە و دانەنانی هیچ سانسۆرێکی پێشینە لەسەر ئەو بەرهەمانەی ڕۆژنامە بڵاویان دەکاتەوە، مەگەر لە سنوورێکی زۆر تەسک نەبێت[٢١].

ئەمەو لە هیچ پارچەیەکی گۆی زەوی ئازادییەکی بێ سنوور نییە، سەرەڕای ئەم هەموو نیدبەکاکردنەی کە لە ئارادایە[٢٢]. بۆ نموونە لە وڵاتانی وەکو سویسرا و فەرەنسا و

---

سولدەمرێت و هێزی یاسایی هەیە و بەرزترە لە بنچینەکانی یاسای ناوخۆو نابێت لەگەڵی ناکۆک بن. هەر بۆیە دەستووری گشت وڵاتانی جیهان دەقنووسی مافی ئازادیی ڕادەربڕین و ڕۆژنامەگەریی کردووە و وەک مافێکی ڕامیاری و بنەڕەتی لە مافەکانی مرۆڤ دانی پیادانراوە.

بڕوانە: حقوق الانسان ١- میثاق واعلان وتعهدان دولیان و بروتوکول- مجلة الحقوقي- السنة الاولى العدد ١ كانون الاول، ٢٠٠٠ ص٩٣-١١٧، وحرية الصحافة تزدهر في المواثيق وتتراجع في التطبيق: http://www.arabia.com23/9/2001، و رودني. أ. سموللا: حرية التعبير في مجتمع مفتوح، ترجمة كمال عبدالرزاق، ط١، منشورات الجمعية المصرية لنشر المعرفة والثقافة العالمية، القاهرة، ١٩٩٥. ل ٥٠٧ بکە.

19- Mise en oeuvte du Droit international Humanttaireet du Droit international des Droits de l. Homme, Une comparaison par Marco Sassoli Annuaire suisse de droit international 1987 p 26.

٢٠- عزيز السيد جاسم: مبادئ الصحافة في عالم المتغيرات، ص٥٩.

٢١- اسامة الكاشف: تشريعات الصحافة العربية، http://www.arabia.com 14/10/2001

٢٢- شایەنی باسە، بەڕێوەبەری ڕێکخراوی پەروەردە و ڕۆشنبیری و زانیاری نێودەوڵەتی (یونسکۆ) سەر بەنەتەوە یەکگرتووەکان کوشیرو ماتسورا لەمبارەیەوە گوتویەتی: «جێگەی داخە، کە ئەمڕۆکە سەد وڵات تاکو ئێستا ڕادەربڕینیان تێدا نییە» هەروەها لە درێژەی قسەکەیدا گوتویەتی: «ئازادیی ڕۆژنامەگەری لەم دە ساڵەی دواییدا لە زۆر ناوچەی جیهاندا خراپ نەبووە»

/new/issue/derasat /sub//org.http://www.almashreq, .http ://www.aljazra23/9/2001 1.htm2/12/2001

بەریتانیا و ئەمەریکا ئەوپەڕی ئازادیی ڕۆژنامەگەری هەیە و سانسۆر لەسەر بڵاوکردنەوە نییە، بەڵام بەرپرسیارێتی هەیە ئەگەر ئەو ئازادییە پێشێل کرا. هەروەها ئازادی لە بنەڕەتدا بەستراوەتەوە بەبەرپرسێتی، بۆیە هیچ ئازادییەک بەبێ بەرپرسێتیی نییە[٢٣].

کەواتە سەرەڕای ئەوەی کە ئازادیی ڕۆژنامەگەری لە دەستووردا زامن کراوە، هیچ ڕۆژنامەیەک ئازاد نییە لە بڵاوکردنەوەی زانیاریی چەواشەکاری یان ئازاربەخش یان زیانبەخش بەناو و ناوبانگ و ئابڕووی هەر کەسێک یان کۆمەڵێک یان دەزگایەک، جا چ بەئەنقەست بێت یان لە ئەنجامی کەمتەرخەمی یان بەڕێکەوت بێت[٢٤]. چونکە ئازادیی ڕۆژنامەنووس بەشێکە لە ئازادیی کەسێکی ئاسایی و نابێ تەجاوزی بکات مەگەر بەپێی یاسایەکی تایبەت نەبێت[٢٥].

لە ڕاستیدا، دوو سیستمی چاودێری و سانسۆر هەیە، یەکیان خۆپارێزییە: Preventif ئەوە سانسۆری پێش دەرچوونی ڕۆژنامەیە. ئەوی تریان، سانسۆری دوای بڵاوکردنەوە: کە بریتییە لە بەرپرسیارێتی ڕۆژنامەگەری، ئەویش ئەگەر بەچەواشە و خراپە ئازادییەکە بەکار هێنرا.

لە کۆتاییدا دەڵێین، چەمکی ئازادیی ڕۆژنامەگەری چەمکێکی ڕوون و ئاشکرا نییە و گەلێک کەلێنی لە لایەنی ئایدیۆلۆژیا و ڕامیاری و یاسایی بگرە لە لایەنی زمانەوانیشەوە تێدایە، ئەمەش وایکردووە کە یاسازانان لەسەر پێناسەیەکی وردی دیاریکراو یەک ڕا نەبن.

شایەنی ئاماژەبۆکردنە، چەمکی (ئازادی) خۆی لەخۆیدا لە تیۆرێکەوە بۆ تیۆرێکی تر دەگۆڕێ. ئازادی لە تێڕوانینی سەرمایەداریدا جیاوازە لە تێڕوانینی سۆسیالیزمدا، هەروەها ئازادی لە ئایینی ئیسلامدا سروشتێکی تایبەتی هەیە جیاوازە لە هەردوو تێڕوانینی سەرەوە. ئەم تێڕوانینە جیاوازەش کاردانەوەی دەبێت بەسەر ئازادیی ڕۆژنامەگەریدا، بەتایبەتی ئەو پرەنسیپانەی لە جیهاندا هەن سەبارەت بەبەستنەوەی

---

٢٣- محمد ناجي عمايرة: حرية الصحافة رؤية الواقع
http://www.alwatan.comgraphics/2001may/1816/heads/ot6.htm6/10/2001

٢٤- ف. فريزر. بوند: مدخل الى الصحافة، ترجمة راجي صهيون، ط١، منشورات مؤسسة فرانكلين للطباعة والنشر، بيروت، مطابع مؤسسة أ. بدران وشركاه، بيروت، لبنان، ١٩٦٤، ص٤٠٥.

٢٥- حسن الفكهاني وعبدالمنعم حسني: الموسوعة الذهبية للقواعد القانونية التي قررتها محكمة النقض المصرية، ط١، ج٦، منشورات الدار العربية للموسوعات، القاهرة، ١٩٨٧، ل٦٨٣.

ئازادی بەهەندێک کۆت و بەندی دیاریکراو لێک جیاوازن[٢٦].

لە ڕاستیدا ناکۆکییەکی قووڵ و بنەڕەتی هەیە لە نێوان چەمکی ئازادیی ڕۆژنامەگەری لە وڵاتە سەرمایەدارەکان و لە نێوان لۆجیک و چەمکی ڕۆژنامەگەری لە یەکێتیی سۆڤیێتی، بۆیە جیاوازی ڕۆڵی ڕۆژنامەگەری لە هەردوو سیستەمدا گەورەترین بەڵگەیە بۆ قووڵی جیاوازیی تێڕوانینی هەردوو کۆمەڵگەدا بۆ ڕۆڵ و فەرمانی ڕۆژنامەگەری لەناو کۆمەڵدا. بێ گومان ئەمەش ناکامی جیاوازیی چەمکی ئازادی و موڵکدارێتی و ڕۆڵی تاکە لەناو کۆمەڵدا لە هەر یەکێک لە سیستەمی سەرمایەداری و سیستەمی سۆسیالیزمدا[٢٧] هەرچەندە ئەمڕۆ ئەو چەمکە سۆڤیێتییە بەسەر چووە، چونکی لە پراکتیزەکردندا سەرکەوتوو نەبوو، ئازادییەکەش تەنها بەناو بوو، بەڵام بێ ناوەڕۆک بوو.

## سێیەم: گرنگیی ئازادیی ڕۆژنامەگەری

ئازادیی ڕۆژنامەگەری یەکێکە لەو بابەتە گرنگانەی کە هەمیشە لای ڕای گشتی و کۆمەڵگەی دیموکراسییەوە جێگای بایەخ بووە، چونکە ئازادیی وشە سەرەتای دیموکراسییەتە[٢٨]. هۆی بایەخدان بەئازادیی ڕۆژنامەگەری لەم سەدەیەدا دەگەڕێتەوە بۆ سیستەمی نوێی جیهانی و بڵاوبوونەوەی سیستەمی دیموکراسی بەشێوەیەکی بەرفراوان لە جیهاندا، ئەو سیستەمەی کە بەسروشت لەسەر پرنسیپی «حوکمڕانێتی گەل لە ڕێگای گەلەوە» دامەزراوە و هەر لە پێشەوە گرێمانەی ئازادیی هەڵبژاردنی لێ دەکرێ و ئەم ئازادیی هەڵبژاردنەش بێ گومان گرێمانەی ئەوەی لێ دەکرێ کە گەل بەئازادی گوزارشت لە بیروڕای خۆی بکات، جا لەبەر ئەوەی ڕۆژنامەگەری گرنگترین هۆکاری نوێیە بۆ گوزارشتکردنی بیروڕا، بۆیە پیادەکردنی ئەم ئازادییە لەلایەن گەلەوە لە دیاردە هەرە دیارەکانی سیستەمی دیموکراسییە[٢٩].

لە سیستەمی دیموکراسیدا، دوای ئەنجامدانی پرۆسەی هەڵبژاردنی نوێنەرانی گەل بۆ

---

٢٦- حرية الصحافة تزدهر في المواثيق وتتراجع في التطبيق: http://www.arabia.com23/9/2001

٢٧- د. سلوى ابو سعدة. الصحافة في الاتحاد السوفيتي. ط١. منشورات دار الموقف العربي للصحافة والنشر والتوزيع. مطبعة الفجر. القاهرة. بلا سنة نشر. ص٢٥.

٢٨- حرية الصحافة: النص الكامل لمناقشات مجلس الشعب المصري حول حرية الصحافة. ملحق مجاني مع العدد الأول من مجلة الشباب (٥) ديسمبر ١٩٧٢. ل١٦.

٢٩- د. عبدالله اسماعيل البستاني: حرية الصحافة. ط١. القاهرة. ١٩٥٠. ص١.

ئەنجوومەنی یاسادانان و ئەو ئەنجوومەنانەی کە سەرۆک و ئەندامەکانی لە ڕێگای هەڵبژاردنەوە دەستنیشان دەکرێ وەک ئەنجوومەنی هەڵسوڕاندنی خۆجێیی (مجالس الادارات المحلية) و ئەنجوومەنی شارەوانی و گەل لەڕێگەی ڕۆژنامە و کەناڵەکانی تری ڕاگەیاندنەوە دەبێتە چاودێر بەسەر کاروبارەکانیانەوە و لەو ڕێگایەوە گوزارشت لە بیروڕای خۆی دەکات. ئەمەو سەرەڕای کۆتایی هاتنی پرۆسەی هەڵبژاردن ئەو پەیوەندییە هەر دەمێنێ کە پێشتر بەناماڵجی خۆ پاڵاوتن و پڕوپاگاندە لە نێوان گەل و ئەو نوێنەرانەدا دروست بووبوو، بۆیە هەر یەکێک لە تاکەکانی گەل لە ڕێگای ئەم کەناڵانەدا موحاسەبەی ئەو کەسانە دەکات کە پێشتر متمانەی پێدابوون. هەر بۆیە لە دەستووری زۆر وڵاتاندا ڕۆژنامەگەری ناوی لێنراوە دەسەڵاتی جەماوەری[30]. تەنانەت هەندێ کەس بەدەسەڵاتی چوارەم ناوی دەبەن[31] لەبەر ئەو ڕۆڵەی کە هەیەتی لە ئاراستەکردنی ڕای گشتی و بەسەرکردنەوەی کاروباری حکوومەت و بەدەرخستنی ڕاستییەکان. هەرچەندە هەندێ کەسیش هەن ئەم ڕایە ڕەت دەکەنەوە و دەڵێن ناکرێ ڕۆژنامەگەری بەدەسەڵاتی چوارەم ناوزەد بکەین، چونکە لە ڕووی یاساییەوە تاکو ئێستا لە دەستووری هیچ وڵاتێکدا بەدەسەڵاتی چوارەم ناوی نەبراوە. هەروەها لەڕووی نرخدانانیشەوە، دانانی بەدەسەڵاتی گشتی لە پلە و پایەکەی کەم دەکاتەوە، هیتلەریش بەقوتابخانەی جەماوەر وەسفی کردووە و دەڵێ: «ڕۆژنامەگەری قوتابخانەیەکە جەماوەر زانیاریی ڕۆژانەی لێ وەردەگرێ»[32].

---

٣٠- بڕوانە ماددە (٢٠٦) لە دەستووری میسریی ساڵی ١٩٧٠ کە تیایدا هاتووە: «ڕۆژنامەگەری دەسەڵاتێکی جەماوەرییە و کار بۆ پەیامی خۆی دەکات بەو شێوەیەی کە لە دەستور و یاسادا دیاریکراوە، هەروەها لە یاسای ڕێکخستنی ڕۆژنامەگەریی میسری ژمارە (٩٦)ی ساڵی ١٩٩٦ دووپاتی کردۆتەوە و لە ماددە (١)دا هاتووە: «ڕۆژنامەگەری دەسەڵاتێکی جەماوەرییە کار بۆ پەیامی خۆی بەبەرپرسیارێتییەوە دەکات و لە خزمەتی کۆمەڵدا گوزارشت لە ڕەوتە جیاجیاکانی ڕای گشتی دەکات و بەشداری لە دروستکردن و ئاراستەکردنی دەکات لە ڕێگای ئازادیی ڕادەربڕین و پرۆسەی ڕەخنەگرتن و بڵاوکردنەوەی هەواڵدا....».

٣١- اديب مروة: الصحافة العربية نشأتها وتطورها، ط١، منشورات دار مكتبة الحياة، بيروت، لبنان، ١٩٦١، ص٩٩، وحامد محمد علي: حول الاعلام والاعلام الاسلامي، ط١، منشورات مكتب الأعلام لاتحاد الاسلامي في كوردستان، مطبعة الثقافة، اربيل، ١٩٩٨، ص٧-٩، وكمال سعدي: السلطة الرابعة، ط١، مطبعة الثقافة، اربيل، ٢٠٠١، ص٣.

٣٢- اديب مروة: الصحافة العربية نشأتها وتطورها، سەرچاوەی پێشوو، ل٩٩.

بەرای ئێمە، ئەوکاتە ڕۆژنامەگەری دەبێتە قوتابخانە و گەل زانیاری لێ وەردەگرێت، کاتێک ئازادبێت. نەک ئامرازێک بێت بەدەست دیکتاتۆر و فاشستەکان بۆ پڕوپاگاندە و چەواشەکردن.

ئینجا بۆ ئەوەی ڕۆژنامە ئەو پەیامەی کە هەڵیگرتووە بەتەواوەتی جێبەجێی بکات، دەبێ بەرلە هەموو شتێ ئابڕوی خۆی بپارێزێت، ئەو ڕۆژنامەیەی ئابڕوی خۆی نەپارێزێ ناگرێ جەماوەر ڕێز لە بیروڕاکانی بنێت هەرچەندە بشیخوێنێتەوە[٣٣].

ڕۆڵی ڕۆژنامەگەری بەپێی کۆمەڵ و ڕژێمی سیاسی دەگۆڕێ، بۆیە لە وڵاتە دیموکراتەکاندا، ڕۆژنامەگەری بەهەموو شێواز و جۆرەکانەوە ئاوێنەی کۆمەڵە و کۆمەڵ کاری تێ دەکات و ئەویش کاردانەوەی بۆسەر کۆمەڵ دەبێت و حاڵەتی کۆمەڵمان بۆ دەردەخات[٣٤].

بەڵام لەو وڵاتانەی کە دیموکراتی ڕاستەقینەی تێدا نییە و دەسەڵاتی گشتی هەڵقوڵاوی جەماوەر نییە، ڕۆژنامەگەری ئەو ڕۆڵەی نییە و ناشبێت.

بۆ نموونە، لە عێراقدا، بەپێی ماددە (٢٦)ی دەستووری ساڵی حەفتا ئازادیی ڕادەربڕین و بڵاوکردنەوە کەفالەت کراوە، کەچی لە واقیعدا حکوومەت ڕێگا بەئازادیی ڕادەربڕین و ئازادیی ڕۆژنامەگەری نادات و بەکردەوە ئەمەی هەڵوەشاندۆتەوە و حکوومەت و حزبی بەعس دەستی بەسەر گشت کەناڵەکانی ڕاگەیاندنی چاپکراو و بیستراو و بینرا و داگرتووە و بۆ پڕوپاگاندەی خۆیان بەکاریان دەهێنن و دەرفەتی بیر و بۆچوونی جیاواز نادەن. بەپێی ڕاپۆرتێکی (Freedom House) لە عێراقدا دەست بەسەر ٩٨٪ی ئازادیی ڕۆژنامەگەریدا گیراوە[٣٥].

هەروەها ڕۆژنامەگەری ڕۆڵێکی گرنگی هەیە لە پەرەپێدانی کۆمەڵایەتی و ڕامیاری و ڕۆشنبیری و ئابووری و ورووژاندنی هەستی نەتەوایەتی و بەرەو پێشەوە بردنی کۆمەڵ[٣٦].

---

٣٣- د. فيس الياسري ود. سؤدد القادري ويونس الشكرجي: الفنون الصحفية، دار الحكمة للطباعة والنشر، بغداد، ١٩٩١، ص٢٠.

٣٤- اديب مروة: الصحافة العربية نشأتها وتطورها، سەرچاوەی پێشوو، ل٩٩، هەروەها arabia.com/life/articlearabic11/11/2001.

٣٥- State Spcl Rprt on Human rights in Iraq ڕاپۆرتی ساڵانەی وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکا ٢٠٠١/٢/٢٦ تایبەت بەمافەکانی مرۆڤ، تۆڕی ئینتەرنێت، http://www.ajeeb.com. ٢٠٠١/٧/٥)

لەسەر ئاستی جیهانیشدا، دەتوانین بڵێین، کۆتایی هاتنی جەنگی جیهانیی دووەم (١٩٣٩-١٩٤٥) و دامەزرانی نەتەوە یەکگرتووەکان لەساڵی ١٩٤٥ دەرفەتێکی زێڕین بوو بۆ بەدەرخستنی ئازادیی ڕۆژنامەگەری لەسەر ئاستی جیهاندا لە ڕێگای دەرکردنی جاڕی گەردوونیی مافی مرۆڤ لە ١٩٤٨/١٢/١٠دا کە ئازادیی ڕۆژنامەگەری زامن کردووە و لە مادەدە (١٩)دا دەقنووسی کردووە کە دەڵێ: «هەموو کەسێک مافی ئازادیی بیروڕا و ڕادەربڕینی هەیە، ئەم مافەش هەڵگرتنی بیروڕا بەبێ خۆ تێکەڵکردنی کەسێکی دیکە و وەرگرتنی هەواڵ و بیروباوەڕ و بڵاوکردنەوەیان بەهەر شێوەیەک و بێ خۆبەستنەوە بەسنووری جوگرافی دەگرێتەوە». جا لە پێشکەوتنێکی تردا، ئەو پرینسیپانەی کە لە دوتۆی ئەم جاڕنامەیەدا هاتبوون کران بەهەندێک بڕیاری وردتر لەبارەی ئازادیی ڕۆژنامەگەرییەوە، وەکو جەختکردنی نەتەوە یەکگرتووەکان لەسەر ئازادیی ڕۆژنامەگەری وەک مافێک لە مافەکانی مرۆڤ یان وەک پەیمانی نێودەوڵەتی بۆ مافە شارستانی و ڕامیارییەکان کە کۆمەڵەی گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان بەپێی بڕیاری ژمارە ٢٢٠٠ ئەلف (و-٢١)ی ١٦ی کانوونی یەکەمی ١٩٦٦، متمانەی پێداوە و ئەم پەیماننامەیە بەپێی یاسا سیفەتی سەپاوێتی هەیە بۆ ئەو وڵاتانەی کە پەسندیان کردووە و جەختیش لەسەر ئازادیی ڕادەربڕین کراوە وەکو مافێک لە مافە ڕامیارییەکانی مرۆڤ[٣٧].

هەروەها ئەو پێشکەوتنەی کە سیستمی جیهانی لە سەرەتای نەوەتەکانی سەدەی ڕابردوو بەخۆیەوە بینی کاریگەرییەکی زۆری بۆ سەر بایەخدان بەئازادیی ڕۆژنامەگەرییەوە هەبوو. هەروەها ڕوخانی سیستمی سەرتاپاگیری (شمولي) لە ڕۆژهەڵاتی ئەورووپا بواری بۆ پێشکەوتنی ڕاگەیاندن و بەخشینی حەسانەیەکی زیاتر بۆ ڕۆژنامەنووسان ڕەخساند بۆ جێبەجێکردنی کارەکانیان، ئەمەو، شۆڕشی زانیاری و گەیاندن و ئینتەرنێت ئاسۆیەکی نوێی لەبەردەم ئازادیی پەخش و بڵاوکردنەوە کردەوە.

---

٣٦- سعيد السلمي: برنامج أكثر من رأي، بمناسبة يوم الصحافة العالمي، تقديم جميل عازر: http://www.aljazera.net23/9/2001، وممتاز حيدري: دور الصحا[illegible] الكوردية في النشئة القومية وتوعيتها، والحركة التحررية الكوردية مجلة (مەتین) العدد (٦٥) حزيران ١٩٩٧ ص١٠٢، و کەناڵی «الجزیرة» بەرنامەی (اكثر من رأي): گۆڤاری ڕۆژنامەڤانی ژمارە (٦-٧) پایز - زستان ٢٠٠١-٢٠٠٢ ل٧٤.

٣٧- حرية الصحافة تزدهر في المواثيق وتتراجع في التطبيق: http://www.arabia.com23/9/2001، و پەیڕەوی نێودەوڵەتی بۆ مافەکانی مرۆڤ، ل٥٢.

## ٢- ٢ شێواز و جۆرەکانی ڕۆژنامەگەری و پەیوەندی بەچەمکی تردوە

لەوەتی ڕۆژنامەگەری لە جیهاندا وەک هۆکارێک لە هۆکارەکانی پەیوەندیی جەماوەری سەری هەڵداوە و تاکو ئەمرۆ، لە ئەنجامی ئەو پێشکەوتنە یەک لە دوایەکانەی کە کۆمەڵگای مرۆڤایەتی بەخۆیەوە بینیوە، گەلێک قۆناغی جیاجیای بڕیوە. لە ئاکامدا، چەندین شێواز بۆ پتەوکردنی ئەم پەیوەندییە جەماوەرییە دۆزراوەتەوە، هەروەها شان بەشانی ئەمە، جۆرەکانی ڕۆژنامەگەریش ڕوو لە زیادی و هەمەرەنگیدا بووە. ئەمەو وێرای ئەوەی ڕۆژنامەگەری وەک ئامرازێک لە ئامرازەکانی گوزارشتکردن لە بیروڕا، هەمیشە پەیوەندی پتەوی بەکۆمەڵێک چەمکەوە هەبووە. لە خوارەوە، لە دوو خاڵدا باس لەمانە دەکەین. لە خاڵی یەکەمدا، باس لە شێواز و جۆرەکانی ڕۆژنامەگەری دەکەین و لە خاڵی دووەمیشدا، باس لە پەیوەندیی ڕۆژنامەگەریی بەغەیری خۆیەوە دەکەین:

### ٢-٢-١ شێواز و جۆرەکانی ڕۆژنامەگەری

#### یەکەم: شێوازەکانی ڕۆژنامەگەری

١- ڕۆژنامەگەریی چاپکراو

دوابەدوای داهێنانی چاپخانە لەلایەن زانای ئەڵمانی گۆتنبێرگەوە، ئەم جۆرە ڕۆژنامەگەرییە سەری هەڵدا. ڕۆژنامەگەریی چاپکراو، بریتییە لە چاپکردنی هەواڵ و بابەتەکانی تری ڕۆژنامەگەری لەسەر کاغەز لە ڕێگای بەکارهێنانی ئامێری چاپکردن. لە سەرەتادا، پیتەکان بەدەست دادەندران و چاپکردنیش بەدەست دەکرا، بەڵام لەدواییدا دانانی پیتەکان لە دەستەوە گۆڕا بۆ لاینۆتایپ و چاپکردنیش لە دەستەوە بوو بەچاپکردنی هەڵسی.ئەمرۆکەش پیتچنین لە ڕێگای کۆمپیوتەرەوەیە و چاپکردنیش بەئامێری ئۆفسێتە.

٢- ڕۆژنامەگەریی بیستراو

لە سەدەی بیستەمدا، ڕادیۆ وەک ئامرازێک لە ئامرازەکانی پەیوەندیی جەماوەری دۆزرایەوە[٣٨] و ڕۆژنامەگەرییش لە سایەی ئەم دۆزینەوە نوێیەدا چووە قۆناغێکی ترەوە و مرۆڤ لە سایەیدا دەتوانی لەکاتی کارکردنیشدا گوێ لە هەواڵەکان بگرێت[٣٩].

---

٣٨- جون ار بیتنر، مقدمة الاتصال الجماهيري، سەرچاوەی پێشوو ل١٤٣.

٣٩- جون. ار. بیتنر. مقدمة الاتصال الجماهيري، سەرچاوەی پێشوو ل١٤٣-١٤٤.

ڕۆژنامەگەریی بیستراو کە لە ڕێگای ڕادیۆوە پەخش دەکرێت، چاوەڕێی دوارۆژێکی ڕووناکی لێ دەکرێت، چونکە ئەو نامێرەی کە لە ڕێگایەوە پەخش دەکرێت (ڕادیۆ) نامێرێکی سووک و هەرزانە و لە توانای هەموو مرۆڤێک دایە بەنرخێکی کەم دەستەبەری بکات، وێڕای ئەوەی پەخشەکەی دەگاتە ژمارەیەکی زۆری خەڵکان و کۆمپانیا بازرگانییەکانیش دەتوانن بەنرخێکی زۆرکەم پڕوپاگاندە بۆ کەلوپەل و خزمەتگوزارییەکانیان لە ڕێگایەوە بکەن.

هەروەها یەکێک لە تایبەتمەندییە هەرە دیارەکانی ئەوەیە کە لە لایەن ژمارەیەکی کەمی کارمەندانەوە و بەدارایییەکی کەمەوە بەڕێوە دەچێت و ئەمەش خۆی لە خۆیدا کاری ڕۆژنامەگەریی بیستراو ئاسان دەکات[40] ئەمەش وایکردووە سەرەڕای بەدەرکەوتنی تەلەفزیۆن وەک ئامرازێکی پەیوەندیی جەماوەریی ناسنامەی خۆی وەک هۆکارێکی پەیوەندیکردن بپارێزێت و ڕۆڵی خۆی لەدەست نەدات[41].

٣- ڕۆژنامەگەریی بینراو

لەساڵی ١٩٤٨ داو دوابەدوای دۆزینەوەی نامێری تەلەفزیۆن[42] و بەکارهێنانی بەشێوەیەکی گرنگ، ڕۆژنامەگەری چووە قۆناخێکی ترەوە و توانرا لە ڕێگای پەخشی وێنەییەوە هەواڵەکان بگەیەندرێنە جەماوەر و بەم شێوەیە شێوازێکی تری ڕۆژنامەگەری سەری هەڵدا کە شێوازی ڕۆژنامەگەریی بینراوە.

بەپێی ڕاپۆرتێکی نووسینگەی پڕوپاگاندە و ئاگاداریی تەلەفزیۆنی ( Televisions Bureau of Advertising) تەلەفزیۆن دەسەڵاتی بەسەر (٣٨٪)ی کاتەکانی گرتووە بەبەراوردکردن لەگەڵ (٣٢٪)ی ڕادیۆ و (١٣٪)ی ڕۆژنامەی چاپکراو و (٧٪)ی گۆڤاری چاپکراو[43]. هەرچەندە، ئێستاکە دوای بڵاوبوونەوەی سەتەلایت و ئینتەرنێت، ئەم ڕێژانە گۆڕانیان بەسەردا هاتووە و وەک خۆیان نەماونەتەوە.

---

٤٠- جون. ار. بيتنر: مقدمة الاتصال الجماهيري، سەرچاوەی پێشوو ل١٧٢.

٤١- جون. ار. بيتنر: مقدمة الاتصال الجماهيري، سەرچاوەی پێشوو ل١٧٣.

٤٢- خەڵک بۆ یەکەمجار ساڵی ١٩٣٩ تەلەفزیۆنی لە پیشانگایەکی جیهانیدا بینی، بڕوانە: جون. ار. بيتنر: مقدمة في الاتصال الجماهيري، سەرچاوەی پێشوو ل٢٠٣.

٤٣- جون. ار. بيتنر: مقدمة الاتصال الجماهيري، سەرچاوەی پێشوو ل٢٠٠.

٤- ڕۆژنامەگەریی تێلیتێکست

تێلیتێکست سیستەمێکە لە ڕێگایەوە ئامێری کۆمپیوتەر بەئامێری تەلەفزیۆن دەبەسترێتەوە و وا دەکات زانیاری و هەواڵەکان بگاتە ئامێری پێشوازی (اجهزة الاستقبال) لە ماڵەوە و لە هەر شوێنێکی تر.

بینەر بۆی هەیە، لەماڵەوە بەرنامەی تەلەفزیۆن یان پەخشەکانی تێلیتێکست هەڵبژێری یان هەردووکیان پێکەوە هەڵبژێری[٤٤]. بەمەش ڕۆژنامە بەشێوەیەکی فراوان لەنێو زۆربەی ماڵاندا و لەنێو کەساندا بڵاودەبێتەوە.

٥- ڕۆژنامەگەریی ڤیدیۆتێکست

لەکاتێکدا کە تێلیتێکست بەکاردێت بۆ هەناردنی زانیاری و هەواڵەکان لە ڕێگای پەخشەوە، کەچی سیستمی ڤیدیۆتێکست لە ڕێگای بەکارهێنانی هەندێ سلک یان کێبڵ بەکار دەهێندرێت کە بریتییە لە بەستانەوەی کۆمپیوتەری نێوەندی (مرکزي) بەئامێری پێشوازیی ماڵەوە.

بەم شێوەیە، پەیوەندییەکی دوو قۆڵی لە نێوان بەکارهێنەر و ئامێری پەخشکردنەکە دروست دەبێت و ئەو کەسەی ڤیدیۆتێکست بەکاردەهێنێ بۆی هەیە دەمودەست لەکاتی داواکردنیدا، زانیاری لە بانقی زانیارییەکان وەدەست بهێنێ[٤٥].

٦- ڕۆژنامەگەریی ئینتەرنێت

بەر لە هەمووشتێ، ئینتەرنێت، بریتییە لە تۆڕێک کە پێکهاتووە لە کۆمەڵێک ئامێری کۆمپیوتەر و هەموویان بەیەکەوە بەستراونەتەوە و، ئەم پەیوەندییەی نێوان ئەم کۆمپیوتەرانە لە ڕێگای تۆڕێکەوە دەبێت پێی دەوترێ ئینتەرنێت[٤٦]، واتە (تۆڕەکانی پەیوەندی جیهانی بەکۆمپیوتەر).

هەمیشە گەیاندنی هەواڵەکان بەخێرایی و لە کاتی گونجاودا سەرچاوەی هێز بووە بۆ ڕۆژنامەگەری، ئەمڕۆکەش ئینتەرنێت ئەوەی سەلماندووە کە بەخێرایی و لە کاتی گونجاودا هەواڵەکان دەگەیەنێتە جەماوەر.

---

٤٤- جون. ار. بیتنر: مقدمة الاتصال الجماهيري، سەرچاوەی پێشوو ل٤٥٢.

٤٥- جون. ار. بیتنر: مقدمة الاتصال الجماهيري. سەرچاوەی پێشوو ل٤٥٢.

٤٦- طلال ابو غزالة: التجارة الالكترونية والملكية الفكرية:

http://www.tagi.com.news/press/9-9-1a.htmyaho24/11/2001

بەم شێوەیە ئینتەرنێت بواری بۆ خاوەن ڕۆژنامەکان ڕەخساندووە کە لە ڕێگای ئەم تۆڕەوە و لە ڕێگای دەرکردنی ڕۆژنامەی ئەلیکترۆنییەوە هەواڵ و زانیارییەکان بەخێرایی و لە کاتی گونجاودا لە گشت شوێنێکدا بگەیەننە هەموو کەسێک[٤٧].

سەرەڕای ئەمە، ئینتەرنێت بەلووتکەی گوزارشتکردن لە بیروڕا دادەندرێت، تا ڕادەیەک دوورە لە سانسۆر و یاساکانی چاپ و بڵاوکردنەوە و پێویست بەمۆڵەتی حکومەت ناکات بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە و پەخشکردنی. ئینتەرنێت ئەم سنوورانەی هەموو بڕیوە و دەچێتە هەموو گۆشەیەکی جیهان[٤٨]. ڕۆژنامەگەریی ئینتەرنێت هەندێک خزمەتگوزاری لەتەک هەواڵەکان پێشکەش دەکات کە ڕۆژنامەگەریی چاپکراو ناتوانێ پێشکەشی بکات، بۆ نموونە، ڕۆژنامەی (نیویۆرک تایمز)ی ئەنتەرنێتی هەندێک خزمەتگوزاری لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت پێشکەش دەکات کە ڕۆژنامەی چاپکراو لەسەر کاغەز ناتوانێ پێشکەشی بکات، وەک دیارکردنی باری ئاو و هەوا و نرخی هوتێل و فڕۆکە و دراوەکان و بازارگەی ئەلیکترۆنی بۆ کڕین و فرۆشتن و بەراوردکردنی نرخی کەلوپەلەکان لەگەڵ یەکتری و کردنەوەی پۆستی ئەلکترۆنی و دەیان خزمەتگوزاری تر[٤٩].

۷ - هاوبەستی ڕۆژنامەگەریی ئاسایی بەڕۆژنامەگەریی ئەلیکترۆنییەوە

ئەم شێوازە بریتییە لە دانانی ڕۆژنامەی چاپکراو لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت، بەمەش ڕۆژنامە بەخێرایی و لە هەموو شوێنێکی گۆی زەوی دەگاتە دەست بینەر و خوێنەر. بۆ نموونە کۆمپانیای تریبیون کە ڕۆژنامەی (شیکاگۆ تریبیون)ی چاپکراو دەردەکات و لە هەمان کاتیشدا تەلەفزیۆن و ڕادیۆ و شوێنی ئەلیکترۆنی لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت هەیە و جارێکی تر ئەم ڕۆژنامەیە لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت پەخش دەکات[٥٠].

---

٤٧ - بوب غابلز: الصحافة في عصر شبكة الانترنت، مجلة «وسائل الاعلام والاخلاق» الالكترونية تصدرها وزارة الخارجية الاميركية، لە تۆڕی ئینتەرنێت لەم شوێنەی خوارەوە وەرگیراوە:
http://www.usinfo.state.gov/journals/itgic10401/ijga0401.htm1/10/2001

٤٨ - اسامة محمود: ثورة الانترنت ومستقبل الصحف المطبوعة الالكترونية في العالم العربي،
http://www.alshargalawsat.arabia24/11/2001

٤٩ - اسامة محمود: ثورة الانترنت ومستقبل الصحف المطبوعة الالكترونية في العالم العربي،
http://www.alshargalawsat.arabia 24/11/2001

٥٠ - اسامة محمود: ثورة الانترنت ومستقبل الصحف المطبوعة الالكترونية في العالم العربي:
http://www.alshargalawsat.arabia 24/11/2001

هەروەها زۆربەی ڕۆژنامە چاپکراوەکانی وڵاتە عەرەبییەکان بەچاپکراوی چۆنن ئاوەها جارێکی تر دەخرێنە سەر تۆڕی ئینتەرنێتەوە. وەک ڕۆژنامەی (الاهرام)ی میسری و (الزمان) و (الشرق الاوسط) کە لە لەندەن دەردەچن و (العراق) و (الثورة)ی عێراقی. هەروەها هەندێک لەو ڕۆژنامانەی کە لە هەرێمی کوردستانی عێراقیشدا دەردەچن دەخرێنەسەر تۆڕی ئینتەرنێتەوە، وەک ڕۆژنامەی (خەبات) و (برایەتی) و (کوردستانی نوێ) و (الاتحاد) و (ڕێگای کوردستان) و (طریق الشعب) و هی دیکەیش.

ئەمڕۆ، ڕۆژنامەگەریی ئەلیکترۆنی، تا ڕادەیەک جێگای ڕۆژنامەگەریی چاپکراوی گرتۆتەوە و تەنانەت ژمارەی ئەو کەسانەی ڕۆژنامە ئەلیکترۆنییەکان لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت دەخوێننەوە، بۆ هەندێ ڕۆژنامە، خۆی لە سەدان هەزار خوێنەر دەدات، ئەمەش خۆی لەخۆیدا بۆتە مایەی کەم بوونەوەی داخوازی بۆ کڕینی ژمارە چاپکراوەکانی ئەو ڕۆژنامانەو کەم بوونەوەی داهاتیان، جا بۆ زاڵبوون بەسەر ئەم کێشەیەدا و بۆ ئەوەی ڕۆژنامەی چاپکراو کاریگەرتر بێت، لە کاتێکدا کە کاریگەرێتییەکەی بەرامبەر کەناڵە ئاسمانییەکان و تۆڕی ئینتەرنێت لاواز بووە، بۆیە ئەم ڕۆژنامە چاپکراوانەی کە دەیانەوێت لەبەردەم ئەم پێشکەوتنە زانستییە هاوچەرخەدا چۆک دانەدەن، دەبێ بەدوای داهێنانی نوێی شێوازەکانی پەخشکردن و خستنەڕووی زانیاری و هەواڵەکاندا بگەڕێن کە هاوبەستی ڕۆژنامەگەریی ئاسایی بەڕۆژنامەگەریی ئەلیکترۆنییەوە بەرهەمی ئەم بەدواگەڕانەیە[٥١].

لە کۆتاییدا، دەتوانین بڵێین، بایەخی ئینتەرنێت دەگەڕێتەوە بۆ ئاسانی بڵاوکردنەوەی زانیارییەکان لەسەر ئەم تۆڕەدا، هەروەها ئاسانیی وەرگرتنی زانیاری لێی هەروەها لەبەرئەوەی بواری ئەوە بۆ بەکارهێنەر دەڕەخسێنێ کە بەئازادی لاپەڕەکان هەڵداتەوە و ئەو زانیارییەی دەشێ‌ێت هەڵیبژێرێ و بیروڕای خۆشی لەبارەیانەوە لە ڕێگای ئەو پۆستە ئەلیکترۆنییەوە دەرببڕێت کە ڕۆژنامەکە خۆی بۆی دەستەبەر کردووە، هەروەها بۆی هەیە لە ڕێگای ئەم تۆڕەوە تەلەفۆن بکات و گوێش لە مۆسیقا بگرێت.

ئەمەو گەلێک لایەنی چاکی تر، وایان کردووە ئەمڕۆکە ڕۆژنامەگەریی ئینتەرنێت بانتاییەکی زۆر لە جیهانی ڕۆژنامەگەریدا بگرێتەوە.

---

٥١- مجدي رياض: مأزق الصحافة العربية في زمن العولمة،
http://www.Intiqad.Com.Archive 9/1/2002

**دووەم: جۆرەکانی ڕۆژنامەگەری**

١- ڕۆژنامەی حکومی و کەسانی گشتیی مەعنەوی:

ئەو ڕۆژنامانەن کە دامودەزگاکانی حکومەت یان پارتە سیاسییەکان دەریان دەکەن.

٢- ڕۆژنامەی کەسانی تایبەتی مەعنەوی:

ئەوڕۆژنامانەن کە کۆمپانیا تایبەتییەکان یان کۆمەڵە و ڕێکخراو و دەستە و دامودەزگا تایبەتییەکان یان تاکەکەسان بەپێی حوکمەکانی یاسای چاپەمەنی دەرُیان دەکەن.

٣- ڕۆژنامەگەریی ساخکردنەوەیی (الصحافة الاستقصائية):

ئەم ڕۆژنامەیە بەوە لە ڕۆژنامەکانی تر جیادەکرێتەوە کە ئەو زانیارییانە بڵاودەکاتەوە کە پەیوەندییان بەکاروباری گشتییەوە هەیە، هەروەها لێپرسینەوە لەگەڵ حکومەت دەکات و سەرپێچی و گەندەڵییەکانی لێپرسراوانی حکومەت بۆ خەڵکی ئاشکرا دەکات.

بۆیە ڕاپۆرتی بەدەرخستنی ڕاستییەکان بەگرنگترین بەشداریکردن دادەنرێت لە بەشدارییەکانی ڕۆژنامەی الاستقصائي بۆ چەسپاندنی دیموکراسیەت[٥٢].

٤- ڕۆژنامەی ڕوو زەرد (صحافة الصفراء)

بەو ڕۆژنامەیە دەگوترێ «ڕۆژنامەی ڕوو زەرد» کە ناو و ناوبانگی ئەزرێت و بۆخۆیان ڕەواج بۆ درۆ و دەلەسە و قسە و قسەلۆک دەکەن بەمەبەستی وروژاندنی خەڵک تاکو ڕۆژنامەکانیان ڕەواج پەیدا بکات و زۆرترین ژمارەی بفرۆشرێت و زۆرترین بڕی قازانج وەدەست بهێنن[٥٣].

ڕۆژنامەی (النبأ)ی میسری و (SUN)ی ئینگلیزی نموونەی ڕۆژنامەی ڕوو زەردن لەم سەردەمەدا[٥٤].

---

52- http;www.iraq2000com/press.com 1/10/2001

٥٣- د. حسين عبدالقادر: الرأي العام والعلاقات، بلا سنة نشر، ل٣٦٠؛ والرقابة ليست المنهم الوحيد... بعض الصحف مسؤولة ايضا: http://www.albayan.co.ae/cge23/9/2001

٥٤- شایەتی باسە، دوابەدوای بڵاوکردنەوەی ڕیپۆرتاژێک بەوێنەی ڕوتەوە لە بارەی کرداری قەشەیەکی قیبتیی میسری دژ بەئەخلاق، لە ڕۆژنامەی (النبأ)ی میسری، سەرنووسەرەکەی درایە دادگا و گشت بڵاوکراوەکانی ئەو دەزگایەش بەبڕیاری دادگا لە بڵاوکردنەوە وەستا. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: http://www.almashreq.org./new.issue/derasat/sub/1.htm2/12/2001، ومحمود المراغي: صحافة محترمة كيف؟ http://www.ahram.org.eg/arab/ahram23/9/2001. واحمد جودة: بوليس وصحافة.. http://www.208.185.82.137/julyof/aqwas11-2htm23/9/2001

٥- ڕۆژنامەی تاراوگە (الصحافة المهاجرة)[٥٥]

بەو ڕۆژنامەیە دەگوترێ (ڕۆژنامەی تاراوگە) کە لە دەرەوەی سنووری وڵاتەکەی خۆی دەرچێت. ئەمەش لەبەر چەند هۆیەک دەبێت، لەوانە نەبوونی ئازادیی ڕۆژنامەگەری و بوونی سانسۆری قورس لەسەر چاپەمەنی و بڵاوکراوەکان یان بەمەبەستی سوود وەرگرتن لە تەکنەلۆژیای ئەو وڵاتانەی کە کۆچیان بۆ دەکەن. هەروەها بەمەبەستی بڵاوبوونەوەی ڕۆژنامەکە بەشێوەیەکی فراوانتر لەبەر بوونی هۆکارەکانی گواستنەوەی پێشکەوتوو لەو وڵاتانەی کە کۆچیان بۆ دەکەن[٥٦].

## ٢-٢- ٢ پەیوەندیی ئازادیی ڕۆژنامەگەری بەچەمکی ترەوە

**یەکەم:** پەیوەندی نێوان ئازادیی ڕۆژنامەگەری و دیموکراسییەت

دیموکراسییەت و ئازادیی ڕۆژنامەگەری دوو چەمکی لێک جیا نەکراوەن و هەریەکەیان ئەوی تریان تەواو دەکات[٥٧].

خۆ ئەگەر ئاوڕێکیش لە ڕابردوو بدەینەوە دەبینین هەندێک دەزگا و پیشەی وا هەبوونە کە شان بەشانی یەکتر لە میانی مێژوودا دروست بوونە و هەرئەمەش هەیە لە نێوان

---

٥٥- ڕۆژنامەی (کوردستان) یەکەم ڕۆژنامەی کوردیی تاراوگەیە کە لە ساڵی ١٨٩٨ لە دەرەوەی کوردستان لە شاری قاهیرە لەلایەن مقداد بەدرخانەوە دەرچووە. هەروەها ڕۆژنامەی (بریجس باریس) یەکەم ڕۆژنامەی عەرەبیی تاراوگەیەکە لە ساڵی ١٨٥٨ لە فەرەنسا دەرچووە. ڕۆژنامەی (ابو نظارة)ش یەکەم ڕۆژنامەی میسریی تاراوگەیە کە لە ساڵی ١٨٧٨ لەلایەن یعقوب صنوع لە فەرەنسا دەرچووە. هەروەها گۆڤاری (الطليعة العربية) ڕۆژنامەیەکی عێراقیی تاراوگەیە کە لە ساڵی ١٩٨٣ لە لایەن ناصیف عواد لە پاریس دەرچووە. بڕوانە: د. كاظم المقدادي: البحث عن حرية التعبير، ط١، منشورات العالم العربي باريس بالتعاون مع مؤسسة رقيب الأحوال في بيروت، ١٩٨٤، ل٣٣، وە. فاروق ابوزيد: الصحافة العربية المهاجرة، ط١، منشورات مكتبة مدبولي، القاهرة، ١٩٨٥، ص٧١ وص٢٢٥.

٥٦- سعيد السلمي: برنامج أكثر من رأي، بمناسبة يوم الصحافة العالمي، تقديمه جميل عازر: http://www.aljazera.net23/9/2001

٥٧- مەلا بەختیار: ئازادیی عەقڵ و... کۆمەڵی مەدەنی، چاپی یەکەم، بڵاوکراوەکانی گۆڤاری مەدەنییەت، چاپخانەی ئاز، ٢٠٠١، ل ١٣٧، و مەم بورهان قانع: ئازادیی ڕۆژنامەنووسی لە یاسای چاپەمەنیی هەرێمی کوردستاندا، چاپی یەکەم، بڵاوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری، چاپخانەی ڕاز، سلێمانی، ٢٠٠١، ل٤٢.

دیموکراسی و ڕۆژنامەگەریدا، چونکە ڕۆژنامە و هەر دەزگایەکی ئازاد لە سێبەری ئازادیدا نەبێت گەشە ناکات و پەرە ناسێنێ و هەرچەندی ئازادی بەرتەسک بێتەوە سێبەرەکەشی هێندە بەرتەسک دەبێتەوە. بۆیە دەبێ ڕۆژنامەگەری بەبەردەوامی لە خزمەتی دیموکراسییەتدا بمێنێتەوە و بەرگری لێ بکات[58].

دیموکراسییەت باشترین سیستەمە بۆ ڕێزگرتن لە مافەکانی مرۆڤ کە ئازادیی ڕۆژنامەگەری یەکێکە لەو مافانە. هەروەها ئازادیی ڕۆژنامەگەریش بەگیانی دیموکراسییەت دەژمێردرێت و باشترین پاڵپشتە بۆی و هۆکارێکی سەرەکیشە بۆ بەردەوام بوونی پەیوەندیی نێوان گەل و حوکم بەدەستان، نەک تەنها لەکاتی هەڵبژاردنی گشتیدا، بەڵکو هەموو کاتێک، چونکە بەهۆیەوە گەل گوزارشت لە خواست و ویستی خۆی دەکات[59] و لەسایەی دیموکراسییەتیشدا ڕۆژنامەنووسان دەتوانن بەئازادی ڕۆڵی خۆیان وەک چاودێر ببینن بۆ لێکۆڵینەوە و خستنەرووی کەموکوڕی و گەندەڵییەکانی حکوومەت، پێشکەشکردنی زانیاری پێویست بۆ هاووڵاتییان و بیرخستنەوەیان کە دەسەڵاتی لێپرسینەوەی حکوومەتیان هەیە، کە ئەمەش خۆی لە خۆیدا خزمەتێکی زۆری دیموکراسییەت دەکات کە پێویستی پێیەتی، هەروەها لە چەسپاندنیشیدا بەشداری دەکات[60].

---

٥٨- جەعفەر شیرازی: ڕۆژنامەگەریی ئازاد لەنێوان ڕەوایی و ناڕەواییدا، وەرگێڕانی: ژاڵە کەمال، گۆڤاری ڕۆژنامەڤانی، ژمارە (٦-٧) ساڵی دووەم پایز - زستان ٢٠٠١ ز ٢٠٠٢ ل ١٠٢، و Http://annaban.org/nba47/sahafa.htm23/9/2001

٥٩- کەمال سەعدی: دەسەڵاتی چوارەم، چاپخانەی ڕۆشنبیری، چاپی یەکەم، هەولێر، ١٩٩٨، ل ١٤ و ل٧٢.

٦٠- سیلفو رایزبورو: لماذا تحتاج الديمقراطية الى صحافة استقصائية، مجلة «وسائل الاعلام والاخلاق» الالكترونية، تصدرها وزارة الخارجية الامريكية، لە تۆڕی ئینتەرنێت لەم شوێنەی خوارەوە وەرگیراوە:

http://www.usinfo.state.gov/journals/itgic/401./ijga 0401.htm1/10/2001

- الدكتورة فيرجينيا وايتهاوس: فهم حراس مراقبة وسائل الاعلام، مجلة «وسائل الاعلام والاخلاق» الالكترونية، تصدرها وزارة الخارجية الامريكية، لە تۆڕی ئینتەرنێت لەم شوێنەی خوارەوە وەرگیراوە:

http://www.usinfo.state.gov/journals/itgic/401./ijga0401.htm1/10/2001

**دووەم:** پەیوەندی نێوان ئازادیی ڕۆژنامەگەری و ڕای گشتی

بەرلەوەی باس لە پەیوەندی نێوان ئازادیی ڕۆژنامەگەری و ڕای گشتی بکەین، بەپێویستی دەزانین پێناسەی ڕای گشتی بکەین. هەرچەندە پێناسەکردنی ڕای گشتی پێناسەیەکی کۆکەر و ڕێ نەدەر (جامع و مانع) ڕەنگە کارێکی ئاسان نەبێت، هەر بۆیە هزرمەندان لەبارەیەوە یەک نین.

لیۆنارد ولیام پێناسەی دەکات و دەڵێ: «ڕای گشتی گوزارشت لە بۆچوونی جەماوەر بەرامبەر کێشەیەکی دیاریکراو دەکات کاتێک ئەندام بن لە هەمان کۆمەڵدا»[61]. هەروەها نارتەر کۆرنهۆز دەڵێ: «ڕای گشتی دەربڕی هەست و بۆچوونی جەماوەرە لە کات و ساتێکی دیاریکراو لەسەر کێشەیەک کە جێگای بایەخدانیانە»[62] ئەمەو ئەلفرێد دی گرازیا بەم شێوەیە پێناسەی دەکات: «ڕای گشتی بریتییە لە بۆچوونی جەماوەر بەرانبەر کێشەیەکی کۆمەڵایەتی»[63].

دوابەدوای پێناسەکردنی زاراوەی ڕای گشتی، بۆمان دەردەکەوێ، کە دەبێ گەل پەنا باتە بەر هۆکارەکانی پەیوەندی کردنی جەماوەریی (وسائل الاتصال الجماهیریة) بۆ گوزارشتکردن لە بۆچوونی خۆی کە ڕۆژنامە باشترین هۆکاریانە و لەمیانی ڕۆژنامەی

---

61- Leonard William, Public Opinion and Propaganda NewYork: Holt, Rinehart and Winston, 1948, P.35.

٦٢- د. شێرزاد نەجار: لە دروستکردنی ڕای گشتیدا دەزگاکانی ڕاگەیاندن ڕۆڵی سەرەکی دەبینن، ڕۆژنامەی برایەتی ژمارە ٣٥١٠ ڕۆژی پێنج شەممە ٢٠٠١/١٠/١١ ل ٧، و د. شەفیق قەزاز: ڕای گشتی هەمیشە لە دروست بوون و نوێبوونەوە و گۆڕاندایە، ڕۆژنامەی برایەتی ژمارە (٣٤٩٩) شەممە ٢٠٠١/٩/٢٩ ل ٦، وە، عدنان ابو فخر: الصحافة السوریة بین النظریة والتطبیق، ط١، منشورات دار الکاتب العربي، دمشق، ١٩٨٥ ل٤٤-٤٥، و د. بسیوني ابراهیم حمادة: دور وسائل الاتصال في صنع القرارات في الوطن العربي - مرکز دراسات الوحدة العربیة، لبنان، بیروت ط ١سنة ١٩٩٣ ص١٠٦، و د ز احمد سویلم العمري - مجال الرأي العام والاعلام - الهیئة المصریة العامة للکتاب، ١٩٧٥، ص٧، وجان ستوتزل والان جیرار - استطلاع الرأي العام- ترجمة عیسی عصفور - منشورات عویدات، منشورات لبنان - بیروت - ١٩٧٥، ص ٧ ومابعدها، و د.حسین عبدالقادر - الرأي العام والعلاقات، بدون سنة نشر، ل١٣ بکە.

٦٣- د. شێرزاد نەجار: لە دروستکردنی ڕای گشتیدا دەزگاکانی ڕاگەیاندن ڕۆڵی سەرەکی دەبینن، ڕۆژنامەی برایەتی ژمارە ٣٥١٠ ڕۆژی پێنجشەممە ٢٠٠١/١٠/١١ سەرچاوەی پێشوو، ل٧.

ئازاددا ڕای گشتی دروست دەبێت و گوزارشت لە خۆی دەکات و ڕەخنە لە حوکمڕانان (حکام) دەگرێت. هەروەها ڕێگایان لێ دەگرێ هەتا دەسەڵاتەکانیان بەخراپی بەکار نەهێنن و بۆ کاری چاکیش ئاراستەیان دەکات[٦٤].

لەبەر ئەم ڕۆڵەی کە ڕۆژنامەی ئازاد لە دروستکردن و کارتێکردنی ڕای گشتی دەیبینێ، وای لە حوکمڕانە دیکتاتۆرەکان کردووە کە هەموو یان زۆربەی کەناڵەکانی ڕاگەیاندن بخەنە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە و دەرکردنی بڵاوکراوە دەورییەکانیش بەرۆژنامەشەوە بەمەرجی مۆڵەت وەرگرتن و سانسۆری پێشینە (الرقابة المسبقة) ببەستنەوە[٦٥].

کەواتە چۆن ئازادی وەکو ئۆکسجین وایە بۆ ڕۆژنامەگەری و ناتوانێ بێ ئەو بژیێت، ئەوهاش بەبێ بوونی ڕۆژنامەی ئازاد و ئازادیی ڕۆژنامەگەری ڕای گشتی بوونی نییە. بۆیە هەرکۆمەڵێک[٦٦] لەپێناوی ئازادییەکەیدا خەبات نەکات، تیایدا ڕای گشتی سەرهەڵ نادات[٦٧].

**[illegible]: پەیوەندی نێوان ئازادیی ڕۆژنامەگەری و سیاسەت**

ڕۆژنامەگەری و سیاسەت دوو چەمکی لێک جیا نەکراوەن و لە هەموو وڵاتێکدا ڕۆژنامە بەبەشێک لە ژیانی سیاسی ئەو وڵاتە دادەندرێ و لێی جیاناکرێتەوە[٦٨].

---

٦٤- فهد ابو العثم: القضاء وحرية الصحافة، http://www.al.mashreq.org/new.issuer/derasat/sub1htm24/9/2001، ودور الاعلام في التنمية، ص ٧٤-٧٥، ود. صبحي المحمصاني: اركان حقوق الانسان، ط١، دارالعلم للملايين، بيروت - لبنان، ١٩٧٩، ل١٤٥.

٦٥- د. عبدلله اسماعيل البستاني: حرية الصحافة، سەرچاوەی پێشوو، ل٤٣.

٦٦- لەبارەی ڕای گشتی لە کوردستانی عێراقدا، د. شێرزاد نەجار دەڵێ: «لە کوردستان کۆشش بۆ وەرگرتنی ڕای گشتی نەکراوە بۆیە ڕۆڵی ڕای گشتی لە پرۆسەی دارشتنی سیاسەتدا لاوازە، هەروەها مامۆستای ناوبراو هۆی دروست نەبوونی ڕای گشتی دەگەڕێنێتەوە بۆ چەند هۆکارێک، لەوانە نەبوونی دەزگای ڕۆژنامەگەریی سەربەخۆ و مانەوەی ئەو دەزگایانە بەدەزگایەکی حزبی و ڕێنوێنییان بەڕێنوێنییەکی حزبی لەلایەن حزبەکانیانەوە» د. شێرزاد نەجار: لە دروستکردنی ڕای گشتیدا دەزگاکانی ڕاگەیاندن ڕۆڵی سەرەکی دەبینن، ڕۆژنامەی برایەتی ژمارە ٣٥١٠ ڕۆژی پێنجشەمە ١١/١٠/٢٠٠١، سەرچاوەی پێشوو، ل٧.

٦٧- عزيز السيد جاسم: مبادئ الصحافة في عالم المتغيرات، سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٩. و سعدالدين خضر - الرأي العام وقوى التحريك - مطبعة الجمهورية - الموصل، ط١، ١٩٦٨ ل٩٩-١٠١.

٦٨- محمد حسنين هيكل: بين الصحافة والسياسة، شركة المطبوعات للتوزيع والنشر، بيروت- لبنان، ط٥، ١٩٨٤ ل٢٣٥.

هەروەکو چۆن مافە سیاسییەکان یەک پارچەن و بۆ هەموو کەسێک دانیان پیانراوە بەو سیفەتەی کە ئەندامە لە کۆمەڵگایەکی سیاسی بۆ ئەوەی لە ڕێگای ئەو مافانەوە لە بەڕێوەبردنی کاروباری وڵاتەکەی بەشداری بکات[٦٩].

مارتن لینسکی Martin Linsky لەم بارەیەوە دەڵێ: «مومارەسەکردنی حوکمڕانێتی بەشێوەیەکی کاریگەر وا دەخوازێ لەو کەسانەی کە نەخشەی سیاسی دەکێشن، تێ بگەن چۆن کەناڵەکانی ڕاگەیاندن کار دەکەن، بۆ ئەوەی بتوانن سوود لە دەسەڵاتەکەی وەربگرن بۆ کاراکردنی ئامانجە گشتییەکانی سیاسەت.

جا ئەگەر هاتوو نەیانتوانی سوود لەو لایەنانەی ڕاگەیاندن وەربگرن کە پەیوەندی هەیە بەسیاسەتەوە، یا بەخراپی بەکاریان هێنا، ئەگەرەکانی سەرنەکەوتنی سیاسەت زیاتر دەبێت»[٧٠].

ئازادیی ڕۆژنامەگەری و ڕۆژنامەی ئازاد لە کەش و هەوای دیموکراسیدا نەشونما (گەشە) دەکات و سیستمی سیاسی یان کەش و هەوایەکی بێ گەرد بۆ ڕۆژنامەگەری دەڕەخسێنێ بەچەشنێک کە بۆنی ئازادیی لێ بێت یان پاڵی پێوە دەنێ بۆ کەش و هەوایەکی خنکێنەر (خانق) بەچەشنێک کە ژیانی ئەستەم بێت، یان بارێکی مام ناوەندی لە نێوان ئەو دوو بارەدا دەڕەخسێنێ[٧١].

ئەمەو ڕۆژنامەگەری ناتوانێ پەیامە کۆمەڵایەتییەکەی بگەیەنێتە جێ و گەشە بکات لە وڵاتە دیموکراتەکاندا نەبێت، چونکە لەوێدا تاکەکان (الأفراد) و کۆمەڵەکەسان مومارەسەی ماف و ئازادییە سیاسییەکانیان دەکەن، لەوانەش ئازادیی ڕۆژنامەگەری. بەڵام لە وڵاتە دیکتاتۆرەکاندا کە تیایاندا تاکەکان و کۆمەڵەکەسان ئەم مافانەیان لێ زەوت دەکرێ، چاوەڕێی هیچ پێشکەوتن و سوودێک لە ڕۆژنامەگەری ناکرێ[٧٢]، چونکە لە وڵاتانی دیموکراسیدا دەرفەت بەفرە حزبی دەدرێ و حزبەکانیش لە ڕێگای ڕۆژنامەگەرییەوە

٦٩- دلیژنەی مافەکانی مرۆڤەی سەر بەڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان مافی ئازادیی دەربڕینی بەبەشێک لە مافە مەدەنی و سیاسییەکان داناوە و لە ماددە (١٩)ی پەیمانی نێودەوڵەتیی تایبەتی مافە مەدەنی و سیاسییەکانی ساڵی ١٩٦٦ دەقنووسی کردووە.

٧٠- دوریس ایه حربر Dorisa Graber: سلطة وسائط الاعلام في السياسة، ط١، منشورات دار البشير، عمان، الاردن، ١٩٩٩، ل٤٨٠.

٧١- د. حسين عبدالقادر - الرأي العام والعلاقات، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٩١.

٧٢- د. حسين عبدالقادر - الرأي العام والعلاقات - سەرچاوەی پێشوو ل٢٩١.

گوزارشت لە بیروڕای خۆیان دەکەن[٧٣] بۆیە شتێکی ئاساییە کە دامەزرانی پارتە سیاسییەکان دامەزرانی ڕۆژنامەیان لێ دەکەوێتەوە، ئەمەش خۆی لە خۆیدا وا دەخوازێ کە ڕۆژنامەگەری و سیاسەت دوو جەمسەری بەرامبەر یەک بن و لەم هاوکێشەیەشدا ڕۆژنامەگەریی ئازاد چاودێری دەسەڵاتی سیاسی دەکات و لەکاتی سنوور بەزاندنی حوکمڕاناندا دەتوانێ هەوڵ بدا دەسەڵاتی سیاسی رابگرێ نەگەر لە بەرژەوەندی گشتی لایدا و کەوتە خزمەتی کەسێک یان گرووپێکی تایبەت[٧٤]. بۆیە پێویستە ڕۆژنامەگەری و سیاسەت لەسەر پاراستنی بەرژەوەندی گشتی ڕێک بکەون. هەروەها دەبێ ئەوانەی دەسەڵاتدارن بە لەخۆ بایی بوونەوە نەڕواننە ڕۆژنامەگەری و دەبێ ڕۆژنامەگەریش بەچاوێکی دوژمنکارانە نەڕوانێتە ئەوان[٧٥].

لەمەش زیاتر، زۆرجاران، ڕۆژنامەگەری ڕۆڵی دیپلۆماتکاری دەبینێت و ڕۆژنامەنووسان وەک دیپلۆماتکارێک هەڵسوکەوت دەکەن بۆ بەدیهێنانی بەرژەوەندییەکی باڵای کۆمەڵ بەتایبەتی لەوکاتەدا کە سیاسەتمەدارەکان نەتوانن ئەو ڕۆڵە ببینن. بۆ نموونە لە کێشەی بارمتە ئەمەریکاییەکان لە ئێران، کاتێک وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکا نەیتوانی پەیوەندی بەلێپرسراوە ئێرانییەکانەوە بکات بۆ بەسەرکردنەوەیان، هەندێک پەیامنێری کەناڵە تەلەفزیۆنییەکانی ئەمەریکا توانییان ئەم ڕۆڵە ببینن و چاوپێکەوتن لەگەڵ بەرپرسە ئێرانییەکان بکەن[٧٦].

٧٣- لە برگەی یەکەمی ماددە (٢)ی یاسای حزبەکانی هەرێمی کوردستانی عێراق ژمارە ١٧ی ساڵی ١٩٩٣دا هاتووە: «هەر هاووڵاتییەک لە هاووڵاتییانی هەرێمی کوردستانی عێراق و تیایدا نیشتەجێی و مەرجەکانی تێدا هەبێ مافی بەشداریکردنی دامەزراندنی حزبی هەیە». هەروەها لە برگەی یەکەمی ماددە (١٣)ی هەمان یاسادا هاتووە: «حزب ئەم مافانەی دەبێ: ١- هۆکارەکانی راگەیاندنی هەبێ کە بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانی بەپێی یاسا رەچاوکراوەکان بەکاریان دێنێ».

٧٤- د. حسین عبدالقادر - الرأي العام والعلاقات - سەرچاوەی پێشوو ل ٢٩١، و حەمەکەریم عارف: راگەیاندن لە پەراوێزی دەسەڵاتدا، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای موکریانی، چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠١، ل ١٥-١٧.

٧٥- حەمەکەریم عارف: راگەیاندن لە پەراوێزی دەسەڵاتدا، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٨، ل ٢٠.

٧٦- جون. ار. بیتر - مقدمة في الاتصال الجماهيري - ترجمة مركز الكتب الاردني، سەرچاوەی پێشوو - ل٦٦٧-٦٦٨.

**چوارەم**: پەیوەندی نێوان ئازادیی ڕۆژنامەگەری و دەسەڵات

پەیوەندی نێوان ئازادیی ڕۆژنامەگەری و دەسەلات لە سیستمێکەوە بۆ سیستمێکی تر دەگۆڕێ، لە سیستمی دیموکراسیدا پەیوەندییەکی کاریگەر لە نێوان سیاسەتی دەسەلات و ئازادیی ڕۆژنامەگەریدا هەیە. ڕۆژنامەگەری ڕۆڵی زمانحاڵی گەل دەبینێت و نوێنەرایەتی دەسەڵاتی چوارەم دەکات و کاریگەرێتیشی لەسەر ڕای گشتی دەبێت[٧٧] هەروەمەش وای کردووە کە ڕژێمە دیکتاتۆرەکان لێی بترسێن و بەهەڕەشەی دابنێن لەسەر ئاسایشی نەتەوەیی[٧٨]. لەبەر ئەو ڕۆڵەی کە ئازادیی ڕۆژنامەگەری دەیبینێ لە ڕەخساندنی بوار بۆ تاکەکانی کۆمەڵ، بۆ بەرهەڵستیی (معارضة) حکوومەت و ئاراستەی حکوومەتیش دەکەن بۆ چاکسازی و چاودێریکردنیشی بۆ ڕێگاگرتن لە خراپ بەکارهێنانی دەسەلات و گەندەڵی، بۆیە لە چوارچێوەی ئازادییەکانی ئۆپۆزسیۆن (حريات المعارضة) دانراوە[٧٩].

بەم چەشنە ڕۆژنامەگەری بەهۆکارێکی دەستووری دادەنرێت بۆ هەوڵی ڕاگرتنی دەسەڵاتی سیاسی لەکاتی لادانیدا لە بەرژەوەندی گشتیدا، ئەمەش مانای ئەوە نییە ڕۆژنامەگەری خولیایەک بێت بۆ دژایەتیکردنی دەسەلات، بەڵکو پێویستە ڕۆڵی ڕەخنەگرتن و بەدەرخستنی گیروگرفتەکان ببینێ. ئەمەش خۆی لە خۆیدا وادەکات کە ڕۆژنامەگەری هۆکارێکی کاریگەر بێت بۆ گۆڕینی ڕەوتەکان (الاتجاهات) و دروستکردنی بڕیاری سیاسی و داڕشتنی سیاسەتەکانی حکوومەت لە ڕێگای دەرخستنی ڕاستییەکاندا.

---

٧٧- لەوانەیە ڕۆژنامەنووس یەکێک بێت لە کارمەندانی حکوومەت یان کارمەندی ئەو نەبێت، بەڵام ج بەشێک بێت لەو دەسەڵاتە یان لە دەرەوەی ئەو دەسەڵاتە بێت، لە ململانێیەکی بەردەوام دایە لە پێناوی بەدیهێنانی پەیامەکەی. بڕوانە كامل الشرقي: حول مفهوم حرية الصحافة، بغداد، ١٩٧٣ ل٣.

٧٨- د. جيهان المكاري: حرية الفرد وحرية الصحافة، الهيئة المصرية للكتاب، ١٩٨١ ل ٦٢، و د. عبدالله اسماعيل البستاني: حرية الصحافة، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٨-١٩.

٧٩- جان شايفر: دور وسائل الاعلام في بناء والمجتمع، گۆڤاری (وسائل الاعلام والاخلاق)ی ئەلیکترۆنی کە وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکا دەری دەکات لە تۆڕی ئینتەرنێت، لەم شوێنەی خوارەوە وەرگیراوە:

http://www.usinfo.state.gov/journals/itgic/401./ijga/htm.2001/10/1، و حيدر حسين الحميد: الصحافة بين الأعباء الذاتية و الضغوطات الخارجية.

http://www.anaaba.org/naba46/sahafa.htm29/9/2001

لەبەر ئەم ڕۆڵەی کە ڕۆژنامەگەری لە کۆمەڵگای دیموکراسیدا دەیبینێ، زۆر جار بەدەسەڵاتی چوارەم ناوی دەبردرێ[٨٠]. کێشەی ئابڕووبەرەکەی «ووتەرگێیت»[٨١] باشترین نموونەیە بۆ ئەو ڕۆڵەی کە ڕۆژنامە لەناو کۆمەڵدا وەک دەسەڵاتی چوارەم دەیبینێ[٨٢]. هەڵبەتە ئەم ڕۆڵەی نامێنێ ئەگەر بێت و بخرێتە ژێر چاودێریی حکومەتەوە[٨٣].

شایەنی باسە، هەندێ ڕۆژنامەی میسری و مەغریبی و ئوردنی ڕۆژانە ئەم ڕۆڵە دەبینن و ڕەخنە لە حکومەت دەگرن، بەڵام باجی ئەم ئازادییە بەچەند شێوەیەک دەدەنەوە. لەوانە تەنگ پێ هەڵچنینی حکومەت بۆ ڕۆژنامە سەربەخۆکان و تەگەرە خستنە ناو کارەکانیانەوە و تەنانەت داخستنیشیان. هەروەها حکومەت ئەو شتە خراپانە دەشارێتەوە کە جێگای بایەخ پێدانی ڕۆژنامەگەرییەوە ڕێگا نادات ڕۆژنامەنووسان بەدوایدا بچن و بەسەری بکەنەوە. ئەمەو وێڕای ئەوەی بەرپرسانی حکومی وەڵامی پرسیاری ڕۆژنامەنووسان بۆ زۆربەی کێشەکان نادەنەوە[٨٤].

---

٨٠- د. بسیوني ابراهيم حمادة: دور وسائل الاتصال في صنع القرارات في الوطن العربي، مركز دراسات الوحدة العربية، بيروت، ط١، ١٩٩٣ ل ١٤١-١٤٢، و سعدالدين خضر: الرأي العام وقوى التحريك، سەرچاوەی پێشوو، ل ١١٩-١٢٠ و حەمە کەریم عارف: ڕاگەیاندن لە پەراوێزی دەسەڵاتدا، وتاری د. شێرزاد نەجار، ل ١٩، وحامد محمد علي: حول الاعلام والاعلام الاسلامي، سەرچاوەی پێشوو، ل٧.

٨١- ئەم کێشەیە دوو ڕۆژنامەنووسی ئەمەریکی لە ڕۆژنامەی «واشنتۆن پۆست» ووروژاندیان و ئاشکرایان کرد و بووە هۆی دەست لەکارکێشانەوەی سەرۆکی پێشووی ئەمەریکی نیکسۆن و دەرچوونی لە کۆشکی سپی بەرلەوەی ماوەی سەرۆکایەتییەکەی تەواو بێت.

٨٢- د. بسیونی ابراهيم حماده: دور وسائل الاتصال في صنع القرارات في الوطن العربي، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٤٢، و کەمال سەعدی: دەسەڵاتی چوارەم، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٠.

٨٣- حرية الصحافة: ملحق مجلة الشباب العدد (١، ٥ دسمبر، ١٩٧٢ النص الكامل لمناقشة مجلس الشعب المصري حول حرية الصحافة، سەرچاوەی پێشوو، ل١٦.

٨٤- سعيد السلمي: برنامج أكثر من رأي، بمناسبة يوم الصحافة العالمي، تقديه جميل عازر، تۆڕی ئینتەرنێت:

http://www.aljazera.net23/9/2001

هەروەها (المشرق الاعلامي)، تۆڕی ئینتەرنێت:

http://www.aljazera.net2/12/2001.

بەپێچەوانەی ئەمە، لە زۆربەی وڵاتە دیموکراتەکاندا ڕۆژنامەگەری چاودێرە بەسەر حکومەتەوە و ڕەخنەی لێ دەگرێت و لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکات و دەبێتە سەرچاوەی بێزارکردنی، کەچی سەرەڕای ئەمەش حکومەت لە پێناوی ئازادیدا باجەکەی دەدات، چونکە بەپلەی سەرەکی، ڕۆژنامە بەرامبەر خوێنەرەکانی بەرپرسیارە[٨٥].

## ٢-٣ ڕۆژنامەگەریی عێراقی... سەرهەڵدان و پێشکەوتن

لەو ڕۆژەوەی یەکەم ڕۆژنامە لە ساڵی ١٨١٦ لە بەغدا بەناوی «جورنال العراق» دەرچووە و تاکو ئەمڕۆ ڕۆژنامەگەریی عێراقی لەژێر کاریگەریتیی بارودۆخی ڕامیاری و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری و پیشەسازی و شۆڕشی تەکنۆلۆژیاوە بووە، زۆر هەنگاوی بەرەو پێشەوە ناوە و گەلێک قۆناغی جیای بڕیوە. قۆناغی یەکەم؛ لە سەرهەڵدانی چاپخانەی بەردین (المطبعة الحجرية) دەست پێ دەکات تاکو هاتنی چاپخانەی ئالی بۆ ویلایەتی بەغدا لە سەردەمی حوکمڕانییەتی مەدحەت پاشا لە (١٨٦٩-١٨٧٢) تاکو ١٩٢١ و قۆناغی دووەمیش لە دروستبوونی دەوڵەتی عێراق لە ساڵی ١٩٢١ دەست پێ دەکات تاکو شۆڕشی چواردەی تەمووزی ١٩٥٨ و قۆناغی سێیەمیش دوای ئەوە دەست پێ دەکات و بەردەوام دەبێت تاکو ئێستا. هەرچەندە لە دوای ساڵی (١٩٩٠)ەوە بەهۆی کۆتایی هاتنی جەنگی سارد و ڕوخانی دیواری بەرلین و هەرەس هێنانی بلۆکی سۆسیالیزم و سەرهەڵدانی سیستمێکی نوێی جیهانی لەسەر بنەمای دیموکراسییەت و مافی مرۆڤ، بواری ڕۆژنامەگەری لە جیهاندا بەگشتی پێشکەوتنێکی پێوانەیی بەخۆیەوە بینی، بەڵام لەبەر ئەوەی بەشی عێراق لەم پێشکەوتنەدا وەکو پێویست نەبووە، بۆیە ناتوانین ئەم ماوەیە لە عێراقدا بەقۆناغێکی جیاواز دابنێین.

ئەمەو، لەبەرئەوەی ئێمە توێژینەوەکەمان، توێژینەوەیەکی یاساییە و نامانەوێ بەو قووڵییە بچینە ناو ئەو بابەتە، کەزیاتر بابەتێکی مێژووییە، بۆیە لەجیاتی باسکردنی ئەو قۆناغانە، نموونەی پێویستە بۆ ناساندنی ڕۆژنامەگەریی عێراقی و پێشکەوتنی، بەر لەوەی بچینە سەر ڕێکخستنی یاسایی ئازادیی ڕۆژنامەگەری لە عێراقدا، بەپێویستمان زانی لە خوارەوە لە دوو خاڵدا، بەکورتی باس لە سەرهەڵدانی ڕۆژنامەگەریی عێراقی و پێشکەوتنی بکەین.

---

٨٥- روبرت. ايج. ايستابروك: «الحقوق والواجبات». ترجمة عبدالرزاق عبدالله، مجلة گولان العربي: العدد (٦٤) ايلول ٢٠٠١، ل٢٩.

### ٢-٣-١ سەرهەڵدانی ڕۆژنامەگەریی عێراقی

ڕۆژنامەگەریی عێراقی بەدەرچوونی ڕۆژنامەی (جورنال العراق) لە ساڵی ١٨١٦ کە لە لایەن داود پاشا الکرجی لە شاری بەغدا دەرچوو سەریهەڵدا[٨٦]. ئەم ڕۆژنامەیە لە چاپخانەیەکی بەردین بەزمانی عەرەبی و تورکی دەردەچوو[٨٧].

دوای دەرچوونی (جورنال العراق) بەپەنجا و سێ ساڵ، ڕۆژنامەی «زوراء» لە ١٨٦٩/٦/١٥ لە لایەن مەدحەت پاشای والی بەغدا دەرچوو.

شایەنی باسە، ئەم والییە بەرلەوەی بێتە بەغدا، لە فەرەنساوە چاپخانەیەکی ئالی لەگەڵ خۆی هێناو ناوی لێنا (مطبعة الولاية) و لە شاری بەغدای دانا و ستافێکی نووسینیشی لە ئاستانەوە بۆ هێنا[٨٨] و لە ڕێگای ئەم چاپخانەیەوە دەستی کرد بەچاپکردنی ڕۆژنامەی (زوراء) و تاکو داگیرکردنی بەغدا لە لایەن هێزەکانی بەریتانیا لە ساڵی ١٩١٧ بەردەوام بوو لە دەرچوون و دوابەدوای ئەوە ڕاوەستا[٨٩].

---

٨٦- لە نێوان ئەوشتانەی کە لیژنەی کەلەپووری شوێنەوار (الآثار والتراث)ی عێراقی لە گردەکانی عەقەر قوف دۆزینیەوە، ڕۆژنامەیەکی لە خشت دروستکراوی سوورکراوەیە، کە ئاشوورییەکان لە سەردەمی ئاشور بانیباڵ پێش زایین دەریان کردووە بۆ پڕوپاگاندە و بڵاوکردنەوەی هەواڵی سەرکەوتنەکانیان، نموونەی ئەم ڕۆژنامەیە لە مۆزەخانەی بەغداو و لەندەن هەیە، بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە:
http://www.Iraq2000.com/presscom1/10/2001

٨٧- هادي طعمة العباسي: الاحتلال البريطاني و الصحافة العراقية - رسالة قدمت الى جامعة بغداد عام ١٩٨٠ لنيل شهادة الماجستير في الصحافة والنشر ص٥٧ هامش رقم ١، و - فائق بطي: الصحافة العراقية ميلادها و تطورها، ط١، بغداد، ١٩٦١، ص ١٣، و منير بكر التكريتي: الصحافة العراقية، ط١، مطبعة الارشاد - بغداد، ١٩٦٩، ص ٥٣، و رفائيل بطي: صحافة العراق، ط١، ج ١، شركة مطبعة الأديب البغدادية المحدودة، بغداد، ١٩٨٥، ص٣٠.

٨٨- هادي طعمة العباسي: الاحتلال البريطاني و الصحافة العراقية - رسالة قدمت الى جامعة بغداد عام ١٩٨٠ لنيل شهادة الماجستير في الصحافة والنشر ص٥٧، و نشأة الصحافة العراقية و تطورها ص٩، و فائق بطي: الصحافة العراقية ميلادها وتطورها، سەرچاوەی پێشوو، ص١٣-١٥، و - منير بكر التكريتي: الصحافة العراقية، سەرچاوەی پێشوو، ص٥٣، و سجاد الغازي: مراحل تطور الصحافة العراقية، المؤسسة العامة للصحافة والطباعة، بغداد، ١٩٦٨، ص٥، و - د. عبدلله البستاني: حرية الصحافة، سەرچاوەی پێشوو، ل ٩٦، و - رفائيل بطي: صحافة العراق، سەچاوەی پێشوو، ل ٣٠.

٨٩- فائق بطي: الصحافة العراقية ميلادها وتطورها، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٣-١٥.

دوابەدوای ڕۆژنامەی (زوراء) بەشازدە ساڵ لە ١٨٨٥/٦/٢٥ ڕۆژنامەی (موصل) لە ویلایەتی موسڵ لە لایەن حکومەتی عوسمانی بەزمانی عەرەبی و تورکی دەرچوو[٩٠]. دوای ئەویش لە ویلایەتی بەسرە، لە ساڵی ١٨٩٥ ڕۆژنامەی (بصرە) دەرچوو[٩١].

بەم شێوەیە، هەر سێ ڕۆژنامە بەردەوام بوون لە دەرچوون بەشێوەیەکی ڕێکوپێک تا کۆتایی هاتنی حوکمڕانێتی عوسمانی لە هەر ویلایەتێک لەو ویلایەتانەی کە ڕۆژنامەکانی تیا دەردەچوو. بۆیە ڕۆژنامەی (بصرە) لە ٢٢ی تشرینی دووەمی ١٩١٤ دوای داگیرکردنی ویلایەتی بەسرە لە دەرچوون وەستا، ڕۆژنامەی (زوراء)یش لە ١١ی ئازاری ١٩١٧ دوای داگیرکردنی ویلایەتی بەغدا لە دەرچوون وەستا و ڕۆژنامەی (موصل)یش لە کۆتایی مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩١٨ دوای داگیرکردنی موسڵ لەلایەن هێزەکانی ئینگلیز لە دەرچوون وەستا[٩٢].

## ٢- ٣- ٢ پێشکەوتنی ڕۆژنامەگەریی عێراقی

بەشێوەیەکی گشتی، دەتوانین بڵێین، دوابەدوای دەرچوونی ڕۆژنامەی (زوراء)، بەدەرچوونی دەستووری عوسمانی کە ناسراوە بەیاسای بنەڕەتی (القانون الأساسي) لە ساڵی ١٩٠٨ و دوابەدوای بەرکاربوونی ئەم دەستوورە، بوارێکی زیاتر بۆ موومارەسەکردنی ماف و ئازادییەگشتییەکان ڕەخسا و ڕۆژنامەش هۆکارێک بوو بۆ گوزارشتکردن لەو ئازادییە، بۆیە دەبینین ژمارەیەکی زۆری ڕۆژنامە دوابەدوای ئەو ساڵە دەرچوون، کە ژمارەیان لە ماوەی چوار ساڵی نێوان (١٩٠٨ - ١٩١١) خۆی لە پەنجا و پێنج ڕۆژنامە دەدا[٩٣].

---

٩٠- سمير صبحي: كشكول الصحافة، ط١، منشورات الهيئة العامة للكتاب - القاهرة، ١٩٩٩٢، ل١٩٥-١٩٦، وفائق بطي: الصحافة العراقية ميلادها وتطورها، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٣-١٥.

٩١- سمير صبحي: كشكول الصحافة، ل ١٩٥-١٩٦، وعدنان عبدالمنعم ابو السعد: تطور الخبر واساليب تحريره في الصحافة العراقية، ط١، منشورات دائرة الشؤون الثقافية والنشر، دار الحرية للطباعة، بغداد، ١٩٨٣، ل ٩.

٩٢- عدنان عبدالمنعم ابو السعد: تطور الخبر واساليب تحريره في الصحافة العراقية، سەرچاوەی پێشوو، ل١٠.

٩٣- هادي طعمة العباسي: الاحتلال البريطاني و الصحافة العراقية، سەرچاوەی پێشوو، ل٦٠، وعدنان عبدالمنعم ابو السعد: تطور الخبر واساليب تحريره في الصحافة العراقية، سەرچاوەی پێشوو، ل١٥.

دوای داگیرکردنی ویلایەتی بەسرە لە لایەن هێزەکانی بەریتانیاوە لە ١ی کانوونی یەکەمی ١٩١٤، ئینگلیزەکان بلاوکراوەیەکیان دەرکرد بەناوی (بصرە تایمس) بەزمانی عەرەبی و تورکی بۆ بلاوکردنەوەی هەواڵەکانی جەنگ و سەرکەوتنەکانی هاوپەیمانان. ئەم بلاوکراوەیە تا کۆتایی ئابی ساڵی ١٩١٧ بەوچەشنە مایەوە. دواتر بووە رۆژنامەیەکی سەربەخۆ بەناوی (الاوقات البصریة) بەزمانی عەرەبی و تورکی و فارسی و ئینگلیزی دەردەچوو[٩٤].

دوای داگیرکردنی ویلایەتی بەغدا، ئینگلیزەکان، رۆژنامەیەکیان بەناوی (العرب) لە ٤ی تەمموزی ١٩١٧ دەرکرد و تا ٣١ی مایسی ١٩٢٠ بەردەوام بوو. دواتر دوو رۆژنامەی تر دەرچوون، یەکیان بەناوی (العراق) کە لە ١ی حوزەیرانی ١٩٢٠ دەرچوو و ئەوەی تریشیان بەناوی (الشرق) لە ٣٠ی ئابی ١٩٢٠ دەرچوو[٩٥].

لەماوەی شۆرشی (١٩٢٠)یشدا رۆژنامەی (الاستقلال)ی بەغدادی و رۆژنامەی (الاستقلال)ی نەجەفی و رۆژنامەی (الفرات) دەرچوون. یەکەمیان لە ٢٨ی ئەیلولی ١٩٢٠ دەرچوو، دووەمیان لە ٣ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٠ و سێیەمیشیان لە ١٥ی ئەیلولی ١٩٢٠ دەرچوو[٩٦].

گشت ئەو رۆژنامانەی لە ماوەی داگیرکردنی عێراق لە لایەن هێزەکانی ئینگلیز دەردەچوون، هی حکوومەت و لە ژێردەسەلاتی ئەودا بوون و بەمەرامی کارکردن لە رای گشتی دەستی بەسەردا گرتبوون[٩٧] و لە ماوەی ئینتیدابی بەریتانیش کۆمەڵێک رۆژنامە دەرچوون، لەوانە رۆژنامەی (الفلاح) و (لسان العرب) و (دجلة) و (الرافدان) و (العاصمة) و (بغداد تایمس)[٩٨].

لە دوای دەرچوونی (القانون الاساسي)یش کۆمەڵێک رۆژنامەی تر دەرچوون، لەوانە، رۆژنامەی (العهد) لە ٢٠ی کانوونی دووەمی ١٩٢٥ و (فتی العراق) و (ندا والشعب)

---

٩٤- فائق بطي: الصحافة العراقیة میلادها ... وتطورها، ١٩٦١، ل ١٩-٢٠.

٩٥- رفائیل بطي: صحافة العراق، سەرچاوەی پێشوو، ل ٦٢-٦٣.

٩٦- رفائیل بطي: صحافة العراق، سەرچاوەی پێشوو، ل ٦٥-٧٠.

٩٧- گرنگترین رۆژنامەکانی ئەو سەردەمە، رۆژنامەی (بصرة تایمس - ١٩١٤/١١/٢٤ و الأوقات البصریة - ١٩١٨/٦/١٢ وجریدة العرب ١٩١٧/٩/١ بوو، بۆ زیاتر زانیاری بروانە: هادي طعمة العباسي: الاحتلال البریطاني و الصحافة العراقیة، سەرچاوەی پێشوو، ل٧٣-٧٤.

٩٨- رفائیل بطي: صحافة العراق، سەرچاوەی پێشوو، ل٧٣ بەدواوە.

له ۲۰ی کانوونی دووه‌می ۱۹۲٦ و (اللواء) له ۲۰ی ئابی ۱۹۲۸ و (التقدم) له ۱٦ی تشرینی یه‌که‌می ۱۹۲۸ و (الوحدة) له ۱۲ی کانوونی دووه‌می ۱۹۳۵[۹۹].

به‌لام له ماوه‌ی نێوان (۱۹۵۰-۱۹۵٤) بۆ یه‌که‌مجار رۆژنامه‌گه‌ریی عێراقی چاپکردنی نالی له رێگای پێچنیتی نالی به‌خۆیه‌وه بینی و به‌کارهێنانی نامێره‌کانی لاینۆتایپ و ئه‌نته‌رتایپ به‌مه‌ش کۆتایی به‌سه‌رده‌می پێچنینی ده‌ستی هات.

له ماوه‌ی نێوان (۱۹۵٤-۱۹۵۸) رۆژنامه‌گه‌ریی عێراقی پێی نایه قۆناخی بایه‌خدان به‌هه‌واڵ و وێنه و مانشێت و ره‌نگه‌کان و به‌شداری کرد له وه‌کاله‌ته نێوده‌وڵه‌تییه‌کانی ده‌نگ و باس بۆ وه‌رگرتنی هه‌واڵ.

له ساڵی ۱۹۵۹ به‌دواوه به‌دامه‌زرانی سه‌ندیکای رۆژنامه‌نووسانی عێراقی، رۆژنامه‌گه‌ریی عێراقی پێی نایه قۆناخێکی تره‌وه و ته‌کانێکی تری دا بۆ پێشه‌وه و دواتریش به‌ده‌رچوونی سندووقی خانه‌نشینکردنی رۆژنامه‌نووسان له ساڵی ۱۹٦۵ و زامن بوونی دوارۆژی خۆیان و خێزانییان له دوای مردنیان، زیاتر رۆژنامه‌گه‌ری پێشکه‌وت[۱۰۰]. ئه‌مه‌و له‌م ساڵانه‌ی دواییدا و دوابه‌دوای سه‌رهه‌ڵدانی ته‌کنۆلۆژیای نوێ و هه‌ڵدانی مانگی ده‌سکرد بۆ ئاسمان و په‌یدابوونی نه‌وه‌ی نوێی کۆمپیوته‌ر و سه‌ته‌لایت و دواتریش په‌ره‌سه‌ندنی زیاتری شۆرشی زانیارییه‌کان و به‌ستانه‌وه‌ی جیهان به‌تۆری ئینته‌رنێته‌وه، ئه‌مانه گشتیان کاردانه‌وه‌یان له‌سه‌ر بزاڤی رۆژنامه‌گه‌ریی عێراقیدا هه‌بووه و ئێستاکه ژماره‌ی رۆژنامه‌کان له زیادبوون دایه و له رووی ته‌کنیکیشه‌وه پێشکه‌وتنی به‌خۆیه‌وه بینیوه و له رۆژنامه‌یه‌کی ناوخۆیی یان سنووردار بۆته رۆژنامه‌یه‌کی به‌رفراوان و چۆته سه‌ر تۆری ئینته‌رنێته‌وه.

هه‌رچه‌نده، ئه‌گه‌ر رۆژنامه‌گه‌ریی عێراقی له‌گه‌ڵ رۆژنامه‌گه‌ری له وڵاتانی تردا و ته‌نانه‌ت له‌گه‌ڵ رۆژنامه‌گه‌ریی کوردستانیشدا به‌راورد بکه‌ین، ده‌بینین پێشکه‌وتنێکی ئه‌وتۆی به‌خۆیه‌وه نه‌بینیوه که شایه‌نی باسکردن بێت. ره‌نگه هۆی ئه‌مه‌ش بگه‌رێته‌وه بۆ سیاسه‌تی دیکتاتۆری و ترسان له ئازادیی بیروڕاو ره‌خنه، که رۆژنامه‌گه‌ریی ئازاد به‌رجه‌سته‌یان ده‌کات و ئه‌مه بۆته هۆی گۆشه‌گیریی رژێمی عێراقی و دابرانی له کۆمه‌ڵگه‌ی نێوده‌وڵه‌تی و سیستمی نوێی جیهانی که له‌سه‌ر بنه‌مای مافی مرۆڤ و دیموکراسییه‌ت بنیات نراوه.

---

۹۹- رفائیل بطي: صحافة العراق، سه‌رچاوه‌ی پێشوو ل ۹۰ به‌دواوه.

۱۰۰- سجاد الغازي: مراحل تطور الصحافة العراقية، سه‌رچاوه‌ی پێشوو، ل ۷-۱۲.

## ٢-٤ ڕۆژنامەگەریی کوردی... سەرهەڵدان و پێشکەوتن

ڕۆژنامەگەریی کوردی لەو ڕۆژەوەی یەکەم ڕۆژنامەی کوردی چاپکراو[١٠١] لە ١٨٩٨/٤/٢٢ لە قاهیرە بەناوی (کوردستان) لە دایک بووە و تاکو ئەمڕۆ لەژێر کاریگەرێتیی باروودۆخی ڕامیاری و جمووجۆڵی بڵاوبوونەوە و بووژانەوەی هەستی نەتەوایەتی و بڵاوبوونەوەی زانیاری و خوێندەواری و وشیاریدا بەزۆر قۆناخی جیاجیادا تێپەڕیوە، بۆیە ئەم بابەتە خۆی لە خۆیدا زۆر هەڵدەگرێ لەسەری بنووسرێ و ڕەنگە ئاسان نەبێ لێرەدا لە خاڵێکی وا بچووکدا تیشک بخەینە سەر گشت لایەنەکانی. لەکاتێکدا نیەمە مەبەستمان تەنها ناساندنی ڕۆژنامەگەریی کوردی و پێشکەوتنیەتی. بۆیە لەخوارەوە، لە دوو خاڵدا باسی سەرهەڵدانی ڕۆژنامەگەریی کوردی و پێشکەوتنی دەکەین.

### ٢-٤-١ سەرهەڵدانی ڕۆژنامەگەریی کوردی

لە ٣٠ ذی القعدەی ١٣١٥ی بەرامبەر بە١٨٩٨/٤/٢٢[١٠٢] یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەی «کردستان»[١٠٣] بەزمانی کوردی لەگەڵ پاشکۆیەکی یەک لاپەڕەیی بەزمانی

---

١٠١- (نەوشیروان مستەفا) لە بارەی سەرهەڵدانی ڕۆژنامە و ڕاگەیاندنی بیستراو بۆ یەکەمجار بەزمانی کوردی دەڵێ: «تا ساڵی ١٩٣٩ ڕاگەیاندن بەزمانی کوردی هەر خوێندراو (بەنووسین و خوێندنەوە) بوو، ئیتر لەوە بەدواوە لە پاڵ ڕاگەیاندنی خوێندراودا بیستراو (گوتن و بیستن)یش پەیدابوو». بۆ زانیاری زیاتر لەمبارەیەوە، بڕوانە: (نەوشیروان مستەفا): ڕاگەیاندنی بیستراو بەکوردی، گۆڤاری (ڕۆژنامەنووسان، وەرزە گۆڤارێکی تۆژینەوەیە یەکێتی ڕۆژنامەنووسانی کوردستان دەریدەکات، ژمارە (٢) ساڵی یەکەم، هاوینی ٢٠٠٢، ل٣ بەدواوە.

١٠٢- ساڵی دەرچوونەکەی (١٣١٥)ی هیجریە... ڕۆژهەڵاتناسی سۆڤیەتی و پسپۆڕ لە مێژووی کوردیدا (دکتۆر ڤیلچیڤسکی) و (مینۆرسکی) ڕۆژهەڵاتناسی مێژووی دەرچوونیان بە(١٨٩٨) سنووردار کردووە بڕوانە: محمود زامدار: (کوردستانی دایک) لە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری حکومەتی هەرێمی کوردستان، چاپخانەی ڕۆشنبیری، هەولێر، ١٩٩٨، ل٢١٧.

١٠٣- ئەم ڕۆژنامەیە (٣١) ژمارەی چوار لاپەڕەیی بەزاراوەی کرمانجی ژووور و لە ماوەی پێنج ساڵ (١٨٩٨-١٩٠٢) لە چەند جێگایەکی جیاجیای جیهان لێ دەرچووە.

پێنج ژمارەی یەکەمی لە قاهیرە لێ دەرچووە و ژمارە شەش تا ژمارە نۆزدەشی لە جنێف دەرچووە و دوایی جارێکی تر گەڕاوەتەوە قاهیرە و ژمارە بیست و یەک تا بیست و سێی لێ دەرچووە و. بەڵام

فەرەنسی لەلایەن مقداد مەدحەت بەدرخان لە قاهیرە دەرچوو[١٠٤].

شایەنی ئاماژە بۆکردنە، لە دایک بوونی ڕۆژنامەگەریی کوردی لە غەریبی، خۆی لە خۆیدا تایبەتمەندییەک بەم ڕۆژنامەگەرییە دەبەخشێ کە تاکە و بێ وێنەیە و لە هیچ وڵاتێکی تردا نەبیستراوە مەگەر لەم سەردەمە نەبێت بەنیسبەت ڕۆژنامە و TV عەرەبی.

ڕۆژنامەی (کردستان) ڕۆژنامەیەکی ڕامیاری بوو، گەلێک بابەتی نەتەوایەتی تایبەت بەکێشەی کوردی لە ئامێز گرتبوو، ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کە خاوەن پێناسەیەکی نەتەوایەتی بووە[١٠٥].

شایەنی ئاماژە بۆکردنە، دەرچوونی ڕۆژنامەی کوردستان لە قاهیرە بەخاڵی وەرچەرخان دادەنرێ لە مێژووی خەباتی گەلی کورد، چونکە یەکەم جارە لە مێژووی بزاڤی نەتەوایەتی کورد بەم ڕێگا شارستانییە، لەپێناوی ئازادی و سەربەخۆیی کوردستان خەبات بکات[١٠٦].

لەم بارەیەوە، ڕۆژنامەنووسی ئەمریکی ماکی زانگر[١٠٧] دەڵێ: «هەر لە دەرچوونی یەکەم ڕۆژنامەی کوردی لە قاهیرە لە ساڵی ١٨٩٨، ڕۆژنامەگەریی کوردی ڕۆڵێکی سەرەکی هەبووە لە خەباتی گەلی کورد لە پێناوی ئازادیدا و دامەزرێنەرەکەی بەر لە سەدەیەک ڕۆژنامەگەریی خستۆتەکار بۆ داواکردنی سەربەخۆیی».

سەبارەت بەو بارودۆخەی کە ڕۆژنامەی کوردستانی تیا لە دایک بوو، دەتوانین بڵێین، لە قۆناغێکی مێژوویی پڕ لە ڕاپەڕین و وردە شەڕ کە زۆربەی ناوچەکانی جیهانی گرتبۆوە

---

* ژمارە بیست و چواری لە لەندەن دەرچووە و ژمارە بیست و پێنج تا ژمارە بیست و نۆی لە ئینگلتەرا دەرچووە و دواتر ژمارە سی و سێ و یەکی جارێکی تر لە جنێف دەرچووە.

١٠٤- مەحموود زامدار:کوردستانی دایک، لە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری، هەولێر ١٩٩٨ ل٥.

١٠٥- ممتاز حیدری: دور الصحافة الكوردية في التنشئة القومية وتوعيتها، والحركة التحررية الكوردية مجلة (مەتین) العدد (٦٥) حزيران ١٩٩٧ ل١٠٢.

١٠٦- احمد شيخ محمود: (كوردستان) اولى الجرائد الكوردية، مجلة گولان العربي العدد (٢٤) ايار ١٩٩٨ ل١١٦.

١٠٧- ماکی زانگر مامۆستای ڕۆژنامەگەرییە لە زانکۆی ئەمریکی لە قاهیرە، هەروەها یاریدەدەری پێشووی سەرنووسەری ڕۆژنامەی (Middle East Report)ە و ڕێکخەری پێشووی بڵاوکردنەوەیە لە مەڵبەندی توێژینەوەی عەرەبیی هاوچەرخ لە زانکۆی تاون لە واشنتۆن، بڕوانە: ڕۆژنامەی «خەبات» ژمارە ١٠٥٣ هەینی ٢٣/١١/٢٠٠١ ل٣.

چاوی هەڵێنا، نەتەوەی کوردیش لە پێناوی وەرگرتنی مافە ڕەواکانی و ڕزگاربوونی لە چەوسانەوە و ستەمی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی خەباتی چەکداری دەکرد. لەوکاتەدا مقداد بەدرخان بۆ ناساندنی کێشەی ڕەوای کورد و بووژانەوەی هەستی نەتەوایەتی لە دڵ و دەروونی ڕۆڵەی کورد لە وڵاتی غەریبیدا، دوور لە دەسەڵاتی سوڵتان عەبدولحەمید، ڕۆژنامەی کوردستانی دەرکرد(۱۰۸).

بەڵام لە عێراقدا، سەرەتای بزاڤی ڕۆژنامەگەریی کوردی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ۱۹۱۳(۱۰۹). لە ۲٦ی کانوونی یەکەمی ساڵی ۱۹۱۳ یەکەمین ژمارەی گۆڤاری کوردی بەناوی (بانگ کرد-بانگی کورد) لە لایەن خوالێخۆشبوو جەمال بابان لە شاری بەغدا دەرچوو. ئەم گۆڤارە پێنج ژمارەی لێ دەرچوو و بەهۆی بەرپابوونی جەنگی جیهانیی یەکەمەوە لە بڵاوکردنەوە وەستا(۱۱۰).

هەروەها یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی بەناوی (تێگەیشتنی ڕاستی) لە ۱۹۱۸/۲/۱ لە بەغدا دەرچووە و گۆڤاری (دیاریی کوردستان)یش لە ۱۹۲۵/۳/۱۱ دەرچووە و ڕۆژنامەی (بانگ کردستان - بانگی کوردستان) لە ساڵی ۱۹۲٦ هەر لە بەغدا دەرچووە و هەر لەو ساڵەدا خوالێخۆشبوو حوسێن حوزنی موکریانی گۆڤاری (زاری کرمانجی) لە شاری ڕواندز دەرکرد(۱۱۱). و پاشانیش لە ساڵی ۱۹۳۹ تاکو ۱۹٤۹ گۆڤاری (گەلاوێژ)

---

۱۰۸- جبار جباري: تأريخ الصحافة الكردية في العراق، سەرچاوەی پێشوو، ل۱۹-۲۱.

۱۰۹- جێی ئاماژەیە، فاروق عەلی عومەر، دەرچوونی یەکەم ژمارەی گۆڤاری «بانگ کرد»ی گەڕاندۆتەوە بۆ ساڵی ١٩١٤ بۆ زیاتر زانیاری سەیری فاروق عەلی عومەر: ڕۆژنامەگەریی کوردی لە عێراقدا، چاپی یەکەم، بڵاوکراوەکانی دەزگای موکریانی، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ۲۰۰۱، ل ٦٩ بکە.

۱۱۰- جبار جباري: تأريخ الصحافة الكردية في العراق، سەرچاوەی پێشوو، ل ۳۱.

۱۱۱- مامۆستا حوسێن حوزنی موکریانی لە ساڵی ۱۹۱۵ چاپخانەیەکی نوێی لە ئەڵمانیا کڕی و لە شاری (حەلەب) لە سوریا دایناو بۆ یەکەمجار پیتە کوردییەکانی (پ، چ، ژ، گ، ڤ)ی دارشت هەروەها خۆی کلیشەی وێنەکانی لە تەختە دروست دەکرد و ئەمە و ژمارەیەکی زۆر داتراوی خۆی و کەسانی تری پێ چاپ کرد، دوای ئەوە لە ساڵی ۱۹۲۵ چاپخانەکەی گواستەوە بۆ شاری ڕواندز لە کوردستانی عێراق و هەر لەوێ لە ساڵی ۱۹۲۹ تا ۱۹۳۲ گۆڤاری «زاری کرمانجی» بۆ ماوەی شەش ساڵ (۲٤) ژمارەی لێ دەرکرد.

بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە جبار جباري: تأريخ الصحافة الكردية في العراق، سەرچاوەی پێشوو، ل ■

لەلایەن مامۆستای خوالێخۆشبوو ئیبراهیم ئەحمەد دەرچوو، گۆڤارێکی دیارە لە مێژووی ڕۆژنامەگەریی کوردیدا و بەتەمەنترین گۆڤاری ئەو سەردەمەیە[112]، هەروەها ڕۆژنامەی (ژین) و (هەتاو) و (شەفەق) دەرچوون.

## ٢-٤-٣ پێشکەوتنی ڕۆژنامەگەریی کوردی

ڕۆژنامەگەریی کوردی لە کوردستانی عێراقدا، دوابەدوای ڕێککەوتننامە مێژووییەکەی یانزەی ئازاری ١٩٧٠ گەلێک هەنگاوی بۆ پێشەوە ناوەو لە زۆر بواریشدا پێشکەوتنی بەخۆیەوە بینیوە.

هەرچەندە ژمارەی ئەو ڕۆژنامە و گۆڤارانەی لەم قۆناخانەدا دەردەچوون بەپەنجەی دەست دەژمێردران، بەڵام لەرووی چۆنایەتی و بەردەوامییەوە دەتوانین بڵێین زۆر جیاوازییان لەگەڵ ڕۆژنامەکانی پێشوو هەبوو.

هەروەها ڕاپەڕینی گەلی کورد لە بەهاری ساڵی ١٩٩١ خاڵی وەرچەرخانی مێژووییە بۆ پێشکەوتن و پەرەسەندنی ڕۆژنامەگەریی کوردی. دوابەدوای هەڵبژاردنی پەرلەمان و دامەزراندنی حکومەتی هەرێمی کوردستان و دەرکردنی (یاسای چاپەمەنی ژمارە ١٠ی ساڵی ١٩٩٣) و (یاسای حزبەکانی هەرێمی کوردستانی عێراق ژمارە ١٧ی ساڵی ١٩٩٣) و (یاسای کۆمەڵە و ڕێکخراوەکانی هەرێمی کوردستانی عێراق) و (یاسای سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی کوردستانی عێراق ژمارە ٤ی ساڵی ١٩٩٨) و (یاسای سندوقی خانەنشینی ڕۆژنامەنووسانی کوردستانی عێراق ژمارە ١٣ی ساڵی ٢٠٠١) کۆمەڵێک پارتی سیاسی و کۆمەڵە و ڕێکخراوی کۆمەڵایەتی و پیشەیی و مرۆڤایەتی لە هەرێمی کوردستاندا دامەزران و هەر یەکێک لەوانە بەلانی کەمەوە ڕۆژنامەیەکی زمانحاڵ و گۆڤارێک و بڵاوکراوەیەکی دەوریی دەردەکات، ئەمەو وێڕای دەرکردنی هەندێک ڕۆژنامە و گۆڤاری نیمچە سەربەخۆ بەهەوڵ و تەقەلاّو دارایی کەسان و پشتگیریی حکومەتی هەرێمی کوردستان. زیاتر لەمە، ئەمڕۆ لەسایەی ئەم ئازادی و دیموکراسییەتەی لە کوردستان لە ئارادایە، ژمارەیەکی زۆری ڕۆژنامە و گۆڤاری دەوریی بەچاپێکی هونەریی

---

= ١٠١. و محەممەد خدر مەولوود: بزاڤی ڕۆژنامەگەریی حکومەتەکانی کوردستان، چاپی یەکەم، بڵاوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، هەولێر، ١٩٩٩، ل ٥٠.

١١٢- فاروق عەلی عومەر: ڕۆژنامەگەریی کوردی لە عێراقدا، ل ٦٩، و جبار جباري: تأريخ الصحافة الكردية في العراق ص ٢٥ ومابعدها، و ل١٠١ هەمان سەرچاوە.

قەشەنگ و بابەتی هەمەڕەنگ لە سەرتاپای کوردستان چاپ و بڵاوکراونەتەوە، تەنانەت هەندێکیشیان دەخرێنە سەر تۆڕی ئینتەرنێت و سروشتێکی جیهانی وەردەگرن.

ئەمەو زیاتر لە کەناڵێکی تەلەفزیۆنیی ئاسمانی و دەیان کەناڵی ناوخۆیی و ئێستگە ڕۆژانە بەرنامەکانیان بۆ ناوەوە و دەرەوەی هەرێمی کوردستانی عێراق پەخش دەکەن و ڕۆژنامەی بیستراو و بینراو بەشێکی زۆری پانتایی ئەو بەرنامانە داگیر دەکەن لەوانە کەناڵی تەلەفزیۆنی ئاسمانیی (کوردسات) و (کوردستان TV) کەناڵی تەلەفزیۆنی ناوخۆ (PUK) و (KTV) و (ئازادی) و (یەکگرتوو) و چەندینی تر.

ڕۆژنامەنووسی ئەمریکی ماکی زانگر دەڵێ: «ئێستا هەرێمی کوردستان چاوەڕێی بارودۆخێکی گونجاو دەکات بۆ دامەزراندنی ڕۆژنامەی سەربەخۆ و ئازاد»[113].

ئەم خشتەیەی خوارەوە[114] کە ڕێژەی دەرکردنی ڕۆژنامە و گۆڤاری کوردی لە شارەکانی کوردستانی عێراق لە نێوان (١٩٩١-١٩٩٧) دەردەخات، ئەگەر بەراوردی بکەین لەگەڵ ڕێژەی دەرچوونی بەر لە ڕاپەڕین، بۆمان دەردەکەوێ کە ڕۆژنامەگەریی کوردی لەم ساڵانەی دواییدا لە پێشکەوتنێکی خێرادا بووە چ لە ڕووی چەندایەتی و چ لە ڕووی چۆنایەتیشەوە:

| ساڵ | ژمارەی تێکڕای گۆڤار و ڕۆژنامەکان | هەولێر | سلێمانی | دهۆک | کەرکووک |
|---|---|---|---|---|---|
| ١٩٩١ | ٧١ | ٣٤ | ٢٣ | ١١ | ٣ |
| ١٩٩٢ | ٧٧ | ٣٨ | ٢٥ | ١٢ | ١ |
| ١٩٩٥ | ٦١ | ٣٤ | ٣١ | ٤ | ٢ |
| ١٩٩٦ | ٧٨ | ٤٢ | ٢٦ | ٧ | ٣ |
| ١٩٩٧ | ٨٩ | ٥٨ | ٢٨ | ٢ | ١ |

١١٣- ڕۆژنامەی (خەبات) ژمارە (١٠٥٣) هەینی ٢٠٠١/١١/٢٣ ل ٣، و ماکی زانگر: لە کلاشینکۆفەوە بۆ کۆمپیوتەر: ڕۆژنامەگەریی کوردی لە عێراق، لە چیاوە دادەبەزێ، بەڵام بەرەو کوێ دەچێت ؟ گۆڤاری (ڕۆژنامەڤانی) ژمارە (٦-٧) ساڵی دووەم (پاییز - زستان) ساڵی ٢٠٠١-٢٠٠٢ ل ٢٠.

١١٤- غازی حەسەن: پێشکەوتن و وابەستەیی ڕۆژنامەگەریی کوردی کە دەسەڵاتێکی بێ دەسەڵاتە، گۆڤاری (ڕامان) ژمارە (٥)ی مایسی ٢٠٠١ ل٨٥.

## ٢-٥ تیۆرەكانی ڕۆژنامەگەری

كاری ڕۆژنامەگەری هەر كۆمەڵگایەک بەپێی جۆری پێکهاتەی سیاسیی ئەو کۆمەڵگایە لەیەکتر جیادەکرێتەوە، چونکە ئازادیی ڕۆژنامەگەری بەشێکە لە ئازادییە گشتییەکانی تری کۆمەڵ و هۆکارە سیاسی و ئابووری و ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتییەکان کاری تێ دەکەن[١١٥]. بۆیە ڕۆژنامەگەری لە هەر وڵاتێکدا بەو ڕەوتەدا تێدەپەڕێ کە حوکمڕانانی ئەو وڵاتە بۆ وڵاتەکەی خۆیان هەڵی دەبژێرن. ئەمەش وادەکات ڕۆژنامەگەری لە هەر کات و شوێنێکدا مۆرکێکی تایبەتیی خۆی هەبێت و ڕەنگدانەوەی بیروبۆچوونی حوکمڕانانی ئەو سەردەمە بێت. بەواتایەکی تر ڕۆژنامەگەریی هەرنەتەوەیەک لە نەتەوەکان ڕەنگدانەوەی ئەو شێوە حوکمڕانێتییەن کە ئەو نەتەوەیە ملکەچینە[١١٦].

حوکمڕان لە هەموو شوێنێک و سەردەمێک یەکێکە لەم دووانە:

یان حوکمڕانێکە تەنها باوەری بەدەسەڵات هەیە و لە خۆی بەولاوە لێ ناگەڕێ هیچ هێزێکی تر بەشداری لەگەڵ بکات و لەم حاڵەتەشدا هیچ کەسێک بوونی «هێزی گەل» ناهێنێتە پێش چاوی خۆی. حوکمڕان لەم حاڵەتەدا دیکتاتۆرە و پشت بەهێزی ماددی دەبەستێ بۆ مانەوەی لەسەر حوکم.

یان حوکمڕانێکە باوەری بەرادەیەکی دیاریکراو لە دیموکراسییەت هەیە و ڕێگا دەدات هێزێکی تر بەشداری لەگەڵدا بکات، بۆیە دەست لە هەندێ دەسەڵاتی خۆی هەڵدەگرێ بۆیان. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە ئەو حوکمڕانە باوەری بەهێزی گەل هەیە[١١٧].

لێرەدا سیستمی حوکمڕانێتی لە کۆن و ئێستادا لێک جیاواز بوونە بەجیاوازی ئەو بارودۆخەی کە نەتەوە تیایدا ژیاوە. مەبەستمان بارودۆخی سیاسی و ئابووری و ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتییە هەروەکو پێشتر باسمان کرد.

---

١١٥- د. جيهان المكاوي: حرية الفرد وحرية الصحافة، ط١، منشورات الهيئة المصرية للكتاب، ١٩٨١، ل ٩. و جون. ار.بيتر: مقدمة في الاتصال الجماهري، سەرچاوەی پێشوو ل ٥٨٦-٥٨٧.

١١٦- د. عبداللطيف حمزة: الاعلام له تأريخه و مذاهبه، دار الفكر العربي، بلا سنة الطبع، ل ٨٥-٨٧.

١١٧- ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە کاروباری ڕۆژنامەگەریی لە جیهاندا یان ئازادە ویان ملکەچی دەسەڵات و زۆردارییە بەپێی جۆری ڕژێمی سیاسی ئەو وڵاتەی کە مومارەسەی دەکات، ئایا ڕژێمێکی دیموکراسییە یان دیکتاتۆری. بڕوانە: د. حسين عبدالقادر: الرأي العام والعلاقات، سەرچاوەی پێشوو ل. ٣٠.

هەر بۆیە، دەبینین لە دێر زەمانەوە، ئازادیی ڕۆژنامەگەری ملکەچی دوو تیۆریی بووە، تیۆری سەربەستی و تیۆری دەسەلآت.

دوو تیۆری نوێش لەم دوو تیۆرییە لە دایک بوون کە (تیۆری بەرپرسێتیی کۆمەلآیەتی) و (تیۆری سۆڤیەتی)یە.

هەروەها ئیسلام وەک ئایینێکی مام ناوەندی لە نێوان هەردوو بۆچوونی لیبرالی و سۆسیالیزمیدا تێڕوانینێکی تایبەتی بۆ ئازادییەکان بەگشتی و بەئازادیی ڕۆژنامەگەرییشەوە هەیە. بۆیە ئێمە پێمان باش بوو کە ئازادیی ڕۆژنامەگەری لە ئیسلام بخەینە پاڵ چوار تیۆرییەکەی سەرەوە و لە خوارەوە لە پێنج خاڵدا بەکورتی باسیان بلاوە بکەین:

## ٣-٥-١ تیۆری سەربەستی (نظریة الحریة) Freedom Theory

تیۆری سەربەستی (ئازادی)، لە ئاکامی چەندان پێشکەوتن بوو کە لە ئەورووپا سەری هەلدا و ڕێگای خۆش کرد بۆ سەرهەلدانی دیموکراسیی سیاسی، هەروەها ڕێگای خۆش کرد بۆ سەرهەلدانی چەندین ئازادیی تر وەک ئازادیی ئایین و ئازادیی ئابووری و ئازادیی ڕادەربڕین[١١٨]. بەپێی ئەم تیۆرە، تاک بوونەوەرێکی سەربەخۆیە و بەشێک نییە لە کۆمەڵ و بەرزتریشە لە دەوڵەت و کۆمەڵێک مافی هەیە بەرلەوەی بێتە ناو کۆمەڵ، ئەم مافانە مافی سروشتین و لەگەڵ سروشتە مرۆڤایەتییەکەی دەگونجێن و سەرچاوەکەی سروشتە نەک دەوڵەت، بۆیە دەوڵەت تەنها نێوانکارێکە لە ڕێگایەوە مرۆڤ مومارەسەی چالاکییەکانی خۆی دەکات و حکوومەت بۆی نییە دژی بوەستێت[١١٩]. ئەم تیۆرە لە سەدەی شازدەهەمدا لە سەرخۆ پێشکەوت و لە سەدەی هەژدەمیشدا سەقامگیر بوو کاتێک پرینسیپەکانی ئازادی بەرەو دەستووری وڵاتان ڕێگایان گرتەبەر[١٢٠].

شایەنی باسە، پەیدابوونی چینی ناوەندی گرینگترین هۆکاربوو بۆ سەرهەڵدانی ئەم تیۆرە چونکە بەرژەوەندییەکانی ئەم چینە ناکۆک بوو لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی چینی

---

١١٨- د. عبداللطیف حمزة: الاعلام لە تأریخه و مذاهبه، دار الفکر العربي، ط١، منشورات دار الفکر العربي، سەرچاوەی پێشوو ل ٩٠.

١١٩- د. محمود متولي و لطفي عبدالقادر: الأعلام وحریة المجتمع، مکتبة نهضة الشرق، جامعة القاهرة، ط١، ١٩٨٧، ل ٩٦.

١٢٠- جون. ار. بیتنر: مقدمة في الاتصال الجماهیري، سەرچاوەی پێشوو ل٥٨٩.

دەرەبەگ، بۆیە بەرژەوەندیی چینی ناوەندی وایدەخواست کە مرۆڤ ئازاد بێت لە دەسەڵاتی زۆردار و هەڵبژاردنی کارەکەیدا.

گومانی تێدانییە کە پرەنسیپەکانی شۆڕشی ئەمریکی دژی دەسەڵاتی ئینگلیز، هەروەها شۆڕشی فەرەنسی ڕۆڵێکی کاریگەریان لە پتەوکردنی ئەم تیۆرییە هەبووە و لێرەدا کۆمەڵێک فەیلەسوف دەرکەوتن و داوای ئازادیی تاکەکانیان کرد و داوایان کرد کە تاک ئازاد بکرێت لە گشت کۆت و بەندێک بۆ ئەوەی لە داهێنان دانەبڕێت[١٢١].

لایەنگرانی ئەم تیۆرە پێیان وایە خەڵک توانای جیاکردنەوەی ڕاست و چەوت و خراپەو چاکەیان لەیەکتری هەیە، لەبەر ئەمەو بۆ دەرکردنی بڕیاری ڕاست دەبێ خەڵک توانای زانینی بیروڕای خەڵکانی تری هەبێت. بۆیە ئەو خەڵکانەی کە دەیانەوێ ڕووناکی بەئەوانی تر ببەخشن دەبێ توانای دواندنی ڕای گشتیی گەلیان بۆ ئەو شتانەی کەبەڕاستی دەزانن بۆ دەستەبەر بکرێ.

کەواتە دەبێ خەڵک مافی بیرکردنەوە و ڕەفتارکردنی هەبێ بەمەرجێک ئازادیی ئەوانی تر پێشێل نەکات، جا لەبەرئەوەی ڕۆژنامەگەری هۆکارێکە بۆ ئاگادارکردنەوەی خەڵک، بۆیە دەبێ ئازاد بێت لە دەسەڵاتی دەوڵەت[١٢٢]. بەم شێوەیە، پرەنسیپەکانی لیبرالی کاریگەرییەکی زۆری بەسەر ئازادیی ڕۆژنامەگەرییەوە هەبووە. کارل بیکر لەبەر ڕۆشنایی ئەم گریمانانەی خوارەوە ئازادیی ڕۆژنامەگەری دەستنیشان دەکات و دەڵێ: «مرۆڤ ئارەزووی زانینی ڕاستییەکانی هەیە، تاکە شێوازیش بۆ گەیشتن بەڕاستییەکان پێشبڕکێی (منافسة) ئازادانەیە لە نێوان بیروڕاکان لە بازاڕێکی والێی پڕ لە بیروڕا. لەم بازاڕەدا باشترین بیروڕا خۆی دەسەپێنێت و لەلایەن زۆرینەی گەلیشەوە پەسند دەکرێت»[١٢٣].

کەواتە ئازادیی ڕۆژنامەگەری، نابێ بخرێتە ژێر دەسەڵاتی حکوومەت، تاکو بتوانێ زانیاری و بەڵگەی پێویست پێشکەشی خەڵک بکات بۆ ئەوەی بڕیاری پێویست سەبارەت بەهەڵسەنگاندنی سیاسەتی حکوومەت وەربگرن[١٢٤].

---

١٢١- د. محمود متولي و لطفي عبدالقادر: الأعلام وحرية المجتمع، سەرچاوەی پێشوو ل ٩٧.

١٢٢- جون. ار. بيتر: مقدمة في الاتصال الجماهيري، سەرچاوەی پێشوو ل ٥٨٩-٥٩٠.

١٢٣- د. بسيوني ابراهيم حمادة: دور وسائل الاتصال في صنع القرارات في الوطن العربي، سەرچاوەی پێشوو. ل١٦٠.

١٢٤- د. بسيوني ابراهيم حمادة: دور وسائل الاتصال في صنع القرارات في الوطن العربي، سەرچاوەی پێشوو. ل١٦٤.

### ٢-٥-٢ تیۆری دەسەڵات (نظرية السلطة) Authoritarian Theory

ئەم تیۆرە بەکۆنترین تیۆر دادەندرێ کە لەگەڵ دەرکەوتنی ڕۆژنامەگەریدا دوابەدوای داهێنانی چاپەمەنی لەلایەن «گۆتنبەرگ»ەوە لە سەدەکانی شازدە و حەڤدەدا پەیدا بووە و بە ئەورووپادا بڵاوبۆتەوە[١٢٥].

ئەم تیۆرە لە بارودۆخی ئەو کۆمەڵگایانەدا لە دایک بوو کە تیایدا کاری پێ دەکرا، لەو کۆمەڵگایانەدا پاشا یان حوکمڕان خۆی بەخوداوەند دادەناو گەلیش خۆی بەکۆیلەی حوکمڕان دەزانی، بۆیە هەموو شتێ بەدەستی دەسەڵاتدارانەوە بوو و لە خزمەتی ئەواندا بوو[١٢٦].

بەپێی ئەم تیۆرە، حکومەت بۆی هەیە بەتەواوەتی تەحەکوم بەڕۆژنامەگەری و وەزیفەکانی ڕۆژنامەگەری و مومارەسەی ڕۆژنامەگەری بکات، لە چوارچێوەی ئەو فەلسەفە سیاسی و کۆمەڵایەتییەی لە کۆمەڵگا دەسەڵات زاڵەکاندا هەیە بەبیانووی ئەوەی کەتاک بەبێ پشتبەستن بەدەوڵەت ناتوانێ هیچ مەرامێکی خۆی وەدی بهێنێ، هەروەها گەشەی تاک لەسەر گەشەی دەوڵەت دەوەستێ و ڕۆژنامەش ئامرازێکە بۆ بڵاوکردنەوەی هەڵوێستی دەوڵەت بەرامبەر جەماوەر و ڕاگەیاندنی ڕاستی و چەوتی بۆیان بەپێی بۆچوونی دەوڵەت بەرامبەر بەمەسەلەکان[١٢٧].

لەژێر سێبەری ئەم جۆرە حوکمڕانێتییەدا، کە تیایدا وەک خوداوەند سەیری حوکمڕان دەکرا، گەلیش کۆیلەی ئەوان بوو، ئەدەچووە ئەقڵەوە خەڵک لە تاکە شێوەیەکی حوکمڕانێتی بەولاوە بزانن کە ئەویش حوکمڕانێتی ستەمکارییە، هەروەها لە تیۆرییەکی ڕاگەیاندن بەولاوە کە (تیۆری دەسەڵاتدارێتی)یە هیچی تریان نەدەزانی[١٢٨].

---

١٢٥- د. بسيوني ابراهيم حمادة: دور وسائل الاتصال في صنع القرارات في الوطن العربي، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٦٩، جون. ار. بيتنر: مقدمة في الاتصال الجماهيري، سەرچاوەی پێشوو ل ٥٨٧.

١٢٦- د. محمود سترلي و لطفي عبدالقادر: الأعلام وحرية المجتمع، سەرچاوەی پێشوو ل ٩١-٩٣.

١٢٧- د. بسيوني ابراهيم حمادة: دور وسائل الاتصال في صنع القرارات في الوطن العربي، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٦١، و جۆن. ار. بیتنەر: «تیۆرەکانی ڕۆژنامەوانی»، وەرگێڕانی هیمداد حوسێن، گۆڤاری ڕامان ژمارە (٥٩)ی (٥)ی مایسی ٢٠٠١ ل ١١٠.

١٢٨- د. عبداللطيف حمزة: الاعلام له تأريخه و مذاهبه، سەرچاوەی پێشوو ل ٩٣.

بەم چەشنە، ڕۆژنامەگەری، موڵکداریتییەکەی چ گشتی و چیش تایبەتی، دەبوایە لەژێر سەرپەرشتی و چاودێری حکومەت بێت[١٢٩].

شایەنی باسە، لەم سەردەمەشدا، لەگەڵێک وڵاتانی جیهان، ئەو وڵاتانەی ڕژێمی حوکمڕانییان دیکتاتۆرییە لەگەڵ زۆربەی وڵاتە عەرەبییەکانیش تاکو ئێستا ئازادیی ڕۆژنامەگەری تیایاندا هەر قسەیەو کرداری لەگەڵدا نییە.

## ٢-٥-٣ تیۆری بەرپرسێتیی کۆمەڵایەتی (نظرية المسؤلية الاجتماعية)

Social Responsibity Theory

ئەم تیۆرە لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا بەهۆی نووسینەکانی ولیەم کنج و جۆن ملتۆن و ئەندامانی تری لیژنەی ئازادیی ڕۆژنامەگەری بۆ نارەزایی دەربڕین دژی ئیستغلالکردنی ڕۆژنامەگەری بۆ دەست درێژی کردنە سەر مافی خەڵک لە ئەمەریکا سەری هەڵدا[١٣٠] و لەسەر بنەمای (ئازادیی ماف و ئەرک و بەرپرسیارێتییە لەیەک کاتدا) دامەزرا بەواتای ئەوە کە ئازادی مافێکە ئەرکێکی لەگەڵدایە، دەبێ ئەو کەسەی مومارەسەی دەکات هەستی پێ بکات[١٣١].

کەواتە بەپێی ئەم تیۆرە، ڕۆژنامەگەری مافی ئەوەی هەیە ڕەخنە لە حکومەت و دامودەزگاکان بگرێت، بەڵام چەندین بەرپرسیارێتی بنچینەیی دیاریکراویشی لەسەر شانە بۆ سەقامگیریی کۆمەڵ دەبێ ڕەچاویان بکات[١٣٢]. جا لە ئاکامی ئەم تیۆرەدا کە ڕەواجێکی باشی لای حکومەتە سەرمایەدارەکانەوە هەبوو، لە ئینگلتەراو ئەمەریکا و

---

١٢٩- د. جيهان المكاوي: حرية الفرد و حرية الصحافة، سەرچاوەی پێشوو ل ١٣.

١٣٠- د. عبداللطيف حمزة: الاعلام له تأريخه و مذاهبه، سەرچاوەی پێشوو ل ١٣٩، و د. جيهان المكاوي: حرية الفرد وحرية الصحافة، سەرچاوەی پێشوو ل ١٤ و د. محمود متولي و لطفي عبدالقادر: الأعلام وحرية المجتمع، سەرچاوەی پێشوو ل١٠٥، و د. صالح ابو اصبع: الاتصال والاعلام في المجتمعات المعاصرة، ط٣، منشورات دار ارام للدراسات والنشر والتوزيع، شركة مطابع الخط، عمان، الاردن، ١٩٩٩، ل٢٥٧.

١٣١- د. عبداللطيف حمزة: الاعلام له تأريخه و مذاهبه، دار الفكر العربي، سەرچاوەی پێشوو ل ١٣٨ و د. محمود متولي و لطفي عبدالقادر: الأعلام وحرية المجتمع، سەرچاوەی پێشوو ل١٠٤.

١٣٢- جۆن. ار. بیتنەر: «تیۆرەکانی ڕۆژنامەوانی» وەرگێڕانی هەمداد حوسێن، گۆڤاری ڕامان ژمارە (٥٩)ی (٥)ی مایسی ٢٠٠١ل ١١٢، و جون. ار. بينتر: مقدمة في الاتصال الجماهيري، سەرچاوەی پێشوو ل ٥٩.

هەندێ وڵاتی تر. ئەنجومەنی باڵای ڕۆژنامەگەری دامەزرا بۆ دانانی ئادابی پیشەی ڕۆژنامەگەری و سەرپەرشتی کردنی[١٣٣].

### ٢-٥-٤ تیۆری سۆڤیەتی (النظرية السوفيتية) The Soviet Theory

تیۆری سۆڤیەتی پشتی بەئایدیۆلۆژیای مارکسی دەبەست، بۆیە یەکێتی سۆڤیەتی یەکێک بوو لەو وڵاتانەی کە کاری بەم تیۆرە دەکرد[١٣٤].

بەپێی ئەم تیۆرە، ڕۆژنامەگەری بەشێکە لە دەزگاکانی دەوڵەتی شیوعی و لێیان جیا ناکرێتەوە، هیچ کەسێکیش بۆی نییە لە دەوڵەت بەولاوە هەیبێ. لەم حاڵەتەشدا حزبی شیوعی بەڕێوەی دەبات و سەرپەرشتی دەکات. وەزیفەی سەرەکی ڕۆژنامەگەریش بریتییە لە پتەوکردنی یەکێتیی فیکریی لە نێوان ئەندامانی کۆمەڵ و فێرکردنی پرنسیپەکانی مارکسی و شیکردنەوە و لێکدانەوەی ڕووداوەکان لەبەر ڕۆشنایی ئەو پرنسیپانە، هەروەها

---

١٣٣- د. محمود متولي ولطفي عبدالقادر: الأعلام وحرية المجتمع، سەرچاوەی پێشوو ل ١٠٥، و د. عبداللطيف حمزة: الاعلام له تأريخه و مذاهبه، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٣٩، و هەروەها بەپێی یاسای ڕێکخستنی ڕۆژنامەگەری «قانون تنظيم الصحافة»ی میسری ژمارە ٩٦ی ساڵی ١٩٩٦ لە میسر ئەنجومەنی باڵای ڕۆژنامەگەری دامەزراوە بۆ ئەم مەبەستە لە ماددە (٦٧)دا هاتووە: «ئەنجومەنی باڵای ڕۆژنامەگەری دەستەیەکی سەربەخۆیە پشت بەخۆی دەبەستێ، بارەگایەکەی لە قاهیرەیە و کەسایەتیی مەعنەوی هەیە و کاری ڕۆژنامەگەری ئەنجام دەدات بەچەشنێک ئازادی و سەربەخۆییەکەی وەدیبهێنێ و سومارەسەی دەسەڵاتەکانی خۆشی بکات لە چوارچێوەی بنەما بنەڕەتییەکانی کۆمەڵ...» ئەم یاسایە بڕوانە ڕۆژنامەی «الوقائع المصرية» ژمارە ٢٥ی دووبارەکراوی ڕێکەوتی ٢٠ یونیۆ ١٩٩٦ بڵاوکراوەتەوە. ئەمەو لە ١٩٩٨/٣/٢٦ ئەنجومەنی باڵای ڕۆژنامەگەری بەڵگەنامەی شەرەفیی ڕۆژنامەگەری دەرکرد و تیایدا جەختی لەسەر ماف و ئەرکەکانی ڕۆژنامەنووسان کردەوە. هەروەها یاسادانەری لوبنانی لە یاسای چاپەمەنی ١٤ی ئەیلولی ١٩٦٢ ماددە (٩٥-١٠٥) لە بەشی چوارەم لەژێر ناونیشانی «ئەنجومەنی باڵای ڕۆژنامەگەری» بۆ ئەم مەبەستە تەرخان کردووە. ئەم یاسایە لە ڕۆژنامەی ڕەسمی ژمارە / ٣٨ی ساڵی ١٩٦٢ بڵاوکراوەتەوە بڕوانە: المحامي عادل بطرس: قانون الأعلام، مطابع الفضالي، بيروت، لبنان، ١٩٩٥ ل ١٥١

هەروەها بەپێی ماددە (٥)ی یاسای ڕۆژنامەگەریی سودانی ساڵی ١٩٩٩ ئەنجومەنێک بەناوی ئەنجومەنی نەتەوەیی ڕۆژنامەگەری دامەزراوە کەسایەتییەکی مەعنەویشی هەیە. بڕوانە:
Http://www.sudanow.net/arabic/political/law/apresslaw.htm27/9/2001.

١٣٤- د.محمود متولي ولطفي عبدالقادر: الأعلام وحرية المجتمع، سەرچاوەی پێشوو ل ١٠٦-١٠٧.

دەبێ سەرنجی جەماوەر بۆ بەرنامە جیاجیاکانی دەوڵەت ڕابکێشێ و پشتگیرییان وەدەست بهێنێ[١٣٥].

کەواتە ڕۆژنامەگەری دەبێ دەزگایەکی ئامادەکار بێت بۆ دەزگا جیاجیاکانی تری حزبی، بۆیە دەبێ دەزگاکانی چاپ و بڵاوکردنەوە و کتێبخانەش بەدەوری خۆیان حزبی بن[١٣٦].

بۆ تێگەیشتنی تیۆری سۆشیالیستی کۆمۆنیستی بۆ ڕۆژنامەگەری، نابێ هەرتەنیا بەدوای چەمکی سیاسیی سۆشیالیستی، کە لە تیۆریی مارکسییەتەوە سەرچاوەی گرتووە، بکۆڵینەوە، بەڵکو دەبێ لەوەش بکۆڵینەوە ئاخۆ، شیکردنەوەی سۆشیالیستی بۆ وشەی «ئازادی» چییە؟.

ئازادی لە تێڕوانینی سۆشیالیستی بریتییە لە ئازادبوونی کۆمەڵێکی فرەچین و توێژی وەکو چینەکانی باڵا و ناوەڕاست و خوارەوە لە چەوسانەوە[١٣٧].

لینین بیرۆکەی (ئازادیی ڕەها) کە لە کۆمەڵگای سەرمایەداریدا هەیە ڕەتکردەوە و جەختی لەسەر ئەوە کرد کە پێویستە ئەدەبێکی ئازاد و سەربەخۆ و دوور لە دەسەڵاتی سەرمایەداران بخوڵقێ، ئەدەبێک پەیوەندییەکی ڕوون و پتەوی بەکرێکارانەوە هەبێت و ئەم ئەدەبەش دەبێ ئەدەبێکی حزبیی بێت. کەواتە دەبێ ڕۆژنامەگەریش حزبیی بێت، چونکە لە بنەڕەتدا گوزارشت لە ئایدیۆلۆژیای حزب و بەرژەوەندییەکانی چینی پرۆلیتاریا دەکات. لەبەرئەوە ڕۆژنامەگەری لە یەکێتیی سۆڤیەتی هەمیشە کەناڵێک بووە لە کەناڵەکانی هۆشیاریی باوەڕ هۆشیاریی ئابووری[١٣٨].

ئەم تیۆرە لە پراکتیکدا سەرکەوتوو نەبوو، چونکە هیچ نرخێکی بۆ ئازادیی تاکەکەس دانەنابوو، بۆیە لەسەرەتای ئەم سەدەیە دوای هەڵوەشانەوەی یەکێتیی سۆڤیەتی هەرەسی هێنا و وەک جاران باوی نەما.

---

١٣٥- د. جیهان احمد رشتي: نظم الاتصال، الاعلام في الدول النامیة، ط١، دار الفكر العربي، القاهرة، بلاسنة طبع، ل٩٣، و د. عبداللطیف حمزة: الاعلام له تأریخه و مذاهبه، سەرچاوەی پێشوو ل ١٦٨، د. جیهان المكاوي: حریة الفرد وحریة الصحافة، سەرچاوەی پێشوو ل١٤.

١٣٦- د. سلوی ابو سعدە: الصحافه فی الاتحاد السوفیتی، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٦.

١٣٧- جون. ار. بینتر: مقدمه فی الاتصال الجماهیری، سەرچاوەی پێشوو ل ٥٩٢-٥٩٣، و جۆن. ار. بیتەر: «تیۆرەکانی ڕۆژنامەوانی» وەرگێڕانی هیمداد حوسێن، گۆڤاری ڕامان ژمارە (٥٩)ی (٥)ی مایسی ٢٠٠١ ل ١١٣.

١٣٨- د. سلوی ابو سعدة: الصحافة في الاتحاد السوفیتي، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٦-٢٧.

### ٢-٥-٥ ئازادیی ڕۆژنامەگەری لە دیدی ئیسلامدا

ئازادیی ڕۆژنامەگەری لە ئیسلامدا بەشێکە لە ئازادیی هزر و ویژدان و ڕادەربڕین و لێی جیا ناکرێتەوە. ئیسلام دانی بەمافی بیرکردنەوەی مرۆڤ ناوە لە کاروباری ژیانی و نەوشتانەی هەستیان پێ دەکات، هەروەها ڕێگای بەهەموو ڕێگاکانی گوزارشتکردن دا، گوزارشتی لێ بکات لەوانەش ڕۆژنامەگەری.

ئەو کەسانەی پێیان وایە شەریعەتی ئیسلام دەست بەسەر ئازادیدا دەگرێت بەهەڵەداچوونە، چونکە ئیسلام ئیرادەی مرۆڤایەتی لە کۆیلایەتیی چاولاکەری و نەفسانە ڕزگار کردووە، بەمەش مرۆڤی لە بیرکردنەوەو ئیرادەیدا ئازاد کردووە[١٣٩].

گەلێک بەڵگە هەن، ئازادیی ڕۆژنامەگەری لە ئیسلامدا دەسەلمێنن[١٤٠] لەوانە (فەرمان کردن بەچاکە و نەهیکردن لە خراپە) کە ئەمانەش دوو لقن لە لقەکانی ئاین و ئەرکن لەو ئەرکانەی کە کردنیان لە لایەن زۆرینەی موسڵمانانەوە بەسە، واتە مەرج نییە هەموو موسڵمانێک ئەنجامی بدات، ڕۆژنامەی ئازاد لادان و سەرپێچییەکان ئاشکرا دەکات و ڕێگە لە دەسەلات دەگرێ بۆ ئەنجام دانیان، لەم ڕووەوە خوای گەورە دەفەرموێ:

«وَلْتَكُنْ مِنْكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنْكَرِ وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ» واتە دەبێ لە نێوانتانا تاقمێک هەبێ کە خەڵک بۆ چاکەکردن بانگ بکەن و

---

139- http://www.al.asfoor.net/books/drasat/bohoush2001/9/29

١٤٠- شایەنی ئاماژە بۆکردنە، وشەی ڕۆژنامە و ڕۆژنامەگەری لە زۆر ئایەتی قورئانی پیرۆزدا هاتووە، ئەمەش نیشانەی ئەوەیە کە ئایینی ئیسلام زاراوەی پڕ بەپێستی خۆی بۆ ئەم لایەنە گرنگەی ژیانی کۆمەلایەتی داڕشتووە، لەوانە خوای گەورە لە سورەتی (التكوير) ئایەتی (١٠) دەفەرموێ: (وَإِذَا الصُّحُفُ نُشِرَتْ)، هەروەها لە سورەتی (الاعلى) ئایەتی (١٨) و (١٩) دەفەرموێ: (إِنَّ هَذَا لَفِي الصُّحُفِ الْأُولَى، صُحُفِ إِبْرَاهِيمَ وَمُوسَى)، هەروەها لە سورەتی (المدثر) ئایەتی (٥٢) دەفەرموێ: (بَلْ يُرِيدُ كُلُّ امْرِئٍ مِنْهُمْ أَنْ يُؤْتَى صُحُفًا مُنَشَّرَةً)، هەروەها لە سورەتی (البينه) ئایەتی (٢) دەفەرموێ: (رَسُولٌ مِنَ اللَّهِ يَتْلُوا صُحُفًا مُطَهَّرَةً)، هەروەها پێغەمبەر (د.خ) لە چەندین فەرموودەی پیرۆزدا زاراوەی ڕۆژنامە و ڕۆژنامەگەری بەکارهێناوە، لەوانە، لە فەرموودەیەکیدا هاتووە: «وعليه سيف فيه صحيفة معلقة»، هەروەها دەفەرموێ: «طوبى لمن وجد في صحيفته استغفارا كثيرا»، بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەیەوە بڕوانە یونس الشيخ ابراهيم السامرائي: تأريخ الصحافة الأسلامية، مطبعة الامة، بغداد، ١٩٨٥، ل٨-٩.

فەرمان بەچاکە بکەن، و نەهی لە کردەوەی خراپ بکەن، هەر ئەمانەش سەرکەوتوون[١٤١].

لە ئیسلامدا، گەل مافی لێپرسینەوەی حوکمڕانانی هەیە، ئاشکرایە فەرمان بەچاکەکردن و نەهیکردن لە خراپە و ئامۆژگاری، تەنیا لێپرسینەوەیەکی سەرزارەکی نییە، بەڵکو لێپرسینەوەیەکە مرۆڤ بەرامبەر خودا و بەرامبەر گەل و بەرامبەر ئەوەکان لێی دەپرسرێتەوە. کاتێک عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خوای لێ بێت) خەلافەتی گرتەدەست و ئەرکی بەڕێوەبردنی دەوڵەتی ئیسلامی کەوتە ئەستۆ، لە وتارێکیدا، بەخەڵکی گوت: «ئەگەر یەکێکتان خواری لە من بەدی کرد باڕاستم بکاتەوە» یەکێک لەو کەسانەی نێو خەڵکەکە هەستایە سەرپێ و پێی وت: «بەخوا ئەگەر بێت و خوارێمان پێتەوە دیت، بەشیرەکانمان ڕاستت دەکەینەوە» عومەری کوڕی خەتاب لە وەڵامدا وتی: «ستایش بۆ خوا، کە وای کردووە لەنێو موسڵمانانەدا کەسێک هەبێ خواریی عومەر ڕاست بکاتەوە». ئەم گفتوگۆیە لە نێوان کەسێکی ئاسایی نێو خەڵک و خەلیفەی موسڵمانان بوو کە سەرۆکی دەوڵەتی ئیسلام بوو، ئەمەش باشترین نموونەیە بۆ باوەڕی ئیسلام بەدیموکراسییەت[١٤٢].

شەریعەتی ئیسلام ئازادیی ڕادەربڕینی بەئەرکێک داناوە لەسەر شانی هەموو کەسێک کە توانای ئەنجامدانی هەبێت بەپێی فەرموودەی خوای گەورە [وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنْ الْمُنْكَرِ وَيُسَارِعُونَ فِي الْخَيْرَاتِ وَأُولَئِكَ مِنْ الصَّالِحِينَ][١٤٣] هەروەها فەرموودەی: [يَابُنَيَّ أَقِمْ الصَّلاَةَ وَأْمُرْ بِالْمَعْرُوفِ وَانْهَ عَنْ الْمُنْكَرِ وَاصْبِرْ عَلَى مَا أَصَابَكَ إِنَّ ذَلِكَ مِنْ عَزْمِ الأُمُورِ][١٤٤] هەروەها فەرموودەی [وَلاَ تَلْبِسُوا الْحَقَّ بِالْبَاطِلِ وَتَكْتُمُوا الْحَقَّ وَأَنْتُمْ

---

١٤١- سورەتی (آل عمران)، ئایەتی ١٠٤. هەروەها خوای گەورە لە چەندین ئایەتدا ئەم حوکمەی دووپات کردۆتەوە لەوانە: ئایەتی ١١٢ سورەتی (التوبة) و ئایەتی ٤١ سورەتی (الحج) و ئایەتی ١٠٤ و ١١٠ و ١١٤ سورەتی (آل‌عمران) و ئایەتی ١٧ سورەتی (لقمان) و ئایەتی ١٥٧ سورەتی (الاعراف) وئایەتی ٦٧ سورەتی (التوبة) و ئایەتی ٧١ سورەتی (التوبة) و ئایەتی ٩٠ سورەتی (النحل) و ئایەتی ٣٨ سورەتی (الشورى) و ئایەتی ١٥٩ سورەتی (آل عمران) و ئایەتی ٤٢ سورەتی (البقرة) و ئایەتی ٧١ سورەتی (آل عمران) و ئایەتی ٨ سورەتی (الانفال).

١٤٢- د. مصطفى ابراهيم الزلمي واخرون: حقوق الانسان في الشريعة الاسلامية والقانون الدولي، منشورات بيت الحكمة، مطبعة الاديب البغدادية، العراق، بغداد، ١٩٩٨، ص٢٥.

١٤٣- سورەتی (آل عمران) و ئایەتی ١١٤.

١٤٤- سورەتی (لقمان) و ئایەتی ١٧

تَعْلَمُونَ][١٤٥] هەروەها فەرمووده‌ی [یا أَهْلَ الْكِتَابِ لِمَ تَلْبِسُونَ الْحَقَّ بِالْبَاطِلِ وَتَكْتُمُونَ الْحَقَّ وَأَنْتُمْ تَعْلَمُونَ][١٤٦] هەروەها خوای گەورە لە چەندین ئایەتی تردا ئەم حوکمەی دووپات کردۆتەوە، هەروەها فەرموودەی پێغەمبەر (د.خ): «من رأى منكم منكرا فليغيره بيده فان لم يستطع فبلسانه فان لم يستطع فبقلبه وذلك اضعف الايمان»[١٤٧]. هەروەها فەرموودەی پێغەمبەر (د.خ): «افضل الجهاد كلمة حق عند سلطان جائر»[١٤٨]. ئەمەو سەرەرای چەندین بەڵگەی تریش کە نیشانەی پابەندبوون بەفەرمان کردن بەچاکە و نەهی کردن لە خراپەن، وەک بنچینەی (ئاگادارکردنەوەی مرۆڤی ژیر ئەرکە) و (رێ پێشاندانی مرۆڤی نەزان ئەرکە)[١٤٩].

ئازادیی بەگشتی، بەئازادیی رۆژنامەگەریشەوە، لە ئیسلامدا لە ئەرک جیاناکرێتەوە و لە بەرپرسیارێتیش بەدەر نییە، بەڵکو هیچ ئازادییەک بەبێ بەرپرسیارێتی نییە و هیچ بەرپرسیارێتییەکیش بەبێ ئازادی نییە. بۆیە (ئازادی) و (بەرپرسیارێتی) بەبۆچوونی ئایینی ئیسلام دوو چەمکی لەیەک جیانەکراوەن[١٥٠] کەواتە مرۆڤ لە ئازادییەکەی بەرپرسیارە و ئازادییش حاڵەتێک نییە لە حاڵەتەکانی نابەرپرسیارێتی[١٥١].

سەبارەت بەم پرنسیپە خوای گەورە دەفەرمووێ: [وَقِفُوهُمْ إِنَّهُمْ مَسْئُولُونَ] واتە: ئەوانە رابگرن، بەراستی ئەوانە بەرپرسیارن[١٥٢] لەبەرئەوەی ئازادیی رۆژنامەگەری، ئازادییەکە

---

١٤٥- سورەتی بەقەرە ئایەتی ٤٢.

١٤٦- سورەتی (ال عمران) و ئایەتی، ٧١.

١٤٧- د. ضاري خليل محمود: الاجتهاد وحقوق الانسان في الاسلام، الموسوعة الصغيرة، دار الشؤون الثقافية العامة، العراق، بغداد، ١٩٩٦ ص٥٥-٥٦.

١٤٨- د. ضاري خليل محمود: الاجتهاد وحقوق الانسان في الاسلام، سەرچاوەی پێشوو، ل٥٥-٥٦.

١٤٩- جەعفەر شیرازی، «رۆژنامەگەریی ئازاد لە نێوان رەوایی و نارەواییدا» وەرگێرانی ژاڵە کەمال، گۆڤاری «رۆژنامەڤانی» ژمارە (٦-٧)ساڵی دووەم، (پاییز - زستان)ی ساڵی ٢٠٠١-٢٠٠٢ ل ١٠٣-١٠٤.

هەروەها http://www.annaban.org/nba47/sahfa.htm23/9/2001

١٥٠- حول مفهوم الحرية:

http://www.balagh.com/mtboat/arbc/dro/index.2001/9/22

151- http://www.al.asfoor.net/books/drasat/bohoush29/9/2001

١٥٢- سورەتی الصافات ئایەتی: ٢٤

لە ئازادییە سیاسییەکان، بۆیە شەریعەتی ئیسلام ڕێگای داوە مرۆڤ پیادەی ئازادیی خۆی بەگوێرەی ئەو سیاسەتە بکات کە تایبەتە بەسەرپەرشتیی مرۆڤایەتی و ڕابەرێتیی ئادەمیزاد لە ڕێگای ئاشتی و چاکەدا و نەیکاتە هۆکارێک بۆ چەوسانەوە و دەستدرێژی کردنە سەر ئازادیی کەسانی تر.

بۆ ئەوەی هەر تاکێک لە تاکەکانی کۆمەڵ بەشە ئازادی خۆی دوور لە دەستدرێژی ئەوانی تر بپارێزێ، دەبێ دەست لە هەندێکی هەڵگرێت و ئەم دەست هەڵگرتنەش لەسەر ئاستی کۆمەڵایەتیدا لەو پاسایانەدا ڕەنگ دەداتەوە کە بۆ ڕێکخستنی کۆمەڵ و کۆنترۆڵکردنی ڕەفتاری تاکەکانی دادەنرێت، بەم چەشنە ئازادیی ڕەها لە ئیسلامدا نییە، چونکە شەریعەتی ئیسلام ئازادی و کۆت و بەندەکانی بەیەکەوە کۆکردۆتەوە و بنچینەی بنەڕەتی لە ئیسلامدا بریتییە لە ئازادیی قسەکردن. بەڵام دانانی کۆت و بەند لەسەر ئەم ئازادییە لەو حاڵەتەدا دەبێ کە دژی ڕەفتاری گشتی و ئیزامی گشتی بێت[١٥٣].

لە کۆتاییدا، دەتوانین بڵێین، ئازادیی ڕۆژنامەگەری لە ئیسلامدا، زۆر نزیکە لە تیۆری بەرپرسیتیی کۆمەڵایەتی، چونکە لە هەردووکیاندا لەپاڵ ئەو ئازادییەی کە بۆ ڕۆژنامەگەری دانی پیانراوە، کۆمەڵێک ئەرک هەن دەبێ ڕەچاو بکرێن و سەرپێچیکردنی ئەم ئەرکانەش دەبێتە مایەی دروست بوونی بەرپرسیتی.

هەرچەندە جۆر و سروشتی ئەو ئەرکانە لە کۆمەڵگای ئیسلامییەوە بۆ کۆمەڵگایەکیتر جیایە، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە بۆچوونی ئیسلام بۆ ئازادیی ڕۆژنامەگەری لە تیۆری بەرپرسیتیی کۆمەڵایەتی زۆر دوور بێت، چونکە هەروەکو لە پێشەوە ئاماژەمان پێ کرد، لە هەردووکیاندا ڕۆژنامەگەری وەک بنچینە ئازادە، بەڵام ئەم ئازادییە بۆ بەرژەوەندی گشتی و پاراستنی ئیزامی گشتی بەستراوەتەوە بەهەندێک ئەرکەوە. سەرپێچیکردنی ئەم ئەرکانە بەرپرسیارێتییەکە دروست دەکات نەک دەربڕینی ڕایەکە.

بەکورتی، خاڵە هاوبەشەکانی نێوانیان بریتین لەم دووانەی خوارەوە:

١ - لە هەردووکیاندا، ڕۆژنامەگەری ئازادە و ئەم ئازادییەش بنەڕەتەو دانانی کۆتوبەند ڕێژەیە لەسەر ئەم بنەڕەتە و نابێ فراوان بکرێت.

٢ - لە هەردووکیاندا، ئازادیی ڕۆژنامەگەری بەرپرسیتی لەگەڵدایە.

---

١٥٣- د. محمد شريف احمد: البصيرة الاسلامية، دار البشير، اردن، عمان، ل ١٣٧. و کەمال سەعدی: چەمکی ماف، چاپخانەی کریستال، هەولێر، ١٩٩٨ ل١٧.

خاڵە جیاوازەکانی نێوانیشیان، ئەمانەی خوارەوەن:

لەئیسلامدا، دەبێ ڕۆژنامەگەری پابەندی پرنسیپ و بنچینەکانی شەریعەتی ئیسلام بێت لەگەڵ ئەو ئەرکانەی کە ڕەوشتی پیشەکە دەیسەپێنێت.

بەڵام بەپێی تیۆری بەرپرسێتی کۆمەڵایەتی، ڕۆژنامەگەری تەنها پابەندی ئەو ئەرکانە دەبێت کە ڕەوشتی پیشەکە بەسەریاندا دەیسەپێنێت.

ئەمە لە ڕووی تیۆرییەوە، بەڵام لە ڕووی پراکتیکەوە، ئازادیی ڕۆژنامەگەری لە هەموو کۆمەڵگایەک و وڵاتێکی ئیسلامیدا وەکویەک پیادە ناکرێت، بەڵکو بەپێی فەلسەفەی حوکمی ئەو وڵاتە دەگۆڕێت.

بۆ نموونە، لە ئەفغانستانی ژێر دەسەڵاتی بزووتنەوەی تالیباندا، ئەم ئازادییە نەبوو، تەنانەت هیچ نرخێکیشیان بۆ ڕای گشتی دانەنابوو، کە لە میانی کەناڵەکانی پەیوەندیی جەماوەرییەوە دروست دەبێت کە ڕۆژنامەگەری یەکێکە لەو کەناڵانە و گرنگترینیانە. ئەمەو بەبەردەوامی دەستدرێژی دەکرایە سەر ڕۆژنامە و ڕۆژنامەنووسان.

بزووتنەوەی تالیبان، لە درێژەی شاڵاوەکانیدا بۆسەر ڕۆژنامە و ڕۆژنامەنووسان و ئازادیی ڕۆژنامەگەری، دەیان ڕۆژنامەنووسی ئەفغانی و بیانی لەلایەن ئەوانەوە گیراون و دەرکراون و کوژراون. لەوانە گرتنی خاتوو ڕۆژنامەنووسی بەریتانی (ئیڤۆن ریدلی) کە لە ڕۆژنامەی (سەندای ئێکسپرێس)ی لەندەنی کاری دەکرد[154] هەروەها گرتنی ڕۆژنامەنووسی فەرەنسی میشێل بیرنارد (Miche Peyrard) پەیامنێری ڕۆژنامەی (پاری ماش)ی فەرەنسی و تۆمەتبارکردنی بەسیخوڕ[155]. تەنانەت، پانزە ڕۆژنامەنووسی ئەفغانی و بیانی بەدەست چەکدارەکانی ئەفغانی کوژراون[156]. هەروەها

---

154- شایەنی باسە، بزووتنەوەی تالیبان (ئیڤۆن ریدلی) یان لە ڕێکەوتی ٢٨ی سێپتێمبەر ٢٠٠١ لە گوندی (بابا الصارم) لەسەر سنووری پاکستان گرتبوو. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە:
AFGANISTAN; Taliban release Brit ish journalist.
-شوێنی لە ئینتەرنێت: Http://www.C.P.J.ORG.News.2001/10/10

155- ڕۆژنامەنووسی فەرەنسی (میشێل بیرنارد) سەر لە بەیانی ٩ی ئۆکتۆبەر ٢٠٠١ لەلایەن هێزەکانی بزووتنەوەی تالیبان لە (جوشتا) لە ڕۆژهەڵاتی جەلال ئاباد گیراو تۆمەتی سیخوڕی درایە پاڵ. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: . Taliban Arrest French Journalist
- شوێنی لە ئینتەرنێت: Http;www.C.P.J.ORG.News.2001/10/10 •

156- (دەنگی ئەمەریکا، بەشی عەرەبی، شەوی هەینی، کاتژمێر ١١.٣٠ ڕێکەوتی ٢٠٠١/١١/٢٨)

حکوومەتی ئەفغانی لێنەگەڕا، ئەو دوانزە ڕۆژنامەنووسە بیانییانەی کە بۆ ئامادەبوونی دادگایی ئەو هەشت بیانییانە ئامادەبن کە بەتۆمەتی بڵاوکردنەوەی ئایینی مەسیحی تۆمەتبار کرابوون[157].

سەبارەت بەبەکارهێنانی تۆڕی ئینتەرنێتیشەوە، پۆلیسی ئایینی لە ئەفغانستانی تالیبان بەیاننامەیەکی دەرکرد و تیایدا بەکارهێنانی تۆڕی ئینتەرنێتی یاساغ کرد. لە بەیاننامەکەدا هاتووە: «هیچ ڕێکخراوێکی حکومی و ناحکومی، ئەفغانی و غەیرە ئەفغانی و هیچ کەسێک لە خاکی ئیمارەتی ئەفغانستانی ئیسلامی بۆی نییە ئینتەرنێت بەکار بهێنێت»[158].

لێرەدا بۆمان دەردەکەوێ، ئەم ڕژێمە هەر بەناو ئیسلامی بووە، دەنا هیچ ڕەفتارێکی لەسەر بنەمای ئیسلام نەبووە، تەنانەت ئایینی ئیسلامیشیان شێواندووە، ئەگینا ئیسلام هیچ کاتێک دژی پێشکەوتن نەبووە، سەبارەت بەمە خوای گەورە لە سورەتی (الزمر - ئایەتی ٩) دەفەرمووێ: «هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لا يَعْلَمُونَ» واتە ئایا ئەوانەی دەزانن و ئەوانەی نازانن دەبنە یەک، هەروەها پێغەمبەر (د.خ) لە فەرموودەیەکیدا دەڵێ: «اطلب العلم من المهد الى اللحد» واتە داوای زانست بکە لە لانکەوە بۆ گۆڕ.

کۆماری ئیسلامیی ئێرانیش، یەکێکە لەو وڵاتانەی کە تیایدا ئازادیی ڕۆژنامەگەری بەبەردەوامی پێشێل دەکرێت و دەستدرێژیش دەکرێتە سەر ڕۆژنامە و ڕۆژنامەنووسان.

ڕێکخراوی (مراسلون بلا حدود) لە ڕاپۆرتێکی ساڵانەی خۆیدا، ئێرانی بەپلەی دەیەم داناوە لەنێو ئەو دەوڵەتانەی کە دەستدرێژی دەکەنە سەر ئازادیی ڕۆژنامەگەری و ڕۆژنامەنووسان. هەروەها لیژنەی پاراستنی ڕۆژنامەنووسان (لجنة حماية الصحفيين) لە ڕێکەوتی ١٩/٦/٢٠٠١ بەبۆنەی ڕۆژی ڕۆژنامەگەریی جیهانییەوە، ناوی دە دوژمنی ڕۆژنامەگەریی بۆ ساڵی ٢٠٠١ ڕاگەیاند، تیایدا ناوی ڕابەری شۆڕشی ئیسلامیی ئێرانی سەرلیستەیە بەوەی کە شاڵاوێکی فراوانی کردۆتە سەر ڕۆژنامە و ڕۆژنامەنووسە چاکسازیخوازەکان کە ژمارەیان خۆی لە سی و دوو ڕۆژنامە و دەیان ڕۆژنامەنووس دەدات.

ئەمەو، ڕێکخراوی (مراسلون بلاحدود) لە بەیاننامەیەکیدا، ئێرانی بەگەورەترین

157- Http://www.almashrek.org.2001/12/2

158- Http://www.almashrek.org.2001/9/4

بەندیخانەی ڕۆژنامەنووسان داناوە و دەڵێ ژمارەی ئەو ڕۆژنامەنووسانەی کە گیراون، خۆی لە بیست و حەوت ڕۆژنامەنووس دەدات و تاکو ئێستا دوانزەیان شوێن بزرن.

شایەنی ئاماژە بۆکردنە، دادگای ئێرانی لە ماوەی پانزە مانگدا، زیاتر لە هەژدە ڕۆژنامەی چاکسازیخوازی وەستاند و ڕۆژنامەنووسی چاکسازیخواز (ئەکبەر غانجی)یشی بەتۆمەتی بەشداریکردن لە کۆڕێکی ڕۆژنامەوانیدا لە بەرلین، بەندیتشین کرد[١٥٩].

مەملەکەتی عەرەبیی سعودییش کە کار بە شەریعەتی ئیسلام دەکات، تارادەیەک لەچاو ڕژێمی ئیسلامیی ئێرانی و بزوتنەوەی تالیبان کراوەترە. بەڵام سەرەڕای ئەمەش بەتەواوەتی و وەکو پێویست نەیتوانیوە ڕێز لە ئازادیی ڕۆژنامەگەری بگرێت، بەڵکوو، وێڕای ڕێگادان بەبەکارهێنانی تۆڕی ئینتەرنێت و کردنەوەی دەیان نووسینگە بۆ ئەم مەبەستە، کەچی بەملیۆنەها دۆلاری ئەمەریکی تەرخانکردووە بۆ داخستنی چەندین شوێن لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت کە بەهەڕەشەی دادەنێت لەسەر ڕژێمەکەی[١٦٠]. هەروەها، دەزگایەکی چاودێریی داناوە بۆ چاودێریکردنی ئەو کەسانەی کە سەیری شوێنەکانی ئینتەرنێت دەکەن، بەمەبەستی ڕێگاگرتنیان لە چوونە ناو ئەو شوێنانەی کە بەهەڕەشەی دادەنێ لەسەر دواڕۆژی ڕژێمەکەی[١٦١].

لە کۆتاییدا، بۆمان دەردەکەوێ کە نەبوونی ئازادیی ڕۆژنامەگەری لە هەندێک دەوڵەت کە کار بەشەریعەتی ئیسلامی دەکەن، خەتاکەی لە ئاینی پیرۆزی ئیسلامدا نییە، بەڵکوو لە خودی سیستمە سیاسییەکاندایە.

ئەم خشتەیەی خوارەوە کاتی سەرهەڵدان و سەرچاوە و مەبەستی سەرەکی هەر چوار تیۆرییەکەی ڕۆژنامەگەری و ئەو کەسەی مافی دەرکردنی هەیە لەگەڵ چۆنێتی سەرپەرشتیکردنی و ئەو بابەتانەی کە نابێ تیایدا بڵاوبکرێتەوە، هەروەها موڵکدارێتی و جیاوازییە سەرەکییەکانی نێوانیان دەردەخات[١٦٢]:

---

159- Http://www.almashrek.org.2201/7/16

160- Http://www.almashrek.org.2001/11/22

161- Http://www.almashrek.org.2001/11/6

١٦٢- لە Fred S.Siebert,Theodore Peterson,Wilbur schramm. four Theories Of The Press. p.7،

وەرگیراوە، بڕوانە د. صالح ابو اصبع: الاتصال والاعلام في المجتمعات المعاصرة، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٥٨-٢٥٩. و ... د. حسين عبدالقادر: الرأي العام والعلاقات، بلا سنة نشر، ل ٣٠١.

| | تیۆری دەسەڵاتدارێتی | تیۆری سەربەستی | بەرپرسێتیی کۆمەڵایەتی | تیۆری سۆڤیەتیی کۆمۆنیستی |
|---|---|---|---|---|
| کەی سەری هەڵدا | لە سەدەی شازدەوە هەڵدە لە ئینگلتەرا و زۆر بەفراوانی بڵاوبووەوە و تاکو ئێستاش لەزۆر دەوڵەتدا مومارەسە دەکرێ | دوای ساڵی ١٦٨٨ لە ئینگلتەرا و ئەمەریکا سەری هەڵدا هەروەها لە دەوڵەتانی تریشدا هەیە | لە وڵاتەیەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە سەدەی بیستەم | لە یەکێتی سۆڤێتیی پێشوو هەرچەندە هەندێک لە ئاکارەکانی لە ئەڵمانیای نازی و ئیتاڵیای فاشی هەبوو |
| سەرچاوەکەی | فەلسەفەی دەسەڵاتی رەهای پاشا یا حکومەتەکەی یا هەردووکیان بەیەکەوە، تیۆرییەکانی ئەفلاتون، ئەرستۆ، میکافیلی، هۆبز، هیگل. | نووسینەکانی ملتۆن و لۆک و میل و فەلسەفەی مافە سروشتییەکان | نووسینەکانی هۆکینج و لیژنەی ئازادیی رۆژنامەگەری لە بەریتانیا و یاساکانی چاپەمەنی | هزری مارکسی و لینینی و ستالینی لەگەڵ هزری هیگل و هزری رووسی لە سەدەی نۆزدەدا |
| مەبەستە سەرەکییەکەی | پاراستن و بەرجەستەکردنی سیاسەتی ئەو حکومەتانەی کە دەسەڵاتیان بەدەستە، هەروەها خزمەتکردنی دەوڵەت | راگەیاندن و رەدەستهێنانی قازانج بەڵام مەبەستی سەرەکی بریتییە لە بەدەرخستنی حەقیقەت و چاودێریکردنی کاروباری حکومەت | راگەیاندن و رەدەستهێنانی قازانج، بەڵام مەبەستی سەرەکی بریتییە لە گۆڕینی ململانێ بۆ دایەلۆگ | درێژەپێدان و پتەوکردنی سیستەمی سۆسیالیزمی و بەشێوەیەکی تایبەتی دیکتاتۆرییەتی حزبی کۆمۆنیست |

| کێ مافی بەکارهێنانی هەیە | هەر کەسێک بتوانێ ڕەزامەندی پادشایەتی یان ڕەزامەندییەکی تری لەو بابەتە وەدەست بێنێ | هەر کەسێک توانای دارایی هەبێت بۆ دامەزراندنی دەزگای ڕاگەیاندن | هەر مرۆڤێک بیەوێ شتێک بڵێ | ئەندامانی لایەنگرو توندڕۆکانی حزب |
|---|---|---|---|---|
| چۆنێتیی سەرپەرشتیکردنی | لە ڕێگای حکومەتەوە، یەکێتییەکان، بەخشینی مۆڵەت، هەندێک جاریش سەپاندنی سانسۆری کارگێڕی | ڕاستکردنەوەی لە خۆوە یان لە ڕێگای دادگاوە | ڕای کۆمەڵ، ڕای بەکاربەرەکان لەگەڵ ئادابی پیشەکە | سەرپەرشتیی حکومەت |
| ئەوەی نابێ بڵاوبێتەوە | ڕەخنەگرتن لە دەزگای سیاسی و فەرمانبەرە گشتییەکانی سەر بە حکومەت | ئاروژاندن، ئەدەبی ڕووت، ئەو بابەتانە زیان بە ئەخلاق دەگەیەنن، هاندان بۆ یاخیبوون لە کاتی جەنگدا | دەست تێوەردان لە مافی تایبەتیی کەسان و بەرژەوەندییە باڵاکانی کۆمەڵ | ڕەخنەگرتن لە ئامانجەکانی حزبی کۆمۆنیست |
| موڵکدارێتییەکەی | تایبەتی، یان گشتی | تایبەتی بەشێوەیەکی تایبەتی | تایبەتی ئەگەرچێت و حکومەت ئیحتیاتاتی خۆی وەرئەگرێ بۆ لێکۆڵینەوە لەوەی کە ڕۆژنامەگەری بەرژەوەندیی گشتی ڕەچاو | گشتی |
| جیاوازییە سەرەکییەکانی نێوانی و نێوان تیۆرییەکانی تر | ئامرازێکە بۆ کاراکردنی سیاسەتی حکومەت هەرچەندە مەرج نییە کە دەوڵەت هەیبێ | هۆکارێکە بۆ چاودێریکردنی کارەکانی حکومەت و بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی پێداویستییەکانی تری کۆمەڵ | دەبێ ئەم کەناڵانە گریمانەی ئەوە بکەن، کە بەرپرسیارێتیی کۆمەڵایەتیان لەسەرە | موڵکی دەوڵەتە و لەژێر چاودێرییەکی توندەوەیە. ئەم چاودێرییە وەک چەکێک لە چەکەکانی دەوڵەت هەیە. |

## ٢- ڕێکخستنی یاسایی دەرکردن و بڵاوکردنەوەی

لەبەر گرنگیی ئازادیی ڕۆژنامەگەری، وەک مافێک لە مافە بنەڕەتییەکانی مرۆڤ، لە هەموو دەوڵەتێکدا یاسادانەر لەناو دەستووردا دانی پیادا ناوە و لە ڕێگای دەستەبەرکردنی کۆمەڵێک گرێنتی یاسایی بۆ کەڵک وەرگرتن لەم ئازادییە کەفالەتیشی کردووە. بێ گومان بنچینە دەستوورییەکانیش باڵاترن لە بنەماکانی یاسای ئاسایی، بۆیە دەستوور دەکەوێتە لوتکەی سیستمی یاسایی و نابێ بنچینە یاساییەکانی لە خۆی خوارتر سەرپێچی بکەن یان لەگەڵیدا دژوار یان ناکۆک بن.

بەم پێیە، ڕێکخستنی ئازادیی ڕۆژنامەگەری لە چوارچێوەیەکی دەستووریدا، بڕێکی زۆری ڕێز و گرێنتی بۆ دەستەبەر دەکری[١٦٣].

جا لەبەر ئەوەی دەستوور جگە لە دیارکردنی پرنسیپ و هێڵە سەرەکییەکان ناچێتە ناو درێژەی بابەتەکان و قووڵایی کاروبارەکان، بۆیە وەک پرنسیپ چوارچێوەی گشت ئەو ماف و ئازادییانە ڕەنگ ڕێژ دەکات و ئەرکی ڕێکخستنیشیان بەیاسادانەر دەسپێرێ تاکو بەیاساو ڕێسای تایبەت ڕێکیان بخات[١٦٤].

کەواتە، یاسادانەر ڕۆڵێکی گرنگ دەبینێ لە ڕێکخستنی ئازادیی ڕۆژنامەگەری. لە ڕێگای دەستنیشانکردنی سنوورەکەی و دانانی کۆت و بەندی پێویست بەمەبەستی زامنکردن و پیادەکردنی لە چوارچێوەیەکی ڕاست و دروستدا.

دانانی ئەو کۆت و بەندانەش نابێ ببێتە مایەی ڕێگاگرتن لەبەردەم پیادەکردنی ئەم ئازادییە و هەڵوەشاندنەوەی، یان سنووردارکردنی بەچەشنێک پانتاییەکەی تەسک بکاتەوە، چونکە ئازادیی ڕۆژنامەگەری بنچینەیە و ئەو کۆت و بەندو سنورانە ڕیزپەڕن لەسەر ئەو بنچینەیە نابێ پانتاییەکەیان لە سنووری پێویستی بچێتە دەر. بۆیە دەبێ لە چوارچێوەیەکی یەکجار تەسک دا و بەپێی پێویستی دابنرێن.

---

١٦٣- ميثم حنظل شريف: التنظيم الدستوري والقانوني لحرية الصحافة في العراق، رسالة مقدمة الى كلية القانون جامعة بغداد كجزء ومن متطلبات نيل شهادة الماجستير في القانون لعام ١٩٩٩، ص٥٦.

١٦٤- محمد سعيد مجذوب: الحريات العامة وحقوق الانسان، ط٩، مطبعة جروس برس، لبنان، بيروت، ١٩٨٦ ص١٣٠.

بەم پێیە، نابێ یاسادانەر لەکاتی ڕێکخستنی یاسایی ئازادیی ڕۆژنامەگەریدا، لە ئامانجی دەستوور، کە ئازادیی بەگشتی کەفالەت کردووە، لابدات یان دوور بکەوێتەوە. بۆیە ئەو یاسایەی دایدەنێ، ئەگەر لەگەڵی ناکۆک بوو، یان لە بڕەکەی کەم کردەوە، بەیاسایەکی ناتەوا و (قانون معيب) دادەندرێ.

ئینجا لەبەرئەوەی ڕۆژنامەگەریی چاپکراو گرنگترین دیاردەی ئازادیی ڕۆژنامەگەرییە، بۆ گوزارشتکردنی تاکەکانی کۆمەڵ لە بیروڕاو هزر و ویژدانی خۆیان، بۆیە بۆتە مایەی بایەخپێدانی یاسادانەران.

دەرکردنی ڕۆژنامە پێویستی بەجۆرە ڕێکخستنێک هەیە، ئەم ڕێکخستنەش لە دەوڵەتێکەوە بۆ دەوڵەتێکی تر بەپێی گۆڕانی سیستمی سیاسی و کۆمەڵایەتی، چەمکی ئازادی لەو دەوڵەتەدا دەگۆڕێ. دوو شێوازی سەرەکی بۆ ڕێکخستنی ڕۆژنامە هەن، شێوازی (ئاگاکاری) و شێوازی (مۆڵەت)، بۆیە یاساکانی ڕۆژنامەگەری و چاپەمەنی بەگوێرەی پابەندبوونیان بەیەکێک لەو دوو شێوازانە دەگۆڕێن. بەم پێیەش مەرجەکانی دەرکردن و بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامە لە یاسایەکەوە بۆ یاسایەکی تر دەگۆڕێ.

لە خوارەوە لە حەوت خاڵدا باسی ئەم بابەتە دەکەین لە یاسای چاپەمەنیی هەرێمی کوردستاندا و بەبەراورد لەگەڵ چەند یاسایەکی دەوڵەتان:

## ٣- ١ ئاگاکاری (الاخطار)

ئاگاکاری بریتییە لە ئاگاداری کردنەوەیەکی بەنووسین کە کەسێک پێشکەشی ئەو لایەنە پەیوەندیدارەی دەکات کە یاسا دەستنیشانی کردووە و تیایدا ئاگاداری دەکاتەوە کە ئارەزووی دەرکردن و بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامەی هەیە[١٦٥]. دووجۆر ئاگاکاری هەن، جۆرێکیان ئاگاکاری ڕەهایە و جۆری دووەمیشیان ئاگاکاری نارەهایە.

لە خوارەوە لەبەر ڕۆشنایی یاسای هەرێمی کوردستان و یاسای میسری و لوبنانی و فەرەنسی و عێراقیدا باسی ئەو مەرج و زانیاریانە دەکەین کە دەبێ لە ئاگاکارییەکەدا هەبن:

---

١٦٥- د. عبدالله اسماعيل البستاني، حرية الصحافة، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٥٦.

### ٣-١-١ سیستەمی ئاگاکاری لە یاسای چاپەمەنی و یاسای دەسەڵاتی ڕۆژنامەگەریی میسردا

یاسادانەری میسری دەرکردن و بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامەگەری بەیاسای چاپەمەنی ژمارە (٢٠)ی ساڵی ١٩٣٦[١٦٦]ی هەمووارکراو بەیاسای ژمارە ٣٧٥ی ساڵی ١٩٥٦ و یاسای ژمارە ١٩٩ی ساڵی١٩٨٣ و یاسای دەسەڵاتی ڕۆژنامەگەری ژمارە ٩٦ی ساڵی ١٩٩٦[١٦٧] ڕێکخستووە. یاسای چاپەمەنیی میسری لە ڕێکخستنی دەرکردن و بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامەگەریدا پێش یاسای ٩٦ی ساڵی ١٩٩٦، کاری بەسیستەمی ئاگاکاری ڕەها کردووە هەروەکو لە دەقی مادده (١٣)ی یاسای ناوبراودا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە تیایدا هاتووە: «ئەوەی بیەوێ ڕۆژنامە دەربکات دەبێ ئاگاکارییەکی نووسراو سەبارەت بەمە پێشکەشی ئەو پارێزگایە یان بەڕێوەبەرێتییە بکات کە شوێنی دەرکردنی ڕۆژنامەکە سەر بەئەوە. دەبێ ئاگاکارییەکە ئەم زانیارییانەی خوارەوەی تیابێت:

یەکەم: ناو و نازناو و ڕەگەزنامە و شوێنی دانیشتنی خاوەن ڕۆژنامە و نووسەرەکەی یان نووسەرە بەرپرسەکان و بڵاوکەرەوە ئەگەر هەبێت.

دووەم: ناوی ڕۆژنامەکە و ئەو زمانەی پێی بڵاوەکرێتەوە و چۆنێتی دەرکردنی و ناونیشانەکەی.

سێیەم: ئەگەر ڕۆژنامەکە چاپخانەیەکی تایبەتی هەبوو ئەگەرنا ناونیشانی ئەو چاپخانەیە دیاربکرێ کە ڕۆژنامەکەی پێ چاپ دەکرێ. پێویستە خاوەنی ڕۆژنامە و سەرنووسەر یان نووسەرە بەرپرسەکان و ئەگەر بڵاوکەرەوەی هەبوو ئاگاکارییەکە ئیمزا بکەن»[١٦٨].

---

١٦٦- ئەم یاسایە لە ڕۆژنامەی «الوقائع المصرية» ژمارە (٢٣)ی ٢ مارس ١٩٣٦ بڵاوکراوەتەوە.

١٦٧- ئەم یاسایە لە ڕۆژنامەی «الوقائع المصرية» ژمارە (٢٥ مكرر -أ-) لە ٢٠ یونیو ١٩٩٦ بڵاوکراوەتەوە.

١٦٨- ئەمەش دەقەکەیەتی: «یجب علی کل من اراد ان یصدر جریدة ان یقدم اخطارا کتابیا بذلك الی المحافظة او المديرية التي يتبعها محل الاصدار:

اولاً: اسم ولقب وجنسية ومحل اقامة صاحب الجريدة والمحرر او المحررين المسؤلين والناشر ان وجد.

ثانياً: اسم الجريدة واللغة التي تنشر بها وطريقة اصدارها وعنوانها.

ثالثاً: اذا كان للجريدة مطبعة خاصة والا فيبين اسم وعنوان المطبعة التي تطبع فيها الجريدة.

ويجب ان يوقع على الاخطار من صاحب الجريدة ومن رئيس التحرير او المحررين المسؤولين ومن الناشر ان وجد».

بەلام بەدەرکردنی یاسای ڕێکخستنی دەسەلاتی ڕۆژنامەگەری ژمارە (٩٦)ی سالی ١٩٩٦ یاسادانەری میسری بەشێوەیەکی زمنی ئەو حوکمەی سەرەوەی هەلوەشاندۆتەوە و لە جیاتی ئاگاکاری ڕەها ئاگاکاری مەرجداری داناوە و بۆ ئەم مەبەستە کۆمەلێک مەرج و زانیاریی لە پێشکەشکەری ئاگاکارییەکە داوا کردووە هەروەکو لە دەقی ماددە (٤٦)دا ئەمەمان بۆ دەردەکەوێ کە تیایدا هاتووە: «ئەو کەسەی دەیەوێ ڕۆژنامەیەک دەربکات دەبێ ئاگاکارییەکی نووسراو لەلایەن نوێنەری یاسایی ڕۆژنامەکە ئیمزا کرابێ پێشکەشی ئەنجوومەنی بالای ڕۆژنامەگەری بکات، ناو و نازناو و ڕەگەزنامە و شوێنی دانیشتنی خاوەن ڕۆژنامەکە و ناوی ڕۆژنامەکە و خولەکەی و ئەو زمانەی کە پێی بلاو دەکرێتەوە و جۆری چالاکییەکەی و کلێشەی ئیداری و دەستەی نووسەران و بودجە و سەرچاوەکانی داهاتەکەی و ناو و ناونیشانی سەرنووسەرەکەی و ناوونیشانی ئەو چاپخانەیەی کە لێی چاپ دەکرێ لەخۆ بگرێ».

ئەمەو ئەو کەسەی ئارەزووی دەرکردنی ڕۆژنامە بکات بەپێی حوکمی ماددە (٤٧)ی یاسای دەسەلاتی ڕۆژنامەگەریی ناوبراو، ئاگاکارییەکی نووسراو کە گشت ئەو زانیاریانەی تیا بێت کە لە ماددە (٤٦)ی یاسای ناوبراودا هاتووە پێشکەشی ئەنجوومەنی بالای ڕۆژنامەگەری دەکات. دوای ئەوە ئەنجوومەنی بالای ڕۆژنامەگەری، سەبارەت بەو ئاگاکارییەی بۆ دەرکردنی ڕۆژنامە پێشکەشی کراوە، لە ماوەیەک کە لە چل ڕۆژ ڕەت نەکات لە ڕۆژی پێشکەشکردنی یاداشتنامەکە بڕیاری خۆی دەردەکات لە حالەتی ڕەتکردنەوەدا دەبێ هۆ و پاساوەکانی ڕەفزکردنەکە دەستنیشان بکرێت،و لە هەمان کاتدا وەلام نەدانەوەی لەلایەن ئەنجوومەنی بالای ڕۆژنامەگەری لەو ماوەیەدا نیشانەی لاری نەبوونییەتی لە دەرکردنیدا[١٦٩].

ئینجا لە حالەتی دەرچوونی بڕیاری ئەنجوومەنی بالای ڕۆژنامەگەری بەڕەتکردنەوەی داوای دەرکردنی ڕۆژنامەکە، پەیوەندیداران بۆیان هەیە لەبەردەم دادگا لە ماوەی سی ڕۆژ لە ڕۆژی ئاگادارکردنەوە بەڕەفزکردن تانەی لێ بدەن[١٧٠].

---

١٦٩- اسامة الكاشف: تشريعات الصحافة العربية، لە ئینتەرنێت لەم شوێنەی خوارەوە وەرگیراوە:
http://www.arabia.com.2001/10/6.

١٧٠- ئەمەش دەقی ماددە (٤٧)ی یاسای دەسەلاتی ڕۆژنامەگەریی ناوبراوە: «ئەنجوومەنی بالای ڕۆژنامەگەری سەبارەت بەو ئاگاکارییەی کە بۆ دەرکردنی ڕۆژنامە پێشکەشی کراوە بڕیاری خۆی دەردەکات لە ماوەیەک کە لە چل ڕۆژ ڕەت نەکات لە ڕۆژی پێشکەشکردنی ئاگاکارییەکە کە دەبێ =

لە دەقی ئەم ماددەیەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە یاسای ڕێکخستنی دەسەڵاتی ڕۆژنامەگەری کاری بەسیستمی ئاگاکاری ئاڕەها دەکات، چونکە مەرجی چل ڕۆژ چاوەڕوانی داناوە لەو ماوەیەدا ئەنجومەنی باڵای ڕۆژنامەگەری بڕیارێک سەبارەت بەئاگاکارییەکە دەردەکات، بەڵام ئەنجومەنی باڵا سەبارەت بەمە دەسەڵاتێکی ڕەهای نییە، بەڵکو دەسەڵاتەکەی تەنها تایبەتە بەتانەگرتن لەو ئاگاکارییە ئەگەر هاتوو ئەو زانیارییانەی تیانەبوو کە لە ماددە چل و شەشی یاسادا هاتووە.

هەروەها بەپێی ماددەی (٥١) لە یاسای ڕێکخستنی دەسەڵاتی ڕۆژنامەگەری ئەگەر هاتوو دوای دەرچوونی مۆڵەتەکە گۆڕانکاری بەسەر ئەو زانیارییانەدا هات کە لە ئاگاکارییەکەدا هاتوون دەبێ بەلای کەمەوە پانزە ڕۆژ بەر لە ڕوودانیان بەنووسراو ئاگاداری ئەنجومەنی باڵا بکرێتەوە ئەگەر هاتوو گۆڕانکارییەکە پێشبینی کراو بێ وەک گۆڕینی ناوی ڕۆژنامەکە یان گۆڕینی ماوەی دەرچوونی و بەپێچەوانەشەوە ئەگەر پێشبینی نەکرابێت وەک مردنی خاوەنی ڕۆژنامەکە یان سەرنووسەرەکەی دەبێ لە ماوەیەکدا کە لە هەشت ڕۆژ تێنەپەڕێ لە ڕۆژی ڕوودانیەوە ئاگادار بکرێتەوە.

ئەمەو لە کاتی سەرپێچیکردن لە حوکمی ماددەی ناوبراو، نوێنەری یاسایی ڕۆژنامەکە بەبەندیشین بۆ ماوەیەک لە شەش مانگ زیاتر نەبێت لەگەڵ غەرامەیەک لە پێنج سەد جونەیهی کەمتر نەبێ و لە هەزاریش زیاتر نەبێ، یان بەیەکێک لەو دوو سزایە، سزا دەدرێ.

ئەمەش دەقی ماددەی (٥١) لە یاسای ڕێکخستنی دەسەڵاتی ڕۆژنامەگەریی ناوبراوە:
«لە حالەتی ڕوودانی گۆڕانکاری لەو زانیارییانەی کە لە ئاگاکاریدا هاتوون دوای دەرچوونی مۆڵەت بەسەریدا دێت دەبێ بەنووسراو ئاگاداری ئەنجومەنی باڵای ڕۆژنامەگەری لەو گۆڕانکارییە پێش ڕوودانیان بەپانزە ڕۆژ بەلای کەمەوە بکرێتەوە مەگەر ئەو گۆڕانکارییە بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو ڕوویدابێ، لەم حالەتەشدا دەبێ لە ماوەی نەپەڕی هەشت ڕۆژ لە ڕۆژی ڕوودانییەوە ڕابگەیەندرێت.

= گشت ئەو زانیارییانەی تیابێت کە لە ماددەی پێشوودا هاتوون، دەبێ بڕیاری ئەنجومەن بەرەتکردنەوەی مۆڵەتدان بەدەرکردنی ڕۆژنامە هۆیەکانی دیاربێت و تێپەڕبوونی ماوەی چل ڕۆژی ئاماژە بۆکراو بەبێ دەرچوونی بڕیار لەلایەن ئەنجومەنەوە نیشانەی لاری نەبوونە لەسەر دەرکردن. لە حالەتی دەرچوونی بڕیار بەرەتکردنەوەی دەرکردنی ڕۆژنامە لایەنی پەیوەندیدار بۆی هەیە لە ماوەی سی ڕۆژدا ▪ ڕۆژی ئاگادار کردنەوە بەرەقز، لەبەردەم دادگادا تانەی لێ بدات»

ئەگەر هاتوو نوێنەری یاسایی ڕۆژنامە سەرپێچی حوکمی ئەم ماددەیەی کرد بەبەندکردن بۆ ماوەیەک لە شەش مانگ زیاتر نەبێ لەگەڵ غەرامەیەک لە پێنج سەد جونەیهی میسری کەمتر نەبێ و لە هەزاریش زیاتر نەبێ یان بەیەکێک لەو دوو سزایانە سزا دەدرێت».

بەپێی ماددەی چل و هەشت لە یاسای ڕێکخستنی دەسەلاتی ڕۆژنامەگەری مۆڵەتی دەرکردنی ڕۆژنامە لە دوو حاڵەتدا بەحوکمی یاسا لەخۆیەوە هەڵدەوەشێتەوە:

حاڵەتی یەکەم: ئەگەر هاتوو ڕۆژنامەکە لە ماوەی سێ مانگی دوای مۆڵەتەکە دەرنەچوو.

حاڵەتی دووەم: ئەگەر هاتوو ڕۆژنامەکە لە ماوەی شەش مانگی دوای مۆڵەتەکە بەڕێکی دەرنەچوو.

شایەنی ئاماژەبۆکردنە، یاسادانەری میسری دوو گریمانەی یاسایی (قرينة قانونية) داناوە بۆ ناڕێکیی دەرچوونی ڕۆژنامە کە ئەمانەی خوارەوەن:

یەکەم: دەرچوونی ڕۆژنامە بەناڕێک دادەندرێت ئەگەر هاتوو نیوەی یان کەمتر لەو ژمارانە دەرچوو کە لە ماوەی شەش مانگدا چاوەڕوان دەکرا دەربچن.

دووەم: ئەگەر هاتوو لە ماوەی شەش مانگدا، ماوەی دەرنەچوونی ڕۆژنامەکە زیاتر بێ لە ماوەی دەرچوونی[171].

ئەمەو بڕیاری ئەنجوومەنی باڵای ڕۆژنامەگەری ناڕێکیەتی دەرچوونی ڕۆژنامە دەسەلمێنێ و ئاگاداری لایەنی پەیوەندیداریشی پێ دەکرێتەوە.

### ۲-۱-۲ سیستمی ئاگاداری لە یاسای چاپەمەنیی لوبناندا

یاسادانەری لوبنانی دەرکردن و بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامەگەری بەیاسای چاپەمەنیی ١٤ی ئەیلولی ١٩٦٢[172]ی هەموارکراو بەمەرسومی یاسایی ژمارە (١٠٤)ی ساڵی ١٩٧٧[173] و یاسای ژمارە (٨٩)ی ساڵی ١٩٩١[174] و یاسای ژمارە (٣٠٠)ی

---

١٧١- ئەمەش دەقەکەیەتی: «اذا لم تصدر الصحيفة خلال الشهور الثلاثة التالية للترخيص او اذا لم تصدر بانتظام خلال ستة اشهر، اعتبر الترخيص كان لم يكن، ويعد صدور الصحيفة غير منتظم اذا تحقق بغير عذر مقبول عدم اصدار نصف العدد المفروض صدوره خلال مدة الأشهر الستة، أو ان تكون مدة الاحتجاب خلال هذه المدة أطول من مدة توالي الصدور. ويكون اثبات عدم انتظام صدور الجريدة بقرار من المجلس الأعلى للصحافة، ويعلن القرار الى صاحب الشأن».

١٧٢- ئەم یاسایە لە ڕۆژنامەی ڕەسمی ژمارە (٣٨)ی ساڵی ١٩٦٢ بڵاوکراوەتەوە.

١٧٣- ئەم یاسایە لە ڕۆژنامەی ڕەسمی ژمارە (٢٠)ی ساڵی ١٩٧٧ بڵاوکراوەتەوە.

١٧٤- ئەم یاسایە لە ڕۆژنامەی ڕەسمی ژمارە (٣٧/٧)ی ساڵی ١٩٩١ بڵاوکراوەتەوە.

ساڵی ١٩٩٤[١٧٥] و یاسای ژمارە (٣٣٠)ی ساڵی ١٩٩٤[١٧٦] ڕێکخستووە.

لە دەقەکانی ئەم یاسایە بۆمان دەردەکەوێ کە یاسادانەری لوبنانی لەجیاتی ئاگاکاری کاری بەسیستمی مۆڵەتی پێشەکی کردووە، هەروەکو لە دەقی ماددە (٢٧)ی یاسای ناوبراودا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە تیایدا هاتووە: «دەرکردنی هەر چاپکراوێکی ڕۆژنامەگەری بەر لە وەرگرتنی مۆڵەتی پێشینە لە وەزیری ڕاگەیاندن دوای ڕاوێژکردنی سەندیکای ڕۆژنامەگەری بەهەموو شێوەیەک قەدەغەیە».

ئەوەی بیەوێ ڕۆژنامە دەربکات دەبێ داخوازییەک پێشکەش وەزیری ڕاگەیاندن بکات هەروەکو لە دەقی ماددە (٣٨)ی یاسای چاپەمەنیی ناوبراودا هاتووە کە ئەمەش دەقەکەیەتی: «ئەوەی ئارەزووی دەرکردنی چاپکراوێکی ڕۆژنامەگەری هەبێ دەبێ داخوازییەکی ئیمزاکراو بەئیمزای خۆی پێشکەشی وەزارەتی ڕاگەیاندن بکات...».

لە دەقی ئەم دوو ماددەیەدا بۆمان دەردەکەوێ کە یاسادانەری لوبنانی نەک هەر باوەڕی بەسیستمی ئاگاکاری نییە، بەڵکو زۆر بەڕاشکاوی و بەتوندی ڕێگەی لە هاووڵاتییان گرتووە بۆ دەرکردنی ڕۆژنامەگەری بەر لە وەرگرتنی مۆڵەتی پێشەکی لە وەزارەتی ڕاگەیاندن، بۆیە لە ماددەی بیست و حەوتدا دەرکردنی ڕۆژنامەی بەر لە وەرگرتنی مۆڵەتی وەزارەتی ڕاگەیاندن بەڕەهایی قەدەغە کردووە.

### ٣-١-٢ سیستمی ئاگاکاری لە یاسای ڕۆژنامەگەریی فەرەنسیدا[١٧٧]

یاسادانەری فەرەنسی ئازادیی ڕۆژنامەگەری وەک پرنسیپێکی گشتی ڕەها کردووە. هەروەکو لە ماددەی یەکەمدا بۆمان دەردەکەوێ کە دەقنووسی کردووە: «چاپەمەنی و بازرگانیکردن بەکتێب ئازادە»[١٧٨]. ئەمەو زۆر بەڕاشکاوی و بەڕوونی لە ماددەی پێنجەمدا سیستمی ئاگاکاری پەسند کردووە و جارێکی تر دووپاتی کردۆتەوە کە دەکرێ ڕۆژنامە یان هەر چاپکراوێکی دەوری بەبێ مۆڵەتی پێشەکی بڵاوبکرێتەوە ئەمەش

---

١٧٥ - ئەم یاسایە لە ڕۆژنامەی ڕەسمی ژمارە (١١)ی ساڵی ١٩٩٤ بڵاوکراوەتەوە.

١٧٦ - ئەم یاسایە لە ڕۆژنامەی ڕەسمی ژمارە (٢١)ی ساڵی ١٩٩٤ بڵاوکراوەتەوە.

١٧٧ - یاسادانەری فەرەنسی چاپ و بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامەگەری بەیاسای ڕۆژنامەگەریی ٢٩/٧/١٨٨١ هەمووارکراو ڕێکخستووە. بۆ دەقی ئەم یاسایە بڕوانە پاشکۆی ژمارە (١) لە کۆتایی ئەم تێزەدا.

١٧٨ - ئەمەش دەقەکەیەتی بەزمانی فەرەنسی: «L'imprimerie et la librairie sont libres».

دەقەکەیەتی: «هەموو ڕۆژنامەیەک یان چاپکراوێکی دەوری دەکرێت دوای ئەو ئاگادارکردنەوەیەی کە لە ماددەی حەوتەمدا هاتووە بەبێ مۆڵەتی پێشەکی و بەبێ دانانی بارمتەی کاش (تأمين نقدي) بڵاوبکرێتەوە»[١٧٩].

لە ماددەی حەوتەمدا داوای کردووە هەر کەسێک بیەوێ ڕۆژنامەیەک یان چاپکراوێکی دەوری دەربکات دەبێ بەر لە دەرکردنی ئاگاکارییەک بەنووسین و بەئیمزای بەڕێوەبەرەکەی پێشکەشی بریکاری داواکاری گشتی بکات و ئەم زانیاریانەی خوارەوەی تیابێت[١٨٠]:

١- ناونیشانی ڕۆژنامەکە یان چاپکراوە دەورییەکە و چۆنێتیی دەرکردنی.

٢- ناوی بەڕێوەبەری چاپەمەنییەکە و شوێنی دانیشتنی.

٣- ئەو چاپخانەیەی کە ڕۆژنامەکە یان چاپکراوە دەورییەکەی لێ چاپ دەکرێ.

جا ئەگەر هاتوو هەر گۆڕانکارییەک بەسەر ئەو زانیاریانەی سەرەوەدا هات، دەبێ لە ماوەی ئەوپەڕی پێنج ڕۆژ لە ڕۆژی ڕوودانی گۆڕانکارییەکە ئاگاداری داواکاری گشتی بکرێتەوە، ئەگینا سەرپێچیکەر بەغەرامە سزا دەدرێ و دەشبێ ڕۆژنامەکە یان چاپکراوە خولەکییەکە لە دەرچوون بوەستێ[١٨١].

شایەنی ئاماژەبۆکردنە، یاسادانەری فەرەنسی، جیاوازی لە نێوان ڕۆژنامەگەریی نیشتمانی و ڕۆژنامەگەریی بێگانەدا کردووە. بۆیە دەبینین ئەو ئازادی و ئاسانکاریانەی

---

١٧٩- ئەمەش دەقەکەیەتی بەزمانی فەرەنسی:

Tout journal ou écrit périodique peut être publié, sans autorisation préalable et sans dépôt de cautionnement, après la déclaration prescrite par l'article 7.

١٨٠- ئەمەش دەقەکەیەتی بەزمانی فەرەنسی:

Modifié par Loi 86-897 1er Aout 1986 art 14 JORF 2 août 1986.

Avant la publication de tout journal ou écrit périodique, il sera fait au parquet du procureur de la République, une déclaration contenant :

1- Le titre du journal ou écrit périodique et son mode de publication ;

2- Le nom et la demeure du directeur de la publication et, dans le cas prévu au troisième alinéa de l'article 6, du codirecteur de la publication ;

3- L'indication de l'imprimerie où il doit être imprimé.

Toute mutation dans les conditions ci-dessus énumérées sera déclarée dans les. cinq jours qui suivront

١٨١- ماددەی (٩) لە یاسای فەرەنسی.

کە بەخشیوەتی بەڕۆژنامەگەریی نیشتمانی نەی بەخشیوە بەڕۆژنامەگەریی بیانی. بۆیە لە ماددەی چواردەمدا مەرجی وەرگرتنی مۆڵەتی پێشەکی داناوە بۆ دەرکردن و بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامەی بیانی کە بەزمانی بیانی لە فەرەنسا دەردەچێ.

ئاشکرایە هۆی ئەم جیاوازییەش دەگەڕێتەوە بۆ بایەخدانی یاسادانەری فەرەنسی بەسیستەمی گشتی و ئاسایشی وڵاتی فەرەنسا و پاراستنی لە ئەگەری هەڕەشەی ڕۆژنامەگەریی بیانییەوە.

ئەوەی تێبینی دەکرێت، یاسادانەری فەرەنسی ئەرکی وەرگرتن و تەماشاکردنی ئاگاکاری خستۆتە ئەستۆی بریکاری داواکاری گشتی کە بەشێکە لە دەسەڵاتی دادگەری بۆ ئەوەی ڕۆژنامەگەری لە فشار و دەسەڵاتی حکومەت بپارێزێ و ئەوپەڕی ئازادی بۆ دەستەبەر بکات. بەمەش ڕۆژنامەگەری پاراستووە لە ئەگەری ئەو گرفتانەی کە ئیدارە بۆی دەنێتەوە لە کاتی پەسەندکردنی یان بەناحەق پەسەندنەکردنی ئاگاکارییەکە. ئەمەو داواکاریی گشتی خۆی دەسەڵاتی تایبەتمەندە بەسەیرکردنی داوا (دعوى) ئەگەر هاتوو ئاگاکارییەکە نادروست بوو یان ئەو زانیاریانەی کە یاسا داوای کردوون لەخۆی نەگرتبێ.

کەواتە، لێرەدا دەردەکەوێ کە یاسادانەری فەرەنسی پەیڕەوی سیستەمی ئاگاکاری ڕەهای کردووە بەمەبەستی بەرجەستەکردن و دابینکردنی ئازادییەکی تەواوی ڕۆژنامەگەری. بێجگە لە حاڵەتی بڵاوکردنەوەی بیانی.

### ٣-١-٤ سیستەمی ئاگاکاری لە یاسای چاپەمەنیی عیراقیدا

چاپ و بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامەگەری لە عێراقدا بەیاسای چاپەمەنی ژمارە (٢٠٦)ی ساڵی ١٩٦٨[١٨٢]ی هەموارکراو بەیاسای ژمارە (١٩٩)ی ساڵی ١٩٧٠[١٨٣]، و یاسای ژمارە (١١٣)ای ساڵی ١٩٧١[١٨٤]، و یاسای ژمارە (١٦٤)ی ساڵی ١٩٧٧ ڕێکخراوە.

لە دەقی ماددە (٤) بڕگەی (أ)ی یاسای چاپەمەنی ژمارە (٢٠٦)ی ساڵی ١٩٦٨دا هاتووە: «داواکاری مۆڵەت بەم زانیارییانەی خوارەوە پێشکەش بەوەزارەت دەکرێت...»

---

١٨٢- ئەم یاسایە لە ڕۆژنامەی «الوقائع العراقية» ژمارە (١٦٧٧)ی ١٩٦٩/١/١٥ بڵاوکراوەتەوە.

١٨٣- ئەم یاسایە لە ڕۆژنامەی «الوقائع العراقية» ژمارە (١٩٣٣)ی ساڵی ١٩٧٠ بڵاوکراوەتەوە.

١٨٤- ئەم یاسایە لە ڕۆژنامەی «الوقائع العراقية» ژمارە (٢٠٢٥)ی ساڵی ١٩٧١ بڵاوکراوەتەوە.

هەروەها لە ماددە ٧ دەقنووسی کردووە: «١- وەزیر بۆی هەیە لە ماوەی یەک مانگ لە ڕۆژی تۆمارکردنییەوە مۆڵەتی چاپراوەکە بدات یان داواکارییەکە ڕەت بکاتەوە».

لەبەر ڕۆشنایی ئەم دەقە یاساییانەی سەرەوە بۆمان دەردەکەوێ کە یاسادانەری عێراقی لە جیاتی سیستمی ئاگاکاری کاری بەسیستمی مۆڵەتی پێشەکی کردووە و دەسەڵاتیشی داوەتە وەزیری ڕاگەیاندن بۆ ڕەتکردنەوەی هەر داوایەک ئەگەر مەرجەکانی ئەم یاسایەی تێدا نەبوو.

هەرچەندە، لە بڕگەی (ج)ی ماددەی (٧)دا ڕێگای داوە بەو کەسەی کە داوایەکەی لەلایەن وەزیری ڕاگەیاندنەوە ڕەت دەکرێتەوە، لە ماوەی پانزە ڕۆژ لە ڕۆژی ئاگادارکردنەوەیدا، لەبەردەم ئەنجوومەنی وەزیران، تانە لە بڕیاری وەزیر بدات[١٨٥].
بەڵام، ئەم حوکمە ئەوە ناگەیەنێ کە یاسادانەر، ئازادیی ڕۆژنامەگەری بۆ هاووڵاتییان زامن کردبێت، چونکە لەلایەکەوە بڕیاری ئەنجوومەنی وەزیرانی بەبنبڕ داناوە و لەلایەکی تریشەوە، لە بڕگەی (ب)ی ماددەی (٣٠)دا ڕێگای لە دادگا گرتووە بۆ تەماشاکردنی ئەو داواکارییانەی کە تایبەتن بەو ئیجرائات و سزا ئیدارییانەی بەپێی یاسای چاپەمەنی وەردەگیرێن دژی وەزارەت و دامودەزگاکانی، بۆ دادگا بەرز دەکرێتەوە[١٨٦].

حوکمەکانی یاسای عێراقی، لەم بارەیەوە، لەگەڵ پرینسیپەکانی مافی مرۆڤ و دیموکراسییەت زۆرگونجاو نییە، چونکە مافی ئازادی لە پێشەوەی مافەکانە و ئازادیی بیروڕادەربڕینیش یەکێکە لەو ئازادییانە کە ئازادیی ڕۆژنامەگەری دیاردەیەکە لە دیاردەکانی و دانانی مەرج لەبەردەمیدا دەست بەسەراگرتنیەتی لە بنەڕەتدا[١٨٧]، ئەمەش پێچەوانەی پرینسیپەکانی جاڕی گەردوونیی مافی مرۆڤ و بەڵێننامەی نێودەوڵەتییە بۆ مافە شارستانیێتی و ڕامیارییەکان کە بەشێکن لە یاسای نێودەوڵەتی مرۆڤانە و سیفەتی سەپاوەیان هەیە و دەبێ یاسای ناوخۆی وڵاتان لەگەڵیان ناکۆک نەبن.

---

١٨٥- ئەمەش دەقەکەیەتی: «یحق لمن رفض طلبه وفق الفقرة (أ) من هذه المادة الاعتراض على قرار الوزیر لدى مجلس الوزراء خلال خمسة عشر یوما من تأریخ تبلغه ویکون قرار المجلس نهائیا».

١٨٦- ئەمەش دەقەکەیەتی: «لاتسمع الدعاوي امام المحاکم بخصوص الاجراءات والعقوبات الاداریة المتخذة وفقا لاحکام هذا القانون».

١٨٧- کەمال سەعدی: یاسای چاپەمەنیی کوردستان و چەند سەرنجێک، گۆڤاری «پارێزەر» ژمارە (٢)ی ساڵی یەکەم ٢٠٠١ی زایینی ل٦١-٦٢، و کەمال سەعدی: ڕۆژنامەگەری و یاسا، گۆڤاری «ڕۆژنامەڤانی»ژمارە (٦-٧)ی ساڵی دووەم(پایز-زستان)ی ساڵی ٢٠٠١-٢٠٠٢ی زایینی ل ٨.

یاسازانەکان. ئیمچە کۆکن لەسەر سەپاوێتی پرنسیپەکانی جاڕی گەردوونیی مافی مرۆڤ لەسەر ئاستی جیهانی و نیشتمانیدا دوای ئەوەی ئەو پرنسیپانەیان بەبەشێک لە یاسای گشتیی نێودەوڵەتی دانا[188]. هەروەها بەڵێننامەی نێودەوڵەتی بۆ مافە شارستانی و رامیارییەکان لە ٢٣ی ئاداری ١٩٧٦ بەرکاربووە هەروەکو لە مادەی (٤٩)ی ئەم بەڵێننامەیەدا هاتووەو عێراقیش بەپێی یاسای ژمارە(١٩٣)ی ساڵی ١٩٧٠ کە لە رۆژنامەی (الوقائع العراقیة) ژمارە (١٩٢٧) لە ٧/ ١٠/ ١٩٧٠ بڵاوکراوەتەوە و پەسەندی کردووە. بەم پێیە، بنچینەکانی ئەم بەڵێننامەیە باڵاترن لە بنچینە یاساییەکانی ناوخۆو نابێ لەگەڵی ناکۆک بن.

ئاشکرایە، عێراق یەکێکە لەو دەوڵەتانەی کە ئازادیی رۆژنامەگەری تێدا نییەو کەناڵەکانی پەخشی ئێستگەیی و تەلەفزیۆنیی حکومین و رۆژنامە و چاپکراوە دەورییەکانیش یان حکومین یان سەر بەحزبی دەسەڵاتن. تەنانەت دەسەڵاتە گشتییەکانیش بەتەواوەتی لێک جیانەکراونەتەوە و هەر سێ دەسەڵات - یاسادانان، جێبەجێکردن، دادوەری - بەشێوەیەک لە شێوەکان لەژێر هەژموون (هیمنة)ی ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش دانە کە سەرۆکی عێراقی خۆی سەرۆکایەتی دەکات. بۆیە رەوت (اتجاه)ی یاسادانەری عێراقی لەم رووەوە سەیر نییە.

### ٣-١-٥ پرۆژەی یاسای ئازادیی رۆژنامەگەریی یەکێتیی رۆژنامەنووسانی عەرەبی و سیستمی ئاگاداری

بەپێی مادەی پێنجەمی پرۆژەی یاسای ئازادیی رۆژنامەگەریی یەکێتیی رۆژنامەنووسانی عەرەبی هەر کەسێک بیەوێ رۆژنامەیەک دەربکات، دەبێ بەئاگاکارییەکی نووسراو ئاگاداری ئیدارە بکاتەوەو ئیدارەش لە ماوەی سی رۆژ لە رۆژی وەرگرتنیدا دەبێ رەزامەندی خۆی لەسەر ئەم ئاگاکارییە بنوێنێ یان تانەی لێبدات و دەبێ لە کاتی تانە لێداندا بەنووسین ئاگاداری خاوەنی ئاگاکارییەکە بکرێتەوە لەو حاڵەتەشدا خاوەنی ئاگاکارییە تانە لێدراوەکە بۆی هەیە لە ماوەی سی رۆژ لە رۆژی ئاگادارکردنەوەیدا لەبەردەم دادگای تایبەتمەند تانە لەو بڕیارەی ئیدارە بدات. ئەمەو لە ئاکامی تانە لێدان و بەرزکردنەوەی داوا (دعوی) بۆ دادگا، رۆژنامەکە لە دەرچوون ناوەستێ مەگەر بڕیارێکی

---

188- بۆ زانیاریی زیاتر لەم بارەیەوە بڕوانە:

The status of the Uneversal Declaration of Human Rights in national and Inter-
VOL 25 . 1996 p 289 . 1 . COMP . & national law Hurst Hamun GA. JINT.

یەکلاکەرەوەی دادگای پێدەرچووبێ. ئەمەش دەقەکەیەتی: «ئەوەی ئارەزووی دەرکردنی ڕۆژنامەیەک بکات دەبێ ئاگاداری لایەنی کارگێری بەئاگاکارییەکی نووسراو بکاتەوە و دەبێ لایەنی کارگێری وەڵامی ئاگاکارییەکە بەرەزامەندی بوون یان ئانە لێدان لە ماوەی سی ڕۆژ لە مێژووی وەرگرتنیەوە بداتەوە ئەگەرنا بەرەزامەند دادەنرێ و لە حاڵەتی لاریی (اعتراض) لایەنی کارگێری دەبێ بەنووسین ئاگاداری خاوەن ئاگاکارییەکە لەوە بکرێتەوە هەروەها داوایەک بۆ پشتگیریکردنی لاری بوونەکە لەسەر دەرچوونی ڕۆژنامەکە بۆ دادگای تایبەتمەند لە ماوەیەک، کە سی ڕۆژ ڕەت نەکات لە ڕۆژی ئاگادارکردنەوەی خاوەن ئاگاکارییەکەوە، بەرز بکرێتەوە.

لارییبوونەکە یان بەرزکردنەوەی داوایەکە نابێتە هۆی ڕاگرتنی دەرچواندنی ڕۆژنامەکە تاکو بڕیارێکی دادگایی یەکلاکەرەوەی بۆ دەرنەچێ.

بەلائیحەیەکی جێبەجێکردنی ئەم یاسایە مەرج و بارەکانی ئاگاکارییەکە دیاردەکرێ» (189).

### ٣-١-٦ سیستمی ئاگاکاری لە یاسای چاپەمەنیی هەرێمی کوردستانی عێراقدا:

یاسادانەری کوردستانی، دەرکردن و بلاوکردنەوەی ڕۆژنامەکەری بەیاسای چاپەمەنی ژمارە (١٠)ی ساڵی ١٩٩٣ ڕێکخستووە (190).

لە دەقەکانی ئەم یاسایە بۆمان دەردەکەوێ کە یاسادانەری کوردستانی کاری بەسیستمی ئاگاکاری نەکردووە، بەڵکو لە جیاتی ئەوە کاری بەسیستمی مۆڵەتی پێشەکی (الترخیص سابقة) کردووە، ئەمەشمان لە دەقی مادده (٥) برگەی (١) بۆ دەردەکەوێ کە تیایدا هاتووە: «هەر هاووڵاتییەکی عێراقی نیشتەجێی هەرێم کە بیەوێ چاپکراوێکی دەوری دەربکا دەبێ داخوازییەک پێشکەش بەوەزیری ڕۆشنبیری بکا...».

ئەمەو، ئەو داخوازییەی کە بەپێی حوکمی ئەم ماددەیە، پێشکەشی وەزارەتی ڕۆشنبیری دەکرێ بەئاگاکاری دانانرێ، چونکە مەبەستی خاوەنەکەی ئاگادارکردنەوەی ئیدارە نییە بەدەرکردن و بلاوکردنەوەی ڕۆژنامە، بەڵکو مەبەستی وەرگرتنی مۆڵەتە بۆ دەرکردن و

189- http://www.ahram.org.eg/faj/act/10c.htmtophttp23/9/2001

١٩٠- ئەم یاسایە لە ڕۆژنامەی پەرلەمان ژمارە (١١) ڕۆژی ١٩٩٣/٥/٢٩ بلاوکراوەتەوە و بەیاسای ژمارە (٨)ی ساڵی ٢٠٠٢ هەموارکراوە و لە ڕۆژنامەی وەقایعی کوردستان ژمارە (٣٠)ی ٢٠٠٢/٥/٢٨ بلاوکراوەتەوە.

بلاوكردنەوەی، كەچی خاوەن ناگاكاری لە پێشكەشكردنی ناگاكارییەكەدا بۆ ئیدارە مەبەستی وەرگرتنی مۆڵەت نییە، بەڵكو مەبەستی ئاگاداركردنەوەیەتی بەدەركردن و بلاوكردنەوەی رۆژنامە بەپێی ئەو مافەی كە یاسا بۆی دەستەبەر كردووە.

ماددەی ناوبراو لەگەڵ ناوەرۆكی بەیاننامەی راگەیاندنی یەكێتیی فیدرالی[191] و هۆیەكانی دەرچواندنی یاسای ئەنجوومەنی نیشتمانیی كوردستانی عێراق ژمارە ١ی ساڵی ١٩٩٢ و بڕیاری سەركردایەتیی سیاسیی بەرەی كوردستانی كە لە ٨/٤/١٩٩٢ دەریكردووە و بۆتە بەشێك لە هۆیەكانی دەرچواندنی ئەو یاسایە، زۆر گونجاو نییە[192].

بۆیە پێشنیار دەكەین، ئەم دەقە هەموار بكرێ و لە جیاتی مۆڵەتی پێشەكی بۆ دەركردن و بلاوكردنەوەی رۆژنامەی نیشتمانی كار بەسیستمی ناگاكاری رەها بكرێت، بەڵام سەبارەت بەرۆژنامەی بیانی كار بەپرەنسیپی مامەڵەی هاوچەشن (المعاملة بالمثل) بكرێت لەگەڵ بوونی ئەو مەرجانەی كە بەپێی یاسای وڵاتەكەی پێویستن.

---

١٩١- بڕوانە دەقی بەیاننامەی راگەیاندنی یەكێتیی فیدرالی كە لەلایەن دەستەی سەرۆكایەتی ئەنجوومەنی نیشتمانیی كوردستانی عێراقەوە لە رۆژی ٤/١٠/١٩٩٢ پێشكەش كراوە و بۆتە پاڵپشتێكی یاسایی بۆ بڕیاری ئەنجوومەنی نیشتمانیی كوردستان ژمارە (٢٢) لە ٤/١٠/١٩٩٢ سەبارەت بەدەستنیشانكردنی پەیوەندیی یاسایی لەگەڵ دەسەڵاتی ناوەندی لەسەر بنچینەی یەكێتیی فیدرالی لە چوارچێوەی عێراقێكی دیموكراتیی پەرلەمانی فرەحزبیدا.

١٩٢- ئەمەش دەقەكەیەتی: «بەرەی كوردستانی بەو ناوەی كە دەسەڵاتی ئەمری واقیعە، بڕیارێدا كە لەرووی ئەم تاقیكردنەوە سەخت و گرانەدا بوەستێ كە حكومەتی عێراق خستوویەتیە پێشێ و بڕیارێشیدا كە بەكیانێكی سەردەمیی نوێ و هەروەها بەگۆڕینی ئەم كاروبارانە بۆ ئەم واقیعەی كە كوردستان تێیدا دەژێت. بەهاوبەشتنی یەكەم هەنگاو لە كاروانی گەیشتنی ئەم میللەتە بەكاروباری جیهانیی شارستانیی پێشكەوتوو بۆ دامەزراندنی بنیاتی كۆمەڵگای كوردستانی لەسەر بنچینەی دیموكراتییەت و رێزگرتن لە ماف و ئازادیی مرۆڤ بەپێی ئەو پەیمان و داب و دەستوورانەی كە دەوڵەتان بڕیاریان لەسەر داوە. تاكو بۆ هەموو جیهانی بسەلمێنێ كە گەلی كوردستانی عێراق لە توانای دا هەیە بەپێی ئەو بنچینانەی كە ئەمڕۆكە دنیا دانی پێدا ناوە، بەڕێوەی ببات». بڕوانە كۆی یاساو بڕیارەكانی ئەنجوومەنی نیشتمانیی كوردستانی عێراق لە ٤/٦/١٩٩٢ تا ٣١/١٢/١٩٩٢، بەرگی یەكەم، چاپی یەكەم، ١٩٩٧، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری- هەولێر، ل١٢٩.

### ٧-١-٢ هەڵسەنگاندنی سیستەمی ئاگاکاری:

لە لێکۆڵینەوەی سیستەمی ئاگاکاریدا بۆمان بەدیار دەکەوێ کە مەبەست لە پێشکەشکردنی ئاگاکاری، سنووردارکردنی ئازادیی ڕۆژنامەگەری نییە بەڵکو دیارکردن و دەستنیشانکردنی ئەو کەسەیە کە بەرپرسێتیی یاسایی دەکەوێتە ئەستۆ لەکاتی ڕودانی سەرپێچییەکانی یان تاوانەکانی بڵاوکردنەوە کە لە ڕێگای ڕۆژنامە و چاپەمەنییەکەی ڕوودەدەن.

هەرچەندە، یاسای دەوڵەتان لەم ڕووەوە یەک ئاست نین، هەندێکیان لە هەندێکیان زیاتر لە مەبەستە سەرەکییەکەی ئەم سیستەمە لایانداوە و لە ناوەڕۆک و گیانەکەی دایان ماڵیوە و کردوویانەتە هۆکارێک بۆ چەواشەکردن و دانانی کۆت و بەند لەبەردەم ئازادیی ڕۆژنامەگەریداو لە ڕێگای دانانی کۆمەڵێک مەرجی قورسەوە تەگەرە دەخەنە پێشەی ڕۆژنامەگەری و ئازادیی ڕۆژنامەگەریش سنووردار دەکەن. هەروەکو لە یاساکانی سەرەوە بۆ لە یاسای فەرەنسی ئەمەمان بۆ دەرکەوت.

لە کۆتاییدا، دەتوانین بڵێین، ئەم سیستەمە لە سیستەمی مۆڵەت وەرگرتنی پێشەکی باشترەو لەگەڵ گیانی سەردەم و ئەو پێشکەوتنە یەک لە دوایەکانەی جیهان کە لە هەزارەی سێیەمدا لە گشت بوارە جیاجیاکانی ژیان بەخۆیەوە بینیوە، بەتایبەتی لە بوارەکانی گواستنەوە و گەیاندنی زانیارییەکان و بەجیهانیکردنی ڕاگەیاندن لە میانی تۆڕی ئینتەرنێت و پرنسیپەکانی مافی مرۆڤ و دیموکراسییەت دەگونجێ. بۆیە پێشنیار دەکەین، یاسادانەری کوردستانی سوود لە ئەزموونی فەرەنسی و ئەمەریکی وەربگرێت و کار بەم سیستەمە بکات بۆ ڕزگارکردنی ڕۆژنامەگەری لە فشار و دەسەڵاتی حکوومەت.

بەڵام بۆ ئەوەی ڕۆژنامەگەری ببێتە دەسەڵاتێکی ئازاد و سەربەخۆ لە هەرێمی کوردستاندا، هەر ئەوەندە بەس نییە، بەڵکو پێویستە ئەنجوومەنێکی باڵای ڕۆژنامەگەری لە ڕێگای هەڵبژاردنێکی پاک و ئازاد لە ڕۆژنامەنووسان پێک بێت بۆ سەرپەرشتیکردنی کاروبارەکانی ڕۆژنامەگەری و ئەو ئەنجوومەنە تایبەتمەند بێت بەوەرگرتن و تەماشاکردنی ئەو ئاگاکارییە نەوەک نێدارە، هەروەکو لە یاساکانی میسری و لوبنانیدا هاتووە، یان داواکاری گشتی هەروەکو لە یاسای فەرەنسیدا هاتووە، بەمەش ڕۆژنامەگەری دەبێتە دەسەڵاتێکی جەماوەری و گوزارشت لە ویست و ئارەزوویان دەکات و لەتەک سێ دەسەڵاتەکەی تر - یاسادانان، جێبەجێکردن، دادگەری - بەشداری لە دەسەڵاتی وڵات دەکات و دەبێتە دەسەڵاتی چوارەم.

## ٣-٢ مۆڵەت و مەرجەکانی

سیستەمی مۆڵەت بریتییە لە ڕێگادانی ئیدارە بەکەسێک یان چەند کەسانێکی دیاریکراو بۆ دەرکردن و بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامە و چاپەمەنیی دەوری ئەگەر مەرجە یاساییەکانی تێدا بوو یان ڕەفزکردنی بەگوێرەی بەرژەوەندی خۆی[١٩٣].

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە مۆڵەت بەشێکی بنەڕەتییە لە سیستەمی خۆپارێزی (النظام الوقائي) کە دەوڵەت بۆ ڕێگاگرتن لەو زیانانەی ئەگەری ڕوودانیان لێ دەکرێ کە لە ڕێگای ڕۆژنامەگەرییەوە لە کۆمەڵ دەکەوێ پەنای دەباتەبەر. بەم پێیە ئەو کەسەی ئارەزووی دەرکردنی ڕۆژنامە یان چاپکراوی دەوری هەیە دەبێ چەند کردارێک ئەنجام بدات و ڕەچاوی ئەو مەرج و زانیارییانە بکات کە ئیدارە لە یاسای چاپەمەنی و ڕۆژنامەگەریدا خستوویەتییە ئەستۆی. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە مۆڵەتی پێشەکی لە ڕووی ئەو مەبەستەی کە ئیدارە بۆی تێدەکۆشێ بەچاودێریی پێشەکی (الرقابة السابقة) دەچێ، هەرچەندە سانسۆر و مۆڵەت دوو شتی لێک جیاوازن. لە بەخشینی مۆڵەتدا، ئەو کەسەی کە دەیەوێ ڕۆژنامە یان چاپکراوی دەوری دەربکات جێگای مەبەستە، کەچی لە خستنە ژێر سانسۆر ڕۆژنامەکە یان چاپکراوە دەورییەکە جێی مەبەستە.

کەوابوو لە حاڵەتی یەکەمدا، سانسۆرەکە لەسەر خاوەنی ڕۆژنامەکەیە، بەڵام لە حاڵەتی دووەمدا، سانسۆرەکە لەسەر ڕۆژنامەکە و ئەو بابەتانەیە کەتیایدا بڵاودەکرێتەوە. ئەمەش خۆی لە خۆیدا ئەوە دەگەیەنێ کە مۆڵەت بۆ دەرکردن و بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامە و چاپەمەنیی دەوری یەکجار دەبەخشرێت و پێویستە بۆ بوونی، بەڵام چاودێری بەشێوەیەکی بەردەوام دەخرێتە سەر ڕۆژنامە و ئەو بابەتانەی کە تیایدا بڵاو دەکرێتەوە، بۆیە بۆ گشت ژمارە و بابەتەکانی ڕۆژنامە و چاپەمەنییە دەورییەکە پێویستە[١٩٤].

لە خوارەوە بەدرێژی لە مەرج و زانیارییەکانی مۆڵەت و ئەو ئاکامانەی لێی دەکەوێتەوە دەکۆڵینەوە لە میانی بەراوردکردنی حوکمەکانی ئەو سیستەمە لە یاسای چاپەمەنیی هەرێمی کوردستان و یاساکانی چاپەمەنی و ڕۆژنامەگەریی میسری و لوبنانی و فەرەنسیدا، بەم شێوەیەی خوارەوە:

---

١٩٣- د. عبدالله اسماعيل البستاني: حرية الصحافة، سەرچاوەی پێشوو، ل١٢٦، ومیثم حنظل شريف: التنظيم الدستوري والقانوني لحرية الصحافة في العراق، سەرچاوەی پێشوو، ل٥٨.

١٩٤- د. عبدالله اسماعيل البستاني: حرية الصحافة، سەرچاوەی پێشوو، ل١٢٦.

### ٣-٢-١ سیستمی مۆڵەت لە یاسای چاپەمەنیی هەرێمی کوردستان

یاسای چاپەمەنیی هەرێمی کوردستان ژمارە (١٠)ی ساڵی ١٩٩٣ کاری بەسیستمی مۆڵەتی پێشینە کردووە بۆ دەرکردن و بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامە و چاپکراوی دەوری هەروەکو لە ماددەی پێنجەمیدا هاتووە:

«هەر هاووڵاتییەکی عێراقی نیشتەجێی هەرێم کە بیەوێ چاپکراوێکی دەوری دەربکا دەبێ داخوازییەک پێشکەش بەوەزیری ڕۆشنبیری بکات...».

هەروەها بۆ جیاکردنەوەی چاپکراوی دەوری لە چاپکراوی نادەوریدا، لە برگەی چوارەمی ماددەی یەکەمدا پێناسەی چاپکراوی دەوری کردووە و دەڵێ: «چاپکراوی دەوری هەر چاپکراوێکە کە بەردەوام بەژمارەی زنجیرەیی و لە کاتێکی دیاریکراودا دەربچێ وەک، ڕۆژنامە و گۆڤار و بڵاوکراوە و هەرچییەکی لەم بابەتە بێ».

ئەگەر سەرنجی دەقی ئەم دوو ماددەیە بدەین، دەبینین، لە دەقی دووەمیدا یاسادانەری کوردستان، لە پێناسەکردنی چاپکراوی دەوریدا سەرکەوتوو نەبووە، چونکە ئەو ماوەیەی دیارنەکردووە کە دەبێ چاپکراوی دەوری تیایدا دەربچێت تاکو بەچاپکراوی دەوری ناوزەد بکرێت، بەڵکو لە جیاتی ئەوە ئیکتیفای بەدەستەواژەی (بەردەوام بەژمارەی زنجیرەیی و لە کاتێکی دیاریکراودا دەربچێت) کردووە، لەکاتێکدا هەندێک چاپکراو هەن کەسانێک بەبەردەوامی و بەژمارەی زنجیرەیی دەری دەکەن بێ ئەوەی پێی بگوترێ چاپکراوی دەوری وەکو ئەو کتێبانەی کە بەزنجیرە دەردەچن، یا ئەو بڵاوکراوە هونەری و تەکنەلۆژی و پیشەییانەی کەوا کۆمەڵە و ڕێکخراوە پیشەییەکان دەریان دەکەن. بۆیە پێشنیار دەکەین، یاسادانەری کوردستان چاوێکی تر بەم پێناسەیەدا بخشێنێتەوەو بەم شێوەیەی خوارەوە دووبارە دایبڕێژێتەوە: «چاپکراوی دەوری بەپێی ئەم یاسایە، هەموو ڕۆژنامەیەک یان گۆڤارێک یان بڵاوکراوەیەکی هەواڵ دەگرێتەوە کە بەرێکوپێکی و بەژمارەی زنجیرەیی و بەبڕی یەک ژمارە لە هەر سێ مانگ جارێک بەلانی کەمییەوە دەربچێت دەگرێتەوە، بەمەرجێک نابێ ئەو چاپکراوەیە خەسڵەتێکی زانستی یان هونەری یان تەکنەلۆژی یان پیشەیی ئەکادیمی هەبێت». هەروەها دەقی ماددەی پێنجەم، ڕێرای ئەوەی کە کۆسپە لەبەردەم ئازادیی ڕۆژنامەگەری، لە هەمان کاتدا لەگەڵ حوکمی ماددە (١٣)[١٩٥]

---

١٩٥- ئەمەش دەقی ماددە (١٣)ی یاسای چاپەمەنیی کوردستانە: «هیچ کۆسپێک لەسەر هاتنی چاپکراو بۆ ناو هەرێم و بردنی بۆ دەرەوەی نییە...».

ناگونجێ کە دانانی کۆتی لەسەر هێنان و بردنی چاپەمەنی بۆ ناوە و دەرەوەی هەرێمی کوردستان قەدەغە کردووە. چونکە بەپێی حوکمی ئەم ماددەیە، هەر کەسێک ئەگەر لە دەرەوەی هەرێمی کوردستان بەپێی یاسای ئەو وڵاتەی تیایەتی ڕۆژنامە دەربکات، ئازادە لە هێنانی ئەو ڕۆژنامەیە بۆ ناو هەرێمی کوردستان.

ئەمەش مانای ئەوەیە، ئەو کەسەی کە ناتوانێ لەبەر هەر هۆیەک بێت، مۆڵەتی دەرکردنی ڕۆژنامە لە هەرێمی کوردستان وەربگرێت، دەتوانێ لەو وڵاتانەی کە لەجیاتی مۆڵەتی پێشەکی کار بەسیستمی ئاگاکاری دەکەن، ڕۆژنامە دەربکات و ئینجا بیهێنێتەوە هەرێمی کوردستان، یاخود دووبارە لە کوردستان چاپی بکاتەوە. لەو حاڵەتەشدا یاسادانەوی کوردستان ئەو ئامانجە ناپێکێ کە لە ماددە ( ٥ )دا بۆی تێکۆشاوە[١٩٦].

## ٢-٢-٢ سیستمی مۆڵەت لە یاسای ڕۆژنامەگەری فەرەنسیدا

یاسادانەری فەرەنسی لە یاسای ڕۆژنامەگەری ساڵی ١٨٨١ی هەمووارکراویدا جیاوازی لە نێوان هاووڵاتییان و بیانییان کردووە بۆ دەرکردن و بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامە. بەپێی حوکمی ماددەی پێنجەم[١٩٧] و شەشەمی[١٩٨] یاسای ناوبراودا، دەکرێ هاووڵاتییان هەر

---

١٩٦ - لەبەر ئەوەی ئەو مەرجانەی کە لە یاسای دەسەڵاتی ڕۆژنامەگەریی میسریدا هاتووە و لەبەر ئاسانیی مەرجەکانی دەرهێنانی ڕۆژنامە لە یاسای قوبرسیدا، زۆر لە هاووڵاتییانی میسری ڕوویان کردۆتە قوبرس و بەپێی یاسای ئەو وڵاتە ڕۆژنامەکانیان دەردەکەن. ئەو ڕۆژنامانەش بەڕۆژنامەی قوبرسی ناویان دەرکردووە، تەنانەت هەندێکیشیان لەبەر هەرزانیی کرێ و پێداویستییەکانی چاپەمەنی لە میسر دووبارە چاپ دەکرێنەوەو دەسەڵاتدارانی میسریش ناتوانن بیانخەنە بەر لێپرسینەوەی یاساییەوە، چونکە ئەوان یاسای وڵاتەکەی خۆیان پێشێل نەکردووە، بەڵکو سوودیان لەو کەلێنە وەرگرتووە کە لە هەردوو یاسای میسری و قوبرسیدا هەیە بڕوانە: ( النبأ ) تکشف عن ظاهرة «الصحف القبرصية» http : www .al mashrek .org ٢٠٠١/٧/٢٢.

١٩٧ - ئەمەش دەقەکەیەتی بەزمانی فەرەنسی:

" Tout journal ou écrit périodique peut être publié, sans autorisation préalable et sans dépôt de cautionnement, après la déclaration prescrite par l'article 7."

واتە: «دەکرێ، بەپێی ئەو مەرجانەی کە لە ماددەی (٧)دا هاتوون، هەر ڕۆژنامەیەک یان چاپکراوێکی دەوری بەبێ وەرگرتنی مۆڵەتی پێشەکی دەربکرێ».

١٩٨ - بۆ دەقی ئەم ماددەیە، بڕوانە بڕگەی (٥-٢-٢-١) بەناونیشانی «سیستمەکانی بەرپرسیارێتی تاوانکاری لە تاوانەکانی ڕۆژنامەگەریدا» . پەراوێزی (٦٥١) لەم تێزەدا.

ڕۆژنامەیەک یان چاپەمەنییەکی دەوری بەبێ مۆڵەت دەربکەن. بەڵام بۆ دەرکردن و بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامەی بیانی کە بەزمانی بیانی لە فەرەنسادا دەردەچن، بەپێی حوکمی ماددەی چواردەهەمی یاسای ناوبراو دەبێ مۆڵەتی پێشەکی وەربگیرێت.

بێ گومان مەبەستی یاسادانەری فەرەنسی، لەم جیاوازییەدا، پەرۆشییە بۆ پاراستنی نیزامی گشتی و ئاسایشی وڵات هەروەکو لە خاڵی پێشوودا ئاماژەمان پێی کرد.

کەچی یاسادانەری کوردستانی، بەپێچەوانەی یاسادانەری فەرەنسی، نەک هەر جیاوازیی نەکردووە بۆ دەرکردن و بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامە و چاپەمەنیی دەوری، لە نێوان هاووڵاتییان و بیانییان، بەڵکو ئەوپەڕی ئاسانکاری بۆ هێنان و بردنی ڕۆژنامە و چاپەمەنی بۆ ناوەوە و دەرەوەی هەرێم کردووە و ئازادیی ڕۆژنامەگەریشی بۆ بیانییان دابین کردووە و ملکەچی سیستمی مۆڵەتی پێشەکی و ئاگاکاری نەکردوونە، هەروەکو لە دەقی هەردوو ماددەی سیانزەهەم و چواردەهەمی یاسای چاپەمەنی ژمارە (١٠)ی ساڵی ١٩٩٣ ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ.

لە دەقی ماددەی سیانزەهەمدا هاتووە: «هیچ کۆتێک لەسەر هاتنی چاپکراو بۆ ناو هەرێم و بردنی بۆ دەرەوی نییە».

هەرچەندە ئەم دەقە تایبەتە بەهێنان و بردنی ڕۆژنامە و چاپەمەنی بۆ ناوەوە و دەرەوەی هەرێمی کوردستان، نەک دەرکردن و بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامە، بەڵام لە ئەنجامدا یەک دەگرنەوە، چونکە ئەو کەسەی بیەوێ خۆی لەو مەرجانە بدزێتەوە کە لە یاسای چاپەمەنی هەرێمی کوردستاندا هاتوون، لە هەمان کاتیشدا، سوود لەو ئاسانکارییانە وەربگرێت کە لە یاسای وڵاتانی تردا هاتوون، دەتوانێ فێڵ لەم دەقە بکات و لە دەرەوەی کوردستان ڕۆژنامە دەربکات و ئینجا بەسوود وەرگرتن لەم دەقە، بەچاپکراوییەوە بۆ کوردستانی بهێنێت، هەروەکو لە خاڵی پێشوو ئاماژەمان پێ کرد.

بەڕای ئێمە، ئەم دەقە لەگەڵ پرنسیپی سەروەریی وڵات و ئاسایشی نەتەوەیی و بەرژەوەندییە باڵاکانی کۆمەڵ ناگونجێ، چونکە کەناڵەکانی ڕاگەیاندن تیغی دوو دەمن و کاری چاک و خراپیان پێ دەکرێ و دوژمنان بۆ بەدیهێنانی مەرامەکانیان بەکاری دەهێنن و سوودی لێ دەبینن[١٩٩].

---

١٩٩- کەمال سەعدی: یاسای چاپەمەنیی کوردستان و چەند سەرنجێک، گۆڤاری «پارێزەر» ژمارە (٢) ساڵی یەکەم ٢٠٠١، ل٦٤.

هەروەها لە مادەی چواردەدا هاتووە: «سەرپەرشتیی کاری ڕاگەیاندن بۆ پەیامنێر و نوێنەرانی دامودەزگاکانی ڕاگەیاندنی بیانی لە هەرێمدا دەزگەرە و مەرج و بنچینەکانی کارکردنیان بەڕێنماییەک دیار دەکرێن کە وەزیر دەریدەکات».

سەرەڕای جەختکردنی یاسادانەر لەسەر دەرکردنی ڕێنمایی بۆ دیارکردنی مەرج و بنچینەکانی کارکردنی بیانییان لەم بوارەدا، کەچی تاکو ئێستاش دوای تێپەڕبوونی ئەم ماوە زۆرە هیچ ڕێنماییەک لەم بارەیەوە دەرنەچووە. ئەمەش خۆی لە خۆیدا ڕێگەدانە بۆ ئیجتیهادات و لێکدانەوەی. بۆیە داوا لە وەزیری ڕۆشنبیری حکومەتی هەرێمی کوردستان دەکەین بەزوویی ئەو ڕێنماییە دەربکات.

دەستووری ئەمەریکی ساڵی ١٧٨٩ لە یەکەمین هەمواری ساڵی ١٧٩١دا لەژێر ناونیشانی «بەڵگەنامەی مافەکانی مرۆڤ» جەختی لەسەر ئەم ئازادییە کردووە و تیایدا هاتووە: «کۆنگرێس بۆی نییە هیچ یاسایەک دەربکات سنوور بۆ ئازادیی ڕۆژنامەگەری دابنێ»[٢٠٠].

کەواتە دەسەڵاتی یاسادانان (کۆنگرێس) بۆی نییە تەنانەت یاسایش دەربهێنێ بۆ سنووردارکردنی ئازادیی ڕۆژنامەگەری. ئەمەش مانای ئەوەیە، تەنها بەگۆڕانکاری و هەموارکردنی دەستوور دەتوانرێ کۆت و بەند بۆ ئەو ئازادییە دابنرێت.

ئینجا ئیستنتاج دەکەین، ئەگەر کۆنگرێس بۆی نەبێت بۆ سنووردارکردنی ئازادیی ڕۆژنامەگەری یاسا دەربکات، ئەوە (من باب اولی) حکومەت ناتوانێ بەهۆی ڕێسا یان ڕێنماییەوە هیچ کۆت و بەندێک بخاتە ڕێگای ئەو ئازادییە.

### ٣- ٢- ٣ سیستمی مۆڵەت لە یاسای ڕێکخستنی دەسەڵاتی ڕۆژنامەگەری میسریدا

یاسادانەری میسری لە یاسای ڕێکخستنی دەسەڵاتی ڕۆژنامەگەری ژمارە (٩٦)ی ساڵی ١٩٩٦دا تەنیا سیستمی مۆڵەتی پیشەکی کاری بەسیستمی ئاگاداری مەرجدار کردووە هەروەکو لە خاڵی پێشوودا باسمان کرد.

---

٢٠٠- ئەمەش دەقەکەیەتی بەزمانی ئینگلیزی.

Congress shall make no law respecting an establishment of religion, or prohibiting the free exercise thereof, or abridging the freedom of speech, or of the press.

ئەم دەقە لە ئینتەرنێت لە ٢٠٠١/١٠/١٧ لەم شوێنە وەرگیراوە:

http://www.Law.emory.edu/federal

### ٣-٢- [illegible] سیستمی مۆڵەت [illegible] یاسای چاپەمەنی لوبناندا

یاسادانەری لوبنانی لە یاسای چاپەمەنی ساڵی ١٩٦٢ هەمواركراودا، كاری بەسیستمی مۆڵەتی پێشەكی كردووە، یاسادانەری كوردستانی هەمان ڕێگای یاسادانەری لوبنانی گرتۆتەبەر هەروەكو لە ماددەی بیست و حەوتەمدا هاتووە: «دەركردنی هەر چاپكراوێكی ڕۆژنامەگەری بەر [illegible] وەرگرتنی مۆڵەتی پێشەكی لە وەزیری ڕاگەیاندن دوای ڕاوێژكردنی سەندیكای ڕۆژنامەگەری بەهەموو شێوەیەك قەدەغەیە»، بەڵام بەپێچەوانەی ئەو لەجیاتی ئاسانكاری ئەوپەڕی توندیی نواندووە بۆ هێنانی ڕۆژنامە و چاپەمەنیی بیانی بۆ ناوەوەی لوبنان و بڵاوكردنەوەی مەگەر مۆڵەتی پێشەكی بۆ دەركردنی بەپێی حوكمەكانی یاسای چاپەمەنی لوبنانی ناوبراو وەرگرتبێت. هەروەكو لە دەقی ماددە پەنجادا هاتووە: «هێنانی هەر چاپەمەنییەكی بیانی بۆ ناو لوبنان بەبڕیارێك لە وەزیری ڕاگەیاندن قەدەغە دەكرێت و دەست بەسەر ژمارەكانیدا دەگیرێت ئەگەر بەدیاركەوت چاپەمەنییەكە دەبێتە هۆی شێواندنی ئاسایش، یان دژی هەستی نەتەوایەتی بێت یان دژی ڕەفتاری گشتی بێت یان نەعرەی تائیفی بورووژێنێ. هەروەها هەر كەسێك لەسەر خاكی لوبناندا چاپەمەنییەك چاپ بكات یان بڵاوی بكاتەوە كە هێنانی قەدەغەكرابێت یان دەست بەسەر ژمارەكانیدا گیرابێت سزا دەدرێ بەبەندكردنی بۆ ماوەیەك لە هەشت ڕۆژ تاكو سێ مانگ لەگەڵ غەرامەیەك بەبڕی یەك ملیۆن لیرەی لوبنانی یان بەیەكێك لەو دوو سزایە.

هەروەها هەر كەسێك دەقێكی قەدەغەكراو چاپ بكات یان بڵاوی بكاتەوە سزا دەدرێ بەغەرامەیەك بەبڕی یەك ملیۆن تا دوو ملیۆن لیرەی لوبنانی هەروەها ئەم حوكمانە پوختەكان (الخلاصات) دەگرێتەوە كە بەنیازخراپی بڵاو دەكرێنەوە ئەگەر هاتوو بووە هۆی ڕوودانی ئەو ئاگاداركردنەوانە (المحاذیر)ی لە پێناویدا دەقەكە قەدەغە كراوە.

هەر ڕۆژنامەیەك لەدەرەوەی لوبنان دەربكرێت یان چاپ بكرێت نابێ دەركردنی بگوازرێتەوە بۆ لوبنان چ بەچاپێكی سەربەخۆ یان پاشكۆ وەیان بەهەر شێوەیەكی تر تاكو ڕەزامەندی بۆ دەركردنی لە لوبنان بەپێی حوكمەكانی ئەم یاسایەو مەرسومی یاسایی ژمارە (٧٤)ی نیسانی ساڵی ١٩٥٣ وەرنەگرێت».

### ٣- ٢- ٥ سیستەمی مۆڵەت لە یاسای چاپەمەنیی عێراقیدا

یاسادانەری عێراقی لە یاسای چاپەمەنی ژمارە (٢٠٦)ی ساڵی ١٩٦٨ هەموارکراودا ڕەوتێکی جیاواز لە ڕەوتی یاسادانەری لوبنانی و کوردستانی گرتۆتەبەر.

لە ڕووی کارکردن بەسیستەمی مۆڵەتی پێشینەوە یاسای عێراقیی ناوبراو لە هەردوو یاسای هەرێمی کوردستان و لوبنان دەچێت هەروەکو لە ماددەی سێیەم و چوارەمدا دەردەکەوێ. لە ماددەی سێیەمدا کۆمەڵێک مەرجی ڕیزکردووە کە دەبێ خاوەنی چاپکراوی دەوری تیای بێت. هەروەها لە ماددەی چوارەمدا کۆمەڵێک زانیاریی دەستنیشان کردووە کە دەبێ لەناو ئەو داخوازییە دابێت کە بۆ وەرگرتنی مۆڵەتی دەرکردن و بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامە یان چاپکراوی خولەکی پێشکەش وەزارەتی ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندن دەکرێت. بەڵام سەبارەت بەو حوکمانەی کە تایبەتن بەبیانییان بۆ دەرکردن و بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامە یان هێنانە ناوەوەی ڕۆژنامە بۆ ناوەوەی وڵات و ئەنجامدانی کاری ڕۆژنامەگەری لەلایەن ئەوانەوە لەوان جیاوازە.

یاسای عێراقی ئەو ئاسانکارییەی بۆ بیانییان نەنواندووە هەروەکو یاسای کوردستانی نواندویەتی، بەڵکو هەمان توندیی نواندووە کە یاسای لوبنانی بەرامبەر ڕۆژنامە و ڕۆژنامەنووسانی بیانی نواندویەتی. بەڵام شێوازێکی تایبەتی بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ ئەم حاڵەتەدا گرتۆتەبەر کە بریتییە لە مامەڵەکردنی هاوچەشن (المعاملة بالمثل) هەروەکو لە ماددەی هەشتەمدا بۆمان دەردەکەوێ کە تیایدا هاتووە: «دەکرێ خەڵکی ناعێراقی لە ناو عێراقدا چاپکراوی دەوری دەربکەن، بەپێی حوکمەکانی ئەم یاسایە و بەڕەزامەندی وەزارەتی دەرەوە، بەپێی مەرجی مامەڵەی هاوچەشن و پشتگیریی نوێنەری سیاسی یان باڵیۆزی دەوڵەتەکەی و بوونی ئەو مەرجانەی کە بەپێی یاسای دەوڵەتەکەی پێویستن».

هەروەها یاسادانەری عێراقی بەپێچەوانەی یاسادانەری کوردستانی[٢٠١] کاری ڕاگەیاندنی بۆ پەیامنێر و نوێنەرانی دامودەزگاکانی ڕاگەیاندنی بیانی لە عێراقدا ئازاد نەکردووە، بەڵکو مەرجی وەرگرتنی مۆڵەتی پێشەکی لە وەزارەتی ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندن بۆ داناوە هەروەکو لە دەقی برگەی (أ)ی ماددەی پانزەهەمدا هاتووە: «أ - نابێت پەیامنێری ڕۆژنامەکان یان گۆڤارەکان یان ئاژانسەکانی بیانی پرۆسەی کاری خۆیان لە

٢٠١ - بڕوانە دەقی ماددەی (٩٤) لە یاسای چاپەمەنیی هەرێمی کوردستان، پێشتر ئاماژەمان پێی کردووە.

عێراقدا بکەن مەگەر بەرەزامەندی وەزارەت نەبێت».

بەڕای ئێمە، ئەمە بیرو بۆچوونێکی تۆتیالیتارییە، لە بیری ئازاددا ئەم جۆرە بۆچوونە جێگای نابێتەوە. ڕژێمێک لەمیللەتی خۆی نەترسێت و لەگەڵ میللەتدا تەباین پاکی نییە.

هەرچەندە هەندێ کەس پێیان وایە، هەندێ لەو ڕۆژنامانە زانیارییەکانی ناوخۆی تایبەت بەسەربەخۆیی و سەروەری و ئاسایشی نیشتمانی و نەتەوەیی دەبەنە دەرەوەو بەئەنقەست و بەنیازخراپی دەیخەنە بەردەستی ئەو لایەنە بیانییانەی مەبەستیانە ئەم زانیارییانە بقۆزنەوە بۆ ئەنجامدانی پرۆژە سیاسییەکانیان و پێکانی مەبەستەکانیان[202]. بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە کاری پەیامنێری ڕۆژنامە و گۆڤار و ئاژانسەکانی بیانی یاساغ بکرێت یانیش کۆت و بەندیان لەبەردەم دابنرێت، بەڵکو دەکرێ مەرج و بنچینەکانی کارکردنیان بەڕێنماییەک دیاریبکرێت، هەروەکو یاسادانەری هەرێمی کوردستان لە ماددەی (١٤)دا ئەم ڕێگایەی گرتۆتەبەر[203].

هەر لەم ڕوانگەیەوە، لە ناوەڕاستی ساڵی ٢٠٠١ (ڕیتشارد شیلبی)ی ئەندامی ئەنجومەنی پیران لە کۆنگرێسی ئەمەریکی، پێشنیارێکی سەبارەت بەتوندکردنی سزاکانی بردنە دەرەوەی زانیارییەکان لە ڕێگای ڕۆژنامەوانییەوە پێشکەش بەکۆنگرێس کرد و خرایە بەردەست لیژنەی هەواڵگری (لجنة الاستخبارات) بۆ لێکۆڵینەوە و داڕشتنی پرۆژەیەکی یاسایی بۆ بەرجەستەکردنی[204]. ئەم پرۆژەیە، لەجیاتی ئەوەی کۆت و بەند لەبەردەم ڕۆژنامەنووسانی بیانی لە مومارەسەکردنی پیشەکەیان دابنێ، ئەو لێپرسە ئەمریکییە بەبەرپرس دادەنێ کە زانیاری نهێنی بۆ بیانیان دەدرکێنێ.

کەواتە، لەجیاتی دانانی ئەم کۆت و بەندە، کە لەگەڵ پرنسیپەکانی مافی مرۆڤ و دنیای هاوچەرخ و مافی ڕۆژنامەنووس لە وەرگرتنی زانیاری و بەسەرکردنەوەی هەواڵەکان

---

٢٠٢- منصور یوسف علي: مراسلون صحفیون ... أم .. جواسیس، جریدة «الاتجاه الاخر» السنة الثالثة العدد (٥٣) الاحد ٢٠٠٢/٢/١٧ ل١١.

٢٠٣- بڕوانە دەقی ئەم ماددەیە لە بڕگەی (٣-٣-٢) لەم تێزەدا.

٢٠٤- بەپێی ئەم پرۆژە پێشنیارکراوە، هەر کەسێک زانیاریی نهێنی بداتە یەکێک لەو کەسانەی کە ڕێگایان پێنەدراوە چاو بەو زانیاریانەدا بخشێنن، سزا دەدرێت بۆ ماوەیەک ڕەنگە بگاتە سێ ساڵ. جێی وەبیرهێنانەوەیە، ناوبراو، ساڵی ڕابردوو، پێشنیارێکی لەم بابەتەی پێشکەش کرد، کۆنگرێس بەهەردوو باڵەکانییەوە پەسندیان کرد، بەڵام سەرۆکی ئەمەریکی پێشوو بیل کلنتۆن ڕەتی کردەوە.
Http://www.almashrek.org.2002/12/2.

زۆر شیاو نییە، باشتروابوو، یاسادانەری عێراقی تەنها ئەو کەسانەی بەرپرس کردبا کە ئەو ئازادییە بۆ پێکانی هەندێ مەرامی سیخوڕی و هەواڵگریی زیانبەخش دەقۆزنەوە، نەک دانانی ئەم مەرجە قورسە لەبەردەم گشت ڕۆژنامەنووسانی بیانیدا.

دوای ئەوەی پێناسەی سیستمی مۆڵەتی پێشەکیمان کرد لەگەڵ دەرخستنی هەڵوێستی یاسادانەری کوردستانی لەبارەیەوە، هەروەها بەراوردکردنی حوکمەکانی یاسای چاپەمەنیی هەرێمی کوردستان ژمارە (١٠)ی ساڵی ١٩٩٣ لەبارەی مۆڵەتی پێشەکی لەگەڵ یاساکانی چاپەمەنی و ڕۆژنامەگەریی میسری و لوبنانی و فەرەنسی و عێراقیدا، ئێستاش لە خوارەوە باسی ئەو مەرجانە دەکەین کە دەبێ لە خاوەنی یان سەرنووسەری ڕۆژنامە یان چاپکراوی دەوریدا هەبێت، لەگەڵ ئەو زانیارییانەی کە دەبێ داواکاری مۆڵەت تیایدا بێت:

**٣-٢-٦ ئەو مەرجانەی کە دەبێ لە خاوەنی یان سەرنووسەری ڕۆژنامە یان چاپکراوی دەوریدا هەبێ**

**٣-٢-٦-١ یاسای چاپەمەنیی هەرێمی کوردستان:**

بەپێی یاسای چاپەمەنیی هەرێمی کوردستان ژمارە (١٠)ی ساڵی ١٩٩٣ ئەو کەسەی بیەوێ ڕۆژنامەیەک دەربکات، دەبێ داخوازییەک پێشکەشی وەزیری ڕۆشنبیری بکات و تیایدا ناوی خۆی و ناوی سەرنووسەر و ناوی ڕۆژنامەکەو زمانەکەی دیاری بکات. هەروەها دەبێ خاوەنی ئیمتیاز یان سەرنووسەری ڕۆژنامە یاخود چاپکراوی دەوری ئەم مەرجانەی خوارەوەی تێدابێت[٢٠٥]:

١- دەبێ هاووڵاتییەکی عێراقی بێت:

بەپێی یاسای ڕەگەزنامەی عێراقی ژمارە (٤٣)ی ساڵی ١٩٦٣ی هەموارکراو هەر کەسێک ڕەگەزنامەی عێراقیی هەبێت بەعێراقی دادەندرێت[٢٠٦]. وە لەبەرئەوەی یاسای ناوبراو بەشێکە لە سیستمی یاسایی هەرێمی کوردستان، بۆیە بۆ دیارکردنی مەبەستی یاسادانەری کوردستان سەبارەت بەهاووڵاتیی عێراقی و جیاکردنەوەی لە بیانی دەگەڕێینەوە بۆ حوکمەکانی ئەم یاسایە.

---

٢٠٥- ماددەی سێهەم لە یاسای ناوبراو.

٢٠٦- بڕوانە دەقی بڕگەی یەک لە ماددەی (١)ی یاسای ڕەگەزنامەی عێراقی ژمارە (٤٣)ی ساڵی ١٩٦٣ی هەموارکراو کە تیایدا هاتووە: «ئەو کەسە عێراقییە کە ڕەگەزنامەی عێراقیی هەبە»، ئەم یاسایە لە ڕۆژنامەی «الوقائع العراقية» ژمارە (٨١٨) لە ١٩٦٣/٦/١٩ بڵاوکراوەتەوە.

٢- دەبێ لێهاتنی یاسایی تەواوی هەبێت:

بەپێی برگەی (١)ی ماددەی (٤٦)ی یاسای شارستانیی عێراقی ژمارە (٤٠)ی ساڵی ١٩٥١ هەمووارکراو هەر کەسێک بگاتە تەمەنی پێگەیشتن و هۆش و قامی تەواوی هەبێت و کرداری یاسایی لێ یاساغ نەکرابێ لێهاتنی یاسایی تەواوی دەبێت بۆ بەکارهێنانی مافە مەدەنی و مافە رامیارییەکانی لەوانەش مافی ئازادیی رۆژنامەگەری کە مافێکی رامیارییە. ئەمەو یاسادانەری عێراقی لە ماددە (١٠٦)ی هەمان یاسادا تەمەنی پێگەیشتنی بەهەژدەساڵی تەواو داناوە. بەم پێیە، مەبەست لە لێهاتنی یاسایی لێهاتنی راپەڕاندنە (اهلیة الاداء) ئەمەیش بریتییە لە توانای بەکارهێنانی ئەو مافانەی بۆی رەخساوە لە وانەش مافی ئازادیی رۆژنامەگەری. ئەمجۆرە لێهاتنەش ئەڵقەبەندی هۆش و قامە، بەبوون و بەنەبوون و تەواوی و ناتەواوییەوە. بەم پێیە هەر کەسێک شێت و وێت نەبێ و کرداری یاسایی لێ یاساغ نەکرابێ لەبەر دەبەنگی (الغفلة) و سەفاهەت (السفة) لێهاتنی یاسایی تەواوی دەبێت[٢٠٧]. ئەمەو تەمەنی پێگەیشتن لە عێراقدا هەژدە ساڵی زایینی تەواوە هەروەکو لە سەرەوە ئاماژەمان پێی کرد.

٣- دەبێ خوێندنەوە و نووسین بەزمانی رۆژنامە یان چاپکراوەکە بزانێت.

٤- نابێ حوکم درابێت لەسەر تاوانێکی گەورە کەتن (جنایة) یان کەتنێک (جنحة)ی نا سیاسیی ئابڕووبەر.

٥- دەبێ نیشتەجێی هەرێمی کوردستانی عێراق بێت.

دوای رەچاوکردنی ئەو مەرجانەی سەرەوە و دوای پێشکەشکردنی داوایەکە بۆ وەزیری رۆشنبیری، دەبێ وەزیر لە ماوەی سی رۆژدا لە رۆژی تۆمارکردنی داوایەکەوە بڕیاری خۆی لەبارەیەوە بدات، ئەگینا بەتێپەڕبوونی ئەو ماوەیە، رۆژنامەکە بەرێگاپێدراو دادەندرێت. بەڵام ئەگەر هاتوو وەزیر داوایەکەی رەت کردەوە، لەو حاڵەتەدا، خاوەنی داوا رەتکراوەکە بۆی هەیە لە ماوەی دە رۆژدا لەو رۆژەی پێی رادەگەیەندرێ لەلای دادگای پیاچوونەوەی هەرێم تانە لە بڕیاری وەزیر بدات و بڕیاری دادگاش بنبڕ دەبێ[٢٠٨].

---

٢٠٧- بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە د. سەعدی بەرزنجی: تیۆری گشتیی ماف، بڵاوکراوەکانی نەمیندارێتیی گشتیی رۆشنبیری و لاوان - ناوچەی کوردستان، چاپی یەکەم، چاپخانەی رۆشنبیری، هەولێر، ١٩٨٩، ل ٨٩-٩١.

٢٠٨- بڕوانە ماددەی (٥) لە یاسای چاپەمەنی کوردستان ژمارە (١٠)ی ساڵی ١٩٩٣ی هەموارکراو.

٣-٢-٦-٢ یاسای میسری:

یاسادانەری میسری لە یاسای چاپەمەنیی ژمارە (٢٠)ی ساڵی ١٩٣٦ هەموارکراودا لە ماددەی دوانزەدا ئەو مەرجانەی دیارکردووە کە دەبێ لە خاوەن و سەرنووسەری رۆژنامە و چاپکراوی دەوریدا هەبێ ئەمەش دەقەکەیەتی: «دەبێ سەرنووسەر و نووسەرە بەرپرسەکان ئەم سیفەتانەی خوارەوەیان تیادا بێت:

یەکەم: دەبێ هاوڵاتیی میسری بن ئەگەر رۆژنامەکە هەموو یان هەندێکی بەزمانی عەرەبی بلاوبکرێتەوە.

دووەم: نابێ تەمەنیان لە بیست و پێنج ساڵی زایینی کەمتر بێت.

سێیەم: دەبێ لێهاتنی تەواویان هەبێت و ناوبانگیان باش بێت (حسني السمعة).

چوارەم: حوکم نەدرابێ بەتاوانێک لە تاوانە ناسایەکان یان دزین یان شاردنەوەی شتی دزیاوی یان فێڵبری یان ناپەمانەتی یان غەدرکردن یان بەرتیل یان خۆنیفلاسکردنی بەفروفێڵ یان تەزویرکردن یان بەکارهێنانی بەڵگەنامەی تەزویرکراو یان شایەتیدانی بەدرۆ یان لە خشتەبردنی شایەتەکان یان لەکەدارکردن یان لەخشتەبردنی ناکامان بۆ لەشفرۆشی یان دەستدرێژیکردنەسەر حورمەتی رەوشت یان پاکیی ئەخلاق یان راکردن لە خزمەتی سەربازی یان دەسپێکردنی یەکێک لەو تاوانانەی کە ئاماژەیان پێکراوە ئەوکاتەی کە دەسپێکردنەکە (الشروع) لە یاسادا دەقنووس کرابێت»[٢٠٩].

---

٢٠٩- ئەمەش دەقەکەیەتی بەزمانی عەرەبی: «يجب ان يكون رؤساء التحرير أو المحررون المسؤلون حائزين للصفات التالية:

اولا: أن يكونوا مصريين اذا كانت الجريدة تنشر كلها أو بعضها باللغة العربية.

ثانيا: ألا تقل سنهم عن خمس و عشرين سنة ميلادية.

ثالثا: أن يكونوا كاملي الاهلية و حسني السمعة.

رابعا: ألا يكون قد حكم عليهم لجناية من الجنايات العادية أو السرقة أو اخفاء اشياء مسروقة أو نصب أو خيانة امانة أو غدر أو رشوة أو تفالس بالتدليس أو التزوير أو أستعمال اوراق مزورة أو شهادة زور أو اغراء شهود أو هتك عرض أو أغراء قصر علي البغاء أو انتهاك حرمة الاداب أو حسن الاخلاق أو تشرد لجنحة ارتكبت للفرار من الخدمة العسكرية أو لشروع في ارتكاب جريمة مما ذكر متى كان الشروع منصوصا عليه في القانون».

لە ئاکامی بەراوردکردنی حوکمەکانی یاسای چاپەمەنیی هەرێمی کوردستان ئاماژەبۆکراو لەسەرەوە لەگەڵ ئەم حوکمانەی یاسای چاپەمەنیی میسری سەبارەت بەو مەرجانەی کە دەبێ لە خاوەن و سەرنووسەری ڕۆژنامە یان چاپکراوی خولەکیدا هەبن، بۆمان بەدیار دەکەوێ. هەردوو یاسا وەکو یەکن لە دانانی مەرجی هەڵگرتنی ڕەگەزنامەی وڵاتی چاپکراوەکە، لە یاسای کوردستاندا ڕەگەزنامەی عێراقییە و لە یاسای میسریشدا ڕەگەزنامەی میسرییە. بەڵام بەنسبەت مەرجەکانی تر هەردوو یاسا لێک جیاوازن، وەک دیارکردنی لێهاتنی یاسایی بەهەژدەساڵی تەواو لە یاسای کوردستاندا و، بیست و پێنج ساڵی تەواو لە یاسای میسریدا. هەروەها لە یاسای کوردستاندا مەرجی نیشتەجێبوونی هەرێمی کوردستانی داناوە، کەچی لە یاسای میسریدا مەرجێکی وەها نییە. هەروەها لە یاسای کوردستاندا مەرجی خوێندنەوە و نووسینی بەزمانی چاپکراوەکە داناوە، کەچی یاسای میسری لێی بێدەنگ بووە. دواتر یاسای کوردستان مەرجی حوکم نەدرانی لەسەر گەورە کەتنێک یان کەتنێکی نائاسایی ناپرووبەر داناوە، کەچی یاسای میسری هەرچەندە هەمان حوکمی داوە، بەڵام کۆمەڵێک تاوانی ناسیاسی لە دووتوێی دەقەکەدا بەنموونە هێناوەتەوە.

دوای ئەم بەراوردکردنە، دەتوانین بڵێین یاسادانەری کوردستان لە دانانی مەرجی نیشتەجێبوون سەرکەوتووتر بووە لە یاسادانەری میسری، چونکە بوونی ئەم مەرجە پێویستە تاوەکو ئەو ئەرکانەی کە لە ئاکامی ئەنجامدانی تاوانێک لە تاوانەکانی ڕۆژنامەگەری دەکەوێتە ئەستۆی ئەو کەسەی کە ڕۆژنامە دەردەکات، بتوانرێ بەسەریدا بچەسپێ. هەروەها لە ڕووی دانانی مەرجی (نابێ حوکم درابێت لەسەر تاوانێکی ناسیاسی ناپرووبەر) یاسای کوردستان سزاکەی لە سزای یاسای میسری سووکترە، چونکە یاسای کوردستان تەنها مەرجی حوکم نەدانی بەتاوانێکی ناسیاسی ناپرووبەر داناوە، لە کاتێکدا یاسای میسری مەرجی حوکمنەدانی بەهەموو تاوانێکی ناسیاسی داناوە.

### ٣-٢-٦-٣ یاسای لوبنانی:

یاسادانەری لوبنانی، لە یاسای چاپەمەنیی ١٩٦٢/٩/١٤ هەمووارکراودا کاری بەسیستمی مۆڵەتی پێشەکی کردووە و دەرکردنی ڕۆژنامەی بەر لە وەرگرتنی مۆڵەتی پێشەکی قەدەغە کردووە، هەروەکو لە ماددەی (٢٧)دا هاتووە «دەرکردنی ڕۆژنامە، بەر لە

وەرگرتنی مۆڵەتی پێشەکی لە وەزیری ڕاگەیاندن دوای ڕاوێژی سەندیکای ڕۆژنامەگەری بەتەواوەتی قەدەغەیە»[٢١٠].

هەروەها کۆمەڵێک مەرجی دەستنیشان کردووە، کە دەبێ ڕەچاوبکرێن بۆ وەرگرتنی مۆڵەت، هەروەکو لە ماددە (٣٠)دا دەقنووس کراوە، ئەمەش دەقەکەیەتی: «دەبێ ئەو کەسەی داوای مۆڵەت دەکات ئەم مەرجانەی خوارەوەی تیابێت:

دەبێ لوبنانی بێت، لە لوبنان نیشتەجێبێت یان شوێنێکی بۆ نیشتەجێبوونی خۆی تیایدا دەستنیشان کردبێت، مافە مەدەنی و ڕامیارییەکانی هەبێت، حوکم نەدرابێ بەگەورەکەتێک یان کەتێنێک لە کەتنەکانی یاسای هەڵبژاردن، هەروەها نابێت خزمەتی وڵاتی بیانی کردبێت».

هەروەها لە ڕووی دیارکردنی لێهاتنی یاساییەوە یاسای چاپەمەنیی لوبنانی لە ماددە (٢٢) بڕگەی (١)دا لێهاتنی یاسایی بەبیست و یەک ساڵی تەواو دەستنیشان کردووە کە ئەمەش دەقەکەیەتی: «دەبێ لوبنانی بێت و بیست و یەک ساڵی لە تەمەندا تەواو کردبێ».

ئەمەو، بەپێی ماددەی (٢٨)ی یاسای ناوبراو، ئەگەر هاتوو، داوای مۆڵەتەکە، هەموو مەرجە یاساییەکانی تێدابوو، دەبێ وەزیری ڕاگەیاندن لە ماوەی مانگێکدا لە ڕۆژی پێشکەشکردنی ئەو داوایەوە، مۆڵەتەکەی پێ ببەخشێت، ئەگینا تێپەڕبوونی ئەو ماوەیە بەڕەتکردنەوەیەکی زمنی دادەندرێت. لەم حاڵەتەشدا، خاوەنی داوایەکە بۆی هەیە لەبەردەم دادگای کارگێڕییەوە تانە لەو بڕیارە بدات[٢١١].

ئەوەی لەم دوو دەقەدا تێبینی دەکرێ ئەوەیە، یاسادانەری لوبنانی بەپێچەوانەی

---

٢١٠- ئەمەش دەقەکەیەتی: «يحظر اطلاقا اصدار اية مطبوعة صحفية قبل الحصول مسبقا على رخصة من وزير الاعلام بعد استشارة نقابة الصحافة».

٢١١- ئەمەش دەقەکەیەتی: «اذا تحقق وزير الاعلام من ان طلب الرخصة مستوف جميع الشروط القانونية فعليه ان يمنح الرخصة في خلال شهر على الاكثر من تأريخ تقديم الطلب. واذا انقضت هذه المهلة عد السكوت رفضا ضمنيا.

اما الرفض الصريح، فيجب ان يصدر بقرار معلل.

يحق للمتضرر ان يطعن امام المحكمة الناظرة بالقضايا الادارية بقرار الرفض سواء كان هذا القرار صريحا أو ضمنيا لعلة تجاوز حدود السلطة ضمن المهلة القانونية.

ينشر قرار وزير الاعلام في الجريدة الرسمية».

یاسادانەری میسری مەرجی نیشتەجێبوونی لەناو لوبنان داناوە. لێرەشدا یاسای لوبنانی لە یاسای کوردستانی دەچێت لەگەڵ جیاوازییەکی کەم ئەویش ئەوەیە، یاسادانەری لوبنانی مەرجی نیشتەجێبوونی حەتمی دانەناوە، بەڵکو ڕێگای داوە بەنیشتەجێبوون لە دەرەوەی لوبناندا بەمەرجێک شوێنێک بۆ نیشتەجێبوون لە ناوەوەی لوبنان دەستنیشان بکرێت، واتە دەگرێ ئەو کەسەی کە داوای مۆڵەت دەکات لە دەرەوەی لوبنان نیشتەجێبێت، بەمەرجێک شوێنێکیشی بۆ نیشتەجێبوونی کاتیی لە لوبناندا هەبێت.

هەروەها لە ڕووی ڕێگادان بەو کەسەی داوایەکەی ڕەت کراوەتەوە، لەبەردەم دادگا تانە لە بڕیاری وەزیر بدات، بەیەک دەچن.

بەڵام، سەبارەت بەحوکمی تێپەڕبوونی ئەو ماوەیەی کە لە ماددەی (٢٨)دا دیارکراوە، ئەم یاسایە جیاوازی هەیە لەگەڵ یاسای کوردستاندا، چونکە لە یاسای کوردستاندا، بەتێپەڕبوونی ئەو ماوەیە، ئەگەر وەزیر بڕیاری خۆی لە بارەی داوایەکەوە نەدا، ڕۆژنامەکە لە ڕووی یاساییەوە بەڕێگاپێدراو دادەندرێت.

هەروەها لە ڕووی دیارکردنی لێهاتنی یاساییەوە، یاسای لوبنانی جیاوازە لە هەردوو یاسای کوردستانی و میسری.

٣-٢-٦-٤ یاسای عێراقی:

یاسادانەری عێراقی، لە یاسای چاپەمەنی ژمارە (٢٠٦)ی ساڵی ١٩٦٨ی هەموارکراودا کاری بەسیستمی مۆڵەتی پێشەکی کردووە بۆ دەرکردن و بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامە و چاپکراوی دەوری. بۆ ئەم مەبەستەش جیاوازی کردووە لە نێوان ئەو ڕۆژنامە و گۆڤارە سیاسییانەی کە ڕۆژانە یان زیاتر لە جارێک لە هەفتەیەکدا دەردەچن، لەگەڵ ئەوانی تر. بۆیە لە بڕگەی (ا)ی ماددە (٧)دا دەسەڵاتی داوە بەوەزیری ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندن تەماشای داواکاریی مۆڵەتی دەرکردن و بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامە و چاپکراوی دەوری بکات و لە ماوەی مانگێک لە ڕۆژی تۆمارکردنیەوە پەسەندی بکات یان ڕەتی بکاتەوە. ئەمەر لە بڕگە (ب)ی هەمان ماددەدا ئەو ڕۆژنامە و گۆڤارە سیاسییانەی کە ڕۆژانە یان زیاتر لە جارێک لە هەفتەیەکدا دەردەچن لە حوکمی بڕگەی پێشووی وەدەرناوەو دەسەڵاتی بڕیاردانی بەئەنجوومەنی وەزیران بەخشیوە، بەو مەرجە، بڕیارەکە لەلایەن ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕشەوە پەسەند بکرێت. لەکاتێکدا ئەم ئەنجوومەنە، دەسەڵاتی یاسادانان و جێبەجێکردنی لە یەک کاتدا هەیە. یاسادانەری عێراقی هەر

بەمەندە نەوەستاوە، تەناتەت مافی تانەگرتنی لەبەردەم دادگا، لەو کەسە سەندۆتەوە کە داوایەکەی ڕەت دەکرێتەوە. هەروەکو لە برگە (ح)ی ئەم ماددەیەدا بۆمان دەردەکەوێ. ئەمەش دەقەکەیەتی:

١- وەزیر بۆی هەیە مۆڵەتی چاپکراوەکە بدات یان داواکارییەکە ڕەت بکاتەوە لە ماوەی یەک مانگ دا لە ڕۆژی تۆمارکردنیدا گەر هۆکارێکی تێدابینی کە بەرژەوەندیی گشتی یان ڕێکخستنی ڕۆژنامەگەری بیخوازێ، گەر ئەم ماوەیەش تێپەڕی و وەزیر داواکەی یەکلا نەکردەوە ئەوا چاپکراوەکە بەڕێگاپێدراو دادەندرێت.

٢- ئەو چاپکراوە سیاسییانەی کە ڕۆژانە یان زیاتر لە جارێک لە هەفتەیەکدا دەردەچن لە حوکمی برگە (أ)ی ئەم ماددەیە دەردەچێت، ئیمتیازی ئەم چاپکراوەیە، بەڕاسپاردەی وەزیر و بڕیاری ئەنجوومەنی وەزیران و دوای پەسەندکردنی لەلایەن ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕشەوە دەبەخشرێت.

٣- ئەو کەسەی بەپێی برگە (أ)ی ئەم ماددەیە داوایەکەی ڕەت کراوەتەوە، بۆی هەیە لە ماوەی پانزە ڕۆژ لە ڕۆژی ئاگادارکردنەوەیەوە، لەبەردەم ئەنجوومەنی وەزیرانەوە تانە لە بڕیاری وەزیر بدات، بڕیاری ئەنجوومەن بنبڕدەبێت».

هەروەها لە ماددە (٣)دا کۆمەڵێک مەرجی دەستنیشان کردووە کە دەبێ لە خاوەن و سەرنووسەری ڕۆژنامە و چاپکراوی دەوری سیاسیدا هەبن بۆ ئەوەی مافی وەرگرتنی مۆڵەتی دەرکردن و بلاوکردنەوەی ڕۆژنامە و چاپکراوی دەوری هەبێت. ئەمەی خوارەوە دەقەکەیەتی: «أ - مەرجە خاوەنی چاپکراوی دەوریی سیاسی:

١- لە دایکبوون عێراقی بێت و تەمەنی بیست و پێنج ساڵی تەواو بێت.

٢- حوکم نەدرابێت بەتاوانێکی ناسیاسی یان کەتنێکی نابرویەر.

٣- لە شوێنی دەرچوونی چاپکراوەکەدا نیشتەجێ بێت.

٤- فەرمانبەر نەبێت یان دەست بەکار نەبێت لە فەرمانگەیەکی ڕەسمی یان نیمچە ڕەسمیدا.

٥- خاوەنی بڕوانامەی لێهاتوویی بێت لە سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی عێراق و لە لایەن وەزارەتەوە پەسند کرابێت بەوەی کە خاوەن بەهرەیە و توانای ڕۆژنامەنووسیی هەیە. ئەم مەرجە ئەوانە ناگرێتەوە کە خاوەن بڕوانامەی زانکۆی باوەڕپێکراون لە بواری ڕاگەیاندن و ڕۆژنامەگەریدا.

٦- بەلایکەمەوە خاوەنی بڕوانامەی ئامادەیی بێت یان بڕوانامەیەک لەو ئاستەدا.

ب- مەرجە سەرنووسەری چاپکراوی دەوریی ئاسیاسی جگە لەو مەرجانەی لە بڕگەی (أ)ی ئەم ماددەیەدا هاتبوون، خاوەنی بڕوانامەیەکی بەرز بێت.

ج- ئەگەر هاتوو خاوەنی چاپکراوی دەوریی سیاسی کۆمپانیایەک بوو، مەرجە ئەو کۆمپانیایە لەناو عێراقدا دامەزرابێت و پێشکەشکەری ئەو داوایە مەرجە وێنەیەکی پەسندکراوی لە بڕوانامەی تۆمارکردنی ئەو کۆمپانیایە و پەیڕەوی ناوخۆیی - گەر هەبوو - هاوپێچ بکات، لەگەڵ ناوبردنی بەڕێوەبەر و ئەندامانی دەستەی بەڕێوەبەر و شوێنی نیشتەجێیان و ڕەگەزیان و ڕەچاوکردنی حوکمەکانی بڕگەی (ب) لەم ماددەیەدا، ئەوەی پەیوەندیدارە بەسەرنووسەری چاپکراوی تایبەت بەکۆمپانیاکەوە.

د- ئەگەر هاتوو خاوەنی چاپکراوی دەوری کۆمەڵەیەک بوو مەرجە لەناو عێراقدا دامەزرابێت و وێنەیەکی باوەڕپێکراوی مۆڵەتەکەی پێشکەش بکات لەگەڵ ناوی دەستەی بەڕێوەبەر و شوێنی نیشتەجێیان و ڕەگەزنامەیان لەگەڵ ڕەچاوکردنی بڕگەی (ب)ی تایبەت بەسەرنووسەر بکات.

هـ- نابێت سەرنووسەر لێپرسراوی زیاتر لە یەک چاپەمەنیی دەوریی سیاسی بێت لەیەک کاتدا.

و- دەشێت خاوەنی چاپکراوی دەوریی سیاسی سەرنووسەری بێت، گەر ئەو مەرجانەی تێدابوو کە لە بڕگەی (ب)ی ئەم ماددەیەدا هاتوون و خاوەنی بڕوانامەی باوەڕپێکراوی زانکۆ بێت لە بواری ڕاگەیاندن و ڕۆژنامەگەریدا.

لێرەدا بۆمان دەردەکەوێ کە هەڵوێستی یاسادانەری عێراقی لەگەڵ هەڵوێستی هەردوو یاسادانەری لوبنانی و یاسادانەری هەرێمی کوردستان سەبارەت بەخستنی ڕۆژنامەگەری بۆ ژێر دەسەڵاتی حکومەت لە ڕێگای سەپاندنی مەرجی مۆڵەت وەرگرتنی پێشەکی بۆ دەرکردن و بڵاوکردنەوەی لێک جیاوازە.

یاسادانەری عێراقی، سەرەڕای داناتی ئەم مەرجە قورسانە، لە بڕگە (ج)ی ماددەی (٧)دا ڕێگای لەو کەسە گرتووە کە داوایەکەی لەلایەن وەزیری ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندنەوە ڕەت دەکرێتەوە، لەبەردەم دادگا تانە لەو بڕیارە بدات. لە کاتێکدا، هەردوو یاسادانەری هەرێمی کوردستان و لوبنانی وێرای ئاسانی ئەو مەرجانەی دایان ناون، بەپێچەوانەی یاسادانەری عێراقی، ڕێگایان داوە بەو کەسەی داوایەکەی لەلایەن وەزیری ڕۆشنبیریەوە ڕەت دەکرێتەوە، لەبەردەم دادگا تانەی لێ بدات.

**٣- ٢- ٧ هەڵسەنگاندنی سیستەمی مۆڵەت:**

دانانی مەرجی قورس و لە توانابەدەر بۆ وەرگرتنی مۆڵەتی دەرهێنان و بڵاوکردنەوەی رۆژنامە و چاپکراوی دەوری لە گۆشەی ئەو مەبەستەی کە ئیدارە بۆی تێدەکۆشێ کۆت و بەندە لەبەردەم ئازادیی رۆژنامەگەریدا و بەسانسۆری پێشینە دەچێت.

ئەم سیستەمە، لەو وڵاتانەی کەوا بڕوایان بەمافی مرۆڤ و دیموکراسییەت نییە، چەکێکی سیاسی دەخاتە ژێردەستی حکومەت بۆ بەرگریکردن دژ بەنەیارەکانی و بەهۆی ئەمەوە تەگەرە دەخاتە بەردەمی ئەو کەسانەی کە دەیانەوێ رۆژنامە و چاپکراوی دەوری دەربکەن و شت بڵاوبکەنەوە کە لە بیرو بۆچوون و بڕوادا جیاوازن لەگەڵ ئەو یان گومانی ئەوەیان لێ دەکات.

بەڵام لەو وڵاتانەدا کە کەفالەتی ماف و ئازادییە گشتییەکانی تیادا کراوە و لە رێگای دادگایەکی پاک و سەربەخۆدا بەکردەوە مافی ئازادیی رۆژنامەگەری بۆ رۆژنامەنووسان زامن کراوە، دەتوانین بڵێین، ئەم سیستەمە تەنها کۆسپێکەو بەس، بەڵام دەتوانرێ لە رێگای پەنابردنە بەر دادوەری لێی دەرباز بیت.

کەواتە، ناکامەکانی ئەم سیستەمە لە یاسایەکەوە بۆ یاسایەکی تر دەگۆڕێت بەپێی رێگادان و رێگانەدانیان بۆ هانابردنەبەر دادوەری.

لە کۆتاییدا پێشنیار دەکەین، یاسادانەری کوردستانی واز لە سیستەمی مۆڵەت بهێنێت و کار بەسیستەمی ئاگاکاری رەها بکات. بۆئەم مەبەستەش تا زووە یاسای چاپەمەنیی ژمارە (١٠)ی ساڵی ١٩٩٣ جارێکی تر هەموار بکرێتەوە، بەچەشنێک لەگەڵ جیهانگیری و شۆڕشی زانیارییەکان و ئینتەرنێت و پێشکەوتنەکانی ئەم سەردەمە بگونجێت کە سنووری وڵاتانیان لەبەردەم شابڵاوی هزریدا تێک شکاندووە و تایبەتمەندێتییەکانی دابونەریت و نادابی گشتیی کۆمەڵگاکانیشیان گۆڕیوە.

•

## ٣- ٢ بارمتەی دارایی (تەئمینی نەقدی)

مسیۆ (رادینا) پێناسەی بارمتەی دارایی دەکات و دەڵێ: «بارمتەی دارایی بریتییە لە هەڵسانی خاوەنی رۆژنامە یان چاپکراوی دەوری یان بڵاوکەرەوەی ئەم چاپکراوانە بەدانانی بڕێک پارە یان ژمارەیەک لە قەواڵە (سندات) لای ئیدارە، بەمەبەستی دانەوەی ئەو غەرامەو قەرەبووانەی حوکمی لەسەر دەدرێ»[٢١٢].

هەروەها مسیۆ (فور) پێناسەی کردووە و دەڵێ: «بارمتەی دارایی بریتییە لە دانانی بڕێک پارە لەلایەن خاوەن رۆژنامەوە بۆ زامنکردنی جێبەجێکردنی ئەو حوکمە داراییانەی کە لەوانەیە دژی رۆژنامەکە دەربچن»[٢١٣].

لەم دوو پێناسەیەدا ئەوەمان بۆ بەدیار دەکەوێ کە مەبەست لە بارمتەی دارایی زامنکردنی جێبەجێکردنی ئەو حوکمانەیە کە دژی رۆژنامە یان چاپکراوی دەوری بۆ بژاردنی غەرامە یان قەرەبوو دەردەکرێن. هەرچەندە ئەگەری ئەوەشی لێ دەکرێ کە وەک هۆکارێک بەکار بهێندرێت بۆ رێگاگرتن لەبەردەم ئازادیی رۆژنامەگەریدا ئەگەر بێت و بڕی ئەو بارمتەیە هێندە زۆر بێت کە هەندێ کەس نەتوانێت دایبنێت.

لە خوارەوە لە پێنج خاڵدا باسی هەڵوێستی یاسای چاپەمەنیی کوردستان و یاساکانی چاپەمەنی و رۆژنامەگەریی میسری و لوبنانی و فەرەنسی و حکوومەتی ناوەندیی عێراقی لە بارمتەی دارایی دەکەین:

### ٣-٣-١ یاسای میسری

لە خوارەوە لە سێ خاڵدا باسی هەڵوێستی یاسادانەری میسری لەبارەی سیستەمی مسۆگەرکردنی داراییەوە دەکەین:

**یەکەم** - یاسای چاپەمەنی ژمارە (٢٠)ی ساڵی ١٩٣٦

یاسادانەری میسری لە یاسای چاپەمەنی ژمارە (٢٠)ی ساڵی ١٩٣٦ دا کاری بەسیستەمی بارمتەی دارایی کردووە و لە مادەدە (١٥)دا داوای لەو کەسە کردووە کە نیازی دەرهێنانی رۆژنامە یان چاپکراوی هەیە بارمتەیەکی دارایی بەبڕی (٣٠٠) جونێە

---

٢١٢- د. عبدالله اسماعیل البستاني: حرية الصحافة، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٤٦.

٢١٣- د. عبدالله اسماعیل البستاني: حرية الصحافة، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٤٦.

دابنێت بۆ هەر ڕۆژنامەیەک هەفتەی سێ جار یان زیاتر دەربچێت هەروەها (١٥٠) جونەیهی میسری لە حاڵەتەکانی تردا یان کەفیلێک پێشکەش بکات پارێزگار (المحافظ) یان بەڕێوەبەر (المدیر) پێی ڕازی بێت.

ئەمەی خوارەوە دەقی ماددەی ناوبراوە: «بۆ زامنکردنی دانەوەی ئەو غەرامە و خەرجییانەی کە ڕەنگە دژی سەرنووسەر یان نووسەرە بەرپرسەکان یان خاوەنی ڕۆژنامە یان بڵاوکەرەوە (ناشر) یان چاپکەر بەپێی حوکمەکانی ئەم یاسایە یان بەپێی بابی چوارەم لە کتێبی دووەم یان بابی حەوتەم لە کتێبی سێیەم لە یاسای سزادانی ئەهلی حوکمی پێدراوە دەبێ ئەو کەسانەی ئەو یاداشتنامەیەی کە لە دەقی ماددە (١١)دا هاتووە ئیمزایان کردووە لە ماوەی سێ ڕۆژدا لە ڕۆژی یاداشتنامەکەوە بارمتەیەکی دارایی بەبڕی ٣٠٠ سێ سەد جونەی بۆ هەر ڕۆژنامەیەک حەفتەی سێ جار یان زیاتر دەردەچێ هەروەها (١٥٠) جونەی لە حاڵەتەکانی تردا یان کەفیلێک پێشکەش بکەن کە پارێزگار یان بەڕێوەبەر پێی ڕازی بێت»[٢١٤].

هەروەها بەپێی حوکمی ماددەی شانزەهەم ئەگەر هاتوو بڕی بارمتەکە کەمتر بووە لەو بڕەی کە لە ماددەی ناوبراو دیاریکراوە، دەبێ لە ماوەی پێنج ڕۆژ دوای ئاگادارکردنەوەی لەلایەن ئیدارەوە تەواو بکرێت.

**دووەم**: یاسای دەسەڵاتی ڕۆژنامەگەری ژمارە (١٤٨)ی ساڵی ١٩٨٠[٢١٥]

یاسادانەری میسری لە یاسای دەسەڵاتی ڕۆژنامەگەری ژمارە (١٤٨)ی ساڵی ١٩٨٠دا کاری بەسیستمی بارمتەی دارایی کردووە و لە ماددەی نۆزدەهەمدا دەقنووسی کردووە. بەڵام بۆ ئەم مەبەستە جیاوازیی کردووە لە نێوان ئەو ڕۆژنامە و چاپکراوە دەورییانەی کە

---

٢١٤- ئەمەش دەقەکەیەتی بەزمانی عەرەبی: «لضمان وفاء الغرامات والمصاریف التي قد یحکم بها علي رئیس التحریر او المحررین المسؤلین او صاحب الجریدة او الناشر او الطابع تطبیقا لاحکام هذا القانون او تطبیقا لاحکام الباب الرابع عشر من الکتاب الثاني او الباب السابع من کتاب الثالث من قانون العقوبات الاهلي یجب علي الموقعین علي الاخطار المنصوص علیه في المادة (١١) اما ان یودعوا في میعاد ثلاثة ایام من تاریخ الاخطار تأمینا نقدیا مقداره ٣٠٠ جنیه عن کل جریدة تصدر ثلاث مرات او اکثر في الاسبوع و ١٥٠ جنیها في الاحوال الاخرى واما ان یقدموا کفیلا یرتضیه المحافظ او المدیر».

٢١٥- ئەم یاسایە لە ڕۆژنامەی (الوقائع المصریة) ژمارە (٢٨) مکرر (٧)ی ڕۆژی ١٤ یولیو ١٩٨٠ بڵاوکراوەتەوە.

پارتە رامیاریەکان و سەندیکاکان و یەکێتییەکان دەری دەکەن و لە نێوان ئەوانەی کە کەسە مەعنەویە تایبەتییەکانی تر دەریان دەکەن.

سەبارەت بەجۆری یەکەمیان مەرجی دانانی سەرمایەیەک بەبڕی دووسەدو پەنجا هەزار جونەی بۆ ڕۆژنامەی ڕۆژانەو سەد هەزار جونەی بۆ ڕۆژنامەی حەفتانە لە یەکێک لە بانقە میسریەکان بەرلە دەرکردنی ڕۆژنامەکە یان چاپکراوە دەوریەکە داناوە. ئەمەی خوارەوە دەقەکەیەتی: «مافی موڵکداریتی ڕۆژنامەگەریی تایبەت بەپارتە سیاسییەکان و کەسە مەعنەویە گشتی و تایبەتییەکان بۆیان پارێزراوە.

مەرجە ئەو ڕۆژنامانەی کە کەسایەتیە مەعنەویە تایبەتیەکان بێجگە لە پارتە سیاسییەکان و سەندیکاکان و یەکێتییەکان دەری دەکەن، شێوەی هەرەوەزییەکان یان کۆمپانیاکانی پشکداری (شركات مساهمة) وەربگرن، بەمەرجێ دەبێ گشت پشکەکان (الاسهم) لە هەردوو حاڵەتدا پشکی بەناو بێت (اسهم اسمية) و بەتەنها موڵکی میسرییەکان بێت وەنابێ سەرمایەی کۆمپانیاکە لە دوو سەد و پەنجا هەزار جونەی بۆ ڕۆژنامەی ڕۆژانە و سەد هەزار جونەی بۆ ڕۆژنامەی حەفتانە کەمتر بێت کە دەبێ بەر لە دەرکردنی ڕۆژنامەکە بەتەواوی لە یەکێک لە بانقە میسرییەکان دابنرێت...»[٢١٦].

لەم دەقەدا تێبینی ئەوە دەکەین کە تاکەکەس بۆی نیە ڕۆژنامە یان چاپکراوی دەوری دەربکات، بۆیە دەبێ چەند کەسانێک ڕێک بکەون و شێوەیەک لەو شێوانە وەربگرن کە یاسادانەری میسری لەم دەقەدا دەستنیشانی کردووە.

**سێیەم - یاسای ڕێکخستنی ڕۆژنامەگەری ژمارە (٩٦)ی ساڵی ١٩٩٦**

یاسادانەری میسری لە یاسای ڕێکخستنی ڕۆژنامەگەری ژمارە (٩٦)ی ساڵی ١٩٩٦ لە ماددەی پەنجاودوودا حوکمێکی وەکو حوکمی ماددەی نۆزدەهەمی یاسای دەسەڵاتی ڕۆژنامەگەری ژمارە(١٤٨)ی ساڵی ١٩٨٠ی داوە سەبارەت بەو کەسانەی کە مافی موڵکداریتی ڕۆژنامەگەریان هەیە لەگەڵ ئەو شێوانەی کە دەبێ بەکاریبهێنن کە بریتییە لە شێوەی هەرەوەزی و کۆمپانیای پشکداری (شركات مساهمة) هەروەها سەبارەت بەموڵکداریتیی پشکەکان.

بەڵام لە دیاریکردنی بڕی ئەو سەرمایەیەی کە دەبێ وەک بارمتەی دارایی بەر لە

---

٢١٦- ئەمەش دەقەکەیەتی: «ملكية الاحزاب السياسية والاشخاص الاعتبارية العامة والخاصة للصحف مكفولة طبقا للقانون».

دەرکردنی ڕۆژنامەکە لە بانق دابنرێ لێک جیاوازن. یاسای میسری ژمارە (٩٦)ی ساڵی ١٩٩٦ بۆ دیارکردنی بڕی ئەو بارمتەیە جیاوازی لە نێوان ئەو ڕۆژنامانەی و ڕۆژنامەی هەفتانە و مانگانەدا کردووە. بۆ جۆری یەکەم مەرجی دانانی بڕی سەرمایەی یەک ملیۆن جونەی و بۆ جۆری دووەمیش دوو سەد و پەنجا هەزار جونەی و بۆ جۆری سێیەمیش سەد هەزار جونەی داناوە. ئەمەی خوارەوەش دەقەکەیەتی: «موڵکداریتی هەریەک لە پارتە سیاسییەکان و کەسە مەعنەوییە گشتی و تایبەتییەکان بۆ ڕۆژنامەکانیان بەپێی یاسا کەفالەت کراوە.

مەرجە ئەو ڕۆژنامانەی کە کەسایەتییە مەعنەوییە تایبەتییەکان بێجگە لە پارتە سیاسییەکان و سەندیکاکان و یەکێتییەکان دەری دەکەن شێوەی هەرەوەزییەکان یان کۆمپانیای پشکداری وەربگرن بەمەرجێ دەبێ گشت پشکەکان لە هەردوو حاڵەتدا پشکی بەناوبن و بەتەنها موڵکی میسرییەکان بن و نابێت سەرمایەی کۆمپانیاکە لە یەک ملیۆن جونەی کەمتر بێت ئەگەر هاتوو ڕۆژانە بێت هەروەها دوو سەد و پەنجا هەزار جونەی ئەگەر هاتوو حەفتانە بوو هەروەها سەدهەزار جونەی ئەگەر هاتوو مانگانە بوو. بەر لە دەرکردنی ڕۆژنامەکە بەتەواوی لە یەکێک لە بانقە میسرییەکان دادەندرێ..»[٢١٧].

## ٣-٢-٢ یاسای لوبنانی

یاسادانەری لوبنانی لە یاسای چاپەمەنی ژمارە (٢٠)ی ساڵی ١٩٦٢ی هەمووارکراودا کاری بەسیستەمی بارمتەی دارایی کردووە و ڕێچکەیەکی جیاوازی لە ڕێچکەی یاسای میسری گرتۆتە بەر و جیاوازیی کردووە لە نێوان کۆمپانیا ڕۆژنامەوانییەکان و کەسە سروشتییە خاوەن ڕۆژنامەکان بۆ بڕی ئەو بارمتەیەی کە دەبێ بەر لە دەرکردن و بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامە و چاپکراوی دەوری دابنرێ. لە مادده (٣٣)دا مەرجی بوونی بارمتەیەک کە نابێ کەمتر بێ لە پێنج سەد هەزار لیرەی لوبنانی، داناوە بۆ کۆمپانیا

---

٢١٧- ئەمەش دەقەکەیەتی: «ملكية الصحف السياسية والاشخاص الاعتبارية العامة والخاصة للصحف مكفولة طبقا للقانون.

ويشترط في الصحف التي تصدرها الاشخاص الاعتبارية الخاصة فيما عدا الاحزاب السياسية والنقابات والاتحادات ان تتخذ شكل تعاونيات أو شركات مساهمة على ان تكون الاسهم جميعها في الحالتين اسمية ومملوكة للمصريين وحدهم وان لايقل رأسمال الشركة المدفوع عن مليون جنيه اذا كانت يومية ومائتين وخمسين الف جنيه اذا كانت اسبوعية و مائة الف جنيه اذا كانت شهرية، ويودع رأس المال بالكامل قبل اصدار الصحيفة في احد البنوك المصرية،...».

ڕۆژنامەوانییەکان و پێشکەشکردنی بارمتەیەکی دارایی یان قەواڵەیەکی بانکی (سند مصـرفي)ی کردووە بەبڕێکی دیاریکراو کە وەزیری ڕاگەیاندن دوای ڕاوێژکردن لەگەڵ سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی لوبنانی دیاری دەکات. ئەمەی خوارەوەش دەقەکەیەتی:

«بەخشینی مۆڵەت بەم مەرجانەی خوارەوە دەبەسترێتەوە:

أ- ......

ب- مەرجە کۆمپانیا ڕۆژنامەوانییەکان سەرمایەیان لە پێنج سەد هەزار لیرەی لوبنانی کەمتر نەبێت.

ج- خاوەنی چاپکراو پێویستە بارمتەیەکی نەقدیی یان بارمتەیەکی بانقیی پێشکەش بکات بۆ زامنکردنی قەرەبووی هەمـوو چەشنە زیانێک کـە دەکـەوێتـە ئەسـتـۆی ڕۆژنامەکە»[٢١٨].

### ٣-٢-٢ یاسای فەرەنسی

دانانی مەرجی بارمتـەی دارایی بۆ دەرکـردنی ڕۆژنامـە و چاپکراوی دەوری لە ئەسـڵـدا بیرۆکەیەکی فەرەنسـییە و بۆ یەکەمجار یاسادانەری فەرەنسـی لە یاسـای ڕۆژنامەگەری ساڵی ١٨١٦ لە ماددە (٣١)دا هێنایە کایەوە کە تیایدا داوای لە هەموو کەسێک کردووە کە دەیەوێ ڕۆژنامەیەک یان چاپکراوێکی دەوری دەربکات، هەموو یان هەندێکی تەرخان بکات بۆ هەواڵەکان یان کێشە سیاسییەکان، بارمتەیەکی دارایی دیاریکراو دابنێن ئەگەر هاتوو ڕۆژنامەکە یان چاپکراوە دەورییەکە مانگی زیاتر لە جارێک دەربچێت.

هەروەها ڕوونی کـردۆتەوە کـە مـەبەست لە دانانی ئەم بارمـتـە داراییـە زامنکردنی جێبەجێکردنی ئەو حوکمە داراییانەیە کە لەوانەیە دژی ڕۆژنامەکە یان چاپکراوە دەورییەکە دەربچن[٢١٩].

---

٢١٨- ئەمەش دەقەکەیەتی: «یقید منح الرخص بالشروط التالیة:

أ- ......

ب- یشترط في الشرکات الصحفیة الا یقل رأسمالها عن مبلغ خمسمائة الف لیرة لبنانیة.

ج- علی صاحب المطبوعة ان یقدم ضمانة نقدیة أو مصرفیة تضمن ما قد یترتب علیه من تعویضات مختلفة. تقدر وزارة الاعلام قیمة هذه الضمانة بعد استشارة نقابة الصحافة».

219- Andre Tou Lemon ■ M. Grelard code de lapresse, 2 edition, paris; librarie sirey . 1964 . p 60.

یاسادانەری فەرەنسی کاری بەسیستمی بارمتەی دارایی کرد بۆ دەرکردن و بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامە و چاپکراوی دەوری تا دەرچوونی یاسای ڕۆژنامەگەریی ۱۸۸۱/۷/۲۹ ئەوکات بەیەکجارەکی ئەم سیستمەی هەڵوەشاندەوە. لە ماددەی پێنجەمی یاسای ناوبراودا هاتووە: «هەر ڕۆژنامەیەک یان چاپکراوێکی دەوری بۆی هەیە بەبێ مۆڵەتی پێشەکی و بەبێ دانانی بارمتەی دارایی دوای جێبەجێکردنی ئەو ئاگاکارییەی کە لە ماددە (۷)دا هاتووە دەربچێ..»(۲۲۰).

بەم شێوەیە دوای دەرچوونی یاسای ڕۆژنامەگەریی ناوبراو، ڕۆژنامەگەریی فەرەنسی ڕزگاری بوو لە مەرجی دانانی بارمتەی دارایی.

### ۳-۲-٤ یاسای عێراقی

بۆ یەکەمین جار ڕۆژنامەگەری لە عێراقدا بەپێی یاسای چاپەمەنیی عوسمانی ۲ی شعبان ۱۲۸۱ هیجری بەرامبەر ۱۹ی کانونی یەکەم ۱۸٦٤ی زایینی ڕێکخراوە.
ئەم یاسایە مەرجی بارمتەی دارایی بۆ دەرکردن و بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامە دانەناوە(۲۲۱).
بەڵام دوای هەڵوەشانەوەی ئەم یاسایە بەیاسای چاپەمەنیی ۱۱ی ڕەجەب ۱۳۲۵ی هیجری بەرامبەر ۱٦ی تەموز ۱۹۰۹ی زایینی یاسادانەری عوسمانی کاری بەسیستمی بارمتەی دارایی کرد. بەپێی ماددە (۲) برگە (۳)ی یاسای ۱۹۰۹ دەبێ خاوەنی ئیمتیازی ڕۆژنامە و چاپکراوی دەوری بەر لە دەرکردنی ڕۆژنامەو چاپکراوە دەورییەکە بارمتەی دارایی دابنێ وەک مەرجێک لە مەرجەکانی وەرگرتنی مۆڵەت(۲۲۲).

---

۲۲۰- ئەمەی خوارەوەش دەقەکەیەتی بەزمانی فەرەنسی:

Tout journal ou écrit périodique peut être publié, sansautorisation préalable et sans dépôt de cautionnement, après la déclaration prescrite par l'article 7

۲۲۱- لە ماددەی (۳)ی یاسای ڕۆژنامەگەریی عوسمانی ناوبراودا هاتووە: «ئەو کەسەی دەیەوێت ڕۆژنامە دەربکات، ئەگەر هاوڵاتی دەوڵەتی عوسمانی بێت، پێویستە تەمەنی لە سی ساڵ کەمتر نەبێت و هیچ تاوانێک و کارێکی نایاسایی ئەنجام نەدابێت و خاوەنی مافی کەسایەتی خۆی بێت و بتوانێت سەربەخۆ کارەکانی ئەنجام بدات، بەو شێوەیە دەتوانێت مۆڵەت وەربگرێت» لە گۆڤاری «ڕۆژنامەڤانی» ژمارە (۳)ی ساڵی یەکەم کۆتایی کانوونی یەکەمی ساڵی ۲۰۰۰ ل ۱٦۳ وەرگیراوە عەبدوڵڵا نەجمەدین تەها لە (گزیدة اسناد سياسي ايران و عثماني) ج ۱ دفتر مطالعات سياسي وەریگرتووە.

۲۲۲- د. عبدالله اسماعيل البستاني: حرية الصحافة، سەرچاوەی پێشوو، ل۹۹.

هەروەها یاسای چاپەمەنیی عێراقی ژمارە (٥٧)ی ساڵی ١٩٣٣ کە جێی یاسای پێشووی گرتەوە هەمان سیستمی پەیڕەو کرد.

بەڵام بەدەرچوونی یاسای چاپەمەنیی ژمارە (٢٠٦)ی ساڵی ١٩٦٨ی هەمووارکراو رۆژنامەگەریی عێراقی لەم مەرجە ئازادکراو خاوەنی رۆژنامە یان چاپکراوی دەوری دەتوانێ بەبێ دانانی مسۆگەرکردنی دارایی رۆژنامە یان چاپکراوی دەوری دەربکات. هەروەکو لە دەقی ماددەی سێیەم و پێنجەمی یاسای ناوبراو بۆمان دەردەکەوێ[223].

## ٢-٣-٥ یاسای هەرێمی کوردستانی عێراق

یاسادانەری هەرێمی کوردستانی عێراق لە یاسای چاپەمەنی ژمارە (١٠)ی ساڵی ١٩٩٣دا مەرجی دانانی بارمتەی دارایی بۆ دەرکردنی رۆژنامە و چاپکراوی دەوری دانەناوە. ئەمەش هەنگاوێکی باشە بۆ ئازادکردنی رۆژنامەگەری لەم کۆتە. بەڵام سەرەڕای ئەمە میرانەی داناوە (رسوم)ی دەرهێنان و نوێکردنەوەی رۆژنامە و چاپکراوی دەوری و وەرگرتنی ئەم میرانەیەش بەداهاتێکی کۆتایی داناوە هەروەکو لە نووسراوی وەزارەتی دارایی و ئابووری هەرێمی کوردستان ژمارە(٦٧٩٥)ی ١٩٩٨/٨/١٠ کە ئاڕاستەی وەزارەتی رۆشنبیری کراوە هاتووە: «پێتان ڕادەگەیەنین لەکاتی تاوتوێکردنی بودجەی وەزارەتتان بۆ ساڵی ١٩٩٩ وادیارکەوت ڕسومی دەرهێنان و نوێکردنەوەی گۆڤار و رۆژنامەکان ناگونجێن لەگەڵ نرخەکانی ئێستا و هەردوولامان بەیەک گەیشتین لەسەر گۆڕینی ئەو ڕسوماتانە بەگوێرەی خشتەی خوارەوە بەمەرجێ لە ١/ ١٩٩٨/١٠ جێبەجێ بکرێ و پارەی داهات بەگوێرەی پسوولەی پارە وەرگرتنی ژمارە (٦/٣٧) وەربگیرێ و لە بانق دابنرێ وەکو داهاتێکی کۆتایی.. لەگەڵ ڕێزماندا.

مۆڵەتی دەرهێنانی گۆڤار و رۆژنامە ٥٠٠٠ پێنج هەزار دینار

نوێکردنەوەی گۆڤار و رۆژنامە ٣٠٠٠ سێ هەزار دینار ساڵانە»[224].

حێتی سەرنجە، ئەگەر مەبەست لە دانانی بارمتەی دارایی زامنکردنی بژارکردنی ئەو غەرامەیە یان قەرەبووە بێت کە دادگا دژی رۆژنامە یان چاپکراوە دەورییەکە دەریدەکات.

---

٢٢٣ - سەیری دەقی ماددەی (٣و٥) بکە لە برگەی (٣-١-٦) و (٣-٢-٦-٤) لەم تێزەدا.

٢٢٤ - بەنووسراوی وەزارەتی رۆشنبیریی هەرێمی کوردستان - بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی ڕاگەیاندن ژمارە ١٢٣٥/٤/١/٢ لە ١٩٩٨/١٠/٢٤ تەعمیم کراوە.

لە بڕینەوەی ئەو میرانەیە لە دانانی کۆسپ لەبەردەم کەسانی کەم دەرامەت بۆ دەرکردنی ڕۆژنامە و چاپەمەنیی دەوری بەولاوە هیچ مەبەستێکی تر بەدی ناکەین.

لە هەرێمی کوردستانی عێراق، جارێ ڕۆژنامەگەری نەبۆتە پیشەسازی، تاکو پابەندی باج و میرانە بکرێت، بەپێچەوانەی وڵاتە پێشکەوتووەکان، کە لەوێدا دەمێکە بۆتە پیشەسازی و سەرمایەداران سەرمایەکانیان لەم بوارەدا دەخەنە گەڕەوە بەمەبەستی وەبەرهێنانی سەرمایەکانیان، کەچی سەرەڕای ئەمەش، هێشتان لە هەندێک لەو وڵاتانەدا میرانە بۆ بەخشینی مۆڵەت و نوێکردنەوەی لە خاوەن ڕۆژنامەکان وەرناگیرێت. دەیانەوێ هانی ڕۆژنامەنووسان بدەن بۆ ئەوەی لە ڕێگای ڕۆژنامەکانیانەوە بەشداری بکەن لە دەستنیشانکردنی ڕەوتەکانی ڕای گشتیی کۆمەڵ، تا لەبەر ڕۆشنایی ئەمەدا بڕیاری گونجاو بۆ کێشە کۆمەڵایەتییەکان وەربگیرێت.

ئەمە لەلایەک، لەلایەکی تریشەوە ئەمڕۆ، ڕۆژنامەنووسان زیاتر لە هەموو کاتێک دەرفەتیان بەدەستەوەیە بۆ گوزارشتکردن لە بیروڕاکانیان، جا ئەم فشارە داراییە، لەوانەیە وا لە هەندێکیان بکات ڕوو لە تۆڕی ئینتەرنێت بکەن و بۆ خۆیان شوێنێک لەسەر ئەو تۆڕە بکەنەوە کە ئاسانتر و ئازادانەتر و بەربڵاوتریشە لە ڕۆژنامەگەریی چاپکراو و بەنرخێکی زۆر کەمتریش مەیسەر دەبێت[٢٢٥].

هەروەها ئەم نووسراوە لەگەڵ گیانی یاسای ناوبراو و حوکمی ماددەی دووەمیدا ناگونجێ کە دەقنووسی کردووە: «هەر هاووڵاتییەک سەربەستە لە دەرکردنی هەر چاپەمەنییەکدا بەپێی حوکمەکانی ئەم یاسایە».

شایەنی ئاماژەبۆکردنە، بەر لە دەرچوونی ڕێنمایی وەزارەتی دارایی، کار بەڕێنمایی وەزارەتی ڕۆشنبیریی هەرێمی کوردستان ژمارە (٣)ی ساڵی ١٩٩٥ سەبارەت بەئاسانکردنی جێبەجێکردنی یاسای چاپەمەنی کوردستان ژمارە (١٠)ی ساڵی ١٩٩٣،

---

٢٢٥- ڕۆژنامەی ئەلیکترۆنی کە ناسراوە بەئۆنلاین (Online) یان ڕۆژنامەی ئینتەرنێت، تێچوونەکەی زۆر کەمترە لە تێچوونی ڕۆژنامەی چاپکراو، چونکە تەنها پێتچنیی کۆمپیوتەریی دەوێ و پێویست ناکات وەکو ڕۆژنامەی چاپکراو وێنەی نووسینەکان جارێکی تر بگیرێتەوەو بخرێتە سەر فلیم یان ترێس و دوایش بخرێتە سەر پلێت و ئینجا بخرێتە سەر کاغەز. هەڵبەتە هەر قۆناغێک لەو قۆناغانەی ڕۆژنامەی چاپکراو خەرجییەکی زۆری دەوێ. چونکە بێ لەم پێداویستییانەی باسمان کردن، ڕۆژنامەی چاپکراو پێویستی بەمەرەکەب و دڵۆپەر و ئیستراتۆنیش هەیە، ئەمەو وێڕای ئەوەی ڕێژەیەکیش لە چاپکراوەکە هەر لە کاتی چاپکردندا خەسار دەبێت.

دەکرا، بەپێی برگەی چوارەمی ئەو ڕێنماییە، میرانەی مۆڵەتی دەرهێنانی ڕۆژنامە و گۆڤار (١٥٠٠) دینار و میرانەی نوێکردنەوەی ڕۆژنامەی ڕۆژانەش (١٠٠٠) دینار ساڵانە و، نوێکردنەوەی ئەو ڕۆژنامە و گۆڤارانەی کە هەفتانە یان چەند هەفتە جارێک یان مانگانە یان بەوەرزی یان ساڵانە دەردەچن (٥٠٠) دینار بوو.

هەڵبەتە، بەهای دراوی عێراقی چاپی سویسری، ئەمڕۆ لەچاو ئەو ساڵەدا، لە چاو دۆلاری ئەمریکی گەلێک زیاترە. بۆیە، بەڕای ئێمە، زیادکردنی ئەم میرانەیە. لەم هەل و مەرجەی ئێمڕۆکەدا هیچ پاساوێکی بۆ نییە.

بۆیە پێشنیار دەکەین، هیچ جۆرە میرانەیەک لەسەر دەرکردن و نوێکردنەوی ڕۆژنامە و چاپکراوی دەوریدا نەمێنێت و دەرچوونی بەردەوام بێت تا ئەوکاتەی مەرجەکانی بوونیی لە دەست دەدات. ئەمەش دەبێتە هاندەرێک بۆ بڵاوبوونەوە و پێشڤەچوونی ڕۆژنامەی ئەهلی و سەربەخۆ کە هیوا و ئاواتی ئەم گەلەیە.

### ٣-٢-٦ هەڵسەنگاندنی سیستمی بارمتەی دارایی:

ئەگەر سەرنجی دەقی ئەو یاسایانەی کە مەرجی بارمتەی داراییان بۆ دەرکردن و بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامە و چاپکراوی دەوری داناوە، بدەین دەڕوانین کە بەوە پاساویان هێناوەتەوە گوایا بۆ زامنکردنی جێبەجێکردنی ئەو حوکمە داراییانەیە کە دژی ڕۆژنامە یان چاپکراوە دەورییەکان دەردەچن. واتە بۆ دابینکردنی ئەو قەرەبووە یان غەرامەیە، کە لە ئاکامی سەرپێچیکردنی یاساکان، دادگا بەسەر ڕۆژنامە یان چاپکراوە دەورییەکەدا دەیسەپێنن.

بەڵام لە حەقیقەتدا، ڕەنگە مەبەستی سەرەکی لە دانانی مەرجی بارمتە، دانانی کۆسپ بێت لەبەردەم ئەو دەست کورتانەی پێیان ناکرێ بۆ دەربڕینی بیروڕای خۆیان ڕۆژنامە و چاپکراوی دەوری دەربکەن، پتر لەوەی بۆ قەرەبوو بێت، بەڵگەیش ئەوەیە لە هەموو دەوڵەتێکدا یاسای تایبەت هەیە بۆ جێبەجێکردنی حوکمەکانی دادگا، جا ئەو حوکمانە چ داراییبن یان نادارایی. ئەو یاسایە کۆمەڵێک هۆکاری دەستەبەر کردووە بۆ کەفالەتکردنی جێبەجێکردنی حوکمەکانی دادگا.[٢٢٦]

---

٢٢٦- بڕوانە یاسای جێبەجێکردنی عێراقی ژمارە (٤٥)ی ساڵی ١٩٨٠ کە یاسایەکی تایبەتە بەجێبەجێکردنی حوکم و بڕیارەکانی دادگای عێراقی. لە ڕۆژنامەی «الوقائع العراقية» ژمارە (٢٧٦٢)ی ١٧ / ٣/ ١٩٨ بڵاوکراوەتەوە.

بەڕای ئێمە، ئەم بیرۆکەیە پەیوەندیی هەیە بەئایدیۆلۆژیای بۆرژوازییەکان و مەبەستی سەرەکی لە دانانیدا بریتی بووە لە مۆنۆپۆلکردنی ڕۆژنامە و چاپکراوی دەوری لەلایەن چینی بۆرژوازییەوە و بێبەشکردنی چینی هەژارانە لێی. هەروەها ئەم سیستەمە لەگەڵ پرینسیپەکانی مافی مرۆڤ و دیموکراسییەت کەمتر گونجاوە و ڕەنگە گرنگترین پرینسیپ لە پرینسیپەکانی مافی مرۆڤ بروخێنێ کە پرینسیپی یەکسانیی مرۆڤە لە زۆر ڕووەوە[227].

## ٣- ٤ ئاگاکاری و ڕاگرتن و هەڵوەشاندنەوە

ئاگاکاری (ئاگادارکردنەوە) بریتییە لە سەرنج ڕاکێشانی خاوەنی ئیمتیاز یان سەرنووسەری ڕۆژنامە لەلایەن ئیدارەوە، ئەگەر هاتوو سەرپێچی حوکمەکانی یاسای چاپەمەنییان کرد، یان هەربابەتێکی دژ بەبەرژەوەندیی گشتییان بڵاوکردەوە لە یاسای چاپەمەنی هەندێ وڵاتدا.

بەڵام ڕاگرتن و هەڵوەشاندنەوە، بریتییە لە یاساغکردنی ڕۆژنامە بۆ ماوەیەکی کاتیی یان هەمیشەیی، ئەگەر هاتوو سەرپێچی حوکمەکانی یاسای چاپەمەنی کرد یان هەر بابەتێکی دژ بەبەرژەوەندیی گشتی بڵاوکردەوە لە یاسای چاپەمەنی هەندێ وڵاتدا. لە ڕێگای دادنووسەوە ئیدارە ئاگادارکردنەوەکە ئاڕاستەی لایەنی پەیوەندیدار دەکات، بەڵام ڕاگرتن و هەڵوەشاندنەوەی ڕۆژنامە، لەوانەیە بەبڕیارێکی کارگێڕیی بێت، ئەوکاتە پێی دەوترێت ڕاگرتن و هەڵوەشاندنەوەی کارگێڕیی، لەوانەشە بەبڕیارێکی دادگایی بێت، ئەوکاتە پێی دەگوترێت ڕاگرتن و هەڵوەشاندنەوەی دادوەری.

سەبارەت بەئاگاکاری هیچ لاریان نییە لەسەر ئەوە کە ئیدارە پێی هەڵدەستێت، چونکە ئەم کارە هەر لە بنەڕەتەوە، کاری ئیدارەیە نەک دادگا، بەڵام ڕاگرتن و هەڵوەشاندنەوە کە دوو سزای قورسترن لە سزای ئاگاکاری، دەشێن کاری کارگێڕی یان دادوەری بن بەپێی سیستمی جیاجیا، بەڵام وەکو پرینسیپ دادگا تایبەتمەندە بەسەپاندنییان، بۆیە هەڵسانی ئیدارە بەم کارە خۆی لە خۆیدا هەڕەشەیە لە ئازادیی ڕۆژنامەگەری، چونکە بەهۆیەوە،

---

٢٢٧- سەرهەڵدانی ئەم بیرۆکەیە بۆ یەکەمین جار دەگەڕێتەوە بۆ ئەو پێشنیارەی کە شاتۆ بریسان لە کتێبەکەی «La Monarchie selon la charte chapitre» کردی کە لە ساڵی ١٨١٦ لە پاریس بڵاویکردەوە و دواتر یاسادانەری فەرەنسی لە یاسای ڕۆژنامەگەریی ساڵی ١٨١٩دا بۆ یەکەمین جار کاری پێ کرد. بڕوانە: عبدالله اسماعيل البستاني: حرية الصحافة، سەرچاوەی پێشوو١٤٦.

هەمـوودەم ئیـدارە دەتوانێ ڕۆژنامـە و چاپکراوە دەورییـەکـان بخـاتە مـەترسی ڕاگـرتن و هەڵوەشاندنەوەی کاتیی و هەمیشـەییـیەوە. هەسـتانی ئیدارە بەم کارە، دوور لە دادگایەکی دادپەروەرانە، نیشـانەی دەست بەسـەراگـرتنی مـافی ئازادیی ڕۆژنامـەگـەرییـە[228]. لە خوارەوە لە پێنج خاڵدا باسی ئەم بابەتە لە یاسای چاپەمەنیی هەرێمی کوردسـتان و یاسای بەراوردا دەکەین:

### ٣-٤-١ ئاگاکاری و ڕاگرتن و هەڵوەشاندنەوە لە یاسای میسریدا

١- یاسـای چاپەمەنیی ژمارە (٢٠)ی ساڵی ١٩٣٦ هەمووارکراو

یاسـادانەری میـسـری، لە یاسـای چاپەمـەنیی ژمـارە (٢٠)ی سـاڵی ١٩٣٦ی هەموارکراودا، هەرچەندە مەرجی وەرگرتنی مۆڵەتی پێشەکی بۆ دەرکردن و بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامە و چاپکراوی دەوری دانەناوە، بەڵکو لە جیاتی ئەوە، لە ماددەی (١٣)دا، کاری بەسـتـنی ئاگاکاری ڕەها کردووە، هەروەکو پێشتر ئاماژەمان پێی کرد[229]، بەڵام سەرەڕای ئەمەش، لە هەندێ حاڵەتی دیاریکراودا ڕێگای بەئیدارە داوە، ئاگاداری خاوەنی ئیمتیاز و سـەرنووسـەر یان ڕۆژنامەکە بکاتەوە، ئەگەر هاتوو سـەرپێچی حوکمـەکانی یاسـایان کرد، هەروەها ڕۆژنامەکە بۆ ماوەیەکی کاتیی یان هەمیشـەیی ڕابگرێ یان هەڵی بوەشێنێتەوە.

بەپێی ماددە (١٦) لە یاسـای میـسـری ناوبراو، ئەگـەر هاتوو بڕی ئەو بارمـتـەیە کـەم بۆوە، کە بەپێی حوکمی ماددە (١٥) لە هەمان یاسـادا بۆ دەرکردنی ڕۆژنامە یان چاپکراوە دەورییەکە لەلایەن پێشکەشکەرانی ئاگاداریـیەکە داندرابوو[230]، دەبێ لە ماوەی پێنج ڕۆژ لەدوای ئاگـادارکـردنەوەیان لەلایەن ئیـدارەوە تەواوی بکەن. ئەمـەش دەقـەکـەیەتی: «ئەگەر هاتوو بڕی مـسۆگـەرییەکە کەمتر بۆوە لەو بڕەی کە لە ماددەی پێشوودا دیارکراوە، لە ماوەی پێنج ڕۆژ دوای ئاگادارکردنەوەی لەلایەن ئیدارەوە دەبێ تەواو بکرێت...».

وە بەپێی حوکمی ماددە (١٨)ی یاسای ناوبراو، ئەگەر هاتوو ڕۆژنامەکە یان چاپکراوە خولەکییەکە، لە ماوەی سێمانگ دوای ئەو ئاگادارکردنەوەیەی کە لەلایەن (صاحب

---

228- http://www.ahramorg.eg/faj/act22htm29/9/2001.

٢٢٩- بۆ دەقی ئەم ماددەیە، بڕوانە بڕگەی (٣-١-١) بەسـتـنی ئاگاکاری لە یاسای چاپەمەنی و یاسای دەسەڵاتی ڕۆژنامەگەریی میسریدا.

٢٣٠- بۆ دەقی ئەم ماددەیە، بڕوانە بڕگەی (٣-٣-١) یاسای میسری پەراوێزی (٢١٤) لەم تێزەدا.

الشـأن) دوه بۆ ئیدارە بەرز دەکرێتەوە بۆ دەرکردنی ڕۆژنامە یان چاپکراوی دەوری، دەرنەچوو، یان لە ماوەی شەش مانگی دوای ئەو ئاگادارییەدا بەڕێکوپێکی دەرنەچوو، ئەوا، لەحاڵەتی یەکەمدا، ئاگادارییەکە پشت گوێ دەخرێت و بەنەبوو دادەندرێت و نابێ لەسەر ئەو ئەساسە ڕۆژنامەکە یان چاپکراوە دەورییەکە دەربکرێت و لە حاڵەتی دووەمیشدا، وەزیری ناوخۆ سەبارەت بەدەرچوونی ڕۆژنامەکە یان چاپکراوە دەورییەکە بەناڕێکی ئاگاداری خاوەن مەبەست (صاحب الشأن) دەکاتەوە. ئەمەش دەقەکەیەتی:

«ئەگەر هاتوو ڕۆژنامەکە لە ماوەی سێمانگ لە ڕۆژی ئاگادارکردنەوەکە دەرنەچوو، یان لە ماوەی شەش مانگ بەڕێکوپێکی دەرنەچوو، ئاگادارییەکە بەنەبوو دادەندرێت و سەلماندنی ناڕێکوپێکی دەرچوونی ڕۆژنامەکە کە لە حاڵەتی دووەمدا ئاماژەی پێ کراوە بەبڕیارێکی وەزیری ناوخۆ دەبێت کە ئاگاداری خاوەن مەبەستی پێ دەکاتەوە».

یاسادانەری میسری لە مادەی (٢٢)دا زۆر بەڕاشکاوییەوە ئەو ڕۆژنامانەی کە لە میسر بەزمانی بیانی دەردەچن و سەرنووسەرەکانیان یان نووسەرە بەرپرسەکانیان ناچنە ژێرباری دادگـای ئەهلی، لەژێر دەسەڵاتی دادگـا دەرهێناوە و ڕێگای داوە بەئیدارە دوای ئاگادارکردنەوەی لەلایەن وەزیری ناوخۆوە یاخود بەبێ ئاگادارکردنەوەی بەبڕیارێکی ئەنجوومەنی وەزیران بەمەبەستی پاراستنی سیستمی گشتی ڕابگیرێت بۆ ماوەی پانزە ڕۆژ ئەگەر هاتوو ڕۆژنامەکە سێجار یان زیاتر لە هەفتەیەکدا دەربچێ، بۆ ماوەی یەک مانگ ئەگەر هاتوو هەفتانە بوو، بۆ ماوەی سێمانگ لە حاڵەتەکانی تردا[٢٣١].

هەروەها، لە مادەی (٣٤)دا زۆر بەڕاشکاوی، جەختیکردووە، ئەو حوکمانەی کە دادگا دەریان دەکات یان ئەو بڕیارانەی کە ئیدارە دەری دەکات بێگوێدانە لاریبوونی خاوەنی ڕۆژنامە یان چاپخانە یان هەر کەسێکی تری خاوەن مەبەست جێبەجێ دەکرێت[٢٣٢].

ئەوەی لەم دەقە یاساییانەدا تێبینی دەکرێت، ئەوەیە. یاسادانەری میسری کەوتۆتە

---

٢٣١- ئەمەش دەقەکەیەتی: «الجرائد التي تصدر في مصر بلغة اجنبية ويكون رئيس تحريرها او محررها المسئولون غير خاضعين للمحاكم الاهلية يجوز محافظة على النظام العام تعطيلها بقرار خاص من مجلس الوزرا، بعد انذار يوجهه اليها وزير الداخلية او بدون انذار سابق وذلك لمدة خمسة عشر يوما اذا كانت الجريدة تصدر ثلاث مرات او اكثر في الاسبوع او لمدة شهر اذا كانت تصدر اسبوعيا او لمدة ثلاثة شهور في الاحوال الاخرى».

٢٣٢- ئەمەش دەقەکەیەتی: «ينفذ مايصدر من الاحكام او مايأمر به من التدابير الادارية بمقتضى هذا القانون بدون نظر الى معارضة صاحب الجريدة او المطبعة او أي شخص اخر ذي شأن».

دژوارییەوە. لەلایەک لە ڕێگای دانپیانانی بەسیستمی یاداشتنامەی ڕەهاوە، هەوڵیداوە ڕۆژنامە لەژێر دەسەڵاتی حکومەت دەربهێنێت و ئازادیی بۆ دەستەبەر بکات، کەچی لە لایەکی تریشەوە، نەک هەر خستوویەتییە ژێر کۆنترۆڵی حکومەتەوە، بەڵکو ڕێگاشی نەداوە تیدارە گوێ لە لاریبوونی خاوەنی ڕۆژنامە یان خاوەن چاپخانە یاخود هەر کەسێکیکە بگرێت لە پیادەکردنی دەسەڵاتەکەیدا.

بەمانایەکی تر، بەئاشکرا دەسەڵات بەئیدارە دراوە، بۆ ئاگاداركردنەوە و ڕاگرتن و هەڵوەشاندنەوەی ڕۆژنامە بەبێ پەنابردنەبەر دادگا بۆ وەرگرتنی حوکمێکی لەم بابەتە.

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ، کە ئازادیی ڕۆژنامەگەری بەپێی ئەم یاسایە، دەبوو لەژێر هەڕەشەو فشاری حکومەت دابوایە و لە چوارچێوەی سیاسەتی گشتیی ئەو لایەنەدایە.

٢- یاسای دەسەڵاتی ڕۆژنامەگەریی ژمارە (١٤٨)ی ساڵی ١٩٨٠

لە مادەی (١)ی یاسای دەسەڵاتی ڕۆژنامەگەریی ژمارە (١٤٨)ی ساڵی ١٩٨٠دا هاتووە: «ڕۆژنامەگەری دەسەڵاتێکی جەماوەریی سەربەخۆیە بەئازادی پەیامی خۆی لە خزمەتی کۆمەڵ پیادە دەکات، گوزارشت لە ڕەوتەکانی ڕای گشتی دەکات و بەشداری دەکات لە پێکهاتن و ئاراستەکردنیدا بەهەموو جۆرە شێوازێکی گوزارشتکردن لە چوارچێوەی بنچینە بنەڕەتییەکانی کۆمەڵ و پاراستنی ماف و ئازادی و ئەرکە گشتییەکان و ڕێزگرتن لە ژیانی تایبەتیی هاووڵاتییان».

ئەم دەقە کۆکە لەگەڵ دەقی مادەی (٢٠٦ و ٢٠٧)ی دەستووری میسری ساڵی ١٩٧١ سەبارەت بەدانانی ڕۆژنامەگەری بەدەسەڵاتێکی جەماوەریی سەربەخۆ. لە مادەی (٢٠٦)ی دەستووردا هاتووە: «ڕۆژنامەگەری دەسەڵاتێکی جەماوەریی سەربەخۆیە پەیامی خۆی بەوشێوەیە پیادە دەکات کە لە دەستوور و یاسادا دیارکراوە». هەروەها لە مادەی (٢٠٧)دا هاتووە: «ڕۆژنامەگەری بەئازادی و سەربەخۆیی پەیامی خۆی لە خزمەتی کۆمەڵ بەهەموو جۆرە شێوازێکی گوزارشتکردن پیادە دەکات بۆ تەعبیرکردن لە ڕەوتەکانی ڕای گشتی و بەشداریکردن لە پێکهاتەکانی و ئاراستەکردنیدا لە چوارچێوەی بنچینە بنەڕەتییەکانی کۆمەڵ و پاراستنی ماف و ئازادی و ئەرکە گشتییەکان و ڕێزگرتن لە ژیانی تایبەتیی هاووڵاتییان».

بەم پێیە، ڕۆژنامەگەری لە دەسەڵاتی حکومەت ئازاد کراوە بوو وەکو دەسەڵاتێکی سەربەخۆ و ئازاد مامەڵەی لەگەڵ کرابوو، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە بەپێی دەستووری

ساڵی ١٩٧١ و یاسای دەسەڵاتی ڕۆژنامەگەریی ناوبراو، ڕۆژنامەگەری بەدەسەڵاتێکی گشتیی دانرابوو لە پاڵ هەرسێ دەسەڵاتە گشتییەکەی وڵاتدا، هەروەکو لەو یاداشتنامەیەدا هاتبوو کە لەلایەن وەزیری دەوڵەتی میسری بۆ کاروباری ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندن لەگەڵ پڕۆژەی یاسای ناوبراودا بۆ ئەنجومەنی یاسادانانی میسری (ئەنجومەنی گەل) بەرز کراوەتەوە و تیایدا هاتووە: «بەم پێیە ڕۆژنامەگەری لە وڵاتدا بۆتە دەسەڵاتی چوارەم لە پاڵ سێ دەسەڵاتە ئاساییەکە»[٢٢٣].

بۆیە، لە ڕێگای دادگاوە نەبێت، ئیدارە بۆی نەبوو، ڕاستەوخۆ ئاگاداری ڕۆژنامە بکاتەوە یان ڕایبگرێت، یان هەڵیبوەشێنێتەوە. لەسەر ئەم ئەساسە، دەستووری میسری بەئاشکرا لە ماددە (٤٨)دا ئاگادارکردنەوە و ڕاگرتن و هەڵوەشاندنەوەی ڕۆژنامەی بەڕێگای کارگێڕی قەدەغە کردووە ئەمەش دەقەکەیەتی: «ئازادیی ڕۆژنامەگەری و چاپ و بڵاوکردنەوە کەفالەت کراوە، و دانانی سانسۆر لەسەر ڕۆژنامەگەری یاساغ کراوە، هەروەها ئاگادارکردنەوەی یان ڕاگرتنی یان هەڵوەشانەوەی بەڕێگای کارگێڕی یاساغ کراوە...».

لێرەدا بۆمان دەردەکەوێ، ئەرکی سەپاندنی ئەم سزا یاساییانە، سپێردراوە بەدەسەڵاتی دادوەری لە ڕێگای ئەو دەقە یاساییانەی کە لە یاسای چاپەمەنی و یاسای دەسەڵاتی ڕۆژنامەگەری و یاسای سزاداندا هاتووە[٢٢٤].

٣- یاسای ڕێکخستنی ڕۆژنامەگەری ژمارە ٩٦ی ساڵی ١٩٩٦

یاسادانەری میسری لە یاسای ڕێکخستنی ڕۆژنامەگەریی ژمارە ٩٦ی ساڵی ١٩٩٦دا هەمان ڕێچکەی یاسای دەسەڵاتی ڕۆژنامەگەریی ژمارە ١٤٨ی ساڵی ١٩٨٠ی گرتۆتەبەر سەبارەت بەدانانی ڕۆژنامەگەری بەدەسەڵاتێکی جەماوەریی سەربەخۆ، هەروەکو لە ماددە (١)دا دەقنووسی کردووە: «ڕۆژنامەگەری دەسەڵاتێکی جەماوەرییە پەیامی خۆی بەئازادییەکی بەرپرسانە (حرية مسؤلة) لە خزمەتی کۆمەڵدا مومارەسە دەکات...».

---

٢٢٣- د. عبدالحميد الشواربي: جرائم الصحافة والنشر، سەرچاوەی پێشوو، ل١٨٦.

٢٢٤- یاسای دەسەڵاتی ڕۆژنامەگەریی ژمارە (١٤٨)ی ساڵی ١٩٨٠ حاڵەتەکانی هەڵوەشاندنەوەی مۆڵەتی دەرکردنی ڕۆژنامەی لە ماددەی (١٦، ١٧)دا ڕێکخستووە، و حاڵەتەکانی ڕاگرتنیشی لە ماددەی (١٤، ٢١)دا ڕێکخستووە. هەروەها یاسای چاپەمەنیی ژمارە (٢٠)ی ساڵی ١٩٣٦ لە ماددە (٢٦، ٢٧)دا هەندێ حاڵەتی تری ڕاگرتنی دەستنیشان کردووە، لە کاتێکدا یاسای سزادانی میسری ژمارە (٥٧)ی ساڵی ١٩٣٨ حاڵەتەکانی هەڵوەشاندنەوەی لە ماددە (١٩٨)دا دیارکردووە و حاڵەتەکانی ڕاگرتنیشی لە ماددە (١٩٩، ٢٠٠) دەستنیشان کردووە.

ئەگەر سەرنجی ئەم دەقە بدەین، بۆمان دەردەکەوێ یاسادانەری میسری لێرەدا بەپێچەوانەی یاسای پێشوو، ئازادیی ڕۆژنامەگەریی بەلێپرسینەوەوە بەستۆتەوە. بۆیە زاراوەی (بەرپرسانە)ی بۆ ئازادییەکە زیاد کردووە. دیارە لێرەدا یاسادانەر ویستوویەتی ئەوە دووپات بکاتەوە کە سەرەڕای دەستەبەرکردنی ئەم هەموو گرێنتییە دەستووری و یاساییانە بۆ ئازادیی ڕۆژنامەگەری، بەڵام ئەم ئازادییە بێ لێپرسینەوە نییە.

بۆیە دەبینین، دوای ئەوەی ئەم مەسەلەیەی یەکلا کردۆتەوە، زۆر بەئاشکراو بێ پێچ و پەنا لە ماددە (٥)دا جەختی لەسەر ئەوە کردووە کە دەست بەسەراگرتن و ڕاگرتنی ڕۆژنامە و هەڵوەشاندنەوەی مۆڵەتەکەی بەڕێگای کارگێڕیی یاساغە. ئەمەش دەقەکەیەتی: «دەست بەسەراگرتنی ڕۆژنامە یان ڕاگرتنی یان هەڵوەشاندنەوەی مۆڵەتەکەی بەڕێگای کارگێڕیی یاساغە».

ئەم حوکمەش گونجاوە لەگەڵ ماددە (٤٨)ی دەستووری میسری ساڵی ١٩٧١ کە ئاگادارکردنەوە و ڕاگرتنی ڕۆژنامە و هەڵوەشاندنەوەی مۆڵەتەکەی یاساغ کردووە[٢٣٥].

ئەوەی تێبینی دەکرێ لەم دەقەدا ئەوەیە، یاسادانەر بەپێچەوانەی یاسای ژمارە ١٤٨ی ساڵی ١٩٨٠ ئەمجارەیان باسی ئاگادارکردنەوەی نەکردووە، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە ئیدارە بۆی هەبێ ڕاستەوخۆ ئاگادارییەک ئاراستەی خاوەنی ئیمتیاز و سەرنووسەری ڕۆژنامە یان ڕۆژنامەکە بکات، کە دەستوور ئەمەی بەئاشکرا یاساغ کردووە. چونکە دەقەکانی دەستوور باڵاترن لە دەقەکانی یاسا و نابێ یاسا لەگەڵیا ناکۆک بێ.

کەواتە، ئیدارە بۆ ئاگادارکردنەوەی خاوەنی ئیمتیاز و سەرنووسەری ڕۆژنامە لە سەرپێچییە یاساییەکانیاندا، هەروەها بۆ ڕاگرتنی ڕۆژنامە و هەڵوەشاندنەوەی مۆڵەتی دەرکردنی دەبێ پەنا بباتە بەر دادگا بۆ یەکلاکردنەوەی بەپێی حوکمەکانی یاسا.

### ٣-٤-٢ ئاگاداری و ڕاگرتن و هەڵوەشاندنەوە لە یاسای لوبنانیدا

یاسادانەری لوبنانی لە دەستووری ساڵی ١٩٢٦ی بەرکاردا (الدستور النافذ) هەرچەندە کەفالەتی ئازادیی بیروڕا دەربڕینی کردووە[٢٣٦]، بەڵام وەکو یاسادانەری

---

٢٣٥- بڕوانە دەقی ماددەی ناوبراو لە خاڵی پێشوو کە ئاماژەمان پێی کردووە.

٢٣٦- بڕوانە ماددە (١٣) کە ئەمەش دەقەکەیەتی: «ئازادیی ڕادەربڕین بەقسە و بەنووسین و ئازادیی چاپەمەنی و ئازادیی کۆبوونەوە و ئازادیی پێکهێنانی کۆمەڵە، هەموویان لە چوارچێوەی یاسادا کەفالەت کراون».

میسری بەدەسەڵاتێکی جەماوەریی سەربەخۆی دانەناوە و ئاگادارکردنەوە و ڕاگرتنی ڕۆژنامە و هەڵوەشاندنەوەی مۆڵەتەکەی بەڕێگای کارگێڕی یاسایی نەکردووە. بۆیە ئەگەر بێت و سەرنجی یاسای چاپەمەنیی لوبنانی ساڵی ١٩٦٢ی هەموارکراو بدەین، دەبینین دەسەڵاتێکی زۆر فراوانی بەوەزیری ڕاگەیاندن داوە بۆ ئاگادارکردنەوە و ڕاگرتنی ڕۆژنامە و هەڵوەشاندنەوەی مۆڵەتەکەی بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ و بەبێ پەنابردنە بەر دادگا. لە هەندێ حاڵەتیشدا، یاسادانەر ئەرکی سەپاندنی ئەم سزایانەی بەدەسەڵاتی دادوەری سپاردووە.

سەبارەت بەحاڵەتی یەکەم، بەپێی حوکمی مادده (٢٩) و (٤٢)ی یاسای چاپەمەنیی لوبنانی ١٩٦٢/٩/١٤ وەزیری ڕاگەیاندن بۆی هەیە لە چەند حاڵەتێکی دیاریکراودا ئاگاداری ڕۆژنامە بکاتەوە بەئاکامی سەرپێچییە یاساییەکانی بۆ ئەوەی باری خۆی ڕاست بکاتەوە بەر لە ڕاگرتنی بۆ ماوەیەکی کاتیی یان هەمیشەیی یان هەڵوەشاندنەوەی مۆڵەتەکەی. لە مادده (٢٩)دا هاتووە: «دەبێ وەزیری ڕاگەیاندن مۆڵەتی دەرکردنی ڕۆژنامە وەربگرێتەوە دوای ئاگادارکردنەوەی بەدوو هەفتە لە یەکێک لەم حاڵەتانەی خوارەوە:

یەکەم: ئەگەر لە ماوەی شەش مانگی تەواودا، لە ڕۆژی بەخشینی مۆڵەتەوە یان لە ڕۆژی بەجێ هێشتنی لە هەموو یان بەشێکی بۆ غەیری خۆی یان لە ڕۆژی گەڕانەوەی مافی دەرکردنی بەپێی حوکمی دادگا یان بڕیاری کارگێڕیی، دەرنەچوو.

دووەم: ئەگەر لە دوای دەرچوونییەوە بەبەردەوامی ڕاوەستا بەدرێژایی سێ مانگی لە دوای یەک، بەڵام وەزیری ڕاگەیاندن بۆی هەیە ئەم ماوەیە درێژ بکاتەوە دوای ڕاوێژکردنی سەندیکای ڕۆژنامەنووسان بەبڕیارێکی پاساودار.

سێیەم: ئەگەر هاتوو سنووری مۆڵەتەکەی خۆی بەزاند بەپێچەوانەی ئەو پێناسەیەی کە لە مادده (٥) و (٦) و (٧) لەم یاسایەدا دیارکراوە.

چوارەم: ئەگەر هاتوو بەدیارکەوت کە خاوەنەکەی ئەو مەرجانەی تێدا نەماوە کە بەپێی مادده (٣٠) و (٣٣) و (٣٤)ی ئەم یاسایە بەسەریدا سەپاوە.

ئەو خاوەن چاپکراوەی بەپێی حوکمی ئەم ماددەیە مۆڵەتەکەی لێ وەرگیراوەتەوە، بەر لە تەواوکردنی ساڵێکی تەواو دوای وەرگرتنەوەی مۆڵەتەکەی، مۆڵەتی نوێی نادرێتێ».

شایەنی ئاماژەبۆکردنە، مادده (٥)ی یاسای ناوبراو تایبەتە بەپێناسەی چاپکراوی

دەوری و تیایدا هاتووە: «چاپکراوی دەوری هەموو چاپکراوێک یان بڵاوکراوەیەک دەگرێتەوە کە بەشێوەیەکی بەردەوام لەژێر ناوونیشانێکی دیاریکراو و چەند زنجیرەیەکی یەک لە دوای یەک دەربچێت و ئامادەبێت بۆ دابەشکردنی بەسەر جەماوەردا».

وە لە مادده (٦)دا پێناسەی هەفتەنامەی کردووە کە ئەو چاپکراوەیەیە کە لە هەفتەیەکدا لە یەکجار زیاتر دەرناچێت.

بەڵام لە مادده (٧)دا چاپکراوی ڕۆژنامەگەریی پۆلێن کردووە بۆ دوو جۆر، ڕۆژنامەگەری سیاسی و ناسیاسی. ئەمەو ڕۆژنامەگەریی ناسیاسی بەهەفتەنامە داناوەو بۆ گۆڕینی ڕۆژنامەگەریی ناسیاسی بۆ سیاسی، مەرجی ڕەچاوکردنی حوکمەکانی مەرسومی یاسایی ژمارە (٧٤)ی ١٣/٤/١٩٥٣ی داناوە. لێرەدا بۆمان دەردەکەوێ، هەرکاتێک ڕۆژنامەگەری سیفەتێک لەو سیفەتانەی کە لە مادده (٧،٦،٥)ی یاسای ناوبراو دەستنیشان کراوە، یان مەرجێک لەو مەرجانەی کە لە مادده (٣٠)[٢٣٧]، (٣٣)[٢٣٨]، (٣٤)[٢٣٩]دا دیارکراوە لە دەستدا، ڕووبەڕووی ڕاگرتن یان هەڵوەشاندنەوەی مۆڵەت

---

٢٣٧- بۆ دەقی ئەم ماددەیە، بڕوانە بڕگەی (٣-٢-٦-٣) لەم تێزەدا.

٢٣٨- ئەمەش دەقەکەیەتی: «یقید منح الرخص بالشروط التالیة:

١- الصحفي حر في اصدار المطبوعة الصحفية بوسائله، ولايتقيد الا في ما يتعلق بالوكالة الاخبارية والوكالة النقلية والنشرة الاختصاصية وفقا للشروط المعينة في المادة التي تلي من هذا القانون.

٢- يشترط في الشركات الصحفية الا يقل رأسمالها عن مبلغ خمسمائة الف ليرة لبنانية.

ج- علي صاحب المطبوعة ان يقدم ضمانة نقدية او مصرفية تضمن ما قد يترتب عليه من تعويضات مختلفة. تقدر وزارة الاعلام قيمة هذه الضمانة بعد استشارة نقابة الصحافة».

٢٣٩- ئەمەش دەقەکەیەتی: «يشترط في صاحب الوكالة الاخبارية المحلية ان تتوافر فيه الشروط المفروضة علي صاحب الصحيفة وان يكون حاملا توكيلا لدى الكاتب العدل من عشر صحف يومية سياسية تصدر بصورة فعلية ودائمة بتكليفه جمع الاخبار لصحفها لقاء اجور معينة.

تعين في النظام الداخلي لنقابة الصحافة الشروط الواجب توفرها في صاحب الوكالة النقلية وصاحب النشرة الاختصاصية.

علي الوكالات الاخبارية المحلية القائمة حاليا ان تتقيد بجميع الشروط الواردة في هذا القانون والمتعلقة بهذه الوكالات في غضون ثلاثة اشهر من نشر هذا القانون والا عطلت فورا بقرار من وزير الاعلام.

تخضع الوكالات الاخبارية الاجنبية الصادرة في لبنان لنظام خاص يحدد بمراسيم لاحقة».

دەبێتەوە، دوای ئاگادارکردنەوەی لە لایەن وەزیری ڕاگەیاندن بەدوو هەفتە بەر لە دەرکردنی بڕیاری ڕاگرتن یان هەڵوەشاندنەوەی مۆڵەتەکەی.

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ، کە ئەو ئاگادارکردنەوەیەی کە لە مادەد (٢٩)دا دەقنووس کراوە، کارێکی خۆپاراستنە و مەبەست لەمەدا ڕاکێشانی سەرنجی نووسەرە تاکو باری خۆی و ڕۆژنامەکەی بەگوێرەی حوکمەکانی یاسای چاپەمەنی چاک بکات بۆ ئەوەی ڕووبەڕووی سزایەکی توندتر نەبێتەوە، ئەویش ڕاگرتنی ڕۆژنامەکەیە، یان هەڵوەشاندنەوەی مۆڵەتەکەیەتی.

بێ لەو چوار حاڵەتەی کەلە مادەد (٢٩)دا دەستنیشان کراوە لە هەندێ حاڵەتی تریشدا ئیدارە بۆی هەیە ئاگاداری ڕۆژنامە بکاتەوە لەسەرپێچییەکانی یان بەبڕیارێکی کارگێڕی ڕایبگرێت وەیان مۆڵەتەکەی هەڵبوەشێنێتەوە بەم شێوەیەی خوارەوە:

١- ئەگەر هاتوو خاوەنی ڕۆژنامەکە لە ماوەی یەک مانگ لە ڕوودانی هەر گۆڕانکارییەک لە ناوەڕۆکی مۆڵەتەکەی ئاگاداری وەزارەتی ڕاگەیاندنی نەکردەوە، بەڕەسمی ئاگادار دەکرێتەوە و مۆڵەتی دوو هەفتەی پێ دەدرێ بۆ چاکردنی باری خۆی، ئەگەر جێبەجێی نەکرد، تا پێشکەشکردنی ئەو زانیاریانە بەبڕیاری وەزیر ڕۆژنامەکە ڕادەگیرێ[٢٤٠].

٢- هەر ڕۆژنامەیەک بەر لە وەرگرتنی مۆڵەت و دانانی بارمتەی دارایی دەربچێت، بەبڕیاری وەزیری ڕاگەیاندن ڕادەگیرێت[٢٤١].

٣- هەر ڕۆژنامەیەک ناوی ڕۆژنامەیەکی تر هەڵبگرێت بەر لە ڕاوەستانی ئەو ڕۆژنامەیە بۆ ماوەی دوو ساڵ یان دەرنەچوونی سەرەڕای ئەو مۆڵەتەی کە پێی دراوە، بەبڕیاری وەزیر ڕادەگیرێت[٢٤٢].

٤- هەرخاوەن ڕۆژنامەیەک، ئەگەر وازی لە هەموو یان بەشێکی ڕۆژنامەکەی بۆ یەکێکی تر هێنا، دەبێ لەماوەی یەک مانگ لە ڕۆژی وازلێهێنانەکە ئاگاداری وەزیری ڕاگەیاندن بکاتەوە و نابێ خاوەنە نوێیەکە بەر لە وەرگرتنی ڕەزامەندیی وەزیری ڕاگەیاندن ڕۆژنامەکە دەربکات، ئەگینا وەزیر بەبڕیارێک ڕۆژنامەکە ڕادەگرێت تا ئەو کاتەی باری خۆی چاک دەکاتەوە[٢٤٣].

---

٢٤٠- مادەد (٤٢).

٢٤١- مادەد (٤٣).

٢٤٢- مادەد (٤٧).

٢٤٣- مادەد (٤٨).

لە میانی نمایشکردنی حاڵەتەکانی ئاگادارکردنەوەو ڕاگرتنی ڕۆژنامە و هەڵوەشاندنەوەی مۆڵەتەکەی بەڕێگای کارگێڕییەوە بۆمان دەردەکەوێ، یاسادانەری لوبنانی سەرەڕای ئەوەی کە لە دەستووری ساڵی ١٩٢٦ دا جەختی لەسەر ئەوە کردووە کە «لوبنان کۆمارێکی دیموکراسیی پەرلەمانییە، لەسەر بنەمای ڕێزگرتنی ئازادییە گشتییەکان دامەزراوە لە سەروویانەوە ئازادیی بیروڕاو باوەڕ...»[٢٤٤] کەچی هەر لە بنەڕەتەوە دەستی بەسەر ئازادیی ڕۆژنامەگەریدا گرتووە و بەتەواوەتی خستوویەتییە ژێر کۆنتڕۆڵ و دەسەلاتی حکومەتەوە.

گومانی تێدا نییە کە بەخشینی دەسەلاتی ئاگادارکردنەوە و ڕاگرتنی ڕۆژنامە و هەڵوەشاندنەوەی مۆڵەتەکەی بەنیدارە، خۆی لە خۆیدا مانای ڕێگادانە بەئیدارە کە بەئارەزووی خۆی ئازادی ڕۆژنامەگەریی پێشێل بکات. چ لە ئاکامی بلاوکردنەوەی ئەو بابەتانەی کە بەدڵی ئەو نین، یان بلاونەکردنەوەیان لەترسی ئەو ئەوەک ڕازی نەبێت و ڕۆژنامەکە ڕابگرێت یان مۆڵەتەکەی هەڵبووەشێنێتەوە. بەمەش ئیدارە ئەو ئامانجە دێنێتە دی کە سانسۆر بۆی دەهێنێتە دی هەروەکو پاش تۆزێکی تر باسی دەکەین.

تەنانەت لەو حاڵەتانەشدا کە دەسەلاتی بەدادگا داوە بۆ ئاگادارکردنەوە و ڕاگرتنی ڕۆژنامە و هەڵوەشاندنەوەی مۆڵەتەکەی، دەسەلاتێکی خەملاندنی فراوانی بەدادوەر نەبەخشیوە لەم ڕووەوە، بەڵکوو لەنێو دەقەکانی یاسادا بەشێوەیەکی بنبڕ ئەم حوکمەی داوە و هیچ مەجالێکی بۆ دادوەر نەهێشتۆتەوە بۆ بڕینەوەی حوکمێکی کەمتر لە حوکمی ڕاگرتن و هەڵوەشاندنەوە، هەروەکو لە خوارەوە لە نمایشکردنی حاڵەتەکانی ئاگادارکردنەوە و ڕاگرتنی ڕۆژنامە و هەڵوەشاندنەوەی مۆڵەتەکەی بەبڕیاری دادگا بۆمان دەردەکەوێت:

١- هەر ڕۆژنامەیەک هەواڵێکی بەدرۆ بلاو بکاتەوە بەچەشنێک ببێتە مایەی شێواندنی ئاسایشی گشتی، ئەو کەسەی بەرپرسە سزا دەدرێت، بەڵام ئەگەر هاتوو بەر لە تێپەڕبوونی ماوەی پێنج ساڵ بەسەر کۆتایی سزاکەیدا هەمان تاوانی دووبارە کردەوە، ئەمجارەیان توندتر سزا دەدرێت و ڕۆژنامەکەش بۆ ماوەی سێمانگ ڕادەگیرێت[٢٤٥].

٢- هەر ڕۆژنامەیەک بڕیاری دادگا سەبارەت بەبلاوکردنەوەی ڕاستکردنەوەی زانیاری یان بەدرۆخستنەوەی جێبەجێ نەکات، سزاکەی توندتر دەبێت لەگەڵ ڕاگرتنی ڕۆژنامەکە بۆماوەی دوو مانگ[٢٤٦].

---

٢٤٤- برگەی (ج) لە پێشەکی دەستووری لوبنانی ساڵی ١٩٢٦

٢٤٥- مادە (٣) لە مەرسومی یاسایی ژمارە ١٠٤ی ساڵی ١٩٩٧.

٢٤٦- مادە (٤) لە مەرسومی یاسایی ژمارە ١٠٤ی ساڵی ١٩٧٧.

٣- هەر ڕۆژنامەیەکی ناسیاسی تۆژینەوە و هەواڵ و پەلاریکی وای بلاوکردەوە کە مۆرکێکی سیاسی پێوە بێت، سزا دەدرێت. ئەگەر هاتوو، لە ماوەی ساڵێک لە ڕۆژی کۆتایی هاتنی سزادانیەوە ئەمەی دووبارە کردەوە، دادگا مۆڵەتی دەرکردنی هەڵدەوەشێنێتەوە[٢٤٧].

٤- هەر کەسێک لە ڕێگای ڕۆژنامەوە هەڕەشە لە یەکێک بکات بەڕیسواکردنی یان ئاشکراکردنی کارێکی ئەو کەسەو ئەو کارەش ببێتە مایەی لەکەدارکردن و ناوزڕاندنی ئەو کەسە یان کەس و کاری بەتوندی سزا دەدرێت. جا ئەگەر هاتوو بەر لە تێپەڕبوونی ماوەی پێنج ساڵ بەسەر کۆتایی هاتنی سزاکەیدا، هەمان تاوانی دووبارە کردەوە، سزاکەی توندتر دەبێت و ڕۆژنامەکەش بۆ ماوەی پانزە ڕۆژ ڕادەگیرێت. جا ئەگەر دیسان دووبارەی کردەوە ئەوجارە بۆماوەی سێ مانگ ڕادەگیرێ[٢٤٨].

٥- هەر کەسێک لە ڕێگای ڕۆژنامەوە شەرەف و کەرامەتی سەرۆکی وڵاتی لەکەدار کرد یان بەرقەوە[illegible] هێنا یان جوێن یان بوختانی دەرهەق بلاوکردەوە، یانیش ئەمەی دەرهەق هەر سەرۆک وڵاتێکی بیانی کرد، سزا دەدرێت. جا ئەگەر بەر لە تێپەڕبوونی ماوەی سێ ساڵ بەسەر کۆتایی هاتنی سزاکەیدا ئەمەی دووبارە کردەوە، ئەوجارە سزاکەی توندتر دەکرێت و ڕۆژنامەکەش بۆ ماوەی دوو مانگ ڕادەگیرێت[٢٤٩].

٦- هەر ڕۆژنامەیەک بابەتێک بلاوبکاتەوە کە ببێتە مایەی ڕق لێبوونەوە ( کراهیة)ی یەکێک لە ئاینە باوەڕپێکراوەکان لە وڵاتدا، یان ببێتە مایەی وروژاندنی ئەعرەی تایفەگەری، ڕەگەز پەرستی، شێواندنی ئاسایشی گشتی، یان ڕووبەڕووکردنەوەی، سنوورو سەروەری و یەکێتیی لوبنان بۆ مەترسی، بەتوندی سزا دەدرێت. جا ئەگەر هاتوو بەر لە تێپەڕبوونی حەوت ساڵ بەسەر کۆتایی هاتنی سزاکەی ئەمەی دووبارە کردەوە، سزاکەی توندتر دەبێت و ڕۆژنامەکەش بەلایەنی کەمەوە بۆ ماوەی شەش مانگ ڕادەگیرێت[illegible].

---

٢٤٧- مادده (١٣) لە مەرسومی یاسایی ژمارە ١٠٤ی ساڵی ١٩٧٧.

٢٤٨- مادده (١٦) لە مەرسومی یاسایی ژمارە ١٠٤ی ساڵی ١٩٧٧.

٢٤٩- مادده (٢٣) لە مەرسومی یاسایی ژمارە ١٠٤ی ساڵی ١٩٧٧.

٢٥٠- مادده (٢٥) لە مەرسومی یاسایی ژمارە ١٠٤ی ساڵی ١٩٧٧

### ٣-٤-٣ ئاگاکاری و ڕاگرتن و هەڵوەشاندنەوە لە یاسای فەرەنسیدا

یاسادانەری فەرەنسی بەپێی مەرسومی یاسایی ١٨٥٨/٢/١٧ لە ماددە (٣٢)ی یاسای ڕۆژنامەگەریی ١٨٨١/٧/٢٩ ڕێگای بەحکومەت داوە لە هەندێ حاڵەتی دیاریکراودا ڕۆژنامە ئاگادار بکاتەوە لە سەرپێچییەکانی یان بۆ ماوەیەکی کاتیی یان هەمیشەیی ڕایبگرێت یان مۆڵەتی دەرکردنی هەڵبوەشێنێتەوە، بەم شێوەیەی خوارەوە:

یەکەم: حکومەت بۆی هەیە ئاگاداری ڕۆژنامە بکاتەوە ئەگەر هاتوو بابەتێکی بەدڵی ئەو بڵاونەکردەوە.

دووەم: لە دوو حاڵەتدا حکومەت بۆی هەیە بۆ ماوەیەکی کاتیی یان هەمیشەیی ڕۆژنامە ڕابگرێت:

١- ئەگەر هاتوو بەڕێوەبەری بەرپرسی ڕۆژنامەکە بەهۆی سەرپێچییەکەوە یان تاوانێکەوە حوکم درا، لەم حاڵەتەدا حکومەت بۆی هەیە لە ماوەی دوو مانگ لە دەرچوونی حوکمەکەوە، بەبڕیارێک بۆ ماوەیەکی کاتیی یان هەمیشەیی ڕۆژنامەکە ڕابگرێت.

٢- ئەگەر هاتوو دوو جاران ئاگاداریی ڕۆژنامەکە کرابێتەوە لەگەڵ دەستنیشانکردنی هۆیەکانی ئاگادارکردنەوە، دەکرێ لەم حاڵەتەدا بەفەرمانێکی وەزاری ڕۆژنامەکە بۆ ماوەیەک کە لە دوو مانگ ڕەت نەکات ڕابگیرێ.

سێیەم: حکومەت بۆی هەیە لەم دوو حاڵەتانەی خوارەوەدا مۆڵەتی دەرکردنی ڕۆژنامە هەڵبووەشێنێتەوە:

١- ئەگەر هاتوو پێشتر ڕۆژنامەکە بەبڕیارێکی کارگێری یان دادوەری ڕاگیرابێت.

٢- ئەگەر هاتوو ئاسایشی گشتی وابخوازێت. لەم حاڵەتەشدا دەبێ هەڵوەشاندنەوەی مۆڵەتی دەرکردنی ڕۆژنامەکە بەمەرسومێکی تایبەتی بێت کە سەرۆکی وڵات دەریکردبێت و لە ڕۆژنامەی ڕەسمییش بڵاوبکرێتەوە.

بەم پێیە، حکومەت دەسەڵاتی ئاگادارکردنەوە و ڕاگرتن و هەڵوەشاندنەوەی ئیداری هەبوو تا دەرچوونی مەرسومی یاسایی ١٨٦٨/٥/١١ و بەدەرچوونی ئەو مەرسومە ئەم دەسەڵاتە درایە دادگا و چیتر ئیدارە بۆی نەبوو بەم کارە هەستێ[٢٥١].

---

٢٥١- بڕوانە: د. عبداللە اسماعیل: حریة الصحافة، سەرچاوەی پێشوو، ل١٣٠-١٣١. هەروەها:
Royer Collard De la Liberte De lapresse. paris; Librairie De Medicis. 1949 pp 93-96.

شابەنی ئامازەبۆکردنە، یاسادانەری فەرەنسی بەپێی مەرسومی یاسایی ژمارە ٩١٦ی ١٩/٩/٢٠٠٠[٢٥٢] جارێکی تر ئەم ماددەیەی هەموار کردووە و ئەمجارەیان نە لە نزیک و نە لە دوورەوە باسی لە دەسەڵاتی دادگا بۆ ڕاگرتن و هەڵوەشاندنەوەی ڕۆژنامە نەکردووە، بەڵکو تەنیا بەسەپاندنی غەرامە و بەندکردنیش یان تەنها یەکێک لەو دوو سزایە وازیهێناوە و کاریکردووە.

تەنانەت لەنێو دەقی ماددەکانی تریشدا، هیچ حوکمێکی وامان بەرچاو ناکەوێ کە نیشانەی بەخشینی ئەم دەسەڵاتە بێت بەدادگا. ئەمەش خۆی لە خۆیدا، ئەوە دەگەیەنێ کە یاسادانەری فەرەنسی نایەوێ ناکامی ئەو سزایەی کە بەسەر سەرپێچیکەر یان کەسی بەرپرس لە ڕۆژنامە دەسەپێ، خودی ڕۆژنامەکە بگرێتەوە. ئەمەش گەرەنتییەکی باشە بۆ دەستەبەرکردن و بەردەوامیی ڕۆژنامەکە.

## ٣-٤-٤ ئاگاداری و ڕاگرتن و هەڵوەشاندنەوە لە یاسای چاپەمەنیی عێراقیدا

بەپێی ماددە (٢٢) برگە (أ) لە یاسای چاپەمەنیی عێراقی ژمارە ٢٠٦ی ساڵی ١٩٦٨ی هەموارکراو، وەزیری ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندن بۆی هەیە ئاگاداری (انذار)ی سەرنووسەر بکاتەوە ئەگەر هاتوو سەرپێچیی حوکمەکانی یاسای چاپەمەنی کرد، دەبێ

---

٢٥٢- ئەم مەرسومە لە ٢٢/٩/٢٠٠٠ لە ڕۆژنامەی ڕەسمیی فەرەنسیدا بڵاوبۆتەوە و لە ١/١/٢٠٠٢ بەرکار بووە. ئەمەش دەقەکەیەتی بەزمانی فەرەنسی:

"Article 32

Modifié par Ordonnance 2000-916 19 Septembre 2000 art 3 JORF 22 septembre 2000 en vigueur le 1er janvier 2002.

La diffamation commise envers les particuliers par l'un des moyens énoncés en l'article 23 sera punie d'une amende de 12000 euros.

La diffamation commise par les mêmes moyens envers une personne ou un groupe de personnes à raison de leur origine ou de leur appartenance ou de leur non-appartenance à une ethnie, une nation, une race ou une religion déterminée sera punie d'un an d'emprisonnement et de 45000 euros d'amende ou de l'une de ces deux peines seulement.

En cas de condamnation pour l'un des faits prévus par l'alinéa précédent, le tribunal pourra en outre ordonner :

1- L'affichage ou la diffusion de la décision prononcée dans les conditions prévues par l'article" 131-35 du code pénal.

ئاگاداریـیـەکـەش دوای گـەیشـتنی ■ یەکـەمین ژمارەی رۆژنامـەکـە بڵاوبکاتەوە، ئەمەش دەقەکەیەتی: «وەزیر بۆی هەیە ئاگاداری سـەرنووسـەر بکاتەوە ئەگەر هاتوو لە چاپکراوی دەوریدا بابەتێکی بڵاوکـردەوە پێـچـەوانەی حـوکـمـەکـانی ئەم یاسـایە بێـت و، دەبێ سـەرنووسـەر دەقی ئاگـاداریـیـەکە لە یەکەمین ژمارە کە لە دوای ئاگـاداریوونەوەی دەردەچێ بڵاوبکاتەوە».

ئەمـەش ئەوە دەگـەیەنێ، کـە یاسـادانەری عـێـراقی ئەم کـارەی بەکـارێکی خـۆ لێ دوورخستنەوە داناوەو لێرەدا مەبەستی سەرنج ڕاکێشـانی سـەرنووسەرە بۆ مـەترسی ئەو سەرپێچییە یاساییە کە لەوانەیە رۆژنامەکە ڕووبەڕووی ڕاگرتن یان هەڵوەشانەوە بکاتەوە ئەگەر دووبارەی بکاتەوە بەتایبەتی ئەگەر هاتوو چاپکراوە دەورییـەکـە نـاسـیـاسی بوو. هەروەها لە مـاددە (٣) بڕگە (٦)دا جەختی لەسەر ئەمە کردۆتەوە کە ئەمەش دەقەکەیەتی: «هەڵوەشـانەوەی مـۆڵەتی چاپکراوی دەوریی نـاسـیـاسی ئەگـەر هاتوو سـەرباری ئاگـادار کردنەوەی لە سنووری مۆڵەتەکەی خۆی دەرچووە».

ئەوەی جێی سەرنجە لەم دەقەدا، ئەوەیە، یاسادانەری عێراقی دەرفەتی تەواوی نەداوە بەسەرنووسـەر بۆ هەڵـسـەنگاندنی قەوارەی مەترسـیی سـەرپێچییـەکەی تاکو خۆی لێ لا بدات، بەڵکو بەتـەنهـا یەکـجـار ئاگـادارکـردنەوە کـاری کـردووە و وازیهێـنـاوە دوای ئەوە یەکـسـەر حوکمی داوە بەهەڵوەشاندنەوەی مۆڵەتی چاپکراوە دەورییە ناسیاسییەکە. ئەمەش سـزایەکی گـەورەترە لە سـەرپێـچـیـیـەکـە، بۆیە باشـتـر وابوو جـارێکی تریش ئاگـاداری سـەرنووسـەر بکرابایەوە، بەرلەوەی بڕیاری ڕاگـرتنی یـان هەڵوەشـاندنەوەی چاپکراوەکـە دەربچـێـت، هەروەکـو یاسـادانەری فـەرەنـسی لە یاسـای ڕۆژنامـەگـەریدا ئەمـەی پـیـادە کردووە[٢٥٣].

بەڵام سـەبارەت بەڕاگرتنی ڕۆژنامـە و چاپکراوی دەوری یاسادانەری عـێـراقی لە مـاددە (٢٣)دا دەسـەڵاتی بەوەزیری ڕۆشنبـیـری و ڕاگـەیاندن داوە، ئەگـەر هاتوو ڕۆژنامـە یان چاپکراوی دەوری بابەتێکی پێچەوانەی حوکمی ماددە (١٦) و ١٧ بڵاوکردەوە ڕایبگرێت بۆ مـاوەیەک کـە لە سی ڕۆژ ڕەت نەکـات. ئەمـەش دەقـەکـەیەتی: «وەزیر بۆی هەیە چاپکراوی دەوری ڕابگرێت بۆ ماوەیەک لە(٣٠) ڕۆژ ڕەت نەکات، ئەگەر هاتوو بابەتێکی

---

٢٥٣- بڕوانە دەقی ماددە (٣٢)ی یاسـای ڕۆژنامەگەریی فەرەنـسی سـاڵی ١٨٨١ کە لە خاڵی پێشـوو ئاماژەمان پێی کردووە.

تیا بلاوکرایەوە سەرپێچی حوکمەکانی ماددە ١٦ و ١٧ی ئەم یاسایەی کردبوو».

لە گەڕانەوەمان بۆ حوکمی ماددە (١٦)ی یاسای چاپەمەنیی ناوبراو، بۆمان دەردەکەوێ کە یاسادانەری عێراقی بلاوکردنەوەی هەندێک بابەتی یاساغ کردووە و خۆ لە قەرەدانیشیان دەبێتە مایەی ڕاگرتنی ڕۆژنامە و چاپکراوە دەورییەکە.

ئەمەش دەقەکەیەتی: «نابێت ئەمانەی خوارەوە لە چاپکراوی دەوریدا بلاوبکرێتەوە:

١- ئەوەی خۆی لە قەرەی سەرۆک کۆمار یان ئەندامانی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش یان سەرۆک وەزیران یان ئەوانەی بەکاری ئەوان هەڵدەستن دەدا.

٢- ئەوەی زیان بەپەیوەندی نێوان عێراق و وڵاتە عەرەبی و دۆستەکانی دەگەیەنێت.

٣- ئەوەی ناوی شۆڕش و چەمکەکانی و کۆماری و دامەزراوەکانی دەزڕێنێ و دەبێتە پیاهەڵدانی بیری ئیمپریالیزمی یان جیاخوازی و کۆنەپەرستی و هەرێمچێتی و زایۆنیزمی و ڕەگەزپەرستی و هەر چییەک ببێتە هۆی تێکدانی ئاسایشی ناوخۆ و دەرەوە.

٤- هەر چییەک هانی تاوان یان گوێڕایەڵ نەبوونی یاسا یان سووکایەتی کردن بەهەیبەتی دەوڵەت بدات.

٥- هەر چییەک قین یان دووبەرەکی یان بلاوکردنەوەی دووبەرەکی لە نێوان ئەندامانی گەل یان نەتەوەکان یان تیرە ئایینییە جۆراوجۆرەکان بدات یان ببێتە هۆی درزتێکردنی یەکێتیی ناوخۆ.

٦- ئەوەی تانە بێت بۆ ئەو ئایینانەی لەلایەن کۆماری عێراقەوە دانیان پیا نراوە.

٧- ئەوەی پێشێلکردن بێت بۆ پیرۆزیی ڕەفتار و بەها ڕەوشتە گشتییەکان.

٨- ئەوەی کاریگەری لەسەر بڕیاری دادوەران هەبێت لەو داوایانەی کە تەماشایان دەکەن.

٩- ڕای جیاوازی ئەندامانی دادگایەک کە لە دەستە پێکهاتبێت.

١٠- ئەوەی کار لە داواکاریی گشتی یان پارێزەران یان شایەتەکان یان ڕای گشتی بکات لە داوایەک کە بەرز بۆتەوە بۆ بەردەم دادگا.

١١- تۆخن کەوتنی کەسانی تر کە خۆی لە خۆیدا بەناوزڕاندن یان جنێودان بۆ کەسایەتییان دابنرێ.

١٢- ئەو هەواڵانەی دەبنە هۆی ڕوخانی پارەی نیشتمانی یان قەوالەکانی قەرزی حکومی یان لاوازکردنی متمانە پێیان لە ناوە و لە دەرەوەدا».

لە کاتێکدا، لە مادده (١٧)دا بڵاوکردنەوەی هەندێک بابەتی تری یاساغ کردووە مەگەر بەڕەزامەندیی لایەنی تایبەتمەند نەبێت کە ئەمەش دەقەکەیەتی: «نابێت لە چاپکراوەکاندا بەبێ مۆڵەتی شوێنی ڕەسمیی تایبەتمەند ئەمانەی خوارەوە بڵاوبکرێتەوە:

١- هیچ بەیاننامە یان وتەیەک بەناوی سەرۆک کۆمار یان ئەندامانی ئەنجوومەنی سەرکردایەتیی شۆڕش یان سەرۆک وەزیران یان هەر کەسێکی دی کە بەکاری ئەوان هەڵدەستێ.

٢- کۆنووسی کۆبوونەوە نهێنییەکانی دادگا یان ئەنجوومەنی سەرکردایەتیی شۆڕش یان ئەنجوومەنی وەزیران یان نووسراوە ڕەسمییە نهێنییەکان.

٣- تاوتوێکارییەکانی ئەنجوومەنی وەزیران یان بڕیارەکانی هەروەها بڕیارە ڕەسمییەکانی تر.

٤- ئەو ڕێککەوتننامە یان بەیاننامانەی حکوومەتی عێراق دەیانبەستێ، هەروەها یاسا و ڕێسا و ڕێنماییەکان بەر لە بڵاوبوونەوەیان لە ڕۆژنامەی ڕەسمیدا.

٥- ڕێچکەی لێکۆڵینەوە لە تاوانەکان.

٦- فەرمانەکانی جموجۆڵی هێزە چەکدارەکان و پۆلیس یان هەر هێزێکی تری ئیشتمانی یان هەر شتێک کە پەیوەندیدار بێت بەپێکهاتەکانی یان ڕێکخستنەکانی یان چەکەکانی یان خەڵک ئامادەکردن بۆی.

٧ - بڕیارە پەیوەندیدارەکان بەنرخاندن یان هاوردن یان تاریفەی گومرگی یان ئاڵوێری دراوە.

لە هەردوو ماددەی (١٦و ١٧)دا بۆمان دەردەکەوێ کە یاسادانەری عێراقی دەسەڵاتێکی زۆر فراوانی داوە بەوەزیری ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندن بۆ ڕاگرتنی چاپکراوی دەوری، بەچەشنێک کە ڕۆژنامە ناتوانن ڕۆڵی خۆی وەکو پێویست ببینن بۆ گەیاندنی زانیارییەکان بەجەماوەر و دروستکردنی ڕای گشتی لەسەر کێشەو بابەتە گشتییەکان.

سەبارەت بەهەڵوەشاندنەوەی مۆڵەتنامەی دەرکردنی چاپکراوی دەوری، یاسای چاپەمەنیی عێراقی جیاوازیی کردووە لە نێوان ئەو چاپکراوە خولەکییانەی کە لەلایەن هاوڵاتی عێراقییەوە لە ناوەوەی عێراقدا دەردەچن و لە نێوان ئەوانەی لە لایەن بیانییانەوە لە ناوەوەی عێراق یاخود لە دەرەوەی عێراقدا دەردەچن.

بۆ جۆری یەکەم، لە مادده (٢٧)دا دەستنیشانی ئەو حاڵەتانەی کردووە کە تیایدا

مۆڵەتنامەی دەرکردنی ڕۆژنامە هەڵدەوەشێنێتەوە ئەمەش دەقەکەیەتی: «١- مۆڵەتنامەی چاپکراوی خولەکی لەم حاڵەتانەی خوارەوەدا هەڵدەوەشێتەوە:

١- ئەگەر خاوەنەکەی داوای هەڵوەشانەوەی بکات.

٢- ئەگەر خاوەنەکەی کەسایەتییەکی مەعنەوی بوو، ئەم کەسایەتییەی لەدەستدا.

٣- ئەگەر هاتوو چاپکراوی دەوریی ناسیاسی، سەرباری ئاگادارکردنەوەیشی سنووری مۆڵەتەکەی خۆی بەزاند.

٤- ئەگەر هاتوو لە چاپکراوی دەوریدا بابەتێک بڵاوکرایەوە ببێتە مایەی مەترسی لەسەر شۆڕش و ئاسایشی ناوخۆ یان دەرەوەی دەوڵەت.

٥- ئەگەر خاوەنی چاپکراوە دەورییەکە پاش مۆڵەت پێدانی، لە دەرکردنی چاپکراوەکەی بەبێ پاساوی ڕەوا کە وەزارەت دیاریدەکات دواکەوت بۆ ماوەی:

أ - سی ڕۆژ بۆ چاپکراوی ڕۆژانە یان ئەوەی زیاتر لەجارێک لە هەفتەیەکدا دەردەچێت.

ب - شەست ڕۆژ بۆ چاپکراوی هەفتانە.

ج - نەوەد ڕۆژ بۆ چاپکراوی نیو مانگی.

د - سەد و بیست ڕۆژ بۆ چاپکراوی مانگانە.

هـ - شەش مانگ بۆ چاپکراوی وەرزی.

و - دوو ساڵ بۆ چاپکراوی ساڵانە.

٦- ئەگەر هاتوو چاپکراوی دەوری، هۆکارێکی گرتەبەر بۆ خەڵەتاندن و دەست بەسەراگرتنی ناشیاو:

أ - هەڵوەشاندنەوەی مۆڵەتی چاپکراوی دەوریی سیاسیی ڕۆژانە، یان ئەوەی زیاتر لە جارێک لە هەفتەیەکدا دەردەچێت، بەپێشنیازی وەزیر و بڕیارێک لە ئەنجوومەنی وەزیرانەوە کە ئەنجوومەنی سەرکردایەتیی شۆڕش پەسندی بکات هەڵدەوەشێتەوە، بەڵام هەڵوەشانەوەی چاپکراوە دەورییەکانی تر تەنها بەبڕیاری وەزیر دەبێت.

ب - خاوەنی چاپکراوی دەوری مافی تانە لێدانی هەیە لە بڕیاری وەزیر لەلای ئەنجوومەنی وەزیرانەوە لە ماوەی پانزە ڕۆژ لە ڕۆژی ئاگادارکردنەوەی بەبڕیارەکە و بڕیاری ئەنجوومەن یەکلاکەرەوە دەبێت».

بەڵام بۆ جۆری دووەم، لە مادده (١٠)دا ڕێگای بەوەزیری ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندن داوە

دوای پرس و ڕاوێژکردن بەوەزیری دەردەوە مۆڵەتنامەی چاپکراوە دەورییەکەی ئەو بیانییە هەڵبوەشێنێتەوە کە سەرپێچی حوکمەکانی ماددە (٩)ی یاسای چاپەمەنی دەکات.

ئەمەش دەقەکەیەتی: «ئەگەر هاتوو کەسێکی بیانی سەرپێچیی حوکمەکانی ماددە (٩)ی کرد وەزیر بۆی هەیە دوای پرس‌وڕاکردن بەوەزیری دەرەوە مۆڵەتی چاپکراوە دەورییەکەی هەڵوەشێنێتەوە».

لە گەڕانەوەماندا بۆ دەقی ماددە (٩)ی یاسای ناوبراو. بۆمان دەردەکەوێ کە لە دوو حاڵەتدا ئیدارە بۆی هەیە مۆڵەتی چاپکراوی دەوری لە بیانییەکە هەڵوەشێنێتەوە، بەم شێوەیەی خوارەوە: «هیچ ناعێراقییەک بۆی نییە چاپکراوێکی دەوری چاپ بکات یان بیهێنێت کە ئامادەکرابێت بۆ دابەشکردن لەناو عێراقدا ئەگەر هاتوو:

أ- دەست تێوەردانێکی تێدابوو بۆ کاروباری ناوخۆی عێراق.

ب- توخنی سیاسەتی دەرەوەی عێراق بکەوێت، یان لەگەڵی ناکۆک بێت».

لە کۆتاییدا، دەتوانین بڵێین، زۆری ئەم کۆت و بەندانە، کە یاسای عێراقی لەبەردەم ئازادیی ڕۆژنامەگەریدا دایناون، هەروەها ئەو دەسەڵاتە ڕەهایەی کە بەئیدارەی حکوومەتی داوە، سەرەڕای نەبوونی گەرەنتی دادوەریی لەبەردەم خاوەن ڕۆژنامە و بڵاوە و حەسرکردنی دەسەڵاتی تەماشاکردنی تانوت لە بڕیاری ئیدارە بەئەنجوومەنی وەزیران و ئەنجوومەنی سەرکردایەتیی شۆڕش کە هەردووکیان دەسەڵاتی ڕاپەڕاندنن، بەجۆرێکە تەنها ڕۆژنامە و بڵاوەی حکوومەت و ڕژێم نەبێت بۆی نییە دەربچێت.

کەواتە، بەخشینی دەسەڵاتی ئاگادارکردنەوە و ڕاگرتن و هەڵوەشاندنەوەی ڕۆژنامە بەو بەرفراوانییەی سەرەوە بەئیدارە، دەرفەتی بۆ ئیدارە ڕەخساندووە کە بەئارەزووی خۆی، بەناوی لادان لە حوکمەکانی ئەم یاسایە بەگشتی و بیانووی پیاهەڵدانی بیری جیاخوازی و هەرێمچێتی کە لە بڕگەی (٣) لە ماددەی (١٦)دا هاتووە، ئازادیی ڕۆژنامەگەریی نووسەران لەناو بەرێت، کە دژ بەگەلی کورد و نەتەوەکانی تری غەیرە عەرەبە و مەبەستی ڕاستەقینەی ئەم ڕژێمە شۆڤێنییەیە.

### ٣-٤-٥ ئاگاداری و ڕاگرتن و هەڵوەشاندنەوە لە یاسای چاپەمەنیی هەرێمی کوردستانی عێراقدا

بەپێی حوکمەکانی یاسای چاپەمەنیی هەرێمی کوردستانی عێراق ژمارە ١٠ی ساڵی ١٩٩٣ ئیدارە نەک دەسەڵاتی ئاگادارکردنەوە و ڕاگرتن و هەڵوەشاندنەوەی ڕۆژنامە و چاپکراوی دەوریی نییە، بەڵکو دادگاش ئەم دەسەڵاتەی نییە.

یاسادانەری کوردستانیی لە مادده (٦) برگە (١)دا جەختی لەسەر ئەوە کردووە کە چاپکراوی دەوری لەکاتی دەرچوونی یەکەم ژمارەیەوە دەبێتە خاوەنی بوونی یاسایی خۆی و ئەو بوونەی بەردەوام دەبێ مەگەر خاوەنەکەی خۆی ئەو بوونەی نەهێڵێ، ئەمەش دەقەکەیەتی: «چاپکراوی دەوری لەکاتی دەرچوونی یەکەم ژمارەیەوە دەبێتە خاوەنی بوونی یاسایی خۆی و ئەگەر خاوەنەکەی ویستی ئەو بوونەی نەهێڵێ دەبێ بەنووسین وەزارەتی لێ ئاگادار بکا و ئەوسا لە ڕۆژی تۆمارکردنی ئاگادارکردنەوە لەلای وەزارەت بوونە یاساییەکەی نامێنێ».

لێرەدا بۆمان دەردەکەوێ کە ئیدارە بۆی نییە مۆڵەتنامەی دەرکردنی ڕۆژنامەکە هەڵبووەشێنێتەوە مەگەر بەڕەزامەندی خاوەنی ئیمتیاز و سەرنووسەرەکەی نەبێت.

هەروەها لە مادده (١٢) برگە (١)دا زۆر بەڕاشکاوییەوە حوکمی داوە کە حوکمی دادگا بەگوناهبارکردنی خاوەنی ئیمتیاز و سەرنووسەر خودی چاپکراوە دەورییەکە ناگرێتەوە و بوونی بەردەوام دەبێ. ئەمەش دەقەکەیەتی: «حوکمی دادوەری بەگوناهبارکردنی خاوەنی ئیمتیاز و سەرۆکی نووسین بەپێی حوکمەکانی ئەم یاسایە لە چاپکراوی خولەکیدا خودی چاپکراوەکە ناگرێتەوە و بوونی بەردەوام دەبێ مەگەر خاوەنی ئیمتیاز خۆی ئارەزووی دەرکردنی نەمابێ کە ئەوسا حوکمی ماددەی شەشەمی ئەم یاسایەی بەسەردا جێبەجێ دەکرێ».

کەواتە بەپێی یاسای چاپەمەنیی هەرێمی کوردستانی عێراق، نەئیدارە و نە دادگا بۆیان نییە کە ئاگاداری ڕۆژنامە بکەنەوە یان ڕایبگرن وەیان مۆڵەتی دەرکردنەکەی هەڵبووەشێننەوە، مەگەر خاوەنەکەی خۆی وا ئارەزوو بکا. لەم حاڵەتەشدا دەبێ خاوەنەکەی بەنووسین وەزارەتی ڕۆشنبیری لەمە ئاگادار بکاتەوە نەک بەقسە.

شایەنی ئاماژەبۆکردنە، وڵاتە عەرەبییەکان زیاتر لە هەموو شوێنێ پیادەی سیستمی ڕاگرتن و هەڵوەشانەوەی ڕۆژنامە دەکەن. لە کۆتایی ساڵی ٢٠٠١ دا وەزارەتی ناوخۆی مەغریب بەبڕیارێکی ئیداری هەرسێ هەفتەنامەی (لوجورنال) و (دومان) و (الصحیفة الجدیدة)ی ڕاگرت بەپێی مادده (٧٧)ی یاسای ڕۆژنامەگەریی مەغریبیی ساڵی ١٩٥٨ کە ڕێگا بەوەزیری ناوخۆ دەدات ڕۆژنامە ڕابگرێت ئەگەر دەستی لە بارودۆخی سیاسیی وڵات وەردا[٢٥٤].

---

٢٥٤- بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە:

http://www.ahramorg.eg/faj/Act22htm29/9/2001

هەروەها، بەبڕیارێکی دادگای ئیداریی میسری هەردوو ڕۆژنامەی (النبأ) و(اخر النبأ) لەسەر داوای ئەنجوومەنی باڵای ڕۆژنامەگەری دوا بەدوای بڵاوکردنەوەی وێنەیەکی نابڕوبەری قەشەیەکی قبتی کە بووە مایەی ڕق و قینی قبتییەکان بەشێوەیەکی هەمیشەیی داخرا[٣٥٥].

لە ئاکامی ئەم زنجیرە دەست درێژیانەی کە لەلایەن ئیدارەوە کراوەتە سەر ڕۆژنامە و ئازادیی ڕۆژنامەگەرییەوە، بۆیە یەکێتیی ڕۆژنامەنووسانی عەرەب لە کۆنگرەی نۆیەمیدا کە لە عەممانی پایتەختی ئوردن لە ٢٥-٢٧ی تشرینی یەکەمی ٢٠٠٠ سازی دا دەعوەتنامەیەکی ئاراستەی حکومەتە عەرەبییەکان کرد تیایدا داوای لێ کردن ڕێگا بدەن بەدەرکردنەوەی ئەو ڕۆژنامانەی کە بەفەرمانی ئیداری ڕایان گرتوون یاخود هەڵیان وەشاندونەتەوە[٢٥٦].

### ٣-٤-٦ پوختە:

دوای دیراسەکردنی سیستمی ئاگادارکردنەوە و ڕاگرتن و هەڵوەشاندنەوە لە یاسای چاپەمەنیی هەرێمی کوردستان و بەراوردا، دەبینین سیستمی ئاگادارکردنەوە و ڕاگرتن و هەڵوەشاندنەوەی ڕۆژنامە یەکێکە لە توندترین سیستمەکانی دژ بەئازادیی ڕۆژنامەگەری و زیاتر لە سیستمی سانسۆری پێشینە فشار دەخاتە سەر ئازادیی ڕۆژنامەگەری لە ڕێگای ڕاگرتنی سەرجەم چالاکییەکانی ڕۆژنامەگەری بۆ ماوەیەکی کاتیی یان هەمیشەیی، کە ئەمەش خۆی لە خۆیدا دەبێتە مایەی دەست لەکارکێشانەوەی ڕۆژنامەنووسان و کارمەندانی دەزگا ڕۆژنامەوانییەکان لەو ماوەیەدا، هەروەها کاردانەوەیەکی خراپی دەبێ بەسەر کتێبخانە و بازاڕی چاپەمەنی و داهاتی نەتەوەییەوە، چونکە ئەمڕۆکە ڕۆژنامەگەری بۆتە پیشەسازی و لەپاڵ پرۆژە پیشەسازییەکانی تری وڵات، بەشداری دەکات لە پەرەپێدان (التنمية) لە گشت بوارە جیاجیاکاندا.

هەروەها ئەم سیستمە ناگونجێ لەگەڵ سیستمی دیموکراسیدا، چونکە ڕۆژنامەنووس دەبەستێتەوە و دەرفەتی نادا ڕۆڵی خۆی وەکو چاودێرێک بەسەر کاروبارەکانی حکومەت ببینێ و بیروڕای جیاواز سەبارەت بەکێشەگشتییەکانی کۆمەڵ بخاتە ڕوو.

بۆیە ئێمە دەستخۆشی لە یاسادانەری کوردستان دەکەین کە دەسەڵاتی ڕاگرتن و

255- http://www.almashrek2/12/2001

256- http://www.arabia.com6/10/2001.

هەڵوەشاندنەوەی ڕۆژنامەی بەنیدارە نەداوە و جەختیشی لەسەر ئەوە کردووە کە حوکمی دادگا بەگوناهبارکردنی خاوەنی ئیمتیاز و سەرنووسەر خودی ڕۆژنامەکە ناگرێتەوە، ئەمەش نیشانەی بایەخپێدانە بەبەرزکردنەوەی ئاستی ڕۆژنامە و ڕۆژنامەنووسان و پتەوکردنی ئازادیی ڕۆژنامەگەری و دیموکراسییەت لە هەرێمی کوردستاندا[٢٥٧].

شایەنی ئاماژەبۆکردنە، ڕاپەڕینی گەلی کورد لە بەهاری ساڵی ١٩٩١ بەخاڵی وەرچەرخانی مێژوویی دادەنرێت بۆ پێشکەوتن و پەرەسەندنی ڕۆژنامەگەریی کوردی. دوابەدوای هەڵبژاردنی پەرلەمان و دامەزراندنی حکومەتی هەرێمی کوردستان و دەرکردنی یاسای چاپەمەنی ژمارە (١٠)ی ساڵی ١٩٩٣ و یاسای حزبەکانی هەرێمی کوردستانی عێراق ژمارە (١٧)ی ساڵی ١٩٩٣ و یاسای کۆمەڵە و ڕێکخراوەکانی هەرێمی کوردستانی عێراق و یاسای سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی کوردستانی عێراق ژمارە (٤)ی ساڵی ١٩٩٨ و یاسای سندوقی خانەنشینی ڕۆژنامەنووسانی کوردستانی عێراق ژمارە (١٣)ی ساڵی ٢٠٠١ کۆمەڵێک پارتی سیاسی و کۆمەڵە و ڕێکخراوی کۆمەڵایەتی و پیشەیی و مرۆڤایەتی لە هەرێمی کوردستاندا دامەزراون و، زۆربەیان لەوانە بەلانی کەمەوە ڕۆژنامەیەکی زمانحاڵ و گۆڤارێک و بڵاوکراوەیەکی وەرزی دەردەکات، ئەمەو وێڕای دەرکردنی هەندێک ڕۆژنامە و گۆڤاری نیمچە سەربەخۆ بەهەوڵ و تەقەلا و دارایی کەسان. زیاتر لەمە، ئەمڕۆکە لەسایەی ئەم ئازادی و دیموکراسییەی لە کوردستان لە ئارادایە، ژمارەیەکی زۆری ڕۆژنامە و گۆڤاری وەرزی بەچاپێکی هونەری و قەشەنگ و بابەتی هەمەڕەنگ لە سەرتاپای کوردستان چاپ و بڵاودەکرێتەوە، تەنانەت هەندێکیشیان دەخرێنە سەر تۆڕی ئینتەرنێت و سروشتێکی جیهانی وەردەگرن.

ئەمەو زیاتر لە کەناڵێکی تەلەڤزیۆنی ئاسمانی و دەیان کەناڵی ناوخۆیی و ئێستگە، ڕۆژانە بەرنامەکانیان بۆ ناوەوە و دەرەوەی هەرێمی کوردستانی عێراق پەخش دەکەن و ڕۆژنامەی بیستراو و بینراو بەشێکی زۆری پانتایی ئەو بەرنامانە داگیر دەکەن.

بۆ دووپاتکردنەوەی ئەم ڕاستییە، ڕۆژنامەنووسی ئەمریکی ماکی زانگر دەڵێ: «ئێستا

---

٢٥٧- ڕێکادان بەنیدارە بۆ ڕاگرتن و هەڵوەشاندنەوەی ڕۆژنامە بەفەرمانی نیداری، وا دەکات کە ڕۆژنامە نەتوانێ بەڕۆڵی خۆی هەستێ وەکو دەسەڵاتێکی جەماوەری و چاودێر بەسەر حکومەتەوە، نەوەکو ڕووبەڕووی ئەو سزا قورسە ببێتەوە. بۆ نموونە، لە ئاوەڕێلی ساڵی ٢٠٠١دا، حکومەتی ئێران بەفەرمانێکی ئیداری گۆڤاری (ئەشیە اردبیل)ی چاکسازیخوازی بۆ ماوەی چوار مانگ ڕاگرت، بڕوانە: http://www.usinfo.state.gov/arabic/iran/807.fpir.htm27/9/2001.

هەرێمی کوردستان چاوەڕێی بارودۆخێکی گونجاو دەکات بۆ دامەزراندنی ڕۆژنامەی سەربەخۆ و ئازاد»[258]. هەر لەم بارەیەوە پرۆفیسۆری ئەمریکی کارۆل تۆلیری کە وانەبێژە لە مەڵبەندی زانکۆی ئەمریکی بۆ ئاشتیی جیهانی لە وتارێکیدا سەبارەت بەرەوشی ئازادی و دیموکراسییەت لە هەرێمی کوردستاندا دەڵێ: «ئەو ئەزموونە دیموکراتییەی کە لە کوردستاندا ڕیشەی داکوتاوە هەر لە سەرەتای دامەزراندنی دامودەزگاکانەوە لە ناوچەی ئارام کە ساڵی ١٩٩١ دامەزرا و هەنگاو بەرەو پێشەوە دەنێ، نابێ هیچی دیکە لەلایەن ئەمریکا و دراوسێکانەوە پشتگوێ بخرێ. ئەو ناوچەیە کە بەرگری لە ئازادی دەکات خۆی بەچرای سەوزی ئازادی دەناسێنێت، پێویستە وڵاتە یەکگرتووەکان پارێزگاری لێ بکات و ئاگاداری بێت لەو کێشانەی کە هەیەتی»[259].

## ٣-٥ گلدانەوە و دەست بەسەراگرتن (الحجز والمصادرة)

مەبەستمان لە چەمکی گلدانەوەی چاپەمەنی ئەو کارەیە کە دادگا یان ئیدارە بەبێ فەرمانی دەسەڵاتی دادوەری بۆ گلدانەوەی ئەو چاپەمەنییانەی کە پێچەوانەی حوکمەکانی یاسان یاخود زیانبەخشن بەبەرژەوەندیی گشتی پێی هەڵدەستێ[260].

گلدانەوەی ئیداریش جیاوازە لەو گلدانەوەیەی کە دەسەڵاتی دادوەری بەپێی حوکمەکانی یاسا فەرمانی پێ دەکات، بۆیە بەوەی یەکەم دەگوترێ گلدانەوەی ئیداری و بەوەی دووەمیش دەگوترێ گلدانەوەی دادوەری.

گومانی تیا نییە دوای دەرچوونی ڕۆژنامەکە ئینجا ئیدارە هەڵدەستێ بەگلدانەوەی ئەگەر هاتوو پێچەوانەی حوکمەکانی یاسا یاخود بەرژەوەندیی گشتی بوو و، دوای گلدانەوەی ڕۆژنامەکە ئەوسا مشووری دەست بەسەراگرتنی ژمارەکانی دەخوا، ئەگەر هاتوو بۆ بڵاوکردنەوە و خوێندنەوە (دەستاودەستکردن) دەستی نەدا. لەو حاڵەتەشدا خاوەنی ڕۆژنامەکە مافی موڵکدارێتییەکەی لەدەست دەدات.

---

٢٥٨- ماکی زانگر: لە کلاشینکۆفەوە بۆ کیبۆرد، ڕۆژنامەگەری لە عێراق، لە چیارە دادەبەزێ. بەڵام بەرەو کوێ دەچێت؟، وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە حوسێن عەلی وەلی، گۆڤاری (ڕۆژنامەڤانی) ژمارە (٦-٧) ساڵی دووەم (پایز. زستان) ساڵی ٢٠٠١-٢٠٠٢، ل٢٠.

٢٥٩- کارۆل تۆلیری: دیموکراسییەت لە هەرێمی کوردستاندا ڕیشە دادەکوتێت، ڕۆژنامەی برایەتی ژمارە (٣٥٠٤) پێنجشەمە ٤/١٠/٩/٢٠٠١، ل٢.

٢٦٠- د. عبدالله البستاني: حرية الصحافة، سەرچاوەی پێشوو، ل١٣٨.

لە خوارەوە لە پێنج خاڵدا باسی ئەم بابەتە لە یاسای میسری و لوبنانی و فەرەنسی و عێراقی و کوردستانی عێراق دەکەین:

### ٣-٥-١ گلدانەوە و دەست بەسەراگرتن [illegible] یاسای میسریدا

١- یاسای چاپەمەنی ژمارە ٢٠ی ساڵی ١٩٣٦

یەکەم: گلدانەوە

یاسادانەری میسری لە یاسای چاپەمەنیی ژمارە ٢٠ی ساڵی ١٩٣٦دا کاری بەبەستی گلدانەوەی نیداری کردووە و ماددە(٣٠و٣١)ی بۆ ئەم مەبەستە تەرخان کردووە.بەپێی حوکمەکانی هەردوو ماددەی ناوبراو، نیدارە بۆی هەیە هەر چاپکراوێک یان ژمارەکانی رۆژنامەیەک گل بداتەوە ئەگەر هاتوو سەرپێچی حوکمەکانی ماددە (٤، ٧، ٩، ١٠، ١١، ١٢، ١٣، ١٤، ١٧، ١٩، ٢١، ٢٢)ی یاسای چاپەمەنیی ناوبراو بکات.

لە ماددە (٣٠)دا هاتووە «لە حاڵەتی سەرپێچیکردنی حوکمەکانی ماددە (٩، ١٠، ٢١، ٢٢) چاپکراوەکان یان ژمارەکانی رۆژنامە بەسیفەتێکی نیداری گل دەدرێنەوە».

هەروەها لە ماددە (٣١)دا هاتووە: «لە حاڵەتی سەرپێچیکردنی حوکمەکانی ماددە (٤، ٧، ١١، ١٢، ١٣، ١٤، ١٧، ١٩) دەکرێ چاپکراوەکان یان ژمارەکانی رۆژنامە بەسیفەتێکی نیداری گل بدرێنەوە».

لەم دوو دەقەدا بۆمان دەردەکەوێ، کە یاسادانەری میسری جیاوازیی کردووە لە نێوان دوو حاڵەتدا، حاڵەتەکانی گلدانەوەی ناچاری (وجوبی) و حاڵەتەکانی گلدانەوەی شیاوەیی (جوازی). بۆیە لە ماددە (٣٠)دا ئەو حاڵەتانەی دەستنیشان کردووە کە دەبێ نیدارە چاپکراوەکان یان ژمارەکانی رۆژنامەی تیا گل بداتەوە ئەگەر هاتوو سەرپێچیی حوکمەکانی ماددە (٩، ١٠، ٢١، ٢٢)ی یاسای چاپەمەنی کرد.

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ، لەم حاڵەتەدا نیدارە بۆی نییە چاپکراوەکان یاخود ژمارەکانی رۆژنامەکان گل نەداتەوە ئەگەر هاتوو سەرپێچیی ئەو حوکمانەی کردبێ یان دژی بەرژەوەندیی گشتی بوبێت.

لە ماددە (٣١)یشدا ئەو حاڵەتانەی دیارکردووە کە دەکرێ چاپکراوەکان یان ژمارەکانی رۆژنامە گل بدرێتەوە ئەگەر هاتوو سەرپێچیی حوکمەکانی ماددە (٤، ٧، ١١، ١٢، ١٣، ١٤، ١٧، ١٩)ی یاسای چاپەمەنی کرد.

لەم حاڵەتەشدا، یاسادانەر خۆی مەبەستییەتی کە ئیدارە دەسەڵاتی خەملاندنی هەبێت بۆ گلدانەوە یاخود گل نەدانەوەی ئەو چاپکراوانە یان ژمارەکانی ئەو رۆژنامانە کە سەرپێچیی ئەو حوکمانە دەکەن یان دژی بەرژەوەندیی گشتی بووتە. رەنگە هۆی ئەمەش ئەوە بێ کە سەرپێچیکردنی ئەم دەقانە نابێتە هۆی گەیاندنی زیانێکی گەورە بەنیزامی گشتی بەپێچەوانەی حاڵەتی پێشوو.

لە گەرانەوەماندا بۆ دەقی مادده (٩، ١٠، ٢١، ٢٢) کە لە مادده (٣٠)دا ئاماژەی پێ کراوە، بۆمان دەردەکەوێ کە مادده (١٠) تایبەتە بەیاساغکردنی دەستاوەدەستکردنی ئەو چاپەمەنی و رۆژنامانەی کە رووبەرووی ئاینی دەبنەوە بەچەشنێک ئاسایشی وڵات دەخەنە مەترسییەوە یان غەریزەکانی مرۆڤ دەورووژێنن.

بەڵام ماددەکانی (٩، ٢١، ٢٢) تایبەتن بەدەستاودەستکردنی رۆژنامە و چاپکراوی بیانی و رێگادان بەئیدارە بۆ گلدانەوەیان بەمەبەستی پاراستنی سیستمی گشتی.

هەروەها ئەگەر ئاورێک لە دەقەکانی مادده (٤، ٧، ١١، ١٣، ١٤، ١٧، ١٩) بدەینەوە، بۆمان دەردەکەوێ کە مادده (٤) تایبەتە بەدیارکردنی ناو و ناونیشانی چاپخانە و بڵاوکەرەوە و رۆژی چاپکردنی چاپکراوەکە، مادده (٧) تایبەتە بەمۆڵەت وەرگرتنی فرۆشتن و دابەشکردنی چاپکراوەکان لە رێگا گشتییەکاندا و مادده (١١) تایبەتە بەئاساندنی ناوی سەرنووسەر، مادده (١٣و١٧) تایبەتە بەئاگاداری و مەرجەکانی دەرکردنی رۆژنامە، مادده (١٩) تایبەتە بەدەستنیشانکردنی هەندێک زانیاریی پێویست لە یەکەمین لاپەرەی رۆژنامەکە.

دووەم: دەست بەسەراگرتن

بەپێی حوکمەکانی هەردوو مادده (٣٠ و ٣١)ی یاسای چاپەمەنی، دادگا بۆی هەیە بریار بدات بەدەست بەسەراگرتنی هەرچاپکراوێک یان ژمارەکانی رۆژنامەیەک ئەگەر هاتوو سەرپێچیی حوکمەکانی مادده (٤، ٧، ٩، ١٠، ١١، ١٢، ١٣، ١٤، ١٧، ١٩، ٢١، ٢٢)ی کرد کە پێشتر ئاماژەمان پێیان کردووە.

لە مادده (٣٠)دا هاتووە: «حوکمی سزادانەکە دەست بەسەراگرتنی چاپکراوەکان یان ژمارەکانی رۆژنامەکە دەگرێتەوە».

هەروەها لە مادده (٣١)دا هاتووە: «دەکرێ حوکمی سزادانەکە دەست بەسەراگرتنی ئەو چاپکراوانە یان ژمارەکانی ئەو رۆژنامانە بگرێتەوە».

لێرەدا بۆمان دەردەکەوێ، ئەو سزایەی کە دادوەر بەپێی حوکمی مادده (٣٠) دەری دەکات، بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی دەست بەسەراگرتنی چاپکراوەکە یان ژمارەکانی ڕۆژنامەکە دەگرێتەوە، چونکە حوکمەکە لێرەدا بەشێوەیەکی وجوبی هاتووە. بەڵام لە مادده (٣١)دا دادوەری سەرپشک کردووە و دەسەڵاتی خەملاندنی دەست بەسەراگرتن و نەگرتنی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو دادوەرەی کە سزایەکە دەردەکات.

٢- یاسای دەسەڵاتی ڕۆژنامەگەریی ژمارە ١٤٨ی ساڵی ١٩٨٠

لە گەڕانەوەماندا بۆ دەقەکانی یاسای دەسەڵاتی ڕۆژنامەگەریی ژمارە ١٤٨ی ساڵی ١٩٨٠ بۆمان دەردەکەوێ کە یاسادانەری میسری دوور و لە نزیکەوە باسی گلدانەوە و دەست بەسەراگرتنی ڕۆژنامەی نەکردووە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە یاسادانەری میسری لەسەر هەمان حوکمی مادده (٣٠ و ٣١)ی یاسای چاپەمەنیی ژمارە ٢٠ی ساڵی ١٩٣٦ ماوەتەوە.

٣- یاسای ڕێکخستنی ڕۆژنامەگەریی ژمارە ٩٦ی ساڵی ١٩٩٦

یاسادانەری میسری لە یاسای ڕێکخستنی ڕۆژنامەگەریی ژمارە ٩٦ی ساڵی ١٩٩٦ دا هەنگاوێک بەرەو پێشەوە چووە، بەوەی کە لە مادده (٥)دا بەراشکاوییەوە دەست بەسەراگرتنی ڕۆژنامەی بەڕێگای ئیداری یاساغ کردووە. بەڵام سەبارەت بەگلدانەوەی ڕۆژنامە، هەمان شێوازی یاسای دەسەڵاتی ڕۆژنامەگەریی ژمارە ١٤٨ی ساڵی ١٩٨٠ی گرتۆتەبەر و لە ئاستیدا بێدەنگ بووە، هەروەکو چۆن لەم یاسایەی دوایشدا لە ئاست گلدانەوە و دەست بەسەراگرتنی دادوەریی بێدەنگ بووە. ئەمەش مانای ئەوەیە بۆ گلدانەوەی ڕۆژنامە بەهەردوو شێوەکانییە و (گلدانەوەی ئیداری و دادوەری) هەروەها دەست بەسەراگرتنی دادوەری، دەبێ بگەڕێینەوە بۆ حوکمەکانی مادده (٣٠و٣١)ی یاسای چاپەمەنیی ناوبراو کە پێشتر ئاماژەمان پێیان کرد.

بەمانایەکی تر، دەتوانین بڵێین، یاسادانەری میسری حاڵەتی دەست بەسەراگرتنی ئیداری لێ دەرچێت، لەسەر هەمان حوکمەکانی پێشوو ماوەتەوە سەبارەت بەگلدانەوە و دەست بەسەراگرتنی ڕۆژنامە. ئەگینا لە مادده (٥)دا تەنها دەست بەسەراگرتنی ئیداریی یاساغ نەدەکرد.

### ۳-۵-۲ گلدانەوە و دەست بەسەراگرتن لە یاسای لوبنانیدا

لە دەقەکانی یاسای چاپەمەنیی لوبنانیی ۱۹٦۲/۹/۱٤ دەردەکەوێ کە یاسادانەری لوبنانی کاری بەسیستمی گلدانەوە نەکردووە، کەچی لە هەندێک حالەتی دیاریکراودا کاری بەسیستمی دەست بەسەراگرتن کردووە. بۆ ئەم مەبەستە ڕێگای بەئیدارە داوە بەبڕیاری وەزیری ڕاگەیاندن لە چوار حالەتدا دەست بەسەر ژمارەکانی ڕۆژنامەدا بگرێت. هەروەها لە دوو حالەتیشدا ڕێگای بەداواکاری گشتیی تێهەڵچوونەوە (النائب العام الاستئنافي) داوە کە دەست بەسەر ژمارەکانی ڕۆژنامەدا بگرێت و بینێرێت بۆ دادگای تایبەتمەند[261].

لەخوارەوە لە دوو خاڵدا باسی ئەو حالەتانە دەکەین. خاڵی یەکەم تەرخان دەکەین بۆ دیارکردنی حالەتەکانی دەست بەسەراگرتنی ڕۆژنامە لەلایەن ئیدارەوە، و خاڵی دووەمیش تەرخان دەکەین بۆ حالەتەکانی دەست بەسەراگرتنی ڕۆژنامە لەلایەن داواکاری گشتیی تێهەڵچوونەوە:

یەکەم: حالەتەکانی دەست بەسەراگرتنی ڕۆژنامە لەلایەن ئیدارەوە

لەم حالەتانەی خوارەوەدا ئیدارە بۆی هەیە بەبڕیاری وەزیری ڕاگەیاندن دەست بەسەر ژمارەکانی ڕۆژنامەدا بگرێت:

۱- ئەو ڕۆژنامانەی بەر لە وەرگرتنی مۆڵەتی دەرکردن دەردەچن[262].
۲- ئەو ڕۆژنامەیەی خاوەنەکەی مردووە و میراتگرەکانی ئاگاداری وەزارەتی ڕاگەیاندن یان لێی نەکردۆتەوە و بەردەوام بوونە لە دەرکردنیدا بێ ڕەچاوکردنی حوکمەکانی یاسای چاپەمەنی بەگشتی و فەسڵی یەکەمی بابی سێهەم بەتایبەتی[263].
۳- ئەو ڕۆژنامە بیانییانەی کە بۆ ناو لوبنان دەهێندرێن و ڕەنگە ئاسایشی وڵات بخەنە مەترسییەوە یان هەستی نەتەوایەتیی خەڵک بشلەژێنن یان لەگەڵ ئادابی گشتی نەگونجێن یان نەعرەی تایفەگەری بوروژێنن[264].

---

۲٦۱- بەپێی حوکمی مادده (۳۱)ی یاسای چاپەمەنیی لوبنانی دوای هەموارکردنی بەیاسای ژمارە ۳۳۰ی ساڵی ۱۹۹٤ کێشەکانی تایبەت بەچاپەمەنی بۆ دادگای چاپەمەنییەکان بەرز دەکرێتەوە.

۲٦۲- مادده (٤۳)ی یاسای چاپەمەنیی لوبنانی.

۲٦۳- مادده (٤۹)ی یاسای چاپەمەنیی لوبنانی.

۲٦٤- مادده (۵۰)ی یاسای چاپەمەنیی لوبنانی.

٤- ئەو رۆژنامەیەی کە سەرەرای راگیرانی یان هەڵوەشانەوەی مۆڵەتەکەی بەفەرمانی ئیداری یان حوکمی دادگا، لەژێر ناوێکی تردا یان بەهەر شێوەیەکی تر لە شێوەکان دەردەچێ و خوێنەر لە خوێندنەوەیدا وا هەست بکا کە هەمان رۆژنامەی پێشوو دەخوێنێتەوە[٢٦٥].

دووەم: حاڵەتەکانی دەست بەسەراگرتنی رۆژنامە لەلایەن بریکاری گشتیی تێهەڵچوونەوە

١- ئەو رۆژنامەیەی ناو و ناوبانگی سەرۆکی وڵات دەزڕێنێ یان بابەتێک بڵاو بکاتەوە ببێتە مایەی بوختان و جوێن و رقکاریی دەرهەق بەسەرۆکی وڵات یان دەرهەق بەسەرۆکی وڵاتێکی بیانی[٢٦٦].

٢- ئەگەر هاتوو بابەتێکی بڵاوکردەوە بووە مایەی قێزەوەنکردنی یەکێک لە ئایینە باوەرپێکراوەکانی وڵات یان نەعرەی تایفەگەری یان رەگەزپەرستی بوروژێنێ یان ئاسایشی گشتی بشێوێنێ یان سەلامەتی و سەروەری و یەکپارچەیی و سنوور و پەیوەندییە دەرەکییەکانی لوبنان بخاتە مەترسییەوە[٢٦٧].

### ٣-٥-٢ گلدانەوە و دەست بەسەراگرتن [illegible] یاسای فەرەنسیدا

فەرەنسا لەسەردەمی ناپلیۆنی یەکەمەوە لەساڵی ١٨٠٠ بۆ یەکەمین جار کاری بەسیستمی گلدانەوە و دەست بەسەراگرتنی ئیداری کرد، ئەوکاتە وەزیری ناوخۆ دەسەڵاتی گلدانەوە و دەست بەسەراگرتنی رۆژنامەی هەبوو ئەگەر هاتوو بابەتێکی بڵاو بکردایەتەوە بەدڵی حوکمران نەبایە. ئەم سیستمە ناوە ناوە ون دەبوو و جارێکیتر سەری هەڵدەدایەوە بەپێی رەوتی رامیاریی فەرەنسا[٢٦٨].

بەم شێوەیە جارێکی تر گلدانەوەی ئیداری بەروخانی ئیمپراتۆرییەتی یەکەم نەما، بەڵام

---

٢٦٥- مادده (٢٧)ی یاسای چاپەمەنیی لوبنانی دوای هەمووارکردنی بەیاسای ژمارە ٣٣٠ی ساڵی ١٩٩٤.

٢٦٦- مادده (٢٣)ی یاسای چاپەمەنیی لوبنانی دوای هەمووارکردنی بەیاسای ژمارە ٣٣٠ی ساڵی ١٩٩٤.

٢٦٧- مادده (٢٥)ی یاسای چاپەمەنیی لوبنانی دوای هەمووارکردنی بەیاسای ژمارە ٣٣٠ی ساڵی ١٩٩٤.

268- Royer COLLARD. De la liberte de lapresse. Paris: Librairiede Medicis, 1949 pp 11-13.

دواتر له سەردەمی ناپلیۆنی سێیەم جارێکی تر بەشێوەیەکی ناڕەوا (غیر مشروع) بێ پشت بەستن بەهیچ دەقێکی یاسایی گەڕایەوە. تەنها یەک حاڵەت نەبێ کە مەرسومی یاسایی ۱۸۵۲/۲/۱۷ له ماددە (۱۰)دا ڕێگای بەئیدارە دابوو کە ئەو ڕۆژنامانە گلبداتەوە کە سەرپێچیی حوکمەکانی تایبەت بەباجی پوول (ضريبة الطابع) دەکەن. کەچی سەرەڕای ئەوەش حکومەت له زۆر حاڵەتی تردا فەرمانی بەگلدانەوەی ڕۆژنامە دەکرد بەپێی لێکدانەوەی خۆی بۆ ماددەی ناوبراو[٢٦٩].

ئەو وەزعە بەم شێوەیە مایەوە تا بەدەرچوونی یاسای ڕۆژنامەگەریی ۱۸۸۱/۷/۲۹ کە گلدانەوە و دەست بەسەراگرتنی ئیداری بەیەکجاری هەڵوەشایەوە. تەنانەت یاسای ناوبراو تەنها بەهەڵوەشانەوەی گلدانەوە و دەست بەسەراگرتنی ئیداری وازی نەهێنا. بەڵکوو دەسەڵێتی دادگاشی لەم بارەیەوە دیارکرد.

لەگەڵ ئەوەشدا، لە ماوەی جەنگی جیهانیی یەکەمدا، فەرەنسا بەشێوەیەکی فراوان کاری بەم سیستەمە کرد، بۆ نموونە، بەفەرمانێکی ئیداری هەردوو ڕۆژنامەی «L Hommelibre» و «L Homme enchaine» گلدرانەوە[٢٧٠].

هەروەها جێی ئاماژەیە، دادگای کێشەکاری (التنازع)ی فەرەنسی لە حوکمێکی بەناوبانگیدا لە ۱۹۳۵/٤/۸ لە کێشەی «Sibour M. Bonnefoy» دا، دانی بەمافی ئیدارە دانا بۆ گلدانەوەی هەر ڕۆژنامەیەک لە هەندێ شوێنی دیاریکراودا ئەگەر هاتوو ئەم گلدانەوەیە پێویست بوو بۆ پاراستنی ئاسایشی گشتی[٢٧١].

شایەنی ئاماژەبۆکردنە، یاسازانی فەرەنسی فالین باسی لە حوکمی ناوبراو کردووە و دەڵێ: «گلدانەوەی چاپەمەنییەکان لە فەرەنسادا بەڕێگای ئیداری، ناکرێ بەڕەوا دابنرێ مەگەر ئەو چوار مەرجانەی تیابێ کە دەبێ لە جێبەجێکردنی ڕاستەوخۆ (التنفيذ المباشر)دا هەبێ کە ئیدارە مومارەسەی دەکات»[٢٧٢].

---

٢٦٩- د. عبدالله اسماعیل البستاني: حرية الصحافة، سەرچاوەی پێشوو، ل١٣٩-١٤٠.

270- Claude Albert COLLIARD, libertes publiques, cinqeime edition, Paris, Dalloz, 1975, P 459

٢٧١- د. عبدالله اسماعیل البستاني: حرية الصحافة، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٤١، هەروەها: Pierres Souty. Recueil De Jurisprudence en matire constitutionnelle, De librtespubliques, Paris; Montchrestien, 1950, P101

٢٧٢- د. عبدالله اسماعیل البستاني: حرية الصحافة، سەرچاوەی پێشوو، ل١٤١.

ئەو مەرجانەش ئەمانەی خوارەوەن:

١- دەبێ ئیدارە لە گلدانەوەی ڕۆژنامەدا پشت بەدەقێکی یاسایی ڕوون و ئاشکرا ببەستێ کە ئەم دەسەلاتەی بەئیدارە دابێت بۆ پاراستنی سیستەم لەهەموو کاتێکدا.

٢- ئەگەر هاتوو ڕۆژنامەیە وتارێکی بلاوکردەوە و تیایدا داوای لە خەلک کرد بۆ بەرهەلستیکردنی یاسا و دەسەلاتی گشتی.

٣- ئەگەر هاتوو یاسا سزای بۆ ئەو کردەوەیە دیارنەکردبوو کە جێبەجێکردنی ڕاستەوخۆ دەخوازێ، یاخود سزایەکەی دیارکردبوو بەلام کاریگەر نەبوو.

٤- ئەگەر هاتوو فرۆشتنی ڕۆژنامە مەترسییەکی گەورە بێت بۆ ئیزامی گشتی و ئاسایشی گشتی.[٢٧٣]

ئەمەش مانای ئەوەیە، هەستانی ئیدارە بەگلدانەوەی ڕۆژنامە بێ کۆبوونەوەی ئەم چوار مەرجانەی سەرەوە کە پێویستن بۆ جێبەجێکردنی ڕاستەوخۆ، گلدانەوەکەی ناڕەوا دەبێت. بەواتایەکی تر، لە فەرەنسادا ئێستا تەنها لەو حالەتانەدا ئیدارە بۆی هەیە بەڕێگایەکی ئیداری ڕۆژنامە گلبداتەوە ئەگەر هاتوو ئەو مەرجانەی تیابوو کە دەبێ بۆ جێبەجێکردنی ڕاستەخۆ هەبن. هەرچەندە، یاسادانەری فەرەنسی، لە دوایین هەمواریدا لە ١٩ی ئەیلول (٢٠٠٠)دا بەمەرسومی یاسایی ژمارە ٩١٦ی سالی ٢٠٠٠ کە لە ١٩ی ئەیلول ٢٠٠٠ دا دەرچووە[٢٧٤]، ماددە (١٤)ی هەموار کردووە و تیایدا ڕێگای داوە بەئیدارە بەفەرمانی وەزیری ناوخۆ دەستاودەستپێکردن (تداول) و دابەشکردن و فرۆشتنی ئەو چاپکراوە خولەکی و ناخولەکییانەی کە بەزمانێکی بیانی دەردەچن لەناو فەرەنسا یاساغ بکات، هەروەها ئەم قەدەغەکردنە دەتوانرێ فەرمانی پێ بکرێت دژ بەڕۆژنامە و نووسراوەکان کە لە هەرێمە بیانییەکان بەزمانی فەرەنسی نووسراون و لە دەرەوەی یان لە ناوەوەی فەرەنسا چاپکراون بەمەبەستی فرۆشتن و بلاوکردنەوە و دووبارە چاپکردنەوەی چاپ دەکرێن. ئەو کەسانەی لێی بەرپرسن سزا دەدرێن بەیەک سال زیندانی و ٤٥٠٠ یۆرۆ غەرامە.

هەروەها سەرلەنوێ دەرکردنەوەی ڕۆژنامەیەک یان نووسراوێکی قەدەغەکراو لەژێر ناوێکی جیاوازدا قەدەغەیە و غەرامەکەی دەکاتە ٩٠٠٠ یۆرۆ دەگەڕێتەوە بۆ خەملاندنی

٢٧٣- د. عبدالله اسماعيل البستاني: حرية الصحافة، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٤١-١٤٢.

٢٧٤- ئەم مەرسومە یاساییە لە ١ کانوونی دووەمی ٢٠٠٢ کاری پێدەکرێ هەروەکو لە مەرسومەکەدا هاتووە.

نیداره، بریاردان دەربارەی ژمارەکانی کۆپیەکانی ڕۆژنامە و نووسراوە قەدەغەکراوەکان و ئەوانەی دەست دەکەنەوە بەبلاوکردنەوەیان لەژێر ناونیشانێکی جیاوازدا[٢٧٥].

بەڵام سەبارەت بەگلدانەوە و دەستبەسەراگرتنی دادوەریی (الحجز والمصادرة القضائية) یاساداندەری فەرەنسی لە ماددە (٦١)ی یاسای ڕۆژنامەگەریدا دانی پیاداناوە و حاڵەتەکانیشی دیارکردووە و دەڵێ: «ئەگەر بەپێی ماددەکانی ٢٤ (بڕگە ١و٣) ٢٥، ٣٦، ٣٧، حوکم درا، دادگا بۆی هەیە لەگەڵ حوکمەکەدا فەرمانی دەستبەسەراگرتنی لە چاپدراوەکان و نووسراوە هەڵواسراوەکان، و لە هەموو حاڵەتێکدا بۆی هەیە فەرمان بدات بەگلدانەوە یان لەناوبردن و نەهێشتنی هەموو ژمارەکانی دانراو بۆ فرۆشتن یان پێشاندراوەکان یان نمایشکراوەکان بۆ دیتنی جەماوەر. بەهەرحاڵ دەشێ لەناوردان و نەهێشتن تەنها بەشێک لە ژمارە گلدراوەکان بگرێتەوە»[٢٧٦].

---

٢٧٥- ئەمەش دەقەکەیەتی بەزمانی فەرەنسی:

Modifié par Ordonnance 2000-916 19 Septembre 2000 art 3 JORF 22 septembre 2000 en vigueur ■ 1er janvier 2002.

La circulation, la distribution ou la mise en vente en France des journaux ou écrits, périodiques ou non, rédigés en langue étrangère, peut être interdite par décision du ministre de l'intérieur.

Cette interdiction peut également être prononcée à l'encontre des journaux ■ écrits de provenance étrangère rédigés en langue française, imprimés à l'étranger ou en France.

Lorsqu'elles sont faites sciemment, la mise en vente, la distribution ou la reproduction des journaux et écrits interdits sont punies d'un an d'emprisonnement et de 4500 euros d'amende.

Il en est de même de la reprise de la publication d'un journal ou d'un écrit interdit, sous un titre différent. Toutefois, en ce cas, l'amende est portée à 9000 euros.

Il est procédé à la saisie administrative des exemplaires ■ des reproductions de journaux et écrits interdits et de ceux qui en reprennent la publication sous un titre différent.

٢٧٦- ئەمەش دەقەکەیەتی بەزمانی فەرەنسی:

Créé par Ordonnance 45-2090 13 Septembre 1945 JORF ■ septembre 1945.

S'il y a condamnation, l'arrêt pourra, dans les cas prévus aux articles 24 (par 1er et 3), 25, 36 et 37, prononcer la confiscation des écrits ou imprimés, placards ou affiches saisis et, dans tous les cas, ordonner la saisie et ■ suppression ou la destruction de tous les exemplaires qui seraient mis en vente, distribués ou exposés aux regard du public. Toutefois, la suppression ou la destruction pourra ne s'appliquer qu'à certaines parties des exemplaires saisis.

### ٣-٥-٤ گلدانەوە و دەست بەسەراگرتن لە یاسای عێراقیدا

لە دوتوێی دەقەکانی یاسای چاپەمەنیی عێراقی ژمارە (٢٠٦)ی ساڵی ١٩٦٨ی هەموارکراودا بۆمان دەردەکەوێ کە یاسادانەری عێراقی دانی بەگلدانەوەی تێداری داناوە لەکاتێکدا کاری بەسیستمی دەستبەسەراگرتنی تێداری کردووە.

بەپێی مادەدە (٢٠) برگەی (ب) بەبڕیارێکی وەزیری رۆشنبیری و راگەیاندن دەست بەسەر گشت ژمارەکانی ئەو رۆژنامەیەدا ■گیرێت کە بابەتێکی لەو بابەتە یاساغ کراوانەی مادەدە (١٩) بڵاوکردۆتەوە. هەروەها بۆی هەیە بەیاننامەیەک لەم بارەیەوە لە رۆژنامەی رەسمی و ناوخۆییەکاندا بڵاو بکاتەوە. ئەمەش دەقەکەیەتی: «ئەگەر ئەو چاپکراوە یەکێک لەو بابەتە یاساغ کراوانەی کە لە مادەدە (١٩)دا هاتوون لەخۆ گرتبوو، دابەشکردنی لە ناو عێراقدا قەدەغە دەکرێت و بەبڕیارێکی وەزیر دەست بەسەر هەموو ئەو ژمارانەیدا دەگیرێت کە لێی هێنراوە و سەرجەم دەزگا تایبەتمەندەکانیشی لێ ئاگادار دەکرێتەوە و بۆشی هەیە بەیاننامەیەک لەو بارەیەوە لە رۆژنامەی رەسمی و ناوخۆییەکاندا بڵاوبکاتەوە».

لەگەڕانەوەماندا بۆ دەقی مادەدە (١٩) بۆمان دەردەکەوێ کە دابەشکردنی ئەو چاپەمەنییانەی یاساغ کردووە کە لە دەرەوەدا دەهێنرێنە عێراق ئەگەر هاتوو بابەتێکی لەم بابەتانەی خوارەوەی لەخۆ گرتبوو:

١- ئەو بابەتەی کە لەگەڵ سیاسەتی کۆماری عێراقدا ناگونجێ.

٢- پڕوپاگاندەکردن بۆ بیری ئیمپریالیزم بەهەردوو شێوەی کۆن و نوێیەوە و شێواندنی بزووتنەوە رزگاریخوازەکانی جیهان.

٣- پڕوپاگاندەکردن بۆ بزووتنەوە رەگەزپەرستەکانی وەک زایۆنیزم و ئەوانی تری لەو چەشنە.

٤- شێواندنی ئابڕوو (سمعة)ی هێزی چەکداری و جوولە و بڵاوکردنەوەی نهێنییەکانی.

٥- وروژاندنی قین و دووبەرەکی لەنێوان ئەندامانی کۆمەڵدا، یان نەتەوەکان و تیرە ئایینییەکاندا.

٦- ئەو بابەتەی کە لەگەڵ ئاداب و رەوشتی گشتیدا ناگونجێ.

٧- پلاردان لە وڵاتە عەرەبی و دۆستەکان بەنیازێکی خراپەوە.

٨- هەر بابەتێکی تر کە بەپێی حوکمەکانی ئەم یاسایە بڵاوکردنەوەیان قەدەغە کرابێت.

لەم دەقەدا بۆمان دەردەکەوێ، ئەو حاڵەتانە بەدەستەواژەیەکی تەمومژاوی داڕێژراوە، بۆیە زیاتر لە مانایەک هەڵدەگرن، ئەمەش وایکردووە ئەو ڕۆژنامانەی کە لە دەرەوەی عێراقدا چاپ دەکرێن و دەهێنرێنە ناوەوە، ڕووبەڕووی سانسۆرێکی پێشینەی یەکجار قورس ببنەوە کە لەلایەن دەزگای سانسۆری چاپەمەنییەکان بەرلە دابەشکردنیان لەناو عێراقدا پیادە دەکرێ.

بۆ ئەم مەبەستە یاسادانەری عێراقی لە مادەی (١٨) بڕگەی (أ)دا مەرجی کردووە بەپێشکەشکردنی دوو دانە لەو ڕۆژنامانەی کە لە دەرەوەی عێراقدا چاپ دەکرێن بۆ وەرگرتنی ڕەزامەندی بەر لە فرۆشتن یان دابەشکردنیان لەناو عێراقدا[٢٧٧].

ئەمەو ئەگەر بەبێ ڕەزامەندی لایەنی پەیوەندیدار، ڕۆژنامەکە لەناو عێراقدا فرۆشرا یان دابەشکرا، لەو حاڵەتەدا بەبڕیارێکی وەزیری ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندن دەست بەسەر ژمارەکانی ئەو ڕۆژنامەیەدا دەگیرێت و ئەو کەسەی شتیش لە دەرەوە دێنێ (مستورد) بۆی نییە داوای قەرەبووکردنەوەی زیانەکانی بکات[٢٧٨]. بەڵام دەتوانێ لەجیاتی ئەوە، بەنووسراوێک داوا لە وەزیری ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندن بکات بۆ ڕەزامەندی کردن لەسەر گێڕانەوەی چاپەمەنییەکە بۆ دەرەوەی عێراق، ئەگەر هاتوو ئەم کارە زیانبەخش نەبوو. لەم حاڵەتەشدا، وەزارەت بۆی هەیە هەندێ ژمارەی چاپەمەنییەکە گلبداتەوە[٢٧٩].

ئەوەی جێی سەرنجە، یاسادانەری عێراقی هە بەمەندە نەوەستاوە، بەڵکوو ڕێگاشی لەبەردەم خاوەن ڕۆژنامە یان ئەو کەسەی کە شت لە دەرەوە دێنێ گرتووە بۆ بەرزکردنەوەی داوا دژی ئیدارە بۆ تانە لێدانی ئەو کار و سزا ئیدارییانەی دەرهەق بەڕۆژنامەکە کراوە.

---

٢٧٧- ئەمەش دەقەکەیەتی: «ئەوانەی چاپکراو لە دەرەوەی عێراق دەهێنن، دەبێ بەم کارانەی خوارەوە هەستن:

١- پێشکەشکردنی دوو دانە بۆ وەزارەت بەر لە فرۆشتنی یان دابەشکردنی لەناو عێراقدا بۆ ئەوەی ڕێگای ئەمەیان پێ بدرێت».

٢٧٨- بڕوانە مادەی (٢٠) بڕگەی (د) کە ئەمەش دەقەکەیەتی: «ئەگەر بڕیار درا بەیاساغکردنی چاپکراو و دەستبەسەراگرتنی ئەو ژمارانەی کە لێی هاوردراون، هاوردەکەی بۆی نییە داوای قەرەبووکردنەوەی زیانەکانی بکات».

٢٧٩- بڕوانە مادەی (٢٠) بڕگەی (ج) کە ئەمەش دەقەکەیەتی «ئەگەر هاتوو لە گەڕانەوەی چاپکراوەکە بۆ دەرەوەی عێراق زیانێک نەبوو، وەزیر بۆی هەیە لەسەر داوا و نووسراوی هاوردە ڕێگا بەمە بدات و لەم حاڵەتەشدا دەکرێ هەندێک ژمارەی گرنجاری چاپکراوەکە لە وەزارەت هەڵبگیرێت».

ئەمەش خۆی لەخۆیدا، دەست تێوەردانێکی زەقە لە دەسەلاتی دادگا و دژی پرنسیپەکانی مافی مرۆڤ[280] و پەیماننامە نێودەوڵەتییەکانە.

حوکمی مادده (٢٠) برگەی (د) وای لە هاوردەی چاپەمەنییەکانی دەرەوەی وڵات کردووە لە ترسی دەستبەسەراگرتن و گلدانەوەی چاپەمەنییەکانیان، زۆر جاران، یەکەمجار تەنها دوو دانەی لێ بهێنن بۆ پێشکەشکردنی بۆ دەزگای سانسۆری چاپەمەنییەکان بەمەبەستی وەرگرتنی رەزامەندی لەسەر هێنانیان و دواتر چاوەڕێی ئەنجام دەبن[281].

ئەوەی شایەنی باسە، حوکمەکانی مادده (١٨ و ٢٠) سەبارەت بەو چاپکراوانەی کە لە دەرەوەی وڵاتەوە دەهێنرێنە ناوەوە لەگەڵ سیستمی نوێی جیهانی و جیهانگیری و شۆڕشی گەیاندن (اتصالات) ناگونجێ.

ئەمڕۆکە جیهان لەسایەی ئینتەرنێت و سەتەلایتدا بچووک بۆتەوە و گشت پارچەکانی وەک تەونی جاڵجاڵۆکە بەیەکەوە بەستراوەتەوە و زەحمەتە وا بەئاسانی بەرهەڵستی شاڵاوی هزر بکرێ بۆ ناوەوە، مەگەر بەخەرجکردنی داراییەکی زۆر نەبێ کە بۆ دانانی سیستمێکی چاودێریی ئەلیکترۆنیی زۆر پێشکەوتوو تەرخان دەکرێت. سەرەڕای ئەمەش تاکو ئێستا نەتوانراوە کۆنترۆڵی گشت سایتی زانیارییەکان لەسەر تۆڕی ئەینتەرنێت بکرێت تەنها هەندێک دۆسییەی دیاریکراو نەبێت[282].

بۆیە باشتروابوو، یاسادانەری عێراقی چاوێکی بەم حوکمانەدا بخشاندایەتەوە، بەجەشنێک لەگەڵ ئەم گۆڕانکارییانەی ئەمڕۆ بگونجایە.

---

٢٨٠- بڕوانە مادده (٨)ی جاڕی گەردوونیی مافی مرۆڤ کە تیایدا هاتووە: هەمرو کەسێک بۆ داوەریکردن و پاراستنی مافە بنەڕەتییەکانی کە یاسا و دەستوور پێی داوە، لە دەست درێژیکردنەسەر، مافی پەنابردنەبەر دادگا نیشتمانییەکانی هەیە.

٢٨١- بڕوانە دەقی مادده (١٨) برگەی (أ) کە پێشتر ئاماژەمان پێی کردووە سەبارەت بەپابەندبوونی ئەوکەسانەی کە لە دەرەوەی عێراق چاپکراو دەهێنن، بەپێشکەشکردنی دوو دانە لە چاپکراوەکە بۆ وەزارەت بەر لە فرۆشتنی یان دابەشکردنی لەناو عێراقدا.

٢٨٢- مەملەکەتی عەرەبیی سعودی وتیرای رێگادان بەبەکارهێنانی تۆڕی ئینتەرنێت و کردنەوەی دەیان ئووسینگە بۆ ئەم مەبەستە، کەچی دەیان ملیۆن دۆلاری ئەمەریکی تەرخان کردووە بۆ داخستنی چەندین شوێن لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت کە بەهەڕەشەی دادەنێت لەسەر ڕژێمەکەی. هەروەها، دەزگایەکی چاودێری داناوە بۆ چاودێریکردنی ئەو کەسانەی کە سەیری شوێنەکانی ئینتەرنێت دەکەن. بەمەبەستی رێگاگرتنیان لە چوونە ناو ئەو شوێنانەی کە بەهەڕەشەی دادەنێ لەسەر دوارۆژی ڕژێمەکەی. بڕوانە: http;www.almashrek.org.2001/11/6

### ٣-٥-٥ گلدانەوە و دەست بەسەراگرتن لە یاسای چاپەمەنیی هەرێمی کوردستاندا

یاسای چاپەمەنیی هەرێمی کوردستان ژمارە (١٠)ی ساڵی ١٩٩٣ لە دوتوێی دەقەکانیدا هیچ ئاماژەیەکی بەستمی دەسبەسەراگرتن و گلدانەوەی ئەو ڕۆژنامانەی کە بەپێی حوکمەکانی یاسای چاپەمەنی دەردەچن بەڕاشکاویی نەکردووە.

بەڵام لە ماددە (١٣) برگەی (١)دا بڕیاری داوە کە حوکمی دادوەری بەگوناهبارکردنی خاوەنی ئیمتیاز و سەرنووسەر لە چاپکراوی دەوریدا خودی چاپکراوەکە ناگرێتەوە و بوونی بەردەوام دەبێ.

بەپێی ئەم دەقە، ڕۆژنامە نەک تەنها بەبڕیاری ئیداری بەڵکوو بەبڕیاری دادگاش ڕاناگیرێت، و لەبەرئەوەی حوکمی گلدانەوە و دەسبەسەراگرتنی ڕۆژنامە سووکترە لە ڕاگرتن و هەڵوەشانەوە، کەواتە حوکمی دادگا گلدانەوە و دەسبەسەراگرتنی ڕۆژنامەش ناگرێتەوە. لەبەرئەوەی دەسەڵاتی ئیدارە بۆ گلدانەوە و دەسبەسەراگرتنی ڕۆژنامە دەسەڵاتێکی لاوەکییە و دەسەڵاتی دادگا لەم بارەیەوە دەسەڵاتێکی بنچینەیە، و لەبەرئەوەی یاسای چاپەمەنی لە ماددە (١٣) برگەی (١)دا ئەم دەسەڵاتەی لە دادگا سەندۆتەوە، کەواتە ئیدارەش بۆی نییە ڕۆژنامە گلبداتەوە و دەستی بەسەردا بگرێت.

لەم گفتوگۆیانەدا بۆمان دەردەکەوێ کە یاسادانەری کوردستان هەر لە سەرەتاوە بەمەبەستی ڕەخساندنی دەرفەتی زیاتر بۆ ئازادیی ڕۆژنامەگەری، نیازی نەبووە ڕێگا بدات بەگلدانەوە و دەسبەسەراگرتنی ڕۆژنامە. ئەمەشمان زۆر بەئاشکرا لە گفتوگۆی ئەو پەرلەمانتارانە بۆ دەردەکەوێ[٢٨٣].

---

٢٨٣- لە گەڕانەوەماندا بۆ پرۆتۆکۆلی دانیشتنەکانی پەرلەمان لەبارەی گفتوگۆکانی ئەم ماددەیە، دەبینین ئەندامێکی پەرلەمان لە سێیەمین دانیشتنی پەرلەماندا کە بۆ تاوتوێکردنی یاسای چاپەمەنی، تەرخان کراوە، لەبارەی حوکمی ماددە (١٢) دەپرسێ: «ئایا چاپەمەنی دەوری، یان ڕۆژنامەیەک ئەگەر شتێکی نووسی و لەبەرژەوەندیی میللەتدا نەبوو، یان پێچەوانەی بەرژەوەندیی گشتی و داب‌ونەریت بوو، یان تێکدانی تێدابوو، ئایا ئەو بڵاوکراوەیە لەبازاڕ دەکێشرێتەوە یان نا؟». ئەندامێکی لیژنەی یاسا لە پەرلەمانی کوردستان، لە وەڵامی ئەو پرسیارەدا دەڵێ: «ئێمە ناتوانین زەلامێک بنێرینە مەکتەبەکان پێیان ڕابگەیەنین و بڵێین بڕۆ ڕۆژنامەکان هەمووی کۆبکەوە ئەوە ڕاست نییە چاپکراوی خولەکی تەنها خاوەن ئیمتیاز و سەرنووسەر تۆژینەوەی دادگاییان لەگەڵ دەکرێت». هەر لەم بارەیەوە ئەندامێکی پەرلەمان دەپرسێ: «ئەگەر چاپەمەنی دەوری هەڵەی کرد و زیانی بەخەڵک گەیاند بۆچی دادگا داینەخات و دەستی بەسەردا نەگرێ». هەمان ئەندامی =

بەڵام سەبارەت بەو ڕۆژنامە و چاپکراوە خولەکییانەی کە لە دەرەوەی هەرێم دەردەچن و دەهێندرێنە ناو هەرێم، زۆر بەڕاشکاوییەوە لە ماددە (١٣)دا جەختی لەسەر ئەوە کردووە کە هیچ کۆتوبەندێک لەسەر هێنانی چاپکراو بۆ ناو هەرێم و بردنی بۆ دەرەوەی نییە، تەنیا ئەوانە نەبێت کە پێچەوانەی حوکمەکانی ماددەی نۆیەمن و لەو حاڵەتەشدا سەرپێچیکەر دەکەوێتە بەر لێپرسینەوەی یاساییەوە.

یاسادانەر لە بەشی یەکەمی ئەم ماددەیەدا، وەک بنچینە بڕیاری داوە بەیاساغ کردنی دانانی هەر کۆتوبەندێک لەسەر هێنانی ڕۆژنامە بۆ ناو هەرێم و ناردنی بۆ دەرەوە، بەڵام لە بەشی دووەمدا ڕیزپەڕێکی لەسەر ئەم بنچینەیە داناوە، ئەویش دانانی ئەو کۆتوبەندانەیە کە لە ماددەی نۆیەمی ئەم یاسایەدا هاتوون.

لە گەڕانەوەماندا بۆ دەقی ماددە (٩)دا، بۆمان دەردەکەوێ کە یاسادانەر بڵاوکردنەوەی هەندێک بابەتی لە ڕۆژنامەدا قەدەغە کردووە، بێ ئەوەی حوکمەکەی لە بەرامبەر دیار کردبێت. هەڵبەتە لێرەدا، مەبەستی یاسادانەر زۆر ڕوون و ئاشکرا نییە، ئەگەر ڕۆژنامەیەک سەرپێچی حوکمی ئەم ماددەیەی کرد، ئایا چی دەبێ؟

بۆ وەڵام دانەوەی ئەم پرسیارە، بەباشی دەزانین، بگەڕێینەوە بۆ ئەو گفتوگۆیانەی کە لەپەرلەمان لەبارەی ماددە (١٣) کراون.

ئەندامێکی پەرلەمان، دەربارەی ماددەی ناوبراو پرسیار لە لیژنەی یاسایی دەکات: «ئایا ئەو چاپەمەنییانە و ئەو ڕۆژنامانەی کە لەلایەن ڕژێمەوە دێنە کوردستان، ئەگەر هاتوو تانەو تەشەری بەکەسانێ تێدابوو چۆن چارەسەر دەکرێ ؟ کێ لێرە تاوانبار دەکرێ ؟ ئایا یاساغ دەکرێ یان نا ؟»[٢٨٤].

هەر لەم بارەیەوە، پەرلەمانتارێکی تریش دەڵێ: «کێشەی ئێمە هەر لەگەڵ ئەو

---

= لیژنەی یاسایی لە وەڵامدا دەڵێ: «مەبەستەکە ئەوەیە بەرای ئێمە ڕۆژنامە مالی ئەو مسەللەتەبە بێنێ». هەر لە بەدواداچوونی ئەم بابەتە پەرلەمانتارێکی تر دەڵێ: «زۆرجار سەرنووسەر سزا دەدرێت خاوەن ئیمتیاز بۆی هەیە سەرنووسەرێکی تر دابنێت بۆئەوەی چاپەمەنییەکە ڕانەوەستێت ئەمە ئازادییەکی زیاتری دەداتێ و پێویستە بدرێت. من لە ناوەرۆکی ئەو ماددەیە واتێدەگەم بێنێت»بۆ دەقی ئەم گفتوگۆیە، بڕوانە پرۆتۆکۆڵەکانی ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستانی عێراق: بەرگی حەوتەم، چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ١٩٩٧ ل ٢٨٥ -٢٨٨.

٢٨٤- پرۆتۆکۆڵەکانی ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستانی عێراق: بەرگی(٧)، چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ١٩٩٧ ل٢٨٨.

چاپەمەنییانە نییە کە لە عێراقەوە دێنە کوردستان، کێشە ئەو چاپەمەنییانەیە کە لە دەرەوەی کوردستان بڵاو دەکرێنەوە، ئێمە خۆمان دەزانین زۆر دوژمنمان هەیە زۆربەشیان خەڵکی زۆر دڵرەشن کە لە ئەورووپا دانیشتوون ژەهر بۆ کوردستان دەرێژن لەبەر ئەوە من بەباشی دەزانم سانسۆرێک دابنرێ بۆ ئەم بابەتە چونکە، چاپەمەنی ئەوان لەبەرژەوەندیی کوردستان نییە بەپێچەوانەوە ژەهر بۆ کوردستان دەرێژن»[٢٨٥].

سەرۆکی فراکسیۆنی کتلەی زەردیش لە درێژەی ئەم بەدواداچوونەدا دەڵێ: «من لەگەڵ ئەوەم کە ئەو شتانەی لەدەرەوە دەنووسرێت بێن بۆ کوردستان هیچ نەبێ بۆ ئەوەی بزانین چیمان پێ دەڵێن چۆن جنێومان پێدەدەن، من پێم وایە هیچ سانسۆریان لەسەر نەبێ هەرچی دەبێت و دەیێن با بیهێنن»[٢٨٦].

دوای گفتوگۆیەکی تێروتەسەل ئەم ماددەیە بەتێکڕای دەنگ وەکو خۆی پەسند کرا، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە یاسادانەری کوردستان، ئازادکردنی ئەو ڕۆژنامانەی بەلاوە باشتر بووە لە کۆتوبەند کردنیان.

هەڵبەتە ئەمەشی لە سۆنگەی باوەڕبوون بەئازادیی بیروڕادەربڕین و ڕای جیاوازەوەیە.

لە کۆتاییدا، لە میانی دیراسەکردنی گلدانەوە و دەستبەسەراگرتنی ڕۆژنامە بەڕێگای ئیداری، بۆمان دەردەکەوێ کە ئەم ڕێگایە کۆتوبەندە لەبەردەم ئازادیی ڕۆژنامەگەری و چەکێکی بەهێزیشە بەدەستی ئیدارەوە بۆ سەپاندنی دەسەڵاتی خۆی بەسەر ڕۆژنامەگەریدا.

هەروەها گلدانەوە و دەستبەسەراگرتنی ڕۆژنامەگەری بەڕێگای دادگا هەمان ئامانج دەپێکێت ئەگەر هاتوو ئەو دادگایە خاوێن و بێلایەن نەبوو لە دەرکردنی بڕیارەکەیدا.

بۆیە بەڕای ئێمە، هەڵوێستی یاسادانەری کوردستان لەم ڕووەوە زۆر ئیجابییە و مایەی دڵخۆشییە. هەرچەندە باشتروابوو لەجیاتی ئەم بێدەنگییە هەمان ڕێچکەی ماددە (١٢) بڕگە (أ)ی بگرتایەتەبەر[٢٨٧].

---

٢٨٥- پرۆتۆکۆڵەکانی ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستانی عێراق: بەرگی(٧)، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٨٨.

٢٨٦- پرۆتۆکۆڵەکانی پەرلەمانی کوردستان: سەرچاوەی پێشوو ل٢٨٩.

٢٨٧- لە ماددە (١٢) بڕگەی (أ)دا هاتووە: «حوکمی دادوەری بەگوناهبارکردنی خاوەنی ئیمتیاز و سەرنووسەر بەپێی حوکمەکانی ئەم یاسایە لە چاپکراوی دەوریدا خودی چاپکراوەکە ناگرێتەوە و بوونی بەردەوام دەبێ...» بۆ زانیاری ئەم ماددەیە سەیری خاڵی (٣ -٢) چوارەم بکە.

## ٢-٦ سانسۆر

سانسۆر بریتییە لە ڕێگاگرتن لە ئاڵوگۆڕکردنی ئەو بیروبۆچوونانەی کە دژی چەمکە گشتییەکانی کۆمەڵن. ڕۆژنامەکان و چاپکراوە دەورییەکان لە زۆربەی دەوڵەتاندا لەلایەن دەزگا بەرپرسەکانەوە سانسۆری توندیان لەسەر دادەندرێت[٢٨٨]. سانسۆریش سێ جۆری هەیە، سانسۆری پێشینە «رقابة سابقة» و سانسۆری دوایینە «رقابة لاحقة» و خود سانسۆریی «رقابة ذاتية». جۆری ئەو سانسۆرەش لە دەوڵەتێکەوە بۆ دەوڵەتێکی تر بەپێی گۆڕانی سیستەمە سیاسییەکەی دەگۆڕێت.

بێ گومان سانسۆری پێشینە لەوانیتر کاریگەرترە و لە هەموویشیان زیاتر فشار دەخاتەسەر ئازادیی ڕۆژنامەگەری. چونکە لە ڕێگای دەستەیەکی تایبەتییەوە کە لەژێر دەسەڵاتی حکوومەت و بۆ بەرژەوەندی ئەو کار دەکەن بەڕێوە دەچێت. لە دەوڵەتە سەرکوتکەر و دکتاتۆرەکان پشت بەسانسۆری پێشینە دەبەستن بۆ ئەوەی هەموو شتێک لەژێر دەسەڵاتی خۆیان بهێڵنەوە و نەهێڵن ڕۆژنامەنووس ئەو سنوورە تەسکە ببەزێنێ کە بۆی داندراوە.

بەڵام دەوڵەتە دیموکراتەکان لەم ڕووەوە دەبن بەدوو بەشەوە، هەندێکیان پشت بەسانسۆری دوایینە دەبەستن و هەندێکی تریشیان پشت بەخود سانسۆریی دەبەستن.

### ٢-٦-١ سانسۆری دوایینە و خود سانسۆریی

ئەو وڵاتانەی کە پەیڕەوی سیستمی سانسۆری دوایینە دەکەن، مەسەلەی بەزاندن و نەبەزاندنی ئەو هێڵە گشتییانەی کە لەلایەن دەسەڵاتی سیاسییەوە بۆ ڕۆژنامەنووسان دانراوە بەدادگا سپێردراوە و دادگاش بۆ بەرژەوەندیی کۆمەڵ حوکمی خۆی لەسەر دەدات ئەگەر دادگا سەربەخۆ بێت هەروەکو چۆن حوکمی خۆی لەسەر تاوانەکانی تری بڵاوکردنەوە دەدات[٢٨٩]

بۆ ئەم مەبەستەش لە یاسای ڕۆژنامەگەری یاخود چاپەمەنیدا، خاوەنی ڕۆژنامەکە ناچار دەکرێ کە دانەیەک لەو ڕۆژنامە یان چاپکراوە دەورییەی کە دەریدەکات بۆ داواکاری

---

٢٨٨- تۆماس نیمزنس: سەرکوتکردنی ڕۆژنامەنووسان لە جیهاندا، وەرگێڕانی لوقمان حەمەئەمین، ڕۆژنامەی برایەتی ژمارە (٣٥١٩) دووشەمە ٢٢/١٠/٢٠٠١ ل٩.

٢٨٩- د. ابراهيم الدالوقي: قانون الاعلام، سەرچاوەی پێشوو ل١٠٧

گشتی یان وەزارەتی ناوخۆ و لایەنە پەیوەندیدارەکان بنێرێت[٢٩٠]. داواکاری گشتییش بەدەوری خۆی ڕۆژنامە چاویان پێدا دەخشێنێت و بەپێی ئەو دەسەڵاتەی کە پێی دراوە ئەو بابەتانە دەستنیشان دەکات کە دژی بەرژەوەندیی کۆمەڵن و لەبەر ڕۆشنایی ئەمە داوایەکی گشتی دژی سەرپێچیکەر بۆ دادگا بەرز دەکاتەوە[٢٩١].

---

٢٩٠- بڕوانە دەقی ماددەی (١٠)ی یاسای ڕۆژنامەگەریی فەرەنسی ساڵی ١٨٨١ کە دەقنووسی کردووە: «لەکاتی بڵاوکردنەوەی هەر ڕۆژنامە و چاپکراوێکی دەوریدا دەبێ دوو دانە بەواژۆکراوییەوە لەلایەن بەڕێوەبەری نووسینگەی بۆ نووسینگەی داواکاری گشتی یان بەڕێوەبەرایەتیی شارەوانی لەو شارانەی کە تێیهەڵچوونەوەیان تێدا نییە ڕەوانە بکرێت. هەروەها ■ دانە بەهەمان شێوە بۆ وەزارەتی ڕۆشنبیری و ناوچە (مقاطعة)ی (لاسێن)و ناوچەکانی تر دەدرێت بەپارێزگا یان قەزا یان بۆ شارەوانی لەو شارانەی کە نە پایتەختی مقاتەعەن و نە پایتەختی بازنگە ئیدارییەکانن هەر سەرپێچییەکی ئەم حوکمە سزا دەدرێت بەو سزایەی بۆ سەرپێچییەکانی پلە چوارەم دانراون کە بەسەر بەڕێوەبەری بڵاوکراوەکە دەسەپێنرێت. ئەمەش دەقەکەیەتی بەزمانی فەرەنسی:

Modifié par Décret 93-726 ■ Mars 1993 art 2 JORF 30 mars 1993 en vigueur le 1er mars 1994.

Au moment de la publication de chaque feuille ou livraison du journal ou écrit périodique, il sera remis au parquet du procureur de la République, ou à la mairie dans les villes où il n'y a pas de tribunal de grande instance, deux exemplaires signés du directeur de ■ publication.

Dix exemplaires devront, dans les mêmes conditions, être déposés au ministère de l'information pour Paris et le département de la Seine et pour les autres départements à la préfecture, à la sous-préfecture ou à ■ mairie, dans les villes qui ne sont ni chefs-lieux de département ni chefs-lieux d'arrondissement.

Chacun de ces dépôts sera effectué sous peine de l'amende prévue pour les contraventions de la 4 classe contre le directeur de la publication.

هەروەها بڕوانە دەقی ماددەی (٢٠)ی یاسای چاپەمەنیی میسری ژمارە (٢٠)ی ساڵی ١٩٣٦ کە ئەمەش دەقەکەیەتی: «دوای بڵاوبوونەوەی هەر ڕۆژنامەیەک یان پاشکۆکەی دەبێ شەش دانەی بەواژۆکراوییەوە بەواژۆی سەرنووسەرەکەی یان یەکێک لە ئەندامانی دەستەی نووسەرانی بۆ وەزارەتی ناوخۆ ڕەوانە بکرێت ئەگەر بێت و ڕۆژنامەکە لە قاهیرە دەربچێت یان بۆ پارێزگا یان بەڕێوەبەرێتی ڕەوانە بکرێت ئەگەر بێت و لە شارەکانی تردا دەربچێت».

٢٩١- لەم ڕووەوە یاسای چاپەمەنیی هەرێمی کوردستانی عێراق کەموکوڕی تێدایە، چونکە سەرەڕای ئەوەی کە لە ماددەی (١١)دا دەسەڵاتی بەرزکردنەوەی داوا کێشەییەکانی داوەتە داواکاری گشتی بەڵام لەناستی ئەمەدا بێدەنگ بووە ئەم ئەرکەی نەخستۆتە ئەستۆی خاوەنی ڕۆژنامە یان =

لە فەرەنسا[٢٩٢] و میسر هەروەها لە هەرێمی کوردستاندا[٢٩٣] پەیڕەوی ئەم سیستمە دەکرێت. بەڵام ئەو وڵاتانەی کە پەیڕەوی سیستمی خود سانسۆریی دەکەن، مەسەلەی سنوور بەزاندنەکە بۆ خودی ڕۆژنامەنووسەکە جێدەهێڵن و دەبێ ڕۆژنامەنووس پابەندی ویژدانی خۆی و بنەماکانی ئەخلاقیی پیشەکەی خۆی بێت و لە هەموو کەسێکیش زیاتر بەرامبەر بەکۆمەڵەکەی و نیشتمانەکەی هەست بەلێپرسینەوە بکات[٢٩٤].

وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا باشترین نموونەی ئەو وڵاتانەیە کە پەیڕەوی ئەم سیستمە دەکەن و لەوێدا ڕۆژنامەنووس ئازادە و لە ویژدانی خۆی و بنەماکانی ئەخلاقیی پیشەکەی بەولاوە پابەندی هیچ بنەمایەکی تر نابێت.

---

جمهوریەکەی. لەکاتێکدا ئەمڕۆکە دەیان ڕۆژنامە و چاپکراوی دەوری لە هەرێمی کوردستانی عێراقدا دەردەچن و رەنگە بێت ئاگاداربوونیان ئاسان نەبێت. بۆیە بەباشی دەزانین یاسادانەری کوردستان ئەم کەموکوڕییە بەیاسایەک چارەسەر بکات یان وەزارەتی ڕۆشنبیری لە ڕێگای دەرکردنی ڕێنماییەوە ئەمە بکات.

٢٩٢- بڕوانە دەقی ماددەی (٤٧)ی یاسای ڕۆژنامەگەریی فەرەنسی کە ئەمەش دەقەکەیەتی:

Créé par Ordonnance 45-2090 13 Septembre 1945 JORF 14 septembre 1945.

La poursuite des délits et contraventions de police commis par la voie de la presse ou par tout autre moyen de publication aura lieu d'office et à la requête du ministère public sous les modifications ci-après.

واتە مولاحەقەکردنی ئەو جونحە و ئەوامانەی کە لە ڕێگای ڕۆژنامەگەری یان هەر ڕێگایەکی تری بڵاوکردنەوەوە ڕوو دەدەن، دەسەڵاتی نووسینگەیە و لەسەر داخوازیی داواکاری گشتی و بەپێی ئەم هەموارانەی خوارەوە دەبێت.

٢٩٣- بڕوانە دەقی ماددەی (١١)ی یاسای چاپەمەنیی هەرێمی کوردستان کە ئەمەش دەقەکەیەتی: «ئەو داوا گشتییانەی لە سەرپێچیکردنی حوکمەکانی ئەم یاسایە دەوەشێتەوە، لەلایەن داواکاری گشتی و بەپەسندکردن لەلایەن وەزیری دادەوە دەکرێن...».

٢٩٤- لەم بارەیەوە (ڕۆبەرت جنسن) کە پرۆفیسۆرە لە ڕۆژنامەگەریدا لە زانکۆی تەکساس، ئۆستن، لەم بارەیەوە دەڵێ: «نیشتمان پەروەریی یان هەستی نیشتمانی لە خراپترین حاڵەتدا وامان لێ دەکات کە پشتگیری چەند یاسایەکی خراپ و دڕندانە بکەین. بەڵام لە باشترین حاڵەتدا وامان لێ دەکات کە هەست بکەین هیچ گەلێک نموونەی سەرکەوتوویی گەلی ئێمە نییە، کەواتە لەسەر ڕۆژنامەنووس پێویستە لە هەموو کاتێکدا بنەما و بەها ڕەسەنەکانی ڕۆژنامەگەری بپارێزێت و گرنگ نییە لەکاتی کارەکەماندا ڕەخنە لە فلان ڕژێم یان فلان بەرپرس بگرین». ڕۆبەرت جنسن: ڕۆژنامەگەری لەنێوان کار و بەرپرسیاریەتی نیشتمانییدا، ڕۆژنامەی برایەتی ژمارە (٣٧٠٧) یەکشەممە ٢٠٠٢/٩/٢٦.

دوای ئەوەی باسی سانسۆری دواینە و خود سانسۆریمان کرد ئێستاش لە خوارەوە بەدرێژی باسی سانسۆری پێشینە دەکەین:

### ٣-٦-٢ سانسۆری پێشینە

سانسۆری پێشینە بریتییە لە پێداچوونەوە و پشکنینی بابەتەکانی رۆژنامەگەری بەر لە بلاوکردنەوەیان. هەندێ کەس بەم کارە هەڵدەستن کە ئیدارە بۆ ئەم مەبەستە دایان دەمەزرێنێ و پێیان دەگوترێ «چاودێر» و دەسەڵاتی رێگاگرتنیان لە بلاوکردنەوەی ئەو بابەتانەی کە دژی بەرژەوەندیی گشتینە هەیە.

ئەم سانسۆرەش گشت ژمارەکانی رۆژنامە و چاپکراوە دەورییەکان و گشت ئەو بابەتانە دەگرێتەوە کە تیایاندا بلاودەکرێتەوە، بۆیە سەرنووسەر بۆی نییە هیچ بابەتێک بەبێ رەزامەندیی چاودێر بلاوبکاتەوە. چاودێریش دەسەڵاتێکی خەملاندنی زۆر فراوانی بۆ بەخشینی ئەم رەزامەندییە یان رەت کردنەوەی هەیە[٢٩٥].

تۆماس تیمۆنس لەمبارەیەوە دەڵێ: «چاپەمەنییەکان لە زۆربەی وڵاتاندا لە لایەن دەزگا بەرپرسەکانەوە سانسۆری توندیان لەسەرە، کە ئەمە کارێک نییە تەنیا لە رابردوودا گیرۆدەی رۆژنامەنووسان بووبێتەوە، بەڵکوو تاکو ئێستا بەدەست پێکردنی سەدەی بیست و یەکەم هەروا ماوەتەوە»[٢٩٦].

جێی سەرنجە، سیستمی سانسۆر توانیویەتی بەوپەڕی توانایەوە، شانبەشانی شۆڕشی گەیاندن بڕوات و لەگەڵ سەرهەڵدانی شێوازەکانی نوێی گەیاندن وەکو ئینتەرنێت و سەتەلایت خۆی نوێ بکاتەوە و خۆی لەگەڵ ئەم داهێنانە نوێیانەدا رابهێنێت.

دوابەدوای سەرهەڵدانی رۆژنامەی ئیلکترۆنی ئۆن لاین «Online» لەسەر تۆری ئینتەرنێت، شێوازەکانی سانسۆریش گۆڕانیان بەسەردا هاتووە و لە رێگای پرۆگرامی تایبەتییەوە کە بۆ ئەم مەبەستە کۆمپانیاکانی کۆمپیوتەر ئامادەیان دەکەن چاودێری فایلەکانی تۆری ئینتەرنێت و پۆستی ئیلکترۆنی دەکرێت و لە رێگای فەرمانێکی تایبەتییەوە ئەو فایلانەی مەبەستن دەستنیشان دەکرێن و رێگایان پێنادرێ بنێردرێن یان بخوێندرێنەوە.

---

٢٩٥- د. عبدالله اسماعیل البستانی: حریة الصحافة، سەرچاوەی پێشوو ل١٢٢.

٢٩٦- تۆماس تیمۆنس: سەرکوت کردنی رۆژنامەنووسان لە جیهاندا، وەرگێڕانی لوقمان حەمەئەمین، رۆژنامەی برایەتی ژمارە (٣٥١٩) دووشەمە ٢٢/١٠/٢٠٠١ ل ٩.

کۆمپانیای (ماسیجیلایز) بەرنامەیەکی نوێی بۆ دۆزینەوەی وێنە ڕووتەکان بەر لە گەیشتنیان لە ڕێگای پۆستی ئیلیکترۆنییەوە ئامادە کردووە و بەمەش گشت ئەو نامە ئیلیکترۆنییانەی کە لە دەرەوە دەنێردرێن ویان لە ناوەوە ڕەوانەی دەرەوە دەکرێن بەو بەرنامەیەدا تێپەڕدەبن و ئەگەر وێنەی ڕووتیان تیابێ دەستگیر دەکرێن[٢٩٧].

بۆ ئەم مەبەستە مەملەکەتی عەرەبی سعودی بەرنامەیەکی بۆ ئەم مەبەستە لە کۆمپانیای مایکرۆسۆفت کڕیوە و چەندین شوێنی ئینتەرنێتی بەهۆیەوە داخستووەو ئەو فایلانەش دەستگیر دەکات کە وێنەی ڕووتیان تێدایە و لێ ناگەڕێ بکرێتەوە[٢٩٨].

حکوومەتی میسریش بەرنامەیەکی بۆ دەستگیرکردنی ئەو فایلانەی وێنەی ڕووتیان تیایە ئامادە کردووە و تاکو ئێستا هەندێ فایلی گرتووەو خاوەنەکانیشی دادگایی کردوون[٢٩٩].

حکوومەتی چینیش هەر لە ڕێگای ئەم بەرنامانەوە چەندین شوێنی هەواڵەکانی بیانی لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت داخستووە، لەوانە شوێنی (CNN)ی ئەمەریکی و شوێنی (BBC)ی بەریتانی و ئاژانسی ڕۆیتەر[٣٠٠].

هەروەها نووسینگەی دادگای فیدراڵی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بەرنامەیەکی کۆمپیوتەری بەناوی (D.C.S.%) بەکار دەهێنێ بۆ کاری سیخوڕی لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا[٣٠١] هەرچەندە دانانی سانسۆری پێشینە لەسەر ڕۆژنامە و چاپکراوی دەوریدا خۆی لە خۆیدا دژی ئازادیی ڕۆژنامەگەرییە، بەڵام سەرەڕای ئەمەش دانانی ئەم سانسۆرە لە بارودۆخە نائاساییەکاندا کارێکی پێویستە بۆ پاراستنی ئاسایشی وڵات.

شایەنی ئاماژەبۆکردنە، بەرپرسانی وەزارەتی بەرگریی ئەمریکی دوای ڕووداوەکانی یانزەی ئەیلوولی ساڵی ٢٠٠١ بۆ سەر سەنتەری بازرگانیی نێودەوڵەتی و پنتاگۆن، هانی دەزگا ڕەسمییەکانی ئەمریکای دا بۆ ڕاگرتنی هاوسەنگی لە نێوان مافی ڕۆژنامەنووس لە بەسەرکردنەوەی زانیاری و هەواڵەکان و شاردنەوەی نهێنییەکان، کاتێک کە دانووستاندن

---

٢٩٧- بڕوانە. http:www.almashrek.org17/11/2001.

298- http:www.almashrek.org.2001/12/2.

٢٩٩- بڕوانە «الحكم علي مهندس مصري بث صورا فاضحة لزوجته على الانترنت» ڕۆژنامەی «الاتحاد الاخرى» ژمارە ٦٨ یەکشەممە ٢٠٠٢/٦/٩ ل١١.

300- http:www.almashrek.org2/12/2001.بڕوانە

301- http:www.almashrek.org13/9/2001.بڕوانە

لەگەڵ کەناڵەکانی ڕاگەیاندن دەکەن سەبارەت بەئاشکراکردنی ئەو هەواڵانەی کە تایبەتن بەجموجۆڵی سەربازی و بەرەکانی جەنگەوە[٣٠٢]. بۆ تەئکیدکردنەوەی ئەمە، جۆرج دەبلیو بۆشی سەرۆکی ئەمریکی لە وتارێکیدا بەبۆنەی ئەو ڕووداوانە لە ١٣/٩/٢٠٠١دا گوتی: «ئەو کارمەندە حکومییانەی کە زانیارییە نهێنییەکان دەبەنە دەرەوە، ڕووبەڕووی سزا دەبنەوە. هەروەها ڕۆژنامەنووسانیش بۆیان نییە شوێن و جۆر و تەجهیزاتی هێزەکانی سەربازی ئاشکرا بکەن»[٣٠٣]. هەروەها دوناڵد رامسفیڵدی وەزیری بەرگریی ئەمریکیش ئاگاداری کارمەندانی حکومەتی کردەوە کە ڕووبەڕووی سزایەکی توند دەبنەوە ئەگەر بێت و ئەو زانیاریانە ئاشکرا بکەن کە گیانی هاووڵاتییان دەخەنە مەترسییەوە[٣٠٤].

شایەنی ئاماژەبۆکردنە، دوو هەفتە دوای ڕووداوەکانی یانزەی ئەیلوول، ئەفسەری پۆلیس و کارمەندانی ئاسایش لە شاری نیۆیۆرک و شاری بنسلفانیا هەندێک ڕۆژنامەنووسیان گرت و دەستیشیان گرت بەسەر کامێراکانیشیانەوە[٣٠٥]. هەروەها ڕاوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی (کوندۆ لیزارایس) ڕایگەیاند کە بڵاوکردنەوەی کاسێتەکانی بن لادن و یاوەرەکانی ئەمریکییەکان دەترسێنن و وورەی لایەنگرانی بن لادن بەرز دەکاتەوە و لەوانەشە بانگێشە بۆ ئەنجامدانی کاری تیرۆرستانە لە داهاتوودا بکات[٣٠٦].

لە ڕاستیدا، هەندێک لە کەناڵەکانی ڕاگەیاندن لەگەڵ ئەم بۆچوونانەی بۆش و پنتاگۆن و کۆشکی سپی بوون، بۆیە هەر لەخۆیانەوە و وەکو ئەرکێکی نیشتمانی و ئەخلاقی بڵاوکردنەوە و پەخشکردنی ئەو زانیاری و هەواڵانەیان قەدەغە کرد کە دەبنە مایەی زیان گەیاندن بەهاووڵاتییان یان کاری تیرۆرستان ئاسان دەکات[٣٠٧].

بەڕای ئێمە، هەرچەندە دانانی سانسۆری پێشینە لەسەر ڕۆژنامە و چاپکراوی دەوریدا خۆی لە خۆیدا دژی ئازادیی ڕۆژنامەگەرییە، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا دانانی ئەم سانسۆرە لە بارودۆخە نائاساییەکاندا لەوانەیە کارێکی پێویست بێ بۆ پاراستنی ئاسایشی وڵات.

---

302- http://www.RCTP.org/new13/10/2001.
303- http://www.RCTP.org/new14/10/2001.
304- http://www.RCTP.org/new15/10/2001.
305- http://www.RCTP.org/new20/10/2001
306- http://www.RCTP.org/new13/10/2001

٣٠٧- بۆ نموونە، بەرپرسانی (C.N.N) لە ڕاگەیاندنێکیاندا، ئاماژەیان بەوە کرد کە بەپێی سیاسەتی کەناڵەکەیان هیچ بابەتێک پەخش ناکرێت ئەگەر بێت و کاری تیرۆرستان ئاسان بکات. بڕوانە:
http://www.RCTP.org/new13/10/2001

سانسۆری پێشینەش ئەم دوو شێوەیەی خوارەوەی هەیە:

١- سانسۆری ڕاستەوخۆ

بەو حاڵەتە دەگوترێ سانسۆری ڕاستەوخۆ، کاتێک چاودێرێک یان زیاتر لە چاودێرێک لە دەزگا ڕۆژنامەوانییەکەدا کار بکات و یەکە یەکەی بابەتەکان بەر لە بڵاوبوونەوەیان بخوێنێتەوە و ڕای خۆی لەسەر بدات[٣٠٨].

٢- سانسۆری ناڕاستەوخۆ

بەوحاڵەتە دەگوترێ سانسۆری ناڕاستەوخۆ، کاتێک ڕێنمایی و ڕاسپاردە بۆ ڕۆژنامە یان چاپکراوە دەوریییەکە لەبارەی هەندێ لەو بابەتانەی کە نابێ بڵاو بکرێنەوە ڕادەگەیێندرێن[٣٠٩].

لە خوارەوە لە .تێج حاڵدا لە چوارچێوەی لێکۆڵینەوەیەکی بەراوردکاریدا باسی ئەم بابەتە دەکەین:

٣-٩-٢-١ سانسۆری پێشینە لە یاسای میسریدا

دەستووری میسری ساڵی ١٩٧١ زۆر بەڕاشکاوی لە ماددەی (٤٨)دا دانانی سانسۆری لەسەر ڕۆژنامە و چاپکراوی دەوریدا یاساغ کردووە مەگەر لە بارودۆخی نائاساییدا نەبێ بەمەرجێک لە هەندێ کاروباری دیاریکراوی تایبەت بەئاسایشی نەتەوەیی تێنەپەڕێ[٣١٠].

ئەمەو لە ئەنجامی ئەو ڕیفراندۆمەی کە لە ٢٢ی مایۆی ساڵی ١٩٨٠ بۆ هەموارکردنی دەستووری میسری کرا، .ەشێکی نوێ لەژێر ناونیشانی (حوکمە نوێیەکان) کە لە دوو فەسڵ پێک دێت، فەسڵی .یەکەم بەناونیشانی (ئەنجومەنی شورا) و فەسڵی دووەمیش

---

308- http://www.Ahram.org14/10/2001

309- http;www.Ahram.org14/10/2001

٣١٠- ئەمەش دەقەکەیەتی: «ئازادیی ڕۆژنامەگەری و چاپەمەنی و بڵاوکردنەوە و ئامرازەکانی ڕاگەیاندن کەفالەت کراوە و دانانی سانسۆریش لەسەر ڕۆژنامەدا یاساغ کراوە، هەروەها ئاگادارکردنەوە و ڕاگرتن و هەڵوەشاندنەوەی بەڕێگای ئیداری یاساغ کراوە و دەکرێ لە حاڵەتی ڕاگەیاندنی حاڵەتی نائاساییدا یان لە کاتی شەڕدا سانسۆرێکی دیاریکراو لەو کاروبارانەی کە پەیوەندییان بەسەلامەتیی گشتی یان ئاسایشی نەتەوەییەوە هەیە بەسەر ڕۆژنامە و چاپکراو و ئامرازەکانی ڕاگەیاندندا بەپێی یاسا بسەپێندرێت».

بەناوونیشانی (دەسەلاتی ڕۆژنامەگەری) خرایە سەر دەستوورەکە و جارێکی تر لە ماددەی ۲۰۸/ی ئەم فەسڵە نوێیەدا جەختی لەسەر یاساغکردنی دانانی سانسۆری پێشینە لەسەر ڕۆژنامە و چاپکراوی دەوریدا کردۆتەوە و تەنانەت ئەمجارەیان بەشێوەیەکی ڕەها یاساغی کردووە[٣١١].

بەم چەشنە هیچ سانسۆرێکی پێشینە لەسەر ڕۆژنامە و چاپکراوی دەوریدا نییە، مەگەر سانسۆری خودیی نەبێت کە سەرنووسەر یان بەرپرسی لاپەڕەکان یان ڕۆژنامەنووس یان نووسەری بابەتەکان پێی هەڵدەستن.

لە بەراوردکردنی دەقی هەردوو ماددەی (٤٨) و ماددەی (٢٠٨)ی دەستووری میسریدا بۆمان دەردەکەوێ کە ماددەی (٢٠٨) حوکمی ماددەی (٤٨)ی بەشێوەیەکی زمنی هەڵوەشاندۆتەوە، چونکە حوکمەکەی سەبارەت بەیاساغکردنی سانسۆر حوکمێکی ڕەهایە، لە کاتێکدا حوکمی ماددەی پێشوو حوکمێکی ناڕەهایە و حوکمی ڕەهاش بەڕەهایی کاری پێدەکرێ مەگەر بەدەقێکی یاسایی سنووردار کرابێت.

بۆیە لەڕووی دارشتنی هونەرییەوە باشتر وابوو دەقی ماددەی (٤٨) لابەردرێت، چونکە هیچ پاساوێک بۆ مانەوەی نییە.

٣-٦-٢-٢ سانسۆری پێشینە لە یاسای لوبنانیدا

دوابەدوای ڕووداوەکانی ساڵانی ١٩٧٥-١٩٧٦ یاسادانەری لوبنانی بەپێی مەرسومی یاسایی ژمارە (١)ی ١٩٧٧/١/١ گشت چاپکراوێکی خستە ژێر سانسۆری پێشینەی بەڕێوەبەرێتیی ئاسایشی گشتییەوە.

ئەم مەرسومە یاساییە بەپێی ماددەی (٣٨) تاکو ماددەی (٤٠) سیستمێکی تایبەتی بۆ سانسۆری پێشینە لەسەر چاپەمەنی و کەناڵەکانی تری ڕاگەیاندن دانا.

لە ماددەی (٣٨)دا بڕیاری دانانی سانسۆری پێشینەی لەسەر چاپەمەنی و کەناڵەکانی ڕاگەیاندن داناوە و دەقنووسی کردووە: «چاپەمەنی و کەناڵەکانی ڕاگەیاندن بەپێی ئەم حوکمانەی خوارەوە سانسۆریان دەخرێتە سەر».

---

٣١١- ئەممەش دەقەکەیەتی: «ئازادیی ڕۆژنامەگەری کەفالەت کراوە و دانانی سانسۆریش لەسەر ڕۆژنامە هەروەها ئاگادارکردنەوە و ڕاگرتن و هەڵوەشاندنەوەی بەرێگای ئیداری هەر هەمووی بەپێی دەستوور و یاسا یاساغ کراوە».

لە گەڕانەوەماندا بۆ دەقی ماددەی (٣٩) بۆمان دەردەکەوێ کە یاسادانەری لوبنانی بوونی هەندێک هەلومەرجی داناوە بۆ سەپاندنی سانسۆری پێشینە لەسەر چاپەمەنی و کەنالەکانی ڕاگەیاندندا. لەوانە بوونی حالەتی نائاسایی و کتوپڕی وەک ڕووبەڕوو بوونەوەی وڵات یان بەشێکی بۆ مەترسییەک لە ئەنجامی شەڕێکی دەرەکیدا یان شۆڕشی چەکداریدا یان ناسەقامگیریدا یان ئەو ڕوودۆخانەی کە هەمیشە کار لە نیزام و ئاسایشی گشتی دەکەن یان لە حالەتی ڕوودانی کارەساتی سروشتی.

لەم حالەتەشدا سەرۆکی حکومەت لەسەر داوای وەزیری ڕاگەیاندن بڕیاری سەپاندنی سانسۆر بەسەر گشت چاپەمەنی و کەنالەکانی ڕاگەیاندنی وڵات دەدات[٣١٢].

بەم شێوەیە ڕۆژنامەگەریی لوبنانی لەژێر سانسۆری پێشینەوە بوو تاوەکو بەیەکجارەکی بەپێی مەرسومی یاسایی ژمارە (١٤/٨٤)ی ١٩٨٦/٢/٢٥ هەلوەشایەوە[٣١٣].

بەڵام کەنالەکانی تری ڕاگەیاندن هەر لەژێر سانسۆر ماونەتەوە، چونکە یاسادانەری لوبنانی لەم مەرسومەیدا تەنها ئاماژەی بەهەلوەشانەوەی سانسۆری سەر چاپەمەنییەکان کردووە لەکاتێکدا لە ماددەی (٣٨)ی مەرسومی یاسایی ساڵی ١٩٧٧ دا ئاماژە بەهەردوو جۆریان کراوە[٣١٤].

### ٣-٦-٢-٣ سانسۆری پێشینە لە یاسای فەرەنسیدا

ڕۆژنامەگەریی فەرەنسی لە سەرەتای سەرهەڵدانییەوە لەژێر سانسۆرێکی پێشینەدا بووە، دواتر یاسادانەری فەرەنسی دوای شۆڕشی فەرەنسا جارێکی تر لە ڕێگای دەرکردنی

---

٣١٢- ئەمەش دەقەکەیەتی: «لە حالەتی نائاسایی وەکو ڕووبەڕووبوونەوەی وڵات یان بەشێکی بۆ مەترسییەک لە ناکامی شەڕێکی دەرەکی یان شۆڕشی چەکداری یان ناجێگیریی یان باروودۆخێک کە هەڕەشە لە نیزام یان ئاسایش یان سەلامەتیی گشتی بکات یان لەکاتی ڕوودانی ڕووداوێک کە سروشتێکی کارەساتیی هەبێت، حکوومەت بۆی هەیە بەمەرسومێک کە لەلایەن ئەنجومەنی وەزیرانەوە و لەسەر پێشنیاری وەزیری ڕاگەیاندن گشت چاپکراو و کەنالەکانی ڕاگەیاندن بخاتە ژێر سانسۆری پێشینەوە....».

٣١٣- ئەمەش دەقەکەیەتی: «مەرسومی یاسایی ژمارە (١)ی ١٩٧٧/١/١ کە تایبەتە بەسەپاندنی سانسۆر لەسەر چاپەمەنیدا هەلدەوەشێتەوە».

٣١٤- ئەمەش دەقەکەیەتی: «دانانی سانسۆر لەسەر چاپەمەنی و کەنالەکانی ڕاگەیاندن پابەندی ئەم حوکمانەی خوارەوەیە، بێ گومان دەستەواژەی «کەنالەکانی ڕاگەیاندن ڕادیۆ و تەلەفزیۆن و ئینتەرنێت دەگرێتەوە».

هەندێک یاسادا کاری پێکردەوە، تا بۆ دواجار بەیاسای ۱۸۲۸/۷/۱۸ هەڵوەشایەوە[۳۱۵].

یاسای ڕۆژنامەگەریی ۱۸۸۱/۷/۲۹ کە ئێستاکە لە فەرەنسادا کاری پێدەکرێت، دوو پرینسیپی سەرەکی لەخۆ گرتووە، یەکێکیان پرینسیپی (دەرکردنی ڕۆژنامە و چاپکراوی دەورییە بەبێ وەرگرتنی ڕەزامەندیی پێشینە)[۳۱۶] واتە ئەو هاوولاتییەی کە لێهاتوویی یاسایی و لێهاتوویی شارستانیی هەبێت و بەتاوانێکی ناپرووبەرانە (مخلة بالشرف) مەحکوم نەکرابێ بۆی هەیە بەبێ مۆڵەتی پێشینە ڕۆژنامە دەربکات. ئەوی تریشیان پرینسیپی (ئازادیی چاپخانە و کتێبخانە)[۳۱۷]یە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ ئەگەر بلاوکراوەیەک سەرپێچییەک بکات واتە شتێکی نایاسایی بلاوبکاتەوە، لێپرسینەوە لەگەڵ ئەو کەسە لەسەر ئەو بابەتەی کە بلاوی کردۆتەوە دەکرێت نەک دانانی سانسۆر لەسەر ئەو بابەتەی کە دەینووسێت.

بەلام دوای ڕوودانی جەنگی جیهانیی یەکەم، یاسادانەری فەرەنسی بەیاسای ۱۹۱٤/۸/۵ ئاشکراکردنی نهێنییەکانی کاروباری سەربازی و دبلۆماسی لەڕێگای ڕۆژنامەگەرییەوە یاساغ کرد و سزای توندیشی بەسەر سەرپێچیکەراندا سەپاند[۳۱۸].

هەروەها دوای ڕوودانی جەنگی جیهانیی دووەم ڕۆژنامەگەریی فەرەنسی جارێکیتر سیستمی سانسۆری بەخۆیەوە بینییەوە.

بەپێی مەرسومی یاسایی ۱۹۳۹/۷/۳۰ لیژنەیەکی ڕاگەیاندن دامەزرا و ئەرکی چاودێریکردنی چاپەمەنییەکانی پێ سپێردرا و دەسەلاتی گلدانەوەی ئەو چاپەمەنییانەی

---

۳۱۵- د. عبدالله اسماعیل البستاني: حریة الصحافة، سەرچاوەی پێشوو ل۱۳۲.

۳۱٦- ئەمەش دەقی ماددەی (۵)ی یاسای ڕۆژنامەگەریی فەرەنسییە کە ئەم پرینسیپەی لەخۆ گرتووە:

Tout journal ou écrit périodique peut être publié, sans autorisation préalable et sans dépôt de cautionnement, après la déclaration prescrite par l'article 7. ))

واتە، هەموو ڕۆژنامەیەک و بلاوکراوەیەکی دەوری دەتوانرێ بلاوبکرێتەوە، بێ ڕەزامەندیی پێشەکی و بێ دانانی بارمتەی دارایی، بەلام پاش ئاگاکارییەکی نووسراو بەپێی ماددە (۷).

۳۱۷- ئەمەش دەقی ماددەی (۱)ی یاسای ڕۆژنامەگەریی فەرەنسییە کە ئەم پرینسیپەی لەخۆ گرتووە:

«L'imprimerie et la librairie sont libres»

318- Claude .Albert COLLIARD. libertes publiques. cinqeieme edition paris; Dloz,1974 pp 470-471

پێدرا کە سەرپێچیی سیستمی چاودێرییان دەکرد بەبێ گەڕانەوە بۆ دادگا. ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە حکومەت ڕۆژنامەگەری بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە و ئازادیی ڕۆژنامەگەری نەمێنێ. ئەم مەرسومە یاساییە کاری پێکرا تاکو بەیەکجاری بەپێی مەرسومی یاسایی ٦/٥/١٩٤٤ هەڵوەشایەوە[٣١٩].

٣-٦-٢-٤ سانسۆری پێشینە لە یاسای عێراقیدا

یاسای چاپەمەنیی عێراقی ژمارە ٢٠٦ی ساڵی ١٩٦٨ی هەمواركراو هیچ ئاماژەیەکی بەبوونی سانسۆری پێشینە لەسەر ڕۆژنامە و چاپکراوی دەوریدا نەکردووە، بەڵام سەرەڕای ئەمەش ڕۆژنامەگەری لە عێراقدا بەپێی ماددەی (٥)ی یاسای (السلامة الوطنية)ی ژمارە (٤)ی ساڵی ١٩٦٥ ملکەچی ئەم سانسۆرەیە.

بەپێی ماددەی (٥)ی یاسای سەلامەتیی نیشتمانیی ناوبراو سەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیران دوای وەرگرتنی ڕەزامەندی ئەنجوومەنی وەزیران بۆی هەیە دەسەڵات بداتە غەیری خۆی کە لەجیاتی ئەو هەموو یان هەندێک لەو دەسەڵاتانەی کە لە ماددەی (٤)دا هاتووە لە سەرتاپای عێراقدا یان لە ناوچەیەک یان چەند ناوچەیەکی دیاریکراوی عێراقدا لە ڕۆژی بڵاوبوونەوەی بڕیاری ئەنجوومەنی وەزیران لە ڕۆژنامەی ڕەسمیدا بەکاری بهێنێ[٣٢٠].

ئەو دەسەڵاتانەی کە بەپێی حوکمی ئەم ماددەیە دراوە بەسەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیران زۆر فراوانە، بەڵام ئەوەی پەیوەندی بەئێمەوە هەیە تەنها ئەو دەسەڵاتەیە کە بەپێی برگەی (ی) پێی دراوە کە تایبەتە بەسەپاندنی سانسۆری پێشینە لەسەر ڕۆژنامە و چاپکراوی دەوریدا کە ئەمەش دەقەکەیەتی: «ڕۆژنامە و گۆڤار و کتێب و بڵاوکراوە و گشت نووسراوێک و ڕەسم و کاسێت پێش بڵاوبوونەوەی یان پەخشکردنی سانسۆری لەسەر دەسەپێ...».

بەم شێوەیە لە عێراقدا پەیڕەوی سیستمی سانسۆری پێشینە دەکرێت و بۆ ئەم مەبەستە لە دەزگا ڕۆژنامەوانیەکاندا پشت بەهەندێ چاودێر دەبەستن کە چاوساغی حکوومەتن و

---

319- Clauden Albert COLLIARD, op. cit. p471

٣٢٠- ئەمەش دەقی ماددەی (٤)ی یاسای ناوبراوە: «سەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیران لەو ناوچەیە یان لەو ناوچانەی کە حاڵەتی نائاسایی دەیگرێتەوە بۆی هەیە بێ خۆبەستنەوە بەحوکمەکانی یاسای دادبینی سزایی ئەم دەسەڵاتانەی خوارەوە بەکار بهێنێ»

بابەتەکانی ڕۆژنامە بەر لە بڵاوکردنەوەیان بەوردی دەخوێننەوەو ڕای خۆیانی لەبارەوە دەدەن.

شایەنی ئاماژەبۆکردنە، د. ئیبراهیم الداقوقي سەبارەت بەسانسۆری پێشینە لە عێراقدا دەڵێ: «تا کۆتاییەکانی ساڵی ١٩٧٤ لە عێراقدا پەیڕەوی سیستمی سانسۆری پێشینە بۆ سنووردارکردنی ئازادیی ڕۆژنامەگەریی کراوە، بەڵام لەوە بەدواوە سانسۆری پێشینە لەسەر چاپکراوی دەورییدا هەڵگیراوە و سانسۆری خودی جێگای گرتۆتەوە»[٣٢١].

بەڵام داقوقي هیچ بەڵگەیەکی بۆ قسەکەی نەهێناوەتەوە. لەکاتێکدا یاسای سەلامەتیی نیشتمانیی ناوبراو تاکو ئێستاش لە عێراقدا هەر بەرکارە، بۆیە ئێمە پێمان وایە یاسادانەری عێراقی خۆی نەیویستووە سانسۆری پێشینە لەسەر چاپکراوی دەوری هەڵگرێت، ئەگینا لە دەستووردا یان لە یاسای چاپەمەنیدا سانسۆری یاساغ دەکرد.

شایەنی ئاماژەبۆکردنە، دەستووری عێراقی ساڵی ١٩٧٠ بەپێچەوانەی دەستووری میسری نە لە دوور و نە لە نزیکەوە باسی سانسۆری نەکردووە، بەڵام پرۆژەی دەستووری عێراقیی ساڵی ١٩٩٠[٣٢٢] لە ماددەی (٥٤)دا دانانی سانسۆری لەسەر ڕۆژنامە و بەرهەمە حزبییەکان (المصنفات) یاساغ کردووە مەگەر بەپێی یاسا نەبێت[٣٢٣].

هەڵبەتە لە عێراقدا کار بەیاسای (الرقابة علی المصنفات والافلام السینمائیة)ی ژمارە(٦٤)ی ساڵی١٩٧٣[٣٢٤] دەکرێت. بۆیە ئەم پرۆژەیەش هیچ جیاوازییەکی بنەڕەتیی لەگەڵ دەستووری عێراقیدا نییە مادام دانانی سانسۆری بەیەکجاری یاساغ نەکردووە. چونکە دەستەواژەی (مەگەر بەپێی یاسا نەبێت) دەستەواژەیەکی چەواشەکارە و دەرگای بۆ بوونی سانسۆر خستۆتە سەرپشت، تەنها ئەوەیە سانسۆر دەبێ بەپێی یاسا

---

٣٢١- د. ابراهيم الداقوقي: قانون الاعلام، سەرچاوەی پێشوو ل١٢٠.

٣٢٢- ئەم پرۆژەیە لە ساڵی ١٩٩٠ داندرا و تاکو ئێستاکە نەبۆتە دەستوور، واش پێدەچێت وازیان لێ هێنابێت، چونکە لەم ڕۆژانە، جێگری سەرۆکی ئەنجوومەنی سەرکردایەتیی شۆڕش لەگەڵ شاندێکی ئۆپۆزسیۆنی عێراقی (التحالف الوطني) لە بەغدا کۆبۆوە و ڕایگەیاند کە لەلایەن سەرۆکی عێراقییەوە ئەرکی دانانی پرۆژەی دەستوورێکی نوێی بۆ عێراق پێ سپێردراوە.

٣٢٣- ئەمەش دەقەکەیەتی: «ئازادیی ڕۆژنامەگەری و چاپەمەنی و بڵاوکردنەوە زامنە و یاسا چۆنێتیی بەکارهێنانی ئەم مافە ڕێکدەخات و سانسۆر لەسەر ڕۆژنامە و بەرهەمەکان دانانرێ مەگەر بەپێی حوکمەکانی یاسا نەبێت».

٣٢٤- موسوعة القوانين العراقية، المجلد ٩، ل٦١٥٣.

بێت، یاساکەیش لەکۆنەوە هەیە و بەرکارە و هەمیشە ڕژێمە سەرکوتکارەکان بۆ پێشێلکردنی مافە دەستورییەکان بەکاریان هێناوە. ئێستاکە چۆن لە عێراقدا ئەنجومەنی سەرکردایەتیی شۆڕش هەیە کە سەرۆکی عێراقی سەرۆکایەتی دەکات و بەپێی بڕگەی (۱) ماددەی (٤٢)ی دەستوور دەسەڵاتی دەرکردنی یاسا و ئەو بڕیارانەی هەیە کە هێزی یاساییان هەیە[٣٢٥] و دەتوانن هەموو کاتێک ئازادیی ڕۆژنامەگەری سنووردار بکات و سانسۆری لەسەر دابنێت. ئەوەهاش بەپێی ماددەی (٦٩)ی پڕۆژەی دەستووری ساڵی ١٩٩٠ ئەو فەرمان و بڕیارانە دەربکات کە هێزی یاساییان هەیە. بۆیە هیچ لە مەسەلەکە نەگۆڕاوە، بەڵکوو خراپ تریش بووە، چونکە بەپێی دەستووری ساڵی ١٩٧٠ سەرۆک کۆمار ئەم دەسەڵاتەی نەبوو کەچی بەپێی ئەم پڕۆژەیە ئەم دەسەڵاتەی هەیە[٣٢٦].

٣-٦-٢-٥ سانسۆری پێشینە لە یاسای چاپەمەنیی هەرێمی کوردستاندا

یاسای چاپەمەنیی هەرێمی کوردستانی عێراق ژمارە (١٠)ی ساڵی ١٩٩٣ی هەمووارکراو پرەنسیپێکی گرنگ و بنەڕەتیی لە ئامێز گرتووە ئەویش پرەنسیپی «لە هەرێمدا سانسۆر ناخرێتە سەر چاپەمەنی»[٣٢٧].

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە لە هەرێمی کوردستاندا هیچ سانسۆرێک لەبەردەم کاری ڕۆژنامەگەریدا نییە، بەڵکوو تەنیا بەلێپێچانەوەی ئەو کەسە لەسەر ئەو بابەتەی کە بڵاوی دەکاتەوە نەک چاودێریکردنی ئەو بابەتەی کە دەینووسێت.

بێ گومان جیاوازییەکی زۆریش هەیە لە نێوان لێپێچانەوەی دواینە و سانسۆری پێشینەدا. لە حاڵەتی یەکەمدا ڕۆژنامەنووس ئازادە لە ڕادەربڕیندا و بەرپرسیتییەکەشی

---

٣٢٥- ئەمەش دەقەکەیەتی: «ئەنجومەنی سەرکردایەتیی شۆڕش ئەم دەسەڵاتانەی خوارەوەی هەیە:
أ - دەرکردنی یاسا و ئەو بڕیارانەی کە هێزی یاساییان هەیە...».

٣٢٦- ئەمەش دەقەکەیەتی: «یەکەم: ئەگەر مەترسییەک هەڕەشە لە ئاسایشی وڵات بکات، یان هەڕەشە لە سەروەرییەکەی بکات یان هەڕەشە لە سەلامەتییەکەی بکات یان هەڕەشە لە یەکێتیی ڕیزەکانی بکات، سەرۆک کۆمار بۆی هەیە، لە ماوەیەک کە شەش مانگ ڕەت نەکات ■ ڕازی سەرهەڵدانی مەترسییەکە، هەندێک فەرمان یان بڕیار دەربکات کە هێزی یاساییان هەیە بۆ دوورخستنەوەی ئەو مەترسییە...».

٣٢٧- بڕوانە دەقی ماددەی (٢) کە ئەمەش دەقەکەیەتی: «سانسۆر لە هەرێمدا ناخرێتە سەر چاپەمەنی و هەر هاووڵاتییەک سەربەستە لە دەرکردنی هەر چاپەمەنییەکدا بەپێی حوکمەکانی ئەم یاسایە».

دەگرێتە ئەستۆ. بۆیە تەنها لەسەر سەرپێچییە یاساییەکانیدا لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکرێ و ئیدارە بۆی نییە ڕێگای ڕادەربڕینی لێ بگرێت. ئەگەر هاتوو لە پرۆسەکردنی کارە ڕۆژنامەوانییەکەیدا سەرپێچی یاسای کرد، لەو حاڵەتەدا ئیدارەش بۆی هەیە وەکو هەر کەسێکی ئاسایی ڕوو بکاتە دادگا و داوای لە دژ بەرز بکاتەوە و بڕیاری دادگاش یەکلاکەرەوە دەبێ.

لەم حاڵەتەشدا، ئیدارە هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ کەسی ئاسایی نابێت و ناتوانێ دەستدرێژی بکاتە سەر ئازادیی ڕۆژنامەگەری و ڕای گشتیش چەواشە بکات و بانگەوازی ئەوە بکات کە ئەو بابەتەی لە ڕۆژنامەدا بڵاوبۆتەوە دژی بەرژەوەندیی گشتی و ئاسایشی نەتەوەییە یان بوختان پێکردن و ئاوزڕاندنی لێپرسراوانی تیایە. چونکە دوای بڵاوبوونەوەی بابەتەکان گەل سەرپشک دەبێت و چەواشەکردنیشی ئاسان نابێت.

لە هەمان کاتیشدا، دەسەڵاتی دادوەریش بۆ پاراستنی ناوی خۆی ناچاردەبێت بڕیارێکی شیاو دەربکات.

بەڵام لە حاڵەتی دووەمدا، ئیدارە هەر لە بنەڕەتدا لێناگەڕێ ئەو بابەتانەی کە دژی بەرژەوەندیی ئەون یان لەگەڵ ڕاوبۆچوونی ئەو ناگونجێن بڵاوبکرێنەوە. لەم حاڵەتەشدا ئیدارە پەنا دەباتە بەر چەمکەکانی «ئاسایشی گشتی» و «بەرژەوەندیی گشتی» بۆ چەواشەکردنی ڕای گشتی و گرنگترین زامنیش کە «زامنیتیی دادگەری»یە بۆ پاراستن و داکۆکیکردن لە مافی ئازادیی ڕۆژنامەگەری لەدەست دەچێت و دادگا ناتوانێ ڕۆڵی خۆی وەکو پێویست ببینێ.

بۆیە ڕەوتی یاسادانەری کوردستان لەم ڕووەوە ڕەوتێکی زۆر سەرکەوتووە و بەڕەوتی یاسادانەری میسری دەچێت و پێچەوانەی ڕەوتی یاسادانەری عێراقی و لوبنانییە.

بەڕای ئێمە، ئەم حوکمەی یاسادانەری کوردستانی هەندێک کەموکوڕی تێدایە، چونکە لە حاڵەتی جەنگ و تەنگژەکاندا بوونی سانسۆر خۆی دەسەپێنێت و ناکرێ دەستبەرداری بێ، هەروەکو چۆن وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە دوای ڕووداوەکانی ئەیلوولی ساڵی ٢٠٠١ ئەمەی گرتەبەر و بڵاوکردنەوەی هەندێ زانیاریی ستراتیژی یاساغ کرد[٣٢٨].

بۆیە پێشنیارەکەم، یاسادانەری کوردستان جارێکی تر چاو بەم حوکمەدا بخشێنێتەوە و بەم شێوەیەی خوارەوە دایبڕێژێتەوە: « لە هەرێمدا سانسۆر ناخرێتە سەر چاپەمەنی تەنها لە

---

٣٢٨- بڕوانە بڕگەی (٣-٦- ٣) لەم تێزەدا.

حاڵەتی نائاسایی و کاتی شەڕ و تەنگژەدا نەبێ کە پەرلەمانی کوردستان بەیاسایەک دیاری دەکات. دەکرێ سانسۆرێکی دیاریکراو بەیاسایەکی تایبەت، بۆ بەرژەوەندیی گشتی بخرێتە سەر چاپەمەنی و ئامرازەکانی تری ڕاگەیاندن».

دوای لێکۆڵینەوە لە سیستمی سانسۆر لە یاسای میسری و لوبنانی و فەرەنسی و عێراقی و یاسای چاپەمەنیی هەرێمی کوردستاندا، بۆمان دەرکەوت کە یاسادانەری کوردستان[٣٢٩] و یاسادانەری میسری[٣٣٠] بەشێوەیەکی ڕەها دانانی سانسۆریان لەسەر ڕۆژنامەگەریدا یاساغ کردووە و ڕۆژنامەنووس لە کارەکەیدا ملکەچی سانسۆرێکی خودییە کە خۆی لە چوارچێوەی ئەخلاقی پیشەدا دەیخاتە سەرخۆی تاکو ئەو هێڵە گشتییانەی بۆی دانراون نەیان بەزێنێ.

بەڵام یاسادانەری لوبنانی و فەرەنسی دانانی سانسۆریان لە حاڵەتی ئاساییدا یاساغ کردووە و لە حاڵەتی نائاساییشدا لە سنوورێکی دیاریکراو لە چوارچێوەی یاسادا ڕێگایان پێداوە.

بەڵام یاسادانەری عێراقی جیاواز لە هەموویان هەرچەندە لە یاسای چاپەمەنی ژمارە ٢٠٦ی ساڵی ١٩٦٨ی هەموارکراویدا ئاماژەی بەدانانی سانسۆر نەکردووە، بەڵام بەپێی بڕگە (ی)ی ماددەی (٤)ی یاسای (السلامة الوطنية) ژمارە (٤)ی ساڵی ١٩٦٥ کە پێشتر ئاماژەمان پێی کردووە کار بەسیستمی سانسۆری پێشینە دەکات و بۆ ئەم مەبەستە پشت بەو چاودێرانە دەبەستێ کە لە دامەزگا ڕۆژنامەوانییەکانیدا دایمەزراندوون و چاوساغی ئەون.

---

٣٢٩- بڕوانە دەقی ماددەی دووەمی یاسای چاپەمەنیی هەرێمی کوردستان لە پەراوێزی (٣٢٧) ئەم تێزەدا.

٣٣٠- بڕوانە دەقی ماددەی (٢٠٨)ی دەستووری میسری ساڵی ١٩٧١ لە پەراوێزی (٣١١) ئەم تێزەدا.

## ٣-٧ بوخته

له لێکۆڵینەوەی بابەتەکانی ئەم بەشەدا بۆمان دەردەکەوێ کە سیستمی سڵپێکەر (النظام الردعي) لە سیستمەکانی تری رۆژنامەگەری بۆ هەرێمی کوردستان گونجاوترە لەبەر ئەوەی لەگەڵ ئازادیی رۆژنامەگەری و دیموکراسییەتدا دەگونجێ و ئەوپەڕی ئازادی بۆ کاری رۆژنامەگەری دەستەبەر دەکات.

هەروەها بۆمان دەردەکەوێ کە یاسا و رێساکانی چاپەمەنی و رۆژنامەگەری لە میسر و لوبنان بەگشتی و عێراق بەتایبەتی، بەپێچەوانەی هەرێمی کوردستان، کۆک نین لەگەڵ جاڕی گەردوونیی مافی مرۆڤ و بەڵگەنامە نێودەوڵەتییەکانی تردا، هەروەها جیاوازییەکی زۆر هەیە لە نێوان لایەنی تیۆری و پراکتیکیی ئازادیی رۆژنامەگەری لەو شوێنانەدا.

هەروەها بۆمان دەردەکەوێ، لە ئاکامی زۆری و پەرتی ئەو یاسایانەی کە کاری رۆژنامەگەری لە هەندێ وڵاتدا رێک دەخەن، گرفتێکی گەورە رووبەرووی رۆژنامەنووس و ئەو کەسانە دەبێتەوە کە کاری رۆژنامەنووسی دەکەن و وادەکا کە ئاگاداری سنووری ئازادیی بیروڕادەربڕینەکەیان نەبن و نەزانن هەتا کوێیە[٣٣١].

هەروەها لە لێکۆڵینەوەی یاسای چاپەمەنیی هەرێمی کوردستاندا بۆمان دەردەکەوێ کە ئەم یاسایە چارەسەری پەخشی تەلەفزیۆنی و ئێستگەیی و ئینتەرنێتی نەکردووە کە ئەمانیش سێ جۆرن لە جۆرەکانی رۆژنامەگەری و ئەمڕۆکە لە هەرێمی کوردستاندا حزبە کوردستانییەکان خاوەنی کەناڵی تەلەفزیۆنی ناوخۆیی و ئێستگەیین و هەندێکیشیان

---

٣٣١- لەوانە یاسای چاپەمەنیی هەرێمی کوردستان ژمارە (١٠)ی ساڵی ١٩٩٣ و یاسای هەمووارکردنی یاسای چاپەمەنیی ژمارە (٨)ی ساڵی ٢٠٠٢ و یاسای سەندیکای رۆژنامەنووسانی کوردستان ژمارە (٤)ی ساڵی ١٩٩٨ و یاسای حزبەکانی کوردستان ژمارە (١٧)ی ساڵی ١٩٩٣ و یاسای هەمووارکردنی یاسای حزبەکانی کوردستان ژمارە (٧)ی ساڵی ٢٠٠٢ و یاسای چاپەمەنی عێراقی ژمارە (٢٠٦) ساڵی ١٩٦٨ و یاسای پاراستنی مافی دانەر ژمارە (٣)ی ساڵی ١٩٧١ و یاسای سزاکان ژمارە (١١١)ی ساڵی ١٩٦٨ و یاسای دادبینی سزایی (قانون اصول المحاكمات الجزائية)ی ژمارە (٢٣)ی ساڵی ١٩٧١ و یاسای شارستانیی عێراقی ژمارە (٤٠)ی ساڵی ١٩٥١ و یاسای چاپخانەکان ژمارە (١٨٩)ی ساڵی ١٩٦٨ و یاسای (السلامة الوطنية)ی ژمارە (٤)ی ساڵی ١٩٦٥ و چەندین یاسا و بەڵگەنامەی نێودەوڵەتیی تر.

سەتەلایت و سایتی ئینتەرنێتیشیان هەیە وێڕای (مراکز الاتصالات الاهلیة) و قاوەخانەکانی کۆمپیوتەر کە ئەمانیش بەشدارن لە تۆڕەکانی ئینتەرنێت و سایتی تایبەتیشیان هەیە، ئەمانە لە عێراقدا بەپێی یاسای عێراقی لە لایەن حکومەتەوە مۆنۆپۆل کراون و لە کوردستانیشدا سەرەڕای ئەوەی حزب و کەرتی تایبەتی بەکاریان دێنن کەچی تاکو ئێستا بەیاسا ڕێک نەخراون[332] لە کاتێکدا ئەمە زۆر پێویستە بۆ ئەوەی شەپۆلەکان دژی یەک نەبن و کار لە پەخشی یەکتری نەکەن[333].

لەبەر ڕۆشنایی ئەم ئەنجامانەدا، ئەم ڕاسپاردانەی خوارەوە دەخەینە بەرچاوی یاسادانەری کوردستان و هیوادارم سوودیان هەبێت:

١- لەم دیراسەیە بۆمان دەردەکەوێ کە یاسای چاپەمەنیی هەرێمی کوردستان تا ڕادەیەکی زۆر گونجاو و گونجاوە لەگەڵ پرانسیپەکانی مافی مرۆڤ و ئازادیی ڕۆژنامەگەری و پرنسیپەکانی دیموکراسییەت، تەنها ئەوە نەبێ کە باشتر وابوو لەبری سیستمی مۆڵەتی پێشەکی بەسیستمی ئاگاکاری کاری بکردایە، بۆیە پێم باشترە ئەم گۆڕانەی تێدا بکرێت تا بەتەواوەتی لەگەڵ ئەو پرنسیپانەدا گونجاو بێت.

٢- هەروەها بۆمان دەردەکەوێ کە ئەو ئازادییەی کە لە بواری پەخشی ئێستگەیی و تەلەفزیۆنی و ئینتەرنێت لە هەرێمی کوردستاندا هەیە لە هیچ وڵاتێکدا بەم جۆرە بەدی

---

٣٣٢- شایەنی ئاماژەبۆکردنە لەسەر بڕیاری وەزارەتی ڕۆشنبیری حکومەتی هەرێمی کوردستان، بەپێی فەرمانی ژمارە (٦٣/٧/١)ی ساڵی ٢٠٠٠ لیژنەیەک کە ئێمەش تیایدا ئەندام بووین بۆ دانانی پرۆژەی یاسای (ڕادیۆ و تەلەفزیۆنی لە هەرێمی کوردستان) پێکهات. دوای ئەوەی لیژنەی ناوبراو پرۆژەی یاساکەی گەڵاڵە کرد، لەلایەن وەزارەتەوە بۆ بەڕێوەبەرێتی دارشتنی یاسایی لە وەزارەتی داد بەرز کرایەوە، لە وێشەوە بۆ ئەنجومەنی وەزیران، بەڵام تاکو ئێستا هیچ دەنگی نییە.

٣٣٣- لە وڵاتەیەکگرتووەکانی ئەمەریکا کەناڵەکانی ڕاگەیاندنی چاپکراوو بیستراو بینراو وەکو یەک سوود لەو ئازادییە ڕۆژنامەگەرییە وەردەگرن کە دەستووری ئەمەریکی لە یەکەمین هەمواریدا مسۆگەری کردووە، بەڵام سەرەڕای ئەمەش ئەرکەسەی بیەوێ بەرنامەکانی لە ڕێگای ئێستگە و تەلەفزیۆنەوە پەخش بکات دەبێ مۆڵەتی یاسای (بەخشینکردنی لاسلکی)ی ساڵی ١٩٢٧ بێت بۆئەوەی شەپۆلەکانیان بەگژ یەکدیدا نەچن. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە نیکۆلاس جۆنسۆن: دەستنیشانکردنی سنووری دەسەڵاتی جوارە، گۆڤاری ئەلیکترۆنی وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکا، ٢٥/ ٢٠٠١/٥ لەم سایتەی خوارەوە وەرگیراوە:

http:usinfo.state.gov.journals itgic./401 /ijga/ijga0401.htm2001/10/1

ناکریت، تەنانەت لەولاتێکی وەکو ئەمریکا کە لە رووی بەخشینی ئازادیی رۆژنامەگەریدا لە هەموو ولاتێکی تر پێشکەوتووترە بەوەی کە لە دەستوورەکەیاندا رێگای لە کۆنگریس گرتووە بۆ دەرکردنی هەر یاسایەک کە ببێتە مایەی کۆتوبەندکردنی ئەم ئازادییە. کەچی دەبینی، سەرەرای ئەمە، یاسایەکی تایبەتی بۆ پەخشەکانی ئێستگەیی و تەلەفزیۆنی داناوە بەمەبەستی رێکخستنی شەپۆلەکان. بۆیە پێم باشە پەرلەمانی کوردستانیش یاسایەک بۆ رێکخستنی پەخشی ئێستگەیی و تەلەفزیۆنی لە هەرێمی کوردستان دەربکات[٣٣٤].

٣- ناچارکردنی خاوەنی چاپخانە بەهەناردنی چەند دانەیەک لەو رۆژنامە و چاپکراوە دەورییانەی کە چاپی دەکات بۆ داواکاری گشتی و وەزارەتی رۆشنبیری و وەزارەتی ناوخۆ و سەندیکای رۆژنامەنووسان و کتێبخانەی نیشتمانی بۆ هەلگرتن و بەدوواداچوونیان.

٤- دامەزراندنی ئەنجوومەنێکی بالای رۆژنامەگەریی سەربەخۆ و ئازاد بۆ سەرپەرشتیکردنی رۆژنامە و رۆژنامەنووسان دوور لە دەسەلات و چاودێریی حکوومەت تاکو رۆژنامەگەری وەک دەسەلاتێکی چوارەم رۆلی خۆی لەنێو کۆمەلدا ببینێ و ئەم رووداوەش لە یاسای چاپەمەنیدا ئاماژەی پێ بکرێت.

٥- هەروەها پێشنیارەکەم کە بەرێوەبەرێتی گشتیی راگەیاندن لە وەزارەتی رۆشنبیری هەلبوەشێتەوە و تەنها بەکاروباری رۆشنبیرییەوە خەریک بێت و چیتر رۆژنامەی هەوال دەرنەکات و گەنالی پەخشی تەلەفزیۆنی و ئێستگەییش بۆ کەرتی تایبەت دەست لێهەلبگرێت.

---

٣٣٤- شایەنی ئاماژەبۆکردنە، بەپێی نووسراوی وەزارەتی رۆشنبیریی هەرێمی کوردستان ژمارە (١١/٧/٦٣)ی ٢٠٠٠/١/٢٠ لیژنەیەک پەنەندامێتی ئێمە و ئەم بەرێزانە (محمد ولی، شاکر محمدامین، مسعود مصطفى، فکرت عزت) بۆ دانانی پرۆژەی یاسای (رادیۆ و تەلەفزیۆنی) پێکهات. لیژنەی ناوبراو پرۆژەکەی دانا و بەنووسراوێک بۆ بەرێوەبەرایەتیی دارشتنی یاسایی لە وەزارەتی داد بەرز کردەوە، بەلام تاکو ئێستا ■ لایەن پەرلەمانەوە دەرنەچووە.

## ٤- سیستم و بردنسیپەکانی رۆژنامەگەری و زامنکردنەکانی ئازادیی رۆژنامەگەری

### ٤- ١ سیستەمەکانی رۆژنامەگەری

ئەو سیستەمە یاساییانەی کە رۆژنامەگەری لە جیهاندا پابەندیان دەبێت، چوار سیستمی یاسایی سەرەکین، لە خوارەوە لە چوار خاڵدا ئاماژەیان پێدەکەین و تیشکیان دەخەینە سەر:

**یەکەم:** سیستمی دانانی رۆژنامەگەری بەدەزگایەکی گشتیpublic - presse service

بەپێی ئەم سیستمە دەوڵەت خۆی خاوەنی دەزگاکانی رۆژنامەگەری دەبێت لە وڵاتدا و رۆژنامەگەریش وەک دەزگایەکی گشتی لە خزمەتی سیاسەتی دەوڵەت دەبێت و پابەندی مۆڵەت وەرگرتن و چاودێری و ڕاگرتن و هەڵوەشانەوەی کارگێری دەبێت[٣٣٥].

شایەنی ئاماژەپێکردنە، ئەمڕۆ، بەشێوەیەکی گشتی لە دنیادا، ئەم سیستمە باوی نەماوە مەگەر لە بواری رۆژنامەگەریی بیستراو و بینراودا نەبێت، کە لە هەندێ وڵاتاندا حکومەت ئەم کەناڵە رۆژنامەگەرییانە دەخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە. بەتایبەتی لە وڵاتە عەرەبییەکان، کە تاکو ئەمڕۆ بەشێکی زۆریان ئەم سیاسەتە پەیڕەو دەکەن[٣٣٦]. بەپێچەوانەی ئەم دەوڵەتانەش، لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، حکومەت رۆژنامەگەریی بیستراو و بینراوی نەخستۆتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە و نەیکردوونەتە دەزگایەکی گشتی، بەڵکو ڕێگای داوە بەکەرتی تایبەت ئەم دەزگایانە دابمەزرێنێت، بەڵام دوای وەرگرتنی مۆڵەت لە لایەنی پەیوەندیدار. ئەمەش تەنها بەمەبەستی ڕێکخستنی شەپۆلەکانی پەخشکردنە نەک ڕێگاگرتن لە ئازادیی رۆژنامەگەری[٣٣٧].

---

٣٣٥- د. عبدالله اسماعيل البستاني: حرية الصحافة، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٧.

٣٣٦- الصحافة في الجزائر الحرية مقابل الموت: ڕاپۆرتێکە لەلایەن ڕێکخراوی «الفيدرالية الدولية للصحفيين» بنکەی جەزائیر ئامادەکراوە. لە تۆڕی ئینتەرنێت لەم شوێنەی خوارەوە وەرگیراوە: http://www.arabia.com.2001/11/11

٣٣٧- نیکولاس جۆنسون: تحديد نطاق السلطة الرابعة، گۆڤاری (وسائل الاعلام والاخلاق)ی ئیلیکترۆنێکە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا دەریدەکات لە تۆڕی ئینتەرنێت، لەم شوێنەی خوارەوە وەرگیراوە: http://www.usinfo.state.gov/journals/itgic/401/ijga/htm.2001/10/1

**دووەم:** سیستەمی خۆپارێزیی (النظام الوقائي) le regime preventif

بەپێی ئەم سیستەمە ئەو کەسانەی ئازادیی ڕۆژنامەگەری پیادە دەکەن دەبێ بەر لە مومارەسەکردن و بڵاوکردنەوەی، هەندێک کاری پێویست ئەنجام بدەن هەروەهاش ڕەچاوی ئەو مەرجانە بکەن کە حکومەت بۆ پیادەکردنی ئازادیی ڕۆژنامەگەری داینلوە بەمەبەستی نەهێشتنی یا سوککردنی ئەو زەرەر و زیانانەی کە لە پیادەکردنی ئەم مافە یان لە خراپ بەکارهێنانیدا پێشبینی دەکرێ[338].

ڕادەی تەنگ پێهەڵچنینی ئەم سیستەمە بەئازادیی ڕۆژنامەگەرییەوە بەپێی سروشت و بڕی ئەو کارە خۆپارێزانە (الاجراءات الوقائية) دەگۆڕێ کە لەخۆی گرتوونە[339]. ئەم کارە خۆپاراستنانەش دوو جۆرن، جۆرێکیان بەربەستن وەک چاودێری و مۆڵەت و ئاگادارکردنەوە و ڕاگرتن و هەڵوەشاندنەوە، جۆرێکی تریشیان ڕێکخەرن (تنظيمي) وەک یاداشتنامە و دابینکردنی دارایی (التأمين النقدي).

عێراق و میسر و لوبنان پەیڕەوی جۆری یەکەم دەکەن و فەرەنساش پەیڕەوی جۆری دووەم دەکات، هەروەکو دواتر لە باسی ڕێکخستنی یاسایی دەرکردن و بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامەدا بۆمان دەردەکەوێ.

**سێیەم:** سیستەمی سڵپێکەر (النظام الردعي) le regime repressif

بەپێی ئەم سیستەمە هەموو کەسێک بۆی هەیە بەوپەڕی ئازادی کاری ڕۆژنامەگەری بکات بەر لە بڵاوبوونەوە یان دوای بڵاوبوونەوە و بێ دەستێوەردانی کارگێڕی.

واتە ڕێگا بەهەموو کەسێک دەدرێت، گوزارشت لە بیر و هزر و ویژدانی خۆی بکات، بێئەوەی هەندێ کاری پێویستی بەسەردا بسەپێندرێت، بەر لە بڵاوبوونەوە یان لە کاتی پیادەکردنی ئازادییەکەیدا، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە ئەو کەسە لێپرسینەوەی لەگەڵ ناکرێت، بەڵکوو دەکەوێتە بەر لێپرسینەوەی تاوانکاری و مەدەنی و ئەدەبییەوە، ئەگەر بێت و کردارێک لەو کردارانە ئەنجام بدات کە یاسا یان بەڵگەنامەی شەرەفی پیشە سزای بۆ داناوە[340].

---

٣٣٨- د. عبدالله اسماعيل البستاني، حرية الصحافة، سەرچاوەی پێشوو، ل١١٩.

٣٣٩- د. عبدالله اسماعيل البستاني، حرية الصحافة، سەرچاوەی پێشوو، ل١٨.

٣٤٠- د. عبدالله اسماعيل البستاني، حرية الصحافة، سەرچاوەی پێشوو، ل١٢١.

ئەم سیستەمە لەباوەڕی ئازادیی ڕۆژنامەگەری و دیموکراسییەوە لە سیستەمەکانی دیکە گونجاوترە، بۆیە دەوڵەتە دیموکراسییەکان پەیڕەوی دەکەن لەگەڵ سەپاندنی هەندێ کاری خۆپارێزانە و پێشکەشکردنی ئاگاکاری، واتە تێکەڵکردنی هەندێ ڕەگەزی سیستەمی پاراستن لەگەڵ سیستەمی بەرپەست.

بۆیە ئەم سیستەمە بۆ بارودۆخی هەرێمی کوردستان لە سیستەمەکانی دیکە گونجاوترە.

**چوارەم:** سیستەمی سڵپێکەر لەگەڵ زامنکردنی ئازادیی یاسایی و ئابووری بۆ ڕۆژنامەگەری (النظام الردعي مع ضمان الحرية القانونية والاقتصادية للصحافة)

ئەم سیستەمە بریتییە لە سیستەمی سڵپێکەر (النظام الردعي) لەگەڵ ڕێکخستنی دەزگای ڕۆژنامەگەری بەچەشنێک کە ئازادییە یاسایی و ئابوورییەکەی بەیەکەوە بپارێزرێت. فەرەنسا ئێستا پەیڕەوی ئەم سیستەمەی دوایی دەکات[341].

## ٤- ٢ پرنسیپەکانی ڕۆژنامەگەری

هەندێک پرنسیپی گشتی هەن کە لە زۆربەی وڵاتاندا لە یاسای ڕۆژنامەگەریدا ڕەچاوکراون پێویستە یاسادانەر لە یاسای چاپەمەنی و ڕۆژنامەگەریدا ڕەچاویان بکات بەمەبەستی دابینکردنی هاوسەنگییەک لەنێوان ئازادیی پێویست بۆ ڕۆژنامە و ڕۆژنامەنووسان و مافی پێویست بۆ تاکەکانی کۆمەڵ و کۆمەڵ بەگشتی.

لە کۆمەڵگەی مەدەنیدا دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوە ئازادن و هیچ کۆسپ و تەگەرەیەکیان لەبەردەم دانانرێ بەپێی یاسا نەبێت. بەڵام بۆ ئەوەی هاوسەنگییەک دروست بێت لەنێوان ئەو ئازادییەی بەڕۆژنامە و ڕۆژنامەنووسان دراوە لەگەڵ ئەو مافەی کە هەر تاکێک لە تاکەکانی کۆمەڵ و کۆمەڵ بەگشتی هەیەتی، دەبێ چوارچێوەیەک بۆ سومارەکردنی دیار بکرێت لەبەر ڕۆشنایی هەندێک پرنسیپی گشتی بەمەبەستی ڕێزگرتن لە مافی کەسان و بەرژەوەندیی گشتی و سیستەمی گشتی[342].

---

٣٤١- د. عبدالله اسماعيل البستاني، حرية الصحافة، سەرچاوەی پێشوو، ل١٨.

٣٤٢- Http://www.Alkabar.alkaleej.com11/11/2001.، و کەمال سەعدی: ئازادیی ڕۆژنامەگەری یا ڕۆژنامەنووس و ڕۆژنامەی ئازاد، گۆڤاری هەرێم ژمارە (٢٦٩) ١٥/٤/ ٢٠٠١. ل٤٨.

ئەم پرەنسیپە گشتییانەش بریتین لەمانەی خوارەوە:

**یەکەم**: پاراستنی دەوڵەت و سیستەمی گشتی

هیچ گومانی تێدا نییە کە ڕۆژنامەگەری تیغێکی دوو دەمە، بۆکاری چاک و خراپ دەشێ و بەکار دەهێندرێت. بۆیە هەر دەوڵەتێک بەیاسایەکی تایبەتی ڕێگی دەخات بۆ ئەوەی خۆی لە شەڕی ڕۆژنامەگەری بپارێزێت، چونکە ئەم چالاکییە وەکو هەر چالاکییەکی تری کۆمەڵایەتی لە خواروخێچی بەدەر نییە و زۆرجاران هەندێ ڕۆژنامە و ڕۆژنامەنووسان بەمەبەستی وەدەستهێنانی پارە و پوول سووکایەتی بەپیرۆزییەکانی گەل و نیشتمان دەکەن و دەست درێژی دەکەنە سەر مافی مرۆڤ و مافی کۆمەڵ و ڕەچاویان ناکەن[٣٤٣].

هەروەها لەبەرئەوەی ڕۆژنامەگەری ئاوێنەی کۆمەڵە و سەرەڕای ئەو ڕۆڵەی کە هەیەتی لە وشیارکردنەوە و ئاراستەکردنی کۆمەڵ، بۆیە ناکرێ ڕەها بکرێ بەچەشنێک ئەو ئایدیۆلۆژیانە بڵاوبکاتەوە کە بەسروشت پێچەوانەی بەها گشتییە هاوبەشەکانی ئەو کۆمەڵگەیەن کە تیایدا کارەکانی خۆی ئەنجام دەدات، چونکە هەستانی بەکارێکی وەها دەبێتە مایەی ڕوخاندنی ئایدیۆلۆژیای کۆمەڵ نەک بەرجەستەکردن و پتەوکردنی)[٣٤٤].

پرۆفیسۆر جیدیۆن ستجوبیرگ[٣٤٥] لەم بارەیەوە دەڵێ: «ڕەوشتی سەرەکی زۆربەی خەڵک لەم سەردەمەدا بریتییە لە ڕێزگرتن لە نیزام و پاراستنی»[٣٤٦].

هەروەها فریزر بۆند دەڵێ: «ڕۆژنامە گەورەکان پێویستە بۆ بەدیهێنانی ئامانجە گەورەکان بۆ بەرژەوەندیی کۆمەڵ تێبکۆشن لەجیاتی ئەوەی ئامانجی سەرەکییان تەنها وەدەستهێنانی پارەو پوول بێت»[٣٤٧].

شایەنی ئاماژەبۆکردنە، هەروەکو پێشتریش ئاماژەمان پێ کرد، هیچ ئازادییەک بەبێ

٣٤٣- د. حسین عبدالقادر: الرأي العام والعلاقات، سەرچاوەی پێشوو، ل٣٠٨.

٣٤٤- حيدر حسين الحمد: الصحافة بين الاعباء الذاتية و الضغوطات الخارجية، تۆڕی ئینتەرنێت:
Http://www.anaabaa.org.nba46/sahafahtm.2001/9/29.

٣٤٥- پرۆفیسۆر جیدیۆن ستجوبیرغ زانای کۆمەڵناسییە لە زانکۆی تەکساس لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.

٣٤٦- بروانە جون. ار. بیتنر: مقدمة في الاتصال الجماهيري، سەرچاوەی پێشوو، ل ٦٩٣.

٣٤٧- ف. فريزر بوند: مدخل الى الصحافة، سەرچاوەی پێشوو، ل١٨.

بەرپرسیارێتی نییە، بۆیە ئازادیی یەكێك نابێ ببێتە مایەی كەم كردنەوەی ئازادیی كەسانی تر یان ئازادیی كۆمەڵ یان زیان گەیاندن بەبەرژەوەندییەكانیان و بەرژەوەندییە باڵاكانی كۆمەڵ. لەبەرئەوە دەوڵەت ئەو یاسایانە دادەنێ كە لەلایەك كەفالەتی ئازادیی ڕۆژنامەگەری بۆ ڕۆژنامە و ڕۆژنامەنووسان دەكات، لە لایەكی تریشەوە كەفالەتی پاراستنی دەوڵەت و مافی كەسانی تر و سیستەمی گشتی دەكات[٣٤٨].

**دووەم: چەواشەنەكردنی ڕای گشتی**

یەكێك لە ئەركەكانی ڕۆژنامەنووسان پابەندبوونە بەڕاستگۆیی لە گواستنەوەی هەواڵەكان بۆ خوێنەران[٣٤٩]. هەرچەندە زۆرجاران ڕۆژنامە بەئەنقەست یان بەنائەنقەست ڕووبەڕووی بڵاوكردنەوەی زانیاری و هەواڵی درۆ دەبێتەوە كە ئەمەش زیانێكی زۆر بەكۆمەڵ و ڕای گشتی دەگەیەنێت. چونكە هەندێك لە خوێنەران بەسروشت باوەڕ بەو زانیاری و هەواڵانە دەكەن كە لە ڕۆژنامەدا دەیان خوێننەوە، بۆیە یاسای چاپەمەنی و ڕۆژنامەگەری هەمیشە بایەخ بەم لایەنە دەدات و كەفالەتی پاراستنی ڕای گشتی دەكات

٣٤٨- د. حسین عبدالقادر: الرأي العام والعلاقات، سەرچاوەی پێشوو، ل٣٠٩.

٣٤٩- بڕوانە دەقی ماددەی یەكەمی بەڵگەنامەی شەرەفی ڕۆژنامەگەریی نێودەوڵەتی كە لە لایەن لیژنەی ئازادیی ڕاگەیاندنی سەر بەڕێكخراوی یونسكۆ دانراوە و لە خولی چواردەهەمینی ئەم ڕێكخراوە لە ساڵی ١٩٥٢ دانی پیادانراوە و حوكمەكانی بەبەشێك لە یاسای گشتیی نێودەوڵەتی دادەندرێن و دەبێ ڕۆژنامەنووسان و خاوەن ڕۆژنامەكان پابەندیی بن، ئەمەش دەقەكەیەتی: «دەبێ كارمەندانی ڕۆژنامەگەری و ڕاگەیاندن ئەوەی لە توانایان دایە بیخەنەگەڕ بۆ بەخشینی هەواڵی ڕاست و دروست بۆ جەماوەر و لەگەڵ ڕووداوەكان وەكو یەك بێت، هەروەها دەبێ لە ڕاستی ئەوزانیاریانەی كە دەستیان دەكەوێ بكۆڵنەوە و نابێ هیچ ڕووداوێكی گرنگ لەبیر بكەن یان ڕووداوەكان بەئەنقەست بشێوێنن» بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: ابراهیم الداقوقي: قانون الاعلام، منشورات جامعة بغداد، مطبعة وزارة الاوقاف والشؤون الدینیة، ١٩٨٦، ل١٦٠-١٦٢. هەرچەندە سەندیكای ڕۆژنامەنووسانی كوردستانی عێراق بەڵگەنامەی شەرەفی ڕۆژنامەگەریی بەشێوەیەكی سەربەخۆ دەرنەكردووە، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت كە پرەنسیپ و بنچینەكانی ڕەوشتی پیشەی ڕۆژنامەگەریی بۆ ڕۆژنامەنووسان دیار نەكردبێت. بەڵكو لەژێر یاسای سەندیكای ڕۆژنامەنووسانی كوردستانی عێراق ژمارە (٤)ی ساڵی ١٩٩٨ لە ماددەی بیستەمدا لەژێر ناونیشانی پابەندییەكان لە دە خاڵدا تۆماری كردووە و لە خاڵی هەشتەمدا جەختی لەسەر ئەوە كردووە كە نابێ ڕۆژنامەنووس بەزانیاری نادروست جەماوەر بەهەڵە ببات، كە ئەمەش دەقەكەیەتی «بەهەڵەبردنی جەماوەر بەزانیاری نادروست و لێكدانەوەی ڕووداوەكان. بەجۆرێك دوورێ لە ڕاستگۆیی یان بڵاوكردنەوەی نادڵنیایی لایان».

له دژی چەواشەکردن[350]. بۆیە پێویستە ڕۆژنامەنووس زۆر وریابێت لە وەرگرتنی هەواڵ و دەبێ دڵنیابێت لە ڕاستیی و دروستی ئەو زانیارییانە بەر لە بەکارهێنانیان لە ڕاپۆرتە هەواڵەکانیدا[351].

کەواتە دەبێ ڕۆژنامەنووسان هەست بکەن کە پێویستە لەسەریان هاوسەنگیی لە نێوان ئاسایشی نەتەوەیی و گەیاندنی هەواڵەکان بەڕاستی و بەئەمانەتەوە بۆ جەماوەر ڕابگرن[352].

**سێیەم: پاراستنی ئاکاری کۆمەڵ**

پاراستنی ئاکاری کۆمەڵ یەکێکە لە ئەرکە هەرە دیارەکانی دەوڵەت، بۆیە لە یاسای ڕۆژنامەگەریدا جەخت لەسەر ئەم لایەنە دەکات و کەفالەتی ئاکاری کۆمەڵ لەو بابەتانەی کە لەگەڵ ئاکاری گشتی ناگونجێن کە لە ڕۆژنامەکاندا بڵاودەکرێنەوە دەکات.

هەڵبەتە ڕۆژنامە ڕووزەردەکان زۆرجاران هەندێ وێنەی ڕووت بڵاودەکەنەوە یان بەشێوەیەکی خراپ هەواڵەکان دادەڕێژن یان باسی بابەتەکانی ئاکار دەکەن وەیان دەچنە ناو وردەی ئەو بابەتانە کە پێویست ناکات خۆیانی لە قەرە بدەن[353] کە ئەمەش دەبێتە

---

٣٥٠- د. حسین عبدالقادر : الرأي العام والعلاقات، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣١٢.

٣٥١- ڕوبرت ستیل و جاي جالد: القواعد الاخلاقية لوسائل الاعلام ومابعدها، گۆڤاری «وسائل الاعلام والاخلاق»ی ئەلیکترۆنی کە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا دەریدەکات، لە ڕێکەوتی ١/١٠/٢٠٠٩ لە تۆڕی ئینتەرنێت لەم شوێنەی خوارەوە وەرگیراوە:

Http://www.usinfo.state.gov/journals/401./ijga/htm

352- Http://www.Rctp.org/new13/10/2001.

٣٥٣- ڕۆژنامەی «النبأ»ی میسری و «SUN»ی ئینگلیزی نموونەی ڕۆژنامەی ڕووزەردن لەم سەردەمەدا، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە (٢-٢-١) دووەم خاڵی چوارەم لەم تێزەدا کە پێشتر ئاماژەمان پێکردووە.

هەروەها لە عێراقدا زۆرجاران لەلایەن بەڕێوەبەری گشتیی ڕاگەیاندن ئەو ڕۆژنامانە ئاگادار کراونەتەوە کە ئەو بابەتانەیان بڵاوکردۆتەوە کە لەگەڵ ڕەوشتی گشتیی کۆمەڵ ناگونجێن یان غەریزەی سێکسی لاوەکان دەوروژێنن. بۆنموونە بەڕێوەبەری گشتیی ڕاگەیاندن لە وەزارەتی ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندنی عێراقی بەنووسراوی ژمارە (٧٠٣) لە ١٩٩٨/٨/١٣ ئاگاداری ڕۆژنامەی «نبض الشباب»ی کردۆتەوە سەبارەت بەو بابەتەی لەبارەی هاوسەرێتی عورفی (الزواج العرفي) بڵاوی کردۆتەوە و تیایدا دەڵێ: «هیچ پێویست ناکات بەدوای هاوسەرێتی عورفیدا بچن، چونکە =

مایەی ورووژاندنی غەریزەی سێکسی لەلای لاوەکانمان و هانیان دەدات بۆ ئەنجامدانیان[٣٥٤].

**چواردەم:** پاراستنی مافی مرۆڤ

مادام مرۆڤ بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتییە و لەگەڵ کەسانی تر لەناو کۆمەڵدا دەژی بۆیە دەبێ دەستبەرداری ئەو مافانەی بێت کە ناکۆکن لەگەڵ مافی کەسانی تر. بیرۆکەی بوونی دەستوور و یاسا و ڕێساکان لەوەوە هەڵقوڵاوە و بۆتە شتێکی پێویست بۆ ڕێکخستنی مافەکانی مرۆڤ بەمافی بیروڕادەربڕینەوە و نەهێشتنی ناکۆکی لە نێوانیاندا[٣٥٥].

ئەگەر بێت و ئازادیی ڕۆژنامەگەری ڕەها بکرێت و ڕۆژنامە ئازاد بێت لەوەی کە هەر ڕێگایەکی بیەوێ بیگرێتەبەر بێئەوەی هیچ کۆتوبەندێکی لەبەردەم دابندرێت، بێ گومان زۆر کەس دووچاری زیان لێکەوتن دێن لە ئاکامی بڵاوبوونەوەی ئەو هەواڵ و ڕاپۆرتەهەواڵانەی کە ناو و ناوبانگیان دەزڕێنێ و کەسایەتییان لەکەدار دەکات[٣٥٦].
بۆیە لە هەموو وڵاتێکدا یاسادانەر بایەخ بەم لایەنە دەدات و تاکەکانی کۆمەڵ لە ناو و ناوبانگ زڕاندن و بوختانپێکردن، کە لە ڕێگای ڕۆژنامەوە ڕوودەدەن، دەپارێزێ و مافی وەڵام دانەوە و ڕاستکردنەوەی ئەو زانیاریانەشیان پێ دەبەخشێت.

شایەنی ئاماژەبۆکردنە، لە جاڕی گەردوونیی مافی مرۆڤی ساڵی ١٩٤٨ و بەڵێننامەی نێودەوڵەتی بۆ مافە مەدەنی و ڕامیارییەکانی ساڵی ١٩٦٦ و ڕێککەوتننامەی تایبەت بەوەڵام دانەوە و ڕاستکردنەوەی ساڵی ١٩٥٢ گەلێک پرنسیپی بنەڕەتیمان لەم بارەیەوە بەرچاو دەکەوێت.

---

= لەوانەیە لاوان پێفرا بکات و چاوی لێ بکەن، بۆیە نابێ لە داهاتوودا بابەتی وەها بڵاوبکەنەوە. هەروەها بەڕێوەبەرێتیی گشتی ناوبراو بەنووسراوی ژمارە (٧١٨) کە لە ١٩٩٦/٧/١٣ دەرچووە ڕۆژنامەی «المصور العربي» بەیەکجاری وەستاند، چونکە وێنەیەکی دژ بەئەخلاقی گشتی بڵاوکردبۆوە. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: د. لطيفة حميد محمد: جرائم النشر في التشريع العراقي، رسالة مقدمة الى كلية القانون جامعة بغداد كجزء من متطلبات نيل شهادة الدكتوراه في القانون الجنائي لعام ١٩٩٩، ل ٢٠٧-٢٠٩.

٣٥٤- د. حسين عبدالقادر: الرأي العام والعلاقات، سەرچاوەی پێشوو ل ٣١٢.

355- Http://www.arabia com.2001/9/24.

٣٥٦- د. حسين عبدالقادر: الرأي العام والعلاقات، سەرچاوەی پێشوو ل ٣١٢.

لە جاڕی گەردوونیی مافی مرۆڤدا هاتووە «نابێت ژیانی تایبەتی و خێزان و منداڵ و نامەکاری هیچ کەسێک بەهەڕەمەکی تووشی دەستێوەردان بێت و نابڕوو و ناو و ناوبانگیشی وەبەر پەلامار بکەوێت، هەموو کەسێش مافی پاراستنی یاسایی لەو جۆرە دەستێوەردان و پەلاماردانە هەیە»[٣٥٧].

هەروەها جارێکی تر بەڵێننامەی نێودەوڵەتی بۆ مافە مەدەنی و ڕامیارییەکانی ساڵی ١٩٦٦ ئەمەی دووپات کردۆتەوەو دەڵێ: «نابێ بەزۆر یان بەشێوەیەکی نایاسایی دەست وەربدرێتە تایبەتمەندییەکانی کەس یان خێزان و ماڵ و نامەکاری. هەروەک نابێ بەشێوەیەکی نایاسایی هێرش بکرێتە سەر ناو و ناوبانگی»[٣٥٨].

بەڵام سەبارەت بەمافی وەڵامدانەوە و ڕاستکردنەوەی زانیاری و هەواڵەکان، کۆمەڵەی گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان لە ڕێککەوتننامەی ساڵی ١٩٥٢[٣٥٩]دا جەختی لەسەر ئەوە کردووە کە ئەو زانیاریانەی کە بەدرۆ یان بەشێواوی ڕۆژنامە بڵاوی کردوونەتەوە، دەبێ بەهەمان شێوە و لەهەمان شوێندا بەدرۆ بخرێنەوە یان ڕاست بکرێنەوە. ئەمە و جارێکی تر دووپاتی کردۆتەوە کە «بەرپرسیارێتیی پیشەیی پەیامنێر و ئاژانسەکانی دەنگوباس لەئەستۆیانە، ڕووداوەکان بێ جیاوازی و بێ ڕێزبەڕ لە ڕاستە ڕێگەدا بگوازنەوە، کە لە دوایشدا ڕێزگرتنی مافی مرۆڤ و ئازادییە بنەڕەتییەکانیان لەسەر دەمەزرێنێ»[٣٦٠].

هەروەها لە هەندێک دەوڵەتدا لە دەستووردا جەخت لەسەر پاراستن و کەفالەتکردنی مافی مرۆڤ کراوە و وەک پرنسیپێکی بنەڕەتی دانی پیانراوە.

---

٣٥٧- بڕوانە دەقی ماددەی (١٢) کە ئەمەش دەقەکەیەتی بەزمانی ئینگلیزی:

"No one shall be subjected to arbitrary interference with his privacy, family, home or correspondence, nor to attacks upon his honour and reputation. Everyone has the right to the protection of the law against such interference or attacks".

٣٥٨- بڕوانە دەقی ماددەی (١٧) کە ئەمەش دەقەکەیەتی بەزمانی ئینگلیزی:

"No one shall be subjected to arbitrary or unlawful interference with his privacy, family, home or correspondence, nor to unlawful attacks on his honour and reputation"

٣٥٩- ئەم ڕێککەوتننامەیە بەبڕیاری ژمارە ٦٣٠ (د- ٧) کە لە (١٦)ی کانوونی یەکەمی ١٩٥٢ بۆ ئیمزاکردن خراوەتە ڕوو و لە ڕێکەوتی ٢٤ی ئابی ١٩٦٢ بەپێی حوکمی ماددەی هەشتەمی ڕێککەوتننامەکە بەرکار بووە.

٣٦٠- بڕوانە هەژاری عەزیز سورمێ: لە بیرەوەری یۆبیلی زێڕینی جاڕنامەی مافی مرۆڤ، بڵاوکراوەکانی گۆڤاری سەنتەری برایەتی، چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ١٩٩٨، ل٦٨.

دەستووری فەرەنسی ساڵی ١٩٥٨ لە پێشەکییەکەیدا جەختی لەسەر پابەندبوونی گەلی فەرەنسی بەمافەکانی مرۆڤ کە لە جاڕی فەرەنسی ساڵی ١٧٨٩ دا هاتووە کردۆتەوە و تیایدا دەڵێ: «گەلی فەرەنسی بەشێوەیەکی رەسمی پابەندبوونی خۆی بەمافەکانی مرۆڤ و پرنسیپەکانی سەروەریی نیشتمانی بەو شێوەیەی کە جاڕی ١٧٨٩ دەستنیشانی کردووە و کە پێشەکی دەستووری ١٩٤٦ یش دووپاتی کردۆتەوە و تەواوی کردووە و رایدەگەیەنێ»[٣٦١].

هەروەها دەستووری میسری ساڵی ١٩٧١ لە ماددەی (٢٠٧)دا لە چوارچێوەی ماف و ئازادییە گشتییەکان و رێزگرتن لە ژیانی تایبەتیی هاووڵاتییان دانی بەئازادیی رۆژنامەگەریدا ناوە[٣٦٢].

یاسادانەری لوبنانی لە پێشەکی دەستووری ساڵی ١٩٢٦ی هەموارکراودا لە برگەی (ج) دانی بەیەکسانیی هاووڵاتییان لە ماف و ئازادییەکاندا ناوە کە ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ئازادیی رۆژنامەنووس هیچی لە ئازادیی هاووڵاتییەکی تری لوبنانی زیاتر نییە تا لە رێگای رۆژنامەکەیەوە دەستدرێژی بکاتەسەر، ئەمەش خۆی لە خۆیدا ئەوە دەگەیەنێ کە یاسادانەری لوبنانی وەکو یاسادانەری میسری و فەرەنسی وەک پرنسیپ دانی بەپاراستن و کەفالەتکردنی مافی مرۆڤ داناوە[٣٦٣].

---

٣٦١- ئەمەش دەقەکەیەتی بەزمانی فەرەنسی:

"Le peuple francais proclame solennellement son attachement aux Droits de l, Homme et aux principes de la souverasnete nationale tels qu,ls ont ete definis par la Declaration de 1789 , confirmee et completee par le preambule de la Constitution de 1946".

٣٦٢- ئەمەش دەقەکەیەتی: «رۆژنامەگەریی سەربەخۆ ئازادانە لە خزمەتی کۆمەڵدا مومارەسەی پەیامی خۆی بەهەموو شێوازێکی گوزارشتکردن دەکات بۆ گوزارشتکردن لە ئاراستەکانی رای گشتی و بەشداریکردن لە پێکهێنانیدا و ئاراستەکردنی لە چوارچێوەی بنچینە بنەڕەتییەکانی کۆمەڵ و پاراستنی ئازادی و ماف و ئەرکە گشتییەکان و رێزگرتنی ژیانی تایبەتیی هاوڵاتییان بەپێی دەستوور و یاسا».

٣٦٣- ئەمەش دەقەکەیەتی: «لوبنان کۆمارێکی دیموکراتیی پەرلەمانییە و لەسەر بنەمای رێزگرتن لە ئازادییە گشتییەکان لەسەرووی هەموویانەوە ئازادیی رادەربڕین و بیروباوەڕ و دادی کۆمەڵایەتی و یەکسانی لە ماف و ئازادییەکان لە نێوان گشت هاوڵاتییاندا بێ جیاوازی و لەپێشکردنی هەندێک بەسەر هی دیکە دامەزراوە».

دەستووری عێراقی بەپێچەوانەی هەردوو دەستووری میسری و فەرەنسی هیچ دەقێکی وەهای تێدا نییە. بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە یاسادانەری عێراقی دانی بەم پرنسیپە نەنابێت، بەڵکوو بۆ یاسای ئاسایی جێی هێشتووە.

یاسادانەری عێراقی هەرچەندە لە یاسای چاپەمەنیدا لەمە بێدەنگ بووە، بەڵام لە یاسای سەندیکای ڕۆژنامەنووسان ژمارە (١٧٨)ی ساڵی ١٩٦٩ی هەمووارکراودا ئەم کەلێنەی پڕکردۆتەوە و دەستدرێژیکردنە سەر ئازادییە گشتی و تایبەتییەکانی یاساغ کردووە[٣٦٤].

هەروەها یاسادانەری کوردستانیی سەرەڕای بێدەنگبوونی لە یاسای چاپەمەنیدا، بەڵام لە یاسای سەندیکای ڕۆژنامەنووسان ژمارە (٤)ی ساڵی ١٩٩٨ هاتۆتە وەڵام و لە ماددەی (٢٠) بڕگەی (٥)دا هەڕەشەکردنی لە هاووڵاتیان یاساغ کردووە کە ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە نابێ ڕۆژنامەنووس لە پیادەکردنی ئازادییەکەیدا ڕۆژنامە بکاتە هۆکارێک بۆ دەستدرێژیکردنە سەر مافی هاووڵاتییان و هەڕەشەکردن لێیان. بەواتایەکی تر دەبێ ڕۆژنامەنووس لە کاتی مومارەسەکردنی ئازادییەکەیدا ڕێز لە مافی مرۆڤ بگرێت و دەستدرێژی نەکاتە سەر.

**پێنجەم**: ئازادیی سەرچاوەیە

**هیچ گومانی تێدانییە کە ئازادیی سەرچاوەیە[٣٦٥] بۆ ئەنجامدانی گشت چالاکییەکی مرۆڤایەتی تەنها ئەوانە نەبێت کە بەحوکمی یاسا و ڕێساکان ڕێزبەر کراون.**

---

٣٦٤- بڕوانە دەقی بڕگەی (١٢) لە ماددەی (٣٥)ی یاسای ناوبراو کە ئەمەش دەقەکەیەتی: «نابێ هیچ ئەندامێک لە ڕێگای ڕۆژنامەگەرییەوە دەستدرێژی بکاتە سەر ئەو ئازادییە گشتی و تایبەتییانەی کە یاسا دەقنووسی کردوون»

٣٦٥- شایەنی ئاماژەبۆکردنە، عومەری کوڕی خەتاب لە گۆتەیەکیدا کە ئاراستەی والی میسر (عمرو بن العاص)ی کردووە، چونکە کوڕەکەی لە دیانێکی قیبتی دابوو، دەڵێ: «ئەی عەمرو، وات لێهات خەڵک کۆیلە بکەیت کە بەئازادیی لە دایک بوونە» بڕوانە د. صبحي المحمصاني: اركان حقوق الانسان، سەرچاوەی پێشوو ل ٩٩.

هەروەها ■ گۆتەیەکی تریدا دەڵێ: «خەڵکی هەموو ئازادن - الناس كلهم احرار»، عەلی کوڕی ئەبو تالیبیش لە گۆتەیەکیدا دەڵێ: «کە خوا ئازادی کردوویت مەبە کۆیلەی هیچ کەسێک» بڕوانە: د. عبدالحسين شعبان: الاسلام وحقوق الانسان، ط٢، منشورات مؤسسة الموكرياني للطباعة والنشر، مطبعة وزارة التربية، اربيل، ٢٠٠١، ل٩٥.

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە هەرچەندە ئازادی لە ژیانی مرۆڤایەتیدا بنەچەیەکی بەرفراوان و ڕەسەنە، بەڵام سەرەڕای ئەمەش بەیاسا و ڕێسا و حوکمە شەرعییەکان سنووردار کراوە و هەرکاتێک ڕووبەڕووی ئەو شتانە بۆوە کە یاساغ کراون ئەو ئازادییە نامێنێ، خۆ بەپێی حوکمی ئەقڵیش ئازادی لەوکاتەدا نامێنێ کە ئازادیی کەسانی تر دەست پێدەکات[٣٦٦].

کەواتە ڕۆژنامەنووس ئازادە لە خودی خۆی و ماف و کاروبارە تایبەتییەکانیدا، لەوانە دوو کاروبار ڕێزپەڕ دەکرێن:

١- هەر کاروبارێک ببێتە هۆی تەنگ پێهەڵچنینی ئازادیی کەسانی تر، چون ڕۆژنامەنووس ئازادە و هیچ کەسێک مافی ئەوەی نییە دەست بەسەر مافیدا بگرێت هەروەهاش ڕۆژنامەنووس مافی ئەوەی نییە دەست بەسەر مافی کەسانی تردا بگرێت و دەسەڵاتییان لەسەر خودی خۆیان تەدەغە بکات، ئازادیی مرۆڤ لە شتا دیارگراوە بەوەی کە نابێ دەستدرێژی بکاتە سەر ماف و ئازادیی کەسانی تر.

٢- ئەو کاروبارانەی یاساغ کراون، لە ڕاستیدا ڕۆژنامەنووس ئازادە لە چوارچێوەی یاساو ئەقڵدا، بۆیە مافی ئەوەی نییە بیانبەزێنێ، چونکە ئەو یاسایانە بۆ پاراستنی کۆمەڵ و بەرژەوەندییەکی گرنگتر داندراون، بۆیە لەوانەیە بگوترێ، سەرپێچیکردنی ڕۆژنامەنووس بۆ ئەو بنچینانەی کە یاسا یان ئایین یان ئەقڵ دایان نابێت بەئازادی دانانەدرێ، بەڵکوو لە ڕاستییدا ئەمە دەرچوونە لە ئازادی و بەزاندنییەتی[٣٦٧].

ئەوەی شایەنی باسە، جاڕی جیهانیی مافەکانی مرۆڤ کە لە ساڵی ١٩٤٨ دەرچووە لە ماددەی یەکەمیدا ئەم پرنسیپەی دەقنووس کردووە و دەڵێ: «مرۆڤ هەموو بەئازادی لە دایک دەبن و یەکسانیشن لە شکۆمەندی و مافدا، ئەقڵ و ویژدانیان پێ بەخشراوە و دەبێ بەگیانێکی برایانە ڕەفتار و هەڵسوکەوت لەگەڵ یەکدیدا بکەن»[٣٦٨].

---

٣٦٦- جعفر الشیرازي: الصحافة الحرة بین المشروع واللامشروع:

http://www.annaban.org/nba47/sahfa.htm23/9/2001

٣٦٧- جەعفەر شیرازی، «ڕۆژنامەگەریی ئازاد لە نێوان ڕەوایی و ناڕەواییدا»، وەرگێڕانی ژاڵە کەمال، سەرچاوەی پێشوو ل ١٠٠-١٠١.

٣٦٨- ئەمەش دەقەکەیەتی بەزمانی ئینگلیزی:

"All human beings are born free and equal in dignity and rights. They are endowed with reason and conscience and should act towards one another in a spirit of brotherhood".

لەڕاستیدا، بەرلەوەی ئەم پرنسیپە لە جاڕی جیهانیی مافەکانی مرۆڤدا دەقنووس بکرێ، بەچواردە سەدە بەرلەوە ئەم بیرۆکەیە لە هزری ئیمامی عەلی کوڕی ئەبو تالب و خەلیفە عومەری کوڕی خەتابدا ڕەنگی دابۆوە کە پێشتر ئاماژەمان پێ کرد.

هەروەها جاڕی شۆڕشی فەرەنسیش بەر لە جاڕی جیهانیی مافەکانی مرۆڤ ئەم پرنسیپەی دەقنووس کردووە[369].

**شەشەم**: ئازادیی بەرپرسیارێتی لەگەڵدایە

هەرچەندە ئازادیی سەرچاوەیە، بەڵام سەرەڕای ئەمەش ڕەها نییە بەڵکوو ئەرک و بەرپرسێتیی کۆمەڵایەتی لەگەڵدایە، دەبێ ئەو کەسەی مومارەسەی دەکات هەستی پێ بکات.کەواتە بۆ ئەوەی ئەم ئازادییە لەلایەن ڕۆژنامەنووسانەوە بەخراپی بەکار نەهێندرێت و نەکرێتە هۆکارێک بۆ دەستدرێژیکردنە سەر مافی خەڵکی، بۆیە دەبێ یاسادانەر لە ڕێکخستنی ئازادیی ڕۆژنامەگەریدا ئەم پرنسیپە لەبەرچاو بگرێت و بەرپرسێتیی ڕۆژنامەنووسیش لەچوارچێوەی ئەم بۆچوونەدا بەرپرسێتییەکی گرێدانەکراو دەبێت[370].

بەم پێیە لە دەوڵەتێکی وەکو وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کە لە دەستوورەکەیدا سنووردارکردنی ئازادیی ڕۆژنامەگەریی یاساغ کراوە[371]، ڕۆژنامەنووس ئازادە لەوەی چی بڵێ و چی بنووسێت و چی بڵاوبکاتەوە بەبێئەوەی ڕەزامەندی حکوومەت وەربگرێ بۆ ئەو قسەیەی کە دەیکات یان دەینووسێت یان بڵاوی دەکاتەوە. بەڵام لە هەمان کاتدا ئەم ئازادییە ئەوە ناگەیەنێ کە لێپرسینەوەی لەگەڵدا ناکرێ. بەڵکوو دەبێ هەموو کاتێک ئەوەی لە خەیاڵدا بێت کە بەرپرسە لە هەموو قسەیەکی کە دەیکات یان دەینووسێت یان بڵاوی دەکاتەوە و ئەم بەرپرسێتییەشی گرێدانەکراوە و دەبێ خۆی هەستی پێ بکات و دەرئەنجامەکەیشی بگرێتە ئەستۆ[372].

---

٣٦٩- جاڕی شۆڕشی فەرەنسی کە بەناوی جاڕی مافەکانی مرۆڤ و هاووڵاتی لە ساڵی ١٧٨٩ دەرچووە لە ماددەی یەکەمیدا دەقنووسی کردووە: «مرۆڤ بەگشتی بەئازادی لە دایک دەبن و بەئازادی دەژین و یەکسانیشن لە مافدا...» بڕوانە: د. عبدالحسین شعبان: الاسلام وحقوق الانسان، سەرچاوەی پێشوو ل١٦٩.

٣٧٠- د. عبداللطیف حمزة: الاعلام له تاریخه ومذاهبه، سەرچاوەی پێشوو ل ١٣٨.

٣٧١-بڕوانە دەقی یەکەمین هەمواری دەستووری ئەمریکیی ساڵی١٧٩١ لەخاڵی(٣-٢-٢) لەم تێزەدا.

٣٧٢- کەمال سەعدی: ئازادیی ڕۆژنامەگەری و ئەخلاقی پیشە. گۆڤاری سەنتەری برایەتی ژمارە (٢٧)ی بەهاری ساڵی ٢٠٠٣، ل٧٦.

کەواتە ئازادیی ڕۆژنامەگەری ڕەها نییە و حکومەت بۆی هەیە لە هەندێ حاڵەتدا بەمەبەستی پاراستنی ئاسایشی کۆمەڵ لە چوارچێوەیەکی تەسکدا کۆتوبەندی لەسەر دابنێ. لەم حاڵەتەشدا هەرچەندە ڕۆژنامەنووس ڕێگای قسەکردن و نووسین و بڵاوکردنەوەی لێ ناگیرێت. بەڵام هەرکاتێک ئەم سنوورەی بەزاند بەرپرسیارێتییەکە دەکەوێتە ئەستۆی خۆی و لە ئاکامی ئەو قسەیەی کە کردوویەتی یان نووسیویەتی یان بڵاوی کردۆتەوە، ڕووبەڕووی لێپرسینەوە و سزایەکی دوایینە دەبێتەوە[٣٧٣].

## ٤- ٣ زامنکردنی ئازادیی ڕۆژنامەگەری

ئەمڕۆ لەپاڵ جاڕنامەی جیهانیی مافەکانی مرۆڤ، دەیان ڕێککەوتننامەو بەیاننامەی نێودەوڵەتی بۆ داکۆکیکردن لە مافەکانی مرۆڤ بەگشتی و مافی ئازادی هزرو بیرکردنەوەو ڕۆژنامەگەری بەتایبەتی لەلایەن ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکانەوە دەرچوونە و بوونەتە بەشێک لە یاسای گشتیی نێودەوڵەتی و هەندێ جاریش بەیاسای مرۆڤایەتیی نێودەوڵەتی ناو دەبرێت. ئەوەی لە بەدواداچوونی ئەم مەسەلەیە تێبینی دەکرێت، ئەوەیە، ئەوەندە گرنگی لە بەدەستووریکردن و بەیاساییکردنی ئەم مافانەدا نییە، هێندەی لە باوەڕبوون بەم مافانە دایە. ئەوانەی دروشمی ئازادی و یەکسانییان بەرز کردەوەو شۆڕشی فەرەنسایان هەڵگیرساند، لە داکۆکیکردنی مافی مرۆڤ لە ئازادی و یەکسانیدا، بەقسە هیچ درێغییان نەکرد، کەچی هەموویان تا دوایی لەسەر ئەم باوەڕە نەمانەوە.

لۆسیل دیمۆلان[٣٧٤] و دانتۆن و دیلاکروا بوونە قۆچی قوربانیی ئەم باوەڕە و ڕۆبسپیر و ناپلیۆنیش بەکردەوە لێی پاشگەز بوونەوە.

---

٣٧٣- هارولد. ج. برمان: احاديث عن القانون الامريكي، ترجمة نور محمد فتح الله الخطيب والدكتور مصطفى احمد فهمي، ط١، منشورات مركز كتب الشرق الاوسط، مؤسسة فراكلين للطباعة والنشر، القاهرة، ١٩٦٤، ل٧٨-٧٩.

٣٧٤- لۆسیل دیمۆلان هەر لەبەرئەوەی دژی زۆرداری و ستەم بوو، بۆیە لە ڕۆژنامەکەیدا ناڕەزایی دەبڕی چونکە باوەڕی بەئازادی هەبوو، بۆیە تاکو سەریان لە لاشەکەی جودا کردەوە هەر داکۆکیی لە بیروڕای خۆی کرد و پاشگەز نەبۆوە و دوا گوتەی ئەوەبوو: «با بکوژرێم و زۆرداریش لەگەڵم بڕوخێ» بڕوانە: فخري قلعجي: اشهر المحاكمات في التأريخ، ط٤، منشورات شركة المطبوعات للتوزيع والنشر، بيروت، لبنان، ١٩٩٦ ل١١٧. ڕۆبسپیریش ئەو شێرەی کە بۆ نەهێشتنی ستەم و بەرگریکردن لە ئازادی هەڵیکردبوو، ئازادی پێ لەتاوبرد، هەروەها ناپلیۆنیش، دوای ئازادکردنی فەرەنسا، کەوتە گیانی گەلانی ئازادو تۆکردنی ئازادی.

کەواتە، بۆ ئەوەی ئازادی رۆژنامەگەری بەتەواوەتی بەرقەراربێت، سەرەرای دەقنووسکردنی ئەم ئازادییە لە دوتوێ دەستوورو یاساو رێساکاندا دەبێ بۆشاییەکی ئەوتۆ لە نێوان ئەم دەقانە و پراکتیزەکردنیاندا نەبێ کە ببێتەمایەی لەبارچواندنی یان لاوازکردنی[375].

ئینجا، بۆ ئەوەی ئازادی رۆژنامەگەری لە پێشێلکاری ئیدارە بپارێزرێت، لە دەستووردا بەشێوەیەکی سەربەخۆ و جیاواز لە ماف و ئازادییە بنەرەتییەکانیتر جەختی لەسەر کراوەتەوە بۆ ئەوەی جۆرە رێز و پیرۆزییەک بەئازادی رۆژنامەگەری ببەخشرێت و لە دەستدرێژیش بپارێزرێت.

دەقنووسکردنی ئەم پرنسیپانە لە دەستووردا بەس نییە بۆ زامنکردنی ئازادی رۆژنامەگەری، بەڵکو دەبێ هەندێک گرێنتی تری وەک پاراستنی دادگەری و پاراستنی نادادگەری و پاراستنی تاوانکاری لەپاڵ ئەمە هەبن بۆ ئەوەی ببنە پاڵپشت بۆ ئەم پرنسیپانەو ئەو دەستدرێژیانەش رەت بکەنەوە کە لەلایەن یاسادانەرەوە یان لەلایەن ئیدارەوە دەکرێتەسەر ئازادی رۆژنامەگەری.

لە خوارەوە لە چوار خاڵدا باسی ئەم زامنکردنانە دەکەین:

**یەکەم:** پاراستنی دەستووری (دەقەکانی دەستوور)

لەبەر ئەو رۆڵەی کە ئازادی رۆژنامەگەری لە ژیانی کۆمەڵایەتی هاوچەرخدا هەیەتی، بۆیە ■ پێشەنگی ئەو ماف و ئازادییە بنەرەتیانەی مرۆڤدایە کە دەستوور لەنێو دەقەکانیدا بەمەبەستی زامنکردن و پاراستنیان دەقنووسی کردوون.

وەکو دەشزانین، بنچینە دەستوورییەکان لە بنچینە یاساییە ئاساییەکان و بڕیارەکانی ئیدارە باڵاترن، بۆیە سەنگێکی تایبەتییان هەیە و بەچاوی رێزەوە تەماشا دەکرێن.

ئەمەش وایکردووە، کە ئازادی رۆژنامەگەری لە دەستووردا دەقنووس بکرێ، تاکو موماریسەکردنی بۆ رۆژنامەنووسان زامن بکرێت.

375- بەرای هانز کازنی یاسازان ئەو یاسایە سەرکەوتووە کە لە پراکتیزەکردندا سەرکەوتوە نەک لە دارشتندا. بۆیە ئەم یاسازانە پێی وایە تەنها مەرجی دروستی (شرط الصحة) بەس نییە بۆ بنچینەی یاسایی بەڵکو دەبێ ئەو بنچینە یاساییە لە پراکتیزەکردنیشدا سەرکەوتوو بێت، واتە هەموو لایەک (دەسەڵاتدار و ژێر دەسەڵات) رێزی لێ بگرن. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: د. منذر الشاوي: مزاهب القانون، دار الحكمة، بغداد، ١٩٩٠ ل ١٢٤-١٢٥.

لەبەر ڕۆشنایی ئەو دەقە دەستوورییانەی کە تایبەتن بەئازادیی ڕۆژنامەگەری لە دەستووری عێراقی و بەراورددا، لە چوار خاڵدا لەم بابەتە دەکۆڵینەوە بەم شێوەیەی خوارەوە:

١ - دەقەکانی دەستووری میسری:

دەستووری میسری ساڵی ١٩٧١ بەپێی ماددەی (٤٧-٤٨، ٢٠٦-٢١١) ئازادیی ڕۆژنامەگەری ڕێکخستووە.

لە ماددەی (٤٧)دا دەقنووسی کردووە کە:

«ئازادیی بیروڕادەربڕین دابین کراوە و هەموو مرۆڤێک بۆی هەیە بەقسە یان بەنووسین یان بەوێنە یان بەهەموو هۆکارێکی تری گوزارشتکردن لە چوارچێوەی یاسادا گوزارشت لە بیروڕای خۆی بکات...».

دوای ئەوەی دەستوور لەم ماددەیەدا بەشێوەیەکی گشتی جەختی لەسەر ئازادیی بیروڕادەربڕین بەهەموو شێوازەکانییەوە کردووە، جارێکی تر لە ماددەی (٤٨)دا بەشێوەیەکی تایبەتی جەختی لەسەر ئازادیی ڕۆژنامەگەری کردۆتەوە و دەقنووسی کردووە:

«ئازادیی ڕۆژنامەگەری و چاپەمەنی و بڵاوکردنەوە و ئامرازەکانی ڕاگەیاندن کەفالەت کراوە و دانانی سانسۆریش لەسەر ڕۆژنامەدا یاساغ کراوە، هەروەها ئاگادارکردنەوە و ڕاگرتن و هەڵوەشاندنەوەی بەڕێگای ئیداری یاساغ کراوە و دەگرێ لە حاڵەتی ڕاگەیاندنی حاڵەتی نائاساییدا یان لە کاتی شەڕدا سانسۆرێکی دیاریکراو لەو کاروبارانەی کە پەیوەندییان بەسەلامەتی گشتی یان ئاسایشی نەتەوەییەوە هەیە بەسەر ڕۆژنامە و چاپکراو وئامرازەکانی ڕاگەیاندندا بەپێی یاسا بسەپێندرێت».

لەم دوو دەقەدا تێبینی ئەوە دەکەین، سەرەڕای ئەوەی کە دەستووری میسری ئازادیی بیروڕادەربڕینی بەگشتی و ئازادیی ڕۆژنامەگەری بەتایبەتی کەفالەت کردووە، کەچی مومارەسەکردنی ئەم ئازادییەی لە چوارچێوەی یاسا و ڕەخنەی بنیاتنەر (النقد البناء) و سەلامەتیی نیشتمانیدا سنووردار کردووە.

بەڕای ئێمە، ئەم دەستەواژانە لە مانایەک زیاتر هەڵدەگرن و ڕێگا بەیاسادانەر دەدەن، بەبیانووی ڕێکخستنی ئازادیی ڕۆژنامەگەری ئەو یاسایانە دەربکات کە مومارەسەکردنەکەی سنووردار دەکات لە کاتێکدا کە هیچ دەقێکی ئەوتۆ نییە ڕێگای

لێبگرێت لە دەرکردنی ئەمجۆرە یاسایانەدا[٣٧٦]. بەپێچەوانەی ئەمە دەستووری ئەمریکی زۆر بەڕاشکاوییەوە ڕێگای لە کۆنگرێس گرتووە بۆ دەرکردنی هەر یاسایەک کە ئازادیی ڕۆژنامەگەری سنووردار بکات[٣٧٧].

ئەوەی شایەنی باسە، دوای ئەو ریفراندۆمەی کە لە ٢٢ی مایۆی ساڵی ١٩٨٠ دا بۆ هەموارکردنی دەستووری میسری کرا، بابێکی نوێ لەژێر ناونیشانی (حوکمە نوێیەکان) کە لە دوو فەسڵ پێک دێ، فەسڵی یەکەم بەناونیشانی (ئەلمجوومەنی شورا) و فەسڵی دووەمیش بەناونیشانی (دەسەڵاتی ڕۆژنامەگەری) خرایە سەر دەستووری ساڵی ١٩٧١ و چەندین پرنسیپی لەخۆ گرتووە کە تایبەتن بەچۆنێتی مومارەسەکردنی ئازادیی ڕۆژنامەگەری و لەهەمان کاتیشدا جەخت لەسەر ئەو پرنسیپانە دەکەنەوە کە لە ماددەی (٤٧) و (٤٨)ی ئەم دەستوورەدا هاتووە.

بەپێی ئەم هەمواره ڕۆژنامەگەری بەدەسەڵاتێکی جەماوەریی دادەنرێت[٣٧٨]. هەروەها لەم هەموارەدا جەخت لەسەر مافی ڕۆژنامەگەری کراوەتەوە بۆ مومارەسەکردنی پەیامەکەی بەسەربەخۆیی و بەئازادی لە خزمەتی کۆمەڵدا، هەروەها گوزارشتکردن لە ڕەوتەکانی ڕای گشتی و بەشداریکردن لە پێکهێنانیدا و ئاراستەکردنی لە چوارچێوەی کۆڵەکە بنەڕەتەکانی کۆمەڵ و پاراستنی ماف و ئازادییە گشتییەکان و ڕێزگرتن لە ژیانی تایبەتیی هاووڵاتییان[٣٧٩].

---

٣٧٦- ئەوەی شایەنی باسە، یاسادانەری میسری لە ساڵی ١٩٩٥ یاسای ژمارە (٩٣)ی دەرکرد. ڕۆژنامەنووسان ئەم یاسایەیان بەیاسای لەناوبردنی ئازادیی ڕۆژنامەگەری ناو دەبرد، چونکە سزای تاوانەکانی بوختان پێکردن و ئاوزڕاندنی زۆر توند کردبوو، بۆیە ڕۆژنامەنووسان لەگەڵ سەندیکاکەیان هەوڵ و کۆششیان کردە یەک و بەتووندیی بەرەنگاری ئەم یاسایە بوونەوە تا زۆری نەخایەند بەیاسای ژمارە (٩٥)ی ساڵی ١٩٩٦ هەڵوەشێندرایەوە. بڕوانە اسامة سرايا: برنامج اكثر من رأي، قدمه جميل عازر بمناسبة يوم الصحافة العالمي، علي قناة الجزيرة في ٢٠٠١/٥/٣، لە ئینتەرنێت لەم شوێنە وەرگیراوە: http://www.aljazeera.net23/9/2001

هەروەها بڕوانە: صلاح عيسى: الرقابة ليست المتهم الوحيد.. بعض الصحف مسؤولة ايضا، لەم شوێنەی خوارەوە لە ئینتەرنێت: http://www.aljazeera.net23/9/2001

٣٧٧- بڕوانە ماددەی (١)ی یەکەمین هەمواری ساڵی ١٧٩١ی دەستووری ئەمریکی کە لە بڕگەی (٣-٢-٢) پەراوێزی (١٩٧) لەم تێزەدا ئاماژەمان پێی کردووە.

٣٧٨- بڕوانە ماددەی (٢٠٦) لە دەستووری میسری.

٣٧٩- بڕوانە ماددەی (٢٠٧) لە دەستووری میسری.

هەروەها جارێکی تر ئازادیی ڕۆژنامەگەری کەفالەت کردووە و دانانی سانسۆریشی لەسەر ڕۆژنامە هەروەها ئاگادارکردنەوە و ڕاگرتن و هەڵوەشاندنەوەی بەڕێگای ئیداری یاساغ کردووە[٣٨٠]. هەر لەم هەموارەدا جەخت لەسەر مافی پارتە سیاسییەکان و کەسە مەعنەوییە گشتی و تایبەتییەکان بۆ موڵکداریتی و دەرکردنی ڕۆژنامە کراوەتەوە[٣٨١].

یەکێک لەو مافانەی ڕۆژنامەنووس کە لەم هەموارەدا جەختی لەسەر کراوە، کەفالەتکردنی مافی ڕۆژنامەنووسە بۆ وەرگرتنی زانیارییەکان و دەستاوەدەست پێکردنیان[٣٨٢].

لە کۆتاییدا، ئەم هەموارە باسی چۆنیتی دامەزراندنی ئەنجومەنی باڵای ڕۆژنامەگەری کردووە بۆ سەرپەرشتیکردنی کاروباری ڕۆژنامەگەری[٣٨٣].

لەم دەقانەی سەرەوەدا بۆمان دەردەکەوێ:

١- دەستووری میسری لە بواری ڕۆژنامەگەریدا کاری بەتیۆری بەرپرسیتیی کۆمەڵایەتی کردووە. ئەمەشمان لە دەقی ماددەی (٢٠٧) بۆ بەدیار دەکەوێ.

٢- بەپێی دەقی ماددەی (٢٠٩) تەنها پارتە سیاسییەکان و کەسە مەعنەوییە گشتی و تایبەتییەکان بۆیان هەیە ڕۆژنامە دەربکەن، واتە کەسی سروشتی و کەسی بیانی بۆیان نییە ڕۆژنامە دەربکەن.

٣- ماددەی (٢٠٨) لە دەستووری میسری حوکمی ماددەی (٤٨)ی بەشێوەیەکی زمنی هەڵوەشاندۆتەوە، چونکە حوکمی ماددەی (٢٠٨) سەبارەت بەیاساغکردنی سانسۆر و ئاگادارکردنەوە و ڕاگرتن و هەڵوەشاندنەوەی ڕۆژنامە بەڕێگای ئیداری حوکمێکی ڕەهایە. لە کاتێکدا حوکمی ماددەی (٤٨) بۆ هەمان شت حوکمێکی ناڕەهایە کە ڕێگای داوە بەئیدارە لە حاڵەتی ڕاگەیاندنی بارودۆخی نائاساییدا یان لەکاتی شەڕدا سانسۆرێکی دیاریکراو بخاتە سەر ڕۆژنامە و چاپکراو و کەناڵەکانی ڕاگەیاندن لە بڵاوکردنەوەی ئەو بابەتانەی کە پەیوەندییان بەسەلامەتیی گشتی و ئاسایشی نەتەوەییەوە هەیە.

---

٣٨٠- بڕوانە ماددەی (٢٠٨) لە دەستووری میسری.

٣٨١- بڕوانە ماددەی (٢٠٩) لە دەستووری میسری.

٣٨٢- بڕوانە ماددەی (٢١٠) لە دەستووری میسری.

٣٨٣- بڕوانە ماددەی (٢١١) لە دەستووری میسری.

بێ گومان، حوکمی ڕەها بەڕەهایی کاری پێدەکرێ ئەگەر بەدەقێکی یاسایی سنووردار نەکرابێت. بۆیە باشتر وایە دەقی ماددەی (٤٨) لابېردرێت و ئیکتیفا بەدەقی ماددەی (٢٠٨) بکرێت.

٤- ماددەی (٢١٠) لە دەستووری میسری کە دانی بەمافی ڕۆژنامەنووس ناوە بۆ وەرگرتنی زانیارییەکان و دەستاودەست پێکردنیان، بەمە گرێنتییەکی تری خستۆتە پاڵ گرێنتییەکانی تری ئازادیی ڕۆژنامەگەری.

٥- سپاردنی ئەرکی سەرپەرشتیکردنی ڕۆژنامەگەری بەئەنجوومەنی باڵای ڕۆژنامەگەری بەپێی ماددەی (٢١١)ی دەستووری میسری، هەنگاوێکی تری گرنگە بۆ ئازادکردنی ڕۆژنامە لە دەسەڵاتی حکوومەت و کردنی بەدەسەڵاتێکی جەماوەریی کە لە ماددەی (٢٠٩)دا وەها وەسف کراوە[٣٨٤].

٢- دەقەکانی دەستووری لوبنانی

دەستووری لوبنانی ساڵی ١٩٢٦ی هەمووارکراو هیچ دەقێکی ڕاشکاوی لەبارەی ئازادیی ڕۆژنامەگەری تێدانییە و ئازادیی ڕۆژنامەگەری بەشێوەیەکی تایبەتی و سەربەخۆ و بەپێی پرنسیپی تایبەتی ڕێکنەخستووە، بەڵکوو ئازادی ڕادەربڕینی بەگشت شێوازەکانییەوە دابین کردووە - لەوانەش ئازادیی ڕۆژنامەگەری - لە میانی ماددەی (١٣)دا بەشێوەیەکی ئاشکرا و، لە میانی ماددەی (٧)دا بەشێوەیەکی زمنی کردووە.

لە ماددەی (٧)دا جەختی لەسەر ئەوە کردۆتەوە کە «هەموو لوبنانییەک وەکو یەکن بەرامبەر یاسا و وەکو یەک سوود لە مافە شارستانی و ڕامیارییەکان وەردەگرن». لە کاتێکدا لە ماددەی (١٣)دا دەقنووسی کردووە کە «ئازادیی ڕادەربڕین بەقسە و بەنووسین و ئازادیی چاپەمەنی و ئازادی کۆبوونەوە و ئازادیی دامەزراندنی کۆمەڵەکان هەرهەمووی لە چوارچێوەی یاسادا کەفالەت کراوە».

لەم دوو دەقەی سەرەوەدا ئەم تێبینییانەی خوارەوە دەکەین:

١- ماددەی (١٣) لە میانی ئازادیی ڕادەربڕیندا بەو سیفەتەی کە ئازادیی ڕۆژنامەگەری شێوازێکە لە شێوازەکانی ئازادیی ڕادەربڕین کەفالەتی ئازادیی ڕۆژنامەگەری کردووە.

---

٣٨٤- شایەنی ئاماژەپێکردنە، یاسای ڕێکخستنی ڕۆژنامەگەری ژمارە(٩٦)ی ساڵی ١٩٩٦ لە بابی چوارەمدا لە دوو فەسڵدا چۆنێتی دامەزراندن و دەسەڵاتەکانی ئەم ئەنجوومەنەی دیارکردووە. لەفەسڵی یەکەمی بۆ چۆنێتی دامەزراندنی تەرخان کردووە و فەسڵی دووەمیشی بۆ دەسەڵاتەکانی تەرخان کردووە.

٢- دەستوور ئەرکی ڕێکخستنی ئازادیی ڕادەربڕینی بەشێوەیەکی ڕەهاو بەبێ کۆت و بەند بەیاسادانەر سپاردووە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە یاسادانەر دەسەڵاتێکی خەملاندنی فراوانی لە ڕێکخستنی ئازادیی ڕادەربڕین بەهەموو شێوازەکانییەوە لەوانەش ئازادیی ڕۆژنامەگەری دەبێ. بۆیە باشتروابوو هەندێک زامنکردن لە دەستووردا بۆ ئازادیی ڕۆژنامەگەری زامن بکرێت، بۆ ئەوەی لە دەستدرێژی یاسادانەر و ئیدارە کەفالەتی بکات. ئەمەش بەیاساغکردنی سانسۆرکردن و ئاگادارکردنەوە و ڕاگرتن و هەڵوەشاندنەوەی ئیدارییانەی ڕۆژنامەگەری دەبێ، بەمەش پاراستنێکی دەستووریی کاریگەر بۆ ئازادیی ڕۆژنامەگەری دەستەبەر دەکرێت.

٣- ماددەی (١٣) کەفالەتی ئازادیی ڕادەربڕینی بەهەموو شێوازەکانییەوە - لەوانەش ئازادیی ڕۆژنامەگەری - بۆ هەموو کەسێک کردووە بەبێ ئەوەی گوێ بداتێ کە چ ڕەگەزنامەیەکی هەیە. ئەم دەرئەنجامەشمان لە گشتێتیی دەستەواژەکە بۆ دەردەکەوێت، لەکاتێکدا لە ماددەی (٧)دا جەختی لەسەر ئەوە کردۆتەوە کە هەموو هاوڵاتییەکی لوبنانی بەرامبەر بەیاسا بۆ سوود وەرگرتن لە مافە مەدەنی و ڕامیارییەکان وەکو یەکن.

بەڕای ئێمە وا باشتر بوو دەستووری لوبنانی کەفالەتکردنی ئازادیی ڕادەربڕینی لە ماددەی (١٣)دا تایبەت بکردبا بەلوبنانییەکان بۆ ئەوەی لەگەڵ دەقی ماددەی (٧)دا دژ بەیەک نەبن.

لە ڕاستیدا، یاسادانەری لوبنانی لە یاسای چاپەمەنی ساڵی ١٩٦٢دا ئەمەی پەیڕەو کردووە و لە ماددەی (٣٠)دا مەرجی کردووە کە ئەو کەسەی دەیەوێ ڕۆژنامە دەربکات دەبێ لوبنانی بێت.

٣- دەقەکانی دەستووری فەرەنسی

دەستووری فەرەنسی ساڵی ١٩٥٨ی هەموارکراو[٣٨٥] بەشێوەیەکی تایبەتی و سەربەخۆ باسی ئازادیی ڕۆژنامەگەری نەکردووە، بەڵکوو لە مبانی پێشەکییەکەیدا وەکو مافێک لە

٣٨٥- دەستووری فەرەنسی ساڵی ١٩٥٨ چەند جارێک هەموار کراوە، بۆ یەکەم جار لە ٦ تشرینی دووەمی ١٩٦٢ هەموارکراوە و دواتر لە ٣٠ دیسەمبەری ١٩٦٣، هەروەها لە ٢٩ ئۆکتۆبەری ١٩٧٤، و ١٨ جوونی ١٩٧٦ هەموارکراوە بڕوانە:

Maurice Duverger; Constitutions et Documents politiques. Imprim en France. Imprimerie des Presses Universitaires de Frace. Janvier 1986. P ; 284

مافە بنەڕەتییەکانی مرۆڤ ئاماژەی پێکردووە و تیایدا هاتووە: «گەلی فەرەنسی بەشێوەیەکی ڕەسمی پابەندبوونی خۆی بەمافەکانی مرۆڤ و پرنسیپەکانی سەروەریی نیشتمانی بەو شێوەیەی کە جاڕنامەی ١٧٨٩ دەستنیشانی کردوون و پێشەکییەکەی دەستووری ١٩٤٦ تەواوی کردوون و جەختی لەسەر کردوونەتەوە ڕادەگەیەنێ»[٣٨٦].

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە دەستووری فەرەنسی دیارکردنی چوارچێوەی ماف و ئازادییە گشتییەکانی بەئازادیی ڕۆژنامەگەرییشەوە بۆ جاڕنامەی فەرەنسی ساڵی ١٧٨٩[٣٨٧] و پێشەکییەکەی دەستووری ساڵی ١٩٤٦ وازلێهێناوە.

کەواتە، دەبێ بگەڕێینەوە بۆ جاڕنامەی فەرەنسی ساڵی ١٧٨٩ و پێشەکی دەستووری فەرەنسی ساڵی ١٩٤٦ بۆ دیارکردنی پرنسیپ و زامنکردنە دەستوورییەکان لە دەستووری فەرەنسیدا.

لە گەڕانەوەماندا بۆ جاڕنامەی فەرەنسی مافەکانی مرۆڤ و هاوڵاتییانی ساڵی ١٧٨٩[٣٨٨] کە لە حەڤدە ماددە پێکهاتووە، بۆمان دەردەکەوێ کە ماددەی (١) و ماددەی (٢) و ماددەی (٤) و ماددەی (١١) پەیوەندییان بەم بابەتەوە هەیە، بۆیە لە خوارەوە دوای تاوتوێکردنی دەقی هەرچوار ماددەی ناوبراو و پێشەکییەکەی دەستووری ساڵی ١٩٤٦ لە بەهای یاسایی جاڕنامەی ناوبراو دەکۆڵینەوە.

---

٣٨٦- ئەمەش دەقەکەیەتی بەزمانی فەرەنسی:

"Le peuple francais proclame solennellement son attachement aux Droits de I,Homme ■ aux principes de la souveraincte nationale tels qu ,ile ont ete definis par la Declaration de 1789. confirmee et completee par le preambule de la Constitution de 1946".

٣٨٧- ئەم جاڕنامەیە لە ١٧٨٩/٨/٢٦ بەناوی جاڕی مافەکانی مرۆڤ و هاوڵاتی لەلایەن کۆمەڵەی دامەزرێنەری فەرەنسی دەرچووە و لە حەڤدە ماددە پێکهاتووە و لەبەر بایەخدانی بەمرۆڤ وەکوو هاوڵاتییەکی نێودەوڵەتی، بۆیە لە سنووری فەرەنسا چۆتە دەرەوە و سروشتێکی جیهانیی وەرگرتووە. بڕوانە: د. غازي حسن صباريني: الوجيز في حقوق الانسان و حرياته الاساسية، منشورات مكتبة دار الثقافة للنشر والتوزيع، ط٢، عمان، الاردن، ١٩٩٧ ص٣٩.

٣٨٨- دەقەکانی ئەم جاڕنامەیەم بەزمانی ئەڵمانی لەم سەرچاوەیەی خوارەوە وەرگرتووە:

Walter Grab [Hrsg.]: Die Franzosische Revolution Eine Dokumentation, Printed in West Germany, Mai 1989, PP47-50.

### ١- تاوتوێکردنی دەقەکانی جاڕنامەی شۆڕشی فەرەنسی:

لە ماددەی (١)ی ئەم جاڕنامەیەدا هاتووە: «مرۆڤ بەئازادی لەدایک دەبن و لە مافیشدا یەکسانن...»[٣٨٩]. لە ماددەی (٢)دا هاتووە «پاراستنی مافە سروشتییەکانی مرۆڤ ئامانجی هەموو کۆبوونەوە رامیارییەکانە و نابێ دەستدرێژیان بکرێتەسەر...»[٣٩٠]. هەروەها لە ماددەی (٤)دا هاتووە: «مرۆڤ هەمووی ئازادە و ئەو ئازادییەش هەموو کارێک دەگرێتەوە کە زیان بەکەس نەگەیەنێ...»[٣٩١]. هەروەها لە ماددەی (١١)دا هاتووە:«گۆڕینەوەی بیروڕا و بۆچوونەکان یەکێکە لە مافە بنەڕەتییەکانی مرۆڤ. ئەمەش واتە هەموو مرۆڤێک مافی ئەوەی هەیە ئەوەی دەیەوێ بیڵێ و بینووسێ و بڵاوی بکاتەوە، مەگەر لەو حاڵەتەدا نەبێ کە دەقی یاسایی رێگریێت بۆی»[٣٩٢].

دوای خوێندنەوەی ئەم دەقانە بۆمان دەردەکەوێ کە ئەنجوومەنی دامەزرێنەر لە داڕشتنی دەقەکانی ئەم جاڕنامەیەدا جیاوازییان نەکردووە لە نێوانی هاووڵاتییان و بیانییاندا بۆ سوود وەرگرتن بە ماف و ئازادییەکان. ئەمەشمان لە دەقی ماددەی (٢) بۆ بەدیار دەکەوێ. لە کاتێکدا یاسادانەری فەرەنسی لە پیادەکردنی ئازادیی رۆژنامەگەری جیاوازی کردووە لەنێوانی هاووڵاتییان و بیانییاندا ،هەروەکو لە باسکردنی دەرکردن و بڵاوکردنەوەی رۆژنامە و سانسۆری پێشینە لە یاسای فەرەنسیدا ئەوەمان بۆ بەدیار کەوت.

---

٣٨٩- ئەمەش دەقەکەیەتی بەزمانی ئەڵمانی:

"Dei Menschen sind und bleiben von Gburt frei und gleich in Rechten"

٣٩٠- ئەمەش دەقەکەیەتی بەزمانی ئەڵمانی:

"Das Ziel jeder politischen Vereinigung ist die Erhaltung der naturlichen und uneverauberlichen Menschenrchte. Diese Rechte sind Freiheit, Eigentum, Sicherheit und Widerstand gegen Unterdruckung"

٣٩١- ئەمەش دەقەکەیەتی بەزمانی ئەڵمانی:

"Die Freiheit bestcht darin , alles tun zu Konnen, Was einem anderen nicht schadet So hat die Ausubung der naturlichen Rechte eines jeden Menschen nur die Grenzen, die den anderen Gliedern der Gesellschaft den GenuB der gleichen Rechte sichern. Diese Grenzen Konnen allein durch Gesetz festgelegt werden"

٣٩٢- ئەمەش دەقەکەیەتی بەزمانی ئەڵمانی:

"Die freie Mitteilung der Gedanken und Meinungen ist eines der kostbarsten Menschenrechte. Jeder Burger kann also frei schreiben , reden , drucken unter Vorbehalt der Verantwortlichkeit fur den MiBbrauch dieser Freiheit in den durch Gesetz bestimmten Fallen"

هەروەها ئەنجوومەنی دامەزرێنەر لەم جاڕنامەیەدا مافە سروشتییەکانیان کردۆتە ئامانجی سەرەکی خۆیان، لە کاتێکدا هەموو مافێکی سروشتی قابیلی پەیڕەوکردن نییە، هەربۆیە لە هەموو وڵاتێکدا بەشێکی ئەو مافە سروشتییانە بەپێی فەلسەفەو سیستمی حوکمڕانییەکەیان بۆ ناو دەستوور و یاساکان گوێزراونەتەوە. ڕێکخستنی ئازادیی ڕۆژنامەگەریش هەروەها سنووردارکردنی ئەو ئازادییە لە ماددەی (٤) و (١١)ی هەمان جاڕنامەدا باشترین بەڵگەیە بۆ سنووردارکردنی ئەو ئازادییە کە لە بنەڕەتدا ئازادییەکی سروشتییە. دوای ئەوەی ناوەڕۆکی هەندێ لەو ماددانەی جاڕنامەی فەرەنسی کە تایبەت بوون بەئازادیی بەگشتی و ئازادیی ڕۆژنامەگەری بەتایبەتی ئاوتوێ کرد، ئێستاکە لە خوارەوە دەقی پێشەکییەکەی دەستووری فەرەنسی ساڵی ١٩٤٦ لەگەڵ هەندێ ڕاوسەرنج تۆمار دەکەین.

٢- دەقی پێشەکییەکەی دەستووری فەرەنسی ساڵی ١٩٤٦:

لە پێشەکی دەستووری فەرەنسی ساڵی ١٩٤٦دا هاتووە: «گەلی فەرەنسی بەشێوەیەکی ئاشکرا جەخت لەسەر ماف و ئازادییەکانی مرۆڤ و هاووڵاتی کە لە جاڕنامەی ساڵی ١٧٨٩ دا هاتووە، هەروەها ئەو پرنسیپە بنەڕەتییانەی کە لە یاساکانی کۆماریدا هاتوون دەکات»(٢٩٣).

ئەگەر بێت و سەرنجی ئەم پێشەکییە بدەین و لەگەڵ جاڕنامەی فەرەنسی ساڵی ١٧٨٩ بەراوردی بکەین، بۆمان دەردەکەوێ کە جاڕنامەی فەرەنسی جەختی لەسەر مافەکانی تاکەکەس کردووە، کەچی پێشەکییەکەی دەستووری ساڵی ١٩٤٦ جەختی لەسەر مافەکانی تاکەکەس و مافەکانی کۆمەڵ کردۆتەوە، هەروەها پشتی بەپرنسیپە ئابووری و

---

٢٩٣- ئەمەش دەقەکەیەتی بەزمانی فەرەنسی:

"Au lendemain de la victoire remportee par la peuples libree sur les regimes qui ont tente d.asservir et de degrader la personne humaine. le peuple francais proclame a nonveau que tout etre humain , sans distinction de race , de religion ni de croyance. possede des droits inalienables ■ sacres. Il reaffirme solennellement les droits et les libertes de l.homme et du citoyen consacres parla Declaration des Droits de 1789 et les principes fondamentaux reconnus par les lois de la Republique"

٢٩٤- د. غازي حسن صباريني: الوجيز في حقوق الانسان وحرياته الاساسية، سەرچاوەی پێشوو ل٣٨-٣٩.

کۆمەڵایەتی و رامیاری و رۆشنبیرییەکانیش بەستووە لەسەر ئەو بنچینەیەی کە جێگای بایەخی مرۆڤە وەک بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتی و چۆن مافی هەیە ئەوهاش ئەرکی لەسەر شانە[٣٩٤]. دوای ئەوەی ئەو چەند تێبینیانەی سەرەوەمان لەبارەی ناوەرۆکی جاڕنامەی ساڵی ١٧٨٩ و پێشەکییەکەی دەستووری ساڵی ١٩٤٦ تۆمار کرد، ئێنجا بابزانین ئەم جاڕنامەیە بەتایبەتی و پێشەکییەکەی دەستووری ساڵی ١٩٥٨ و پێشەکییەکەی دەستووری ساڵی ١٩٤٦ بەگشتی چ بەهایەکی یاساییان هەیە.

٣- سروشتی یاسایی جاڕنامەی فەرەنسی ساڵی ١٧٨٩ و پێشەکی هەردوو دەستووری ساڵی ١٩٤٦ و ١٩٥٨

بیروڕای یاسازانان لەبارەی سروشتی یاسایی جاڕنامەی فەرەنسی ساڵی ١٧٨٩ و پێشەکی هەردوو دەستووری ساڵی ١٩٤٦ و ١٩٥٨ لێک جیاوازە، هەندێک دەڵێن، پێشەکی دەستووری ساڵی ١٩٥٨ تێکرا، بەجاڕنامەی مافەکانی مرۆڤ و هاووڵاتیانی ساڵی ١٧٨٩ و پێشەکییەکەی دەستووری ساڵی ١٩٤٦ یشەوە هەمان هێزی یاسایی ئەو بنچینانەی دەبێت کە لە ناواخنی دەستوورەکەدا هەن[٣٩٥].

هەندێکیتر جیاوازی لە نێوان دوو جۆرە بنچینەو حوکم دەکەن کە لە پێشەکی دەستوورەکەدا هاتوون. جۆری یەکەمیان، ئەو بنچینە و حوکمانەن کە داندراون (القواعد الوضعية) و هەندێک باری یاسایی دیاریکراو (مراكز قانونية معينة) دروست دەکەن، بۆیە لەبەر ئەوە سیفەتی سەپاوێتی و هەمان هێزی یاسایی ماددەکانی دەستووری دەبێت. بەڵام جۆری دووەمیان، بریتین لەو بنچینە و حوکمە ناراستەکراوانەی کە گوزارشت لە هیوا و ئاوات و بەها باڵاکان (امال و مثل عليا) دەکەن و ڕواڵەتەکان (معالم)ی ئەو سیستەمە دەردەخەن کە دەبێ لە دەوڵەتدا سەروەر بێت. بەڕای ئەوان، ئەمجۆرە بنچینانەی دوایی سیفەتی سەپاوێتی و هێزی یاساییان نابێ چونکە روون و ئاشکرا نین[٣٩٦].

---

٣٩٥- اندريه هوريو: القانون الدستوري والمؤسسات السياسية، ترجمة علي مقلد واخرون، منشورات دار الاهلية للنشر والتوزيع، ج١، بيروت، لبنان، ١٩٧٧ ل١٩١-١٩٢، هەروەها د. غازي حسن صباريني: الوجيز في حقوق الانسان وحرياته الاساسية، سەرچاوەی پێشوو ل٣٩.

٣٩٦- د. احسان حميد المفرجي واخرون: النظرية العامة في القانون الدستوري والنظام الدستوري في العراق، دار الحكمة، بغداد، ١٩٩٠ ل٢١٤ نقلا عن ميثم حنظل شريف: التنظيم الدستوري والقانوني لحرية الصحافة في العراق، سەرچاوەی پێشوو ل٢٩.

شایەنی ئاماژەبۆکردنە، ئەنجوومەنی دەوڵەتی فەرەنسی (مجلس الدولة الفرنسي) پشتگیری ڕاوبۆچوونی یەکەمی کردوە و دەڵێ: «ئەم دادگا باڵایە پێی وانییە، دەسەڵاتی جێبەجێکردن بۆی هەبێ ڕزگاری بێت لە ڕێزگرتنی پێشەکییەکەی دەستوور. دەسەڵاتی جێبەجێکردن دەبێ ڕێز لەو پرنسیپە یاساییە گشتییانە بگرێت کە زۆربەیان لە پێشەکییەکە و لە دەستووردا دەقنووس کراون»[397].

لە کۆتاییدا، دوای ئاوتوێکردنی جاڕنامەی مافەکانی مرۆڤ و هاووڵاتی ساڵی ١٧٨٩ و پێشەکییەکەی هەردوو دەستووری فەرەنسی ساڵی ١٩٤٦ و ١٩٥٨ بۆمان دەردەکەوێ کە جاڕنامەی ناوبراو بەرلە دەقنووسکردنی لە پێشەکی دەستووری ساڵی ١٩٤٦ و دوایش لە پێشەکی دستووری ساڵی ١٩٥٨، تەنها جاڕێکی ڕامیاریی تایبەت بەماف و ئازادییەکانی مرۆڤ بوو، بەڵام دوایی، دوای دەقنووسکردنی لەم دوو پێشەکییانەدا، سروشتێکی یاسایی لە ئاستی دەستووردا وەرگرت و ئەو پرنسیپانەش کە لەخۆی گرتبوون، بوونە بەشێکی جیانەکراوە لەو دوو دەستوورە.

٤- دەقەکانی دەستووری عێراقی

دەستووری عێراقی ساڵی ١٩٧٠ی هەمووارکراو بەڕاشکاوییەوە ئاماژەی بەئازادیی ڕۆژنامەگەری نەکردووە و لە ڕێگای هیچ پرنسیپێکی تایبەتی و سەربەخۆوە ڕێکی نەخستووە، بەڵام لە ماددەی (٢٦)دا ڕاشکاوانە جەختی لەسەر کەفالەتکردنی ئازادیی ڕادەربڕین و بڵاوکردنەوە بەهەموو شێوازەکانییەوە - لەوانەش ئازادیی ڕۆژنامەگەری - کردووە و تیایدا هاتووە: «دەستوور کەفالەتی ئازادیی ڕادەربڕین و بڵاوکردنەوە و کۆبوونەوە و خۆپیشاندان و دامەزراندنی پارتەسیاسییەکان و سەندیکاکان و کۆمەڵەکان بەگوێرەی ئامانجەکانی دەستوور و لە چوارچێوەی یاسادا کردووە و دەوڵەت ئەرکی دەستەبەرکردنی پێداویستییەکانی مومارەسەکردنی ئەم ئازادییانە کە لەگەڵ ڕەوتی شۆڕشی نەتەوەیی پێشکەوتنخواز دەگونجێن لە ئەستۆی خۆی دەگرێت»[398].

---

٣٩٧- اندریة هوریو: القانون الدستوري والمؤسسات السیاسیة، سەرچاوەی پێشوو ل ١٩٢-١٩٣.

٣٩٨- ئەم دەقە وەکو دەقی ماددەی (١٢)ی یاسای بنەڕەتیی عێراقی ساڵی (١٩٢٥)، کە تیایدا هاتووە: «هەموو عێراقییەک ئازادیی ڕادەربڕین و بڵاوکردنەوە و کۆبوونەوە و دروستکردن و چوونەڕیزەوەی کۆمەڵەیان لە چوارچێوەی یاسادا هەیە» هەروەها وەکو دەقی ماددەی (١٠)ی دەستووری ساڵی (١٩٥٨)، کە تیایدا هاتووە: «ئازادیی بیروڕادەربڕین زامنە و بەیاسا ڕێک =

لەم دەقەدا ئەم تێبینیانەی خوارەوە دەکەین:

١- دەستووری عێراقی لە ڕێگای ئازادیی ڕادەربڕینەوە کەفالەتی ئازادیی ڕۆژنامەگەری کردووە و ئەرکی ڕێکخستنی ئەم ئازادییەشی بەیاسادانەر سپاردووە بۆ ئەوەی بەیاسایەکی ئاسایی ڕێکیبخات، بێئەوەی ئەو دەسەڵاتەی کە پێی داوە بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە بەهەندێک مەرجی ڕوون و ئاشکراوە ببەستێتەوە بۆ پاراستنی ئازادیی ڕۆژنامەگەری لە دەستدرێژی دەسەڵاتی یاسادانان و ئیدارە.

بێ گومان لەم حاڵەتەشدا دەسەڵاتی یاسادانەر و دەسەڵاتی ئیدارە زۆر فراوانە و هەمیشە دەتوانن لە ڕێگای سانسۆرکردنی ڕۆژنامەگەری و ئاگادارکردنەوە و ڕاگرتن و هەڵوەشاندنەوەی ڕۆژنامە بەڕێگای ئیداری هەڕەشە لە ئازادیی ڕۆژنامەگەری بکەن و ئەم دەقە دەستوورییە پووچەڵ بکەنەوە. بۆیە باشتروابوو یاسادانەری عێراقی وەکو یاسادانەری ئەمریکی، دەرکردنی ئەو یاسایانەی یاساغ کردبا کە ئازادیی ڕۆژنامەگەری سنووردار دەکات. یان وەکو دەستووری میسری و فەرەنسی دانانی سانسۆری پێشینەی یاساغ کردبا، هەروەها وەکو دەستووری میسری ڕێگای پێڕەوکردنی سیستمی ئاگاکاری و ڕاگرتن و هەڵوەشاندنەوەی لە ئیدارە بگرتبا.

بێ گومان، دەقنووسکردنی ئەم پرنسیپانە لە دەستووردا، دەسەڵاتی یاسادانەر سنووردار دەکات و ڕێگای لێ دەگرێ دەستدرێژی بکاتە سەر ئەو پرنسیپە بنەڕەتییانەی کە ئازادیی ڕۆژنامەگەری پشتی پێ دەبەستێ.

٢- ئەم ماددەیە ئازادیی ڕۆژنامەگەری بەدوو کۆتوبەند سنووردار کردووە. یەکەمیان، دەبێ ئازادیی ڕۆژنامەگەری بەگوێرەی ئامانجەکانی دەستوور مومارەسە بکرێ. دووەمیان،

---

=دەکرێ» هەروەها لە ماددەی (٣٠) لە دەستووری ساڵی ١٩٦٤دا هاتووە: «ئازادیی ڕۆژنامەگەری و چاپ و بڵاوکردنەوە لە چوارچێوەی یاسادا کەفالەت کراوە» بەپێی ئەم دەقەش، دەستووری ساڵی ١٩٦٤ یەکەم دەستوورە کە ئازادیی ڕۆژنامەگەری جیاواز لە شێوازەکانی تری ڕادەربڕین بەشێوەیەکی سەربەخۆ ڕێکیبخات. هەروەها دەستووری ساڵی ١٩٦٨ بۆ ڕێکخستنی ئازادیی ڕۆژنامەگەری هەمان ڕێگای دەستووری ساڵی ١٩٦٤ی گرتۆتەبەر و لە ماددەی (٣١)دا دەقنووسی کردووە: «ئازادیی ڕادەربڕین و توێژینەوەی زانستی کەفالەتکراوە و هەموو مرۆڤێک مافی ئەوەی هەیە کە گوزارشت لە ڕای خۆی بکات و بەقسە یان بەنووسین یان بەهەر ڕێگایەکی تر لە چوارچێوەی یاسادا بڵاوبکاتەوە» لە کاتێکدا لە ماددەی (٣٢)دا دەقنووسی کردووە: «ئازادیی ڕۆژنامەگەری و چاپ و بڵاوکردنەوە بەگوێرەی بەرژەوەندیی گەل و لەسەر بنەمای نیشتمانی لەچوارچێوەی یاسادا زامن و کەفالەتکراوە».

دەبێ مومارەسەکردنی ئازادیی ڕۆژنامەگەری لەگەڵ ڕەوتی «شۆڕشی نەتەوەیی پێشکەوتنخواز» بگونجێ.

بێ گومان، دەستنیشانکردنی ئامانجەکانی دەستوور و ڕەوتی شۆڕشی نەتەوەیی پێشکەوتنخواز کارێکی ئاسان نییە[399] چونکە ئامانجەکانی دەستوور زۆرن و ڕەوتی شۆڕشیش ڕوون و ئاشکرا نییە، بەڵام دەتوانین لەبەر ڕۆشنایی ڕەوتی دەستووری عێراقی لە پاراستنی بنەما کۆمەڵایەتییەکانی گەلی عێراق و ئامانجەکانی کە دەسەڵاتی سیاسی گوزارشتیان لێدەکات کە بریتین لە بەدیهێنانی دەوڵەتێکی عەرەبی یەکگرتووی سۆسیالیزم و سەروەری و یەکپارچەیی خاکی عێراق و زامنکردنی مافە ڕەواکانی ئەو نەتەوە و کەمەنەتەواییانەی کە گەلی عێراقیان لێ پێکهاتووە، سنووری ئازادیی ڕۆژنامەگەری و ئازادییە گشتییەکانی تر بەپێی ماددەی (٣٦)ی دەستوور دەستنیشان بکەین کە تیایدا هاتووە:

«هەموو چالاکییەک کە لەگەڵ ئامانجەکانی گەل کە لەم دەستوورەدا دەستنیشان کراوە ناکۆک بێت، لەگەڵ هەموو کارێک یان کردەوەیەک مەبەستی پارچەکردنی یەکێتیی نیشتمانیی جەماوەر یان وروژاندنی نەعرەی ڕەگەزپەرستی یان تایەفەگەری یان ناوچەگەری بێت لە نێوان ڕیزەکانی گەل یان مەبەستی دەستدرێژیکردنە سەر دەسکەوتەکانی پێشکەوتنخواز بێت، پاساغ دەکرێ».

٣- ماددەی (٢٦) بەشێوەیەکی گشتی کەفالەتی ئازادیی ڕادەربڕینی کردووە و تایبەتی نەکردووە بەهاووڵاتییانی عێراقی، لەمەشدا وەکو دەستووری میسری و لوبنانی و فەرەنسی یە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە ئەو کەسەی عێراقییش نەبێت بۆی هەیە لە عێراقدا مومارەسەی ئازادیی ڕۆژنامەگەری بکات بەمەرجی مامەڵەکردنی هاوچەشن و

---

٣٩٩- هەرچەندە دەستوور بەشێوەیەکی گشتی ئامانجی ڕێکخستنی چۆنێتی مومارەسەکردنی دەسەڵاتی سیاسی و دەستاودەستکردنی ئەو دەسەڵاتە و ڕێکخستنی پەیوەندی نێوان دەسەڵاتە گشتییەکان و دەستنیشانکردن و زامنکردنی ماف و ئازادییە گشتییەکانی تاکەکانی کۆمەڵە، بەڵام سەرەڕای ئەمە هەندێک ئامانجی تریشی هەیە.

دەستووری عێراقی ساڵی ١٩٧٠ هەروەکو لە دەقی ماددەی (١)دا دەقنووسی کردووە «ئامانجی سەرەکی بەدیهێنانی دەوڵەتێکی عەرەبی یەکگرتووە لەگەڵ پێڕەوکردنی سیستمی سۆسیالیزمی»، هەروەها «پاراستنی سەروەریی عێراق و یەک پارچەیی خاکەکەی» هەروەکو لە ماددەی (٣)دا هاتووە.

وەرگرتنی ڕەزامەندیی وەزارەتی دەرەوە و پشتگیریکردنی قونسڵی وڵاتەکەی و بوونی ئەو مەرجانەش تیایدا کە لە یاسای وڵاتەکەیدا هەیە[400].

٤- دەستووری عێراقی بۆ ئاسانکاری پتەوکردنی ئازادیی ڕۆژنامەگەری، ئەرکی دەستەبەرکردنی پێداویستییەکانی ڕۆژنامەگەری خستۆتە ئەستۆی دەوڵەت، هەروەکو لە دەستەواژەی «دەوڵەت ئەرکی دەستەبەرکردنی پێداویستییەکانی مومارەسەکردنی ئەم ئازادییانە کە لەگەڵ ڕەوتی شۆڕشی نەتەوەیی پێشکەوتنخواز دەگونجێن لە ئەستۆی خۆی دەگرێت» کە لە دەقی ماددەی (٢٦)دا هاتووە، بۆمان دەردەکەوێ.

ئەوەی شایەنی باسە، یاسادانەری عێراقی لە ساڵی ١٩٩٠ پرۆژەیەکی بۆ دەستووری هەمیشەیی عێراق گەڵاڵە کرد و تیایدا ئازادیی ڕادەربڕین و ئازادیی ڕۆژنامەگەری لە ماددەی (٥٣) و (٥٤)دا ڕێکخستووە. لە ماددەی (٥٣)دا ئازادیی ڕادەربڕینی بەشێوەیەکی گشتی زامن کردووە و دەڵێ: «ئازادی هزر و ڕادەربڕین بەکەناڵەکانی ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندنەوە زامنە و مومارەسەکردنی ئەم ئازادییانە یاسا ڕێکی دەخات».

لەکاتێکدا ماددەی (٥٤) ئازادیی ڕۆژنامەگەری بەشێوەیەکی تایبەتی و سەربەخۆ زامن کردووە و دەڵێ: «ئازادیی ڕۆژنامەگەری و چاپ و بڵاوکردنەوە زامنەو مومارەسەکردنی ئەم ئازادییە یاسا ڕێکی دەخات و سانسۆریش لەسەر ڕۆژنامە و دانراوەکان (مصنفات) دانانرێ مەگەر بەپێی حوکمەکانی یاسا نەبێت»[401].

هەروەها، پەرلەمانی کوردستان، پرۆژەیەکی بۆ دەستووری کۆماری فیدراڵی عێراق و دەستووری هەرێمی کوردستانی عێراق داناوە و لە ماددە (١٨)ی پرۆژەی دەستووری کۆماری فیدراڵی عێراقدا، ئازادیی ڕۆژنامەگەری لە چوارچێوەی یاسادا کەفالەت کردووە و تیایدا هاتووە: «ئازادیی ڕادەربڕین و چاپ و بڵاوکردنەوە و ڕۆژنامەگەری و کۆبوونەوە و خۆپیشاندان و مانگرتن و دامەزراندنی پارتی سیاسی و سەندیکا و کۆمەڵەکان لە چوارچێوەی یاسادا کەفالەت کراوە».

بەهەمان شێوە، لە ماددە (١٦)ی پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستانی عێراقدا،

---

٤٠٠- بڕوانە دەقی ماددەی (٨) لە یاسای چاپەمەنیی عێراقی ژمارە (٢٠٦)ی ساڵی ١٩٦٨ی هەموارکراو، لە خاڵی (٣-٢-٥) لەم تێزەدا.

٤٠١- بڕوانە: نص مشروع دستور جمهورية العراق، منشورات دار الثورة للصحافة والنشر، بغداد، ١٩٩٠.

کەفالەتی ئازادیی ڕۆژنامەگەری کردووە و تیایدا هاتووە: «ئازادیی ڕادەربڕین و چاپ و بڵاوکردنەوە و ڕۆژنامەگەری و مافی کۆبوونەوە و خۆپیشاندان و مانگرتنی ئاشتییانە و دامەزراندنی پارت و کۆمەڵە و سەندیکاکان کەفالەت کراوە و بەپێی یاسا ڕێک دەخرێن»[٤٠٢].

لە کۆتاییدا، دوای لێکۆڵینەوەی دەقەکانی دەستووری میسری و لوبنانی و فەرەنسی و بەراوردکردنیان لەگەڵ دەقەکانی دەستووری عێراقیدا، بۆمان دەردەکەوێ کە ناکرێ ئازادیی ڕۆژنامەگەری لە ڕێگای دەقەکانی دەستوورەوە بەتەواوەتی زامن بکرێ، مەگەر پرنسیپ و ڕەگەزە بنەڕەتییەکانی ئازادیی ڕۆژنامەگەری بەڕاشکاوییەوە لە ناو دەستووردا دەقنووس بکرێ. بۆیە بۆ یاسادانەری عێراقی پێشنیار دەکەین کە بەڕاشکاوییەوە ئازادیی ڕۆژنامەگەری لە دەستووردا کەفالەت بکات و ئەو کردارانەش یاساغ بکات کە دەبنە کۆسپ لەبەردەمیدا و سنوورداری دەکەن، بۆیە ئەم دەستەواژەی خوارەوە بۆ ئەم مەبەستە پێشنیار دەکەین: «ئازادیی ڕۆژنامەگەری کەفالەت کراوە بێ سانسۆرکردن و ئاگادارکردنەوە و ڕاگرتن و هەڵوەشاندنەوەشی بەڕێگای ئیداری یاساغە».

**دووەم**: پاراستنی دادگەری

دادگا ڕۆڵێکی گرنگی هەیە لە پاراستن و داکۆکیکردن لە ماف و ئازادییە گشتییەکان - بەئازادیی ڕۆژنامەگەریشەوە - ئەگەر بێت و سەربەخۆییەکەی بۆ زامن بکرێت، بۆ ئەوەی بتوانێ بەبێلایەنی و بەباشترین شێوە چاودێری دەستووریتیی یاساکان و ڕەوایەتیی ئەو بڕیارانە بکات کە ئیدارە دەریان دەکات.

کەواتە، مرۆڤ لە هەموو شتێک زیاتر پێویستی بەدادگایەکی ئازاد و سەربەخۆ هەیە بۆ پاراستن و داکۆکیکردن لە مافەکانی بەمافی ئازادیی ڕۆژنامەگەریشەوە. بۆیە، ئەو بڕیار و حوکمانەی کە دادگا دەریان دەکات، دادپەروەر نابن، ئەگەر بێت و ئەو دادگایانەی کە دەریان دەکەن ئازاد و سەربەخۆ نەبن. کەواتە، ئەگەر دادپەروەریی بنچینەی مڵکداری بێت، ئەوا سەربەخۆیی دادگا بنچینەی دادپەروەرییە[٤٠٣].

---

٤٠٢- بۆ دەقی هەردوو پڕۆژەی دەستووری کۆماری فیدرالی عێراقی و دەستووری هەرێمی کوردستانی عێراقی بڕوانە: ڕۆژنامەی «وەقایعی کوردستان» ژمارە ٣٨ سالی سێیەم ٢٠٠٢/١٢/٣٠.

٤٠٣- سردار یاسین حمدامین: استقلال السلطة القضائية بين النظرية والتطبيق، رسالة ماجستير، كلية القانون والسياسة جامعة صلاح الدين - اربيل، ٢٠٠١ ل٧١.

کەواتە، سەربەخۆیی دادگا و چاودێری دادگەری باشترین زامنن بۆ ئەو کەسەی کە مومارەسەی ئازادیی ڕۆژنامەگەری دەکات، لە ڕووبەڕوو بوونەوەیدا لەگەڵ ئیدارەدا کاتێک کە ئیدارە دەستدرێژی دەکاتە سەر ئەو ئازادییە و سنووری فەرمانی خۆی و پرنسیپی ڕەوایی (مەشروعییەت) دەبەزێنێت.

بۆ لێکۆڵینەوەی ئەم بابەتە، لە خوارەوە لە دوو خاڵدا لێی دەکۆڵینەوە. خاڵی یەکەم تەرخان دەکەین بۆ باسکردنی سەربەخۆیی دادگا و خاڵی دووەمیش بۆ باسکردنی چاودێری دادگەری، بەم شێوەیەی خوارەوە:

## ١- سەربەخۆیی دادگەری

مەبەستمان لەمە سەربەخۆیی دەسەڵاتی دادگەرییە بەچەشنێک لە یاسا بەولاوە هیچ دەسەڵاتێکی تری بەسەرەوە نەبێت. واتە دەبێ دادوەران ئازادبن لە یەکلاکردنەوەی ئەو کێشانەی بۆیان بەرز دەکرێتەوە بێ ئەوەی بکەونە ژێر کاریگەریتیی هیچ کەس و هیچ لایەنێک. ئاشکرایە، دادگا لەو وڵاتانەدا سەربەخۆ دەبێ کە تێیاندا هەر یەکێک لە سێ دەسەڵاتە گشتییەکە (یاسادانان، ڕاپەڕاندن، دادوەری) لێک جیاواز و سەربەخۆبن. هەرچەندە لێکجیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان پرنسیپێکی گرنگە بۆ ڕێگاگرتن لە ستەمکاری (استبداد)، بەڵام ئەزموون و پێشکەوتنە کۆمەڵایەتی و ڕامیارییەکان بۆیان سەلماندووە کە مەحاڵە بەشێوەیەکی ڕەهایی دەسەڵاتەکان لەیەکتری جیا بکرێنەوە. بۆیە جۆرە چاودێرییەک لە نێوان دەسەڵاتی جێبەجێکردن و دەسەڵاتی یاسادانان دانی پێدانرا، کەچی هەموو ڕژێمەکان کۆکن لەسەر ئەوەی کە دەبێ دەسەڵاتی دادوەری سەربەخۆ بێت وەک گرەنتییەک بۆ بێلایەنی و خاوێنی و سەرپەرشتیکردنی مافی ئەو کەسانەی لەبەردەمیدا داوەری دەکرێن[٤٠٤].

گومانی تێدا نییە، ژیانی مرۆڤ بەئازادی لەناو کۆمەڵدا لە هەموو شتێک زیاتر پێویستی بەسەربەخۆیی دادگەری هەیە، چونکە سەربەخۆیی دادوەری باشترین پاڵپشتە بۆ سەروەریی یاسا و زامنبوونی ماف و ئازادییە گشتییەکان بەئازادیی ڕۆژنامەگەرییشەوە، بۆیە جاڕی جیهانیی مافەکانی مرۆڤ و ڕێککەوتننامە و پرۆتۆکۆلە نێودەوڵەتییەکان و دەستووری وڵاتان بایەخێکی زۆریان پێی داوە، هەروەها بایەخیان بەدەستەبەرکردنی ئەو گرێنتی و مەرجانە داوە کە کەفالەتی بوونی دادگای سەربەخۆ دەکەن.

---

٤٠٤- د.جیهان مکاوي: حریة الفرد وحریة الصحافة، سەرچاوەی پێشوو، ل٣٢.

جاڕی جیهانیی مافەکانی مرۆڤ لە ماددەی (١٠)دا جەختی لەسەر سەربەخۆیی دادگا کردۆتەوە و دەقنووسی کردووە: «هەموو کەس مافی تەواوی هەیە کە لەبەردەم دادگایەکی سەربەخۆ و بێ لایەندا بەئاشکرا و بەیەکسانی گوێی لێ بگیرێت بۆ دیارکردنی ماف و ئەرکەکانی و بەرگریکردن لەخۆی دژ بەهەر تۆمەتێک کە دراپێتە پالی»[٤٠٥]. هەروەها بەڵێننامەی نێودەوڵەتیی تایبەت بەمافە مەدەنی و سیاسییەکانی ساڵی ١٩٩٦ جارێکی تر جەختی لەسەر ئەم پرنسیپە و سەربەخۆیی دادگا کردۆتەوە و لە ماددەی (١٤) برگەی (١)دا دەقنووسی کردووە: «هەموو کەسێک، لەبەردەم یاسادا یەکسانە و مافی ئەوەی هەیە لە کاتی سەیرکردنی هەر تۆمەتێکی گوناهبارکارانەی دژ بەو یان بەماف و ئەرکەکانی، لە کێشەیەکی یاساییدا، بدرێتە دادگایەکی تایبەتمەند و سەربەخۆ و بێ لایەن بەپێی یاسای دامەزراو، کە بەئاشکرا و دادپەروەرانە دادگایی بکات..»[٤٠٦].

دەستووری زۆربەی وڵاتانی دنیا، بەشێوەیەک لە شێوەکان، جەختیان لەسەر سەربەخۆیی دادگا کردۆتەوە. بۆ نموونە، دەستووری وڵاتە عەرەبییەکان هەموویان دەنووسن «دادوەران تەنها پابەندی یاسا دەبن» و هیچ دەسەڵاتێک بۆی نییە دەست لە کاروباری دادگا وەربدات، یان دەنووسن «دەسەڵاتی دادوەری سەربەخۆیە». ئەم دەقانە بەدەستەواژەیەکی گشتی داڕێژراون، وا خۆیان پیشان دەدەن گوایا ئاماژە بەجاڕدانی پرنسیپێک دەدەن، کەچی هەوڵی دەستەبەرکردن و دابینکردنی گرەنتییەکی کاریگەر نادەن، چونکە هەر هەموو ئەو دەستوورانە ئەرکی ڕێکخستن و جێبەجێکردنی ئەم پرنسیپانە بەیاسا دەسپێرن[٤٠٧].

---

٤٠٥- ئەمەش دەقەکەیەتی بەزمانی ئینگلیزی:

"Everyone is entitled in full equality to a fair and public hearing by an independent and impartial tribunal, in the determination of his rights and obligations and of any criminal charge against him"

٤٠٦- ئەمەش دەقەکەیەتی بەزمانی ئینگلیزی:

All persons shall be equal before the courts and tribunals ."In the determination of any criminal charge against him, or of his rights and obligations in a suit at law, everyone shall be entitled to a fair and public hearing by a competent, independent and impartial tribunal established by law"

٤٠٧- فاتح سميع عزام: الحقوق المدنية والسياسية في الدساتير العربية. مجلة (المستقبل العربي) يصدرها (مركز دراسات الوحدة العربية)، العدد (٢٧٧)، السنة الرابعة والعشرون، اذار- مايس٢٠٠٢.

هەرچەندە ئێمە ناتوانین لە توێژینەوەیەکی وادا تیشک بخەینە سەر گشت ئەو دەقە دەستوورییانە، بەڵام، لە خوارەوە دەقی هەندێک لەو ماددانەی دەستووری میسری و لوبنانی و فەرەنسی و عێراقیدا دەخەینە ڕوو.

دەستووری میسری ساڵی ١٩٧١ لە بابی پێنجەم کە تایبەتە بە(سیستمی حوکمڕانێتی) فەسڵی چوارەمی تەرخان کردووە بۆ (دەسەڵاتی دادوەری) و لە ماددەی (١٦٥)دا دەقنووسی کردووە: «دەسەڵاتی دادوەری سەربەخۆیە، دادگا بەگشت جۆر و پلەکانیانەوە پێی هەڵدەستن و حوکمەکانی بەپێی یاسا دەردەکات».

دەستووری لوبنانی ساڵی ١٩٢٦ بایەخی بەسەربەخۆیی دادگا داوە و لەم ڕووەوە جەختی لەسەر بوونی دادگایەکی سەربەخۆ بۆ ڕاپەڕاندنی کاری دادوەری و زامنکردنی کردووە. بۆ ئەم مەبەستە لە ماددەی (٢٠)دا دەقنووسی کردووە: «دەسەڵاتی دادوەری، دادگاکان بەگشت جۆر و پلە و تایبەتمەندێتییەکانیان لە چوارچێوەی سیستمێک کە یاسا دیاریدەکات پێی هەڵدەستن و بەپێی ئەو سیستمە زامنکردنی پێویست بۆ دادوەران و لایەنەکانی داوا (اطراف الدعوى) پارێزراوە. بەڵام سەبارەت بەمەرج و سنوورەکانی زامنکردنی دادوەری، یاسا دیاریدەکات. دادوەرانیش سەربەخۆن لە ڕاپەڕاندنی کارەکانیاندا و بڕیار و حوکمەکانیش لەلایەن دادگاکانەوە بەناوی گەل دەردەچن و جێبەجێ دەکرێن». دەستووری فەرەنسی ساڵی ١٩٥٨ لەم ڕووەوە هەنگاوێکی زیاتری بۆ پێشەوە ناوە و ئەرکی زامنکردنی سەربەخۆیی دادگای بەسەرۆکی وڵات سپاردووە و بۆ ئەم مەبەستە لە ماددەی (٦٤)دا دەقنووسی کردووە:

«سەرۆک کۆمار سەربەخۆیی دەسەڵاتی دادوەری زامن دەکات.

- ئەنجوومەنی باڵای دادوەری هاریکاری دەکەن.
- بەیاسایەکی بنەڕەتی سیستمی دادوەری دەستنیشان دەکرێ.
- دادوەران دەستیان لە کار ناکێشرێتەوە»[408].

بەڵام سەبارەت بەهەڵوێستی یاسادانەری عێراقی لە بارەی سەربەخۆیی دادگاوە، لە

408- ئەمەش دەقەکەیەتی بەزمانی فەرەنسی:

Le President de la Republique est garant de l. independence de l. autorite judiciaire

Il est assiste par le Conseil superieur de la Magistrature. Une loi organique du siege sont inamovibles. Les magistrats du siege sont inamovibles

کەرانەوەماندا بۆ یاسای بنەڕەتیی عێراقی ساڵی ۱۹۲۵ و دەستووری ساڵی ۱۹۵۸ و دەستووری ساڵی ۱۹٦۳ و دەستووری ساڵی ۱۹٦٤ و دەستووری ساڵی ۱۹٦۸ و تا دەگاتە دەستووری ساڵی ۱۹۷۰، دەبینین، ئەو دەستوورانە گشتیان جەختیان لەسەر سەربەخۆیی دادگا و زامنکردنی کردووە.

دەستووری ساڵی ۱۹۷۰ لە ماددەی (٦۳) لە برگەی (أ)دا دەقنووسی کردووە: «دادگا سەربەخۆیە و لە یاسا بەولاوە هیچ دەسەڵاتێکی تری بەسەرەوە نییە»[٤٠٩].

بەڵام سەبارەت بەهەڵوێستی یاسادانەری هەرێمی کوردستانی عێراق لە بارەی سەربەخۆیی دادگاوە، لە ماددەی یەکەمی یاسای دەسەڵاتی دادوەری ژمارە (١٤)ی ساڵی ۱۹۹۲ دا بڕیاری سەربەخۆیی دادگای داوە و تیایدا هاتووە: «دادگا سەربەخۆیە و جگە لە یاسا هیچ سەروەرێکی تری نییە و نابێ هیچ دەسەڵاتێک یا کەسێک دەست لە سەربەخۆیی دادوەری و کاروباری دادگەری وەربدات».

بەم پێیە، لەو وڵاتانەی کە تیایاندا، دادگا سەربەخۆیە، دادوەران لە کارەکانیاندا ئازادن و لە یاسا بەولاوە ملکەچی هیچ دەسەڵاتێکی تر نابن و ئامانجیشیان تەنها بەدیهێنانی دادپەروەرییە لە نێوان لایەنەکانی کێشە، بێ گوێدانە ئەوەی، ئەو لایەنە حکوومەتە یان تاکێکە لە تاکەکانی کۆمەڵ و چ تاکێکە؟ کەواتە، ڕۆژنامەنووس وەکو هەر کەسێکی ئاسایی بەشی لە ماف و ئازادییە گشتییەکان هەیە و بۆی هەیە لە چوارچێوەی یاسا و بەبەرپرسیارێتییەوە سومارەسەیان بکات و بەهەر شێوازێکی گوزارشتکردن گوزارشتیان لێ بکات، بێ گوێدانە ئەوەی ئایا حکوومەت ڕازییە لەسەر ئەو ڕاوبۆچوونەی یان نا؟

حکوومەتیش هیچ ئیمتیازی لە تاکەکانی کۆمەڵ زیاتر نییە و لە حاڵەتی بەکارهێنانی ئەم ئازادییە لە لایەن ڕۆژنامە و ڕۆژنامەنووسانەوە، بەخراپی، بۆی هەیە پەنا بباتە بەر دادگا و داوای بۆ بەرز بکاتەوە.

---

٤٠٩- پرۆژەی دەستووری عێراقی ساڵی ۱۹۹۰ لە ماددەی (٦۹)دا دانی بەسەربەخۆیی دادگا دانا وە و دەقنووسی کردووە: «لە یاسا بەولاوە هیچ دەسەڵاتێک بەسەر دادگاوە نییە و دەست تێوەردانە ناو کاروبارەکانی دادوەری یاساغە و دادوەران ئازادن لە بڕیاراندا بۆ ئەوەی ئەرکی دادوەرانەیان بەباشترین شێوە ڕاپەڕێنن».

هەروەها لە ماددە (٥۷)ی پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستانی عێراق کە پارتی دیموکراتی کوردستان لە ساڵی ۲۰۰۲ دایناوە هاتووە: «دادگا سەربەخۆیە و لە یاسا بەولاوە هیچ دەسەڵاتێکی تری بەسەرەوە نییە».

بێ گومان دەزگایەکی دادوەری خاوێنمان نابێت ئەگەر دادوەران لە پیش وکارەکانیاندا سەربەخۆ و بێلایەن نەبن لە بینینی ئەو کێشانەی کە لەلایەن هاوولاتییان یان حکوومەتەوە بۆیان بەرز دەبێتەوە، چونکە سەربەخۆیی دادگا و بێلایەنیی دادوەران وادەکات کە شوێنێکی دیاری هەبێت لە دڵ و دەروونی هاوولاتییان و کۆڵەکەکانی یاسا بچەسپێنێت و هەست کردنیش بەدادپەروەری و دڵنەوایی و سەقامگیریش بڵاوبکاتەوە(٤١٠).

لە کۆتاییدا، دەتوانین بڵێین، سەربەخۆیی دادگەری زەمانەتێکی گرنگە بۆ ئازادیی رۆژنامەگەری ئەگەر دەوڵەت کەفالەتی بکات، بەپێچەوانەشەوە دەقنووسکردنی لە ناو یاسا و دەستووردا هیچ بایەخی نابێت ئەگەر بێت و کاری پێ نەکرێت و بەکردەوە پیادە نەکرێت.

بۆیە سەرەڕای دەقنووسکردنی ئەم دوو پرنسیپە لە ناو دەستوور و یاسای ولاتانی رۆژهەلاتی ناوەڕاست، هێشتا تێیاندا دەسەلاتی دادوەری سەربەخۆ نییە، چونکە تاکو ئێستا حوکمڕانانی زۆربەی دەوڵەتانی ئەم ناوچەیە بەتەواوەتی باوەڕیان بەدیموکراسییەت و مافی مرۆڤ نییە و لە هێز بەولاوە مانای هیچ شتێکی تر نازانن بۆ وەرگرتن و پاراستنی دەسەلات، بۆیە هیچ کاتێک ئامادەنین گوێ لە راوبۆچوونی جیاواز بگرن.

۲- چاودێری دادگەری

دادگا رۆڵێکی گرنگی هەیە لە پاراستنی ئازادیی رۆژنامەگەری و گرێنتییەکی گرنگە لە گرێنتییەکانی ئەم ئازادییە، چونکە مومارەسەکردنی ئەم ئازادییە پەیوەندییەکی بەهێزی بەدەسەلاتە گشتییەکانەوە بەگشتی و دەسەلاتی جێبەجێکردن بەتایبەتی هەیە لەبەر ئەو رۆڵەی کە رۆژنامەگەری وەک دەسەلاتێکی جەماوەری و وەک چاودێرێک لەناو کۆمەڵدا هەیەتی، بۆیە ئەمە وادەکات کە ئەم ئازادییە لە دەستدرێژیی دەسەلاتی جێبەجێکردن و دەسەلاتی یاسادانان بەدوور نەبێت. دەسەلاتی یەکەمیان لە رێگای دەرکردنی هەندێک بڕیاری ناڕەوا و دەسەلاتی دووەمیشیان لەرێگای دەرکردنی هەندێک یاساوە ڕەنگە ئەم ئازادییە سنووردار بکەن یان لەدەستی بدەن.

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە دانپێدانان و دەقنووسکردنی ئەم ئازادییە بەتەنها لە

٤١٠- د. سامي جمال الدين: الرقابة علي اعمال الادارة، منشورات منشأة المعارف بالاسكندرية، ط١، ١٩٨٢، ل٢٤٤.

دەستوور و یاسادا سوودێکی ئەوتۆی نابێت ئەگەر بێت و چاودێری دادگەری بۆ دەستەبەر نەکرێت بۆ داکۆکیکردن و پاراستنی لەم دەستدرێژییانەی دەسەڵاتی جێبەجێکردن و یاسادانان‌اندا، هەروەکو «کۆلیار» دەڵێ: «چاودێری دادگەری گیانی ئازادیی رۆژنامەگەرییە، ئەو ئازادییەی کە تەنها پێویستی بەدەقێک نییە کە دانی پێدا بنێت، بەڵکو پێویستیشی بەدادگایەکی دادپەروەرە بۆ یەکلاکردنەوەی ئەو کێشانەی کە لە ئاکامی جیاوازی بیر و بۆچوونەکانی لەگەڵ دەسەڵاتدا روو دەدەن، بۆیە بەبێ بوونی ئەم چاودێرییە و سەپاندنی سزا کە لە ئاکامی سەرپێچیکردنی دەقەکانی دەستوور لەلایەن دەسەڵاتە گشتییەکانی دەوڵەتەوە دێتە کایەوە، پرنسیپی رەوایی هیچ بایەخێکی نابێت»[٤١١].

لە حاڵەتی دەرچوونی دەسەڵاتی یاسادانان لە دەقەکانی دەستوور و دەرچوونی دەسەڵاتی جێبەجێکردن لە حوکمەکانی دەستوور و یاسادا، دادگا بەمەبەستی پاراستنی ئازادیی رۆژنامەگەری بەدوو شێوە مومارەسەی ئەم چاودێرییە دەکات، یەکەمیان، چاودێری دەستووریتیی یاساکانە، و دووەمیشیان، چاودێری شەرعییەتی بڕیارەکانی ئیدارەیە.

لە خوارەوە لە دوو خاڵدا باسی ئەم بابەتە دەکەین، خاڵی یەکەم تەرخان دەکەین بۆ لێکۆڵینەوە لە چاودێری دادگەری لەسەر دەستووریتیی یاساکان و خاڵی دووەمیش تەرخان دەکەین بۆ چاودێری دادگەری لەسەر شەرعییەتی بڕیارەکانی ئیدارە بەم شێوەیەی خوارەوە:

أ - چاودێری دادگەری لەسەر دەستووریتیی یاساکان

ئەم چاودێرییە بریتییە لە هەستانی دادگا بەچاودێریکردن لەسەر دەستووریتی ئەو یاسایانەی کە دەسەڵاتی یاسادانان بۆ رێکخستنی ئازادیی رۆژنامەگەری دەریان دەکات بۆ ئەوەی بەدەری بخات کە تا چ رادەیەک گونجاوە یان ناکۆکە لەگەڵ پرنسیپ و حوکمەکانی دەستوور. ئەگەر هاتوو یاسادانەر لە سنووری ئەو پرنسیپ و حوکمە دەستوورییانە چووە دەرەوە کە بۆ رێکخستنی ئازادیی رۆژنامەگەری داندراوە، لە دەسەڵاتی یاسادانانندا بەلادەر دادەندرێت[٤١٢].

ئەم چاودێرییە رۆڵێکی گەورەی هەیە لە زامنکردنی ئازادیی رۆژنامەگەریدا لە رێگای

---

٤١١- عبدالرحمن احمد حسين المختار: حرية الصحافة و تنظيمها الدستوري والقانوني في اليمن، رسالة ماجستير كلية القانون جامعة بابل، ٢٠٠٢، ل٣٤.

٤١٢- عبدالرحمن احمد حسين المختار: حرية الصحافة وتنظيمها الدستوري والقانوني في اليمن. سەرچاوەی پێشوو ل٣٥.

دەستەیەکی تایبەتمەندەوە کە دەستوور دەسەڵاتی چاودێریکردنی لەسەر دەستووریتیی یاساکان پێ بەخشیوە، چونکە ئەرکی ڕێکخستنی ئەم ئازادییە و دیارکردنی سنوورەکەی بەیاسادانەر سپێردراوە و دەبێ سەرپێچی ئەو پرنسیپ و حوکمە دەستوورییانە نەکات کە کەفالەتی ئازادیی ڕۆژنامەگەرییان کردووە، چونکە لادانی لەو پرنسیپ و حوکمانەدا دەبێتە مایەی هەڵوەشاندنەوەی ئەو یاسایانەی کە ئەم ئازادییەیان ڕێکخستووە[٤١٣].

وڵاتان هەموو وەکو یەک نین لە پەیڕەوکردنی شێوازێکی دیاریکراو بۆ چاودێریکردن لەسەر دەستووریتیی یاساکاندا، بەڵکو لێک جیاوازن. بەپێی دەستووری هەندێکیان ئەم ئەرکە بەدەستەیەکی دادگەریی تایبەت سپێردراوە، بەڵام هەندێکی تریان ئەم ئەرکە بەبەرزترین دادگای وڵات دەسپێرن.

لە نێوان ئەو دوو شێوازەدا، شێوازێکی تریش هەیە، کە بریتییە لە سپاردنی ئەم ئەرکە بەدادگاکانی وڵات بێ گوێدانە جۆرەکەی، ئایا ئەو دادگایە دادگایەکی ئاساییە یان ئیدارییە یان دادگایەکی مەدەنییە یان سزاییە. ئەم دادگایانە هەر هەموویان پێکەوە نوێنەرایەتی دەسەڵاتی دادوەری دەکەن و پێکەوە بەم ئەرکە هەڵدەستن[٤١٤].

لەبەر ڕۆشنایی ئەمەی سەرەوەدا، لە چوار خاڵدا لە ڕۆڵی چاودێری دادگەری لەسەر دەستووریتیی یاساکان لە یاسای عێراقی و یاساکانی بەراوردا دەکۆڵینەوە بەم شێوەیەی خوارەوە:

١- چاودێری دادگەری لەسەر دەستووریتیی یاساکان لە دەستووری میسریدا

دەستووری میسری ساڵی ١٩٧١ ئەرکی چاودێریکردنی دەستووریتیی یاساکانی بەدادگای باڵای دەستووری سپاردووە، هەروەکو لە دەقی ماددەی (١٧٥)دا هاتووە: «تەنها دادگای باڵای دەستووری، کاری چاودێریکردن لەسەر دەستووریتیی یاساکان و لێکدانەوەی دەقە یاساییەکان بەو شێوەیەی کە لە یاسادا دیار کراوە دەکات».

---

٤١٣- میثم حنظل شریف: التنظیم الدستوري والقانوني لحریة الصحافة في العراق، سەرچاوەی پێشوو ل٣٧.

٤١٤- بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە:

د. سامي جمال الدین: الرقابة علی اعمال الادارة، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٤٤، د. رمضان ابو السعود و د. همام محمد محمود: المدخل الی القانون، دار المطبوعات الجامعیة، اسکندریة، ١٩٩٧، ل٢٦٥.

ئینجا لە ماددەی (١٧٦)دا چۆنێتی دامەزران و مومارەسەکردنی دەسەڵاتی ئەم دادگایەی بەیاسا سپاردووە[٤١٥].

بەم پێیە، بەپێی ئەو ماددەیەی سەرەوە، یاسادانەری میسری یاسای دادگای باڵای دەستووریی ژمارە (٤٨)ی ساڵی ١٩٧٩ی دەرکرد و لە مادده (٢٩)ی ئەم یاسایەدا دەسەڵاتەکانی دادگای ناوبراوی بۆ چاودێریکردنی دەستووریتیی یاساکان بەم شێوەیەی خوارەوە دیارکردووە:

١- دادگای باڵای دەستووری چاودێریکردنی دەستووریی یاساو ڕێساکان دەکات، ئەگەر هاتوو یەکێک لە دادگاکان یان ئەو لیژنانەی کە دەسەڵاتی دادوەرییان هەیە، لەکاتی یەکلاکردنەوەی داوایەکدا بینیان دەقێکی یاسا یان ڕێسا (لائحة) نادەستوورین و پێویستن بۆ یەکلاکردنەوەی کێشەکە، لەو حاڵەتەدا دەبێ داوایەکە ڕابگرێت و فایلی کێشەکە بەبێ میرانە (بغیر رسوم) بۆ دادگای باڵای دەستووری بەرز بکاتەوە بۆ یەکلاکردنەوەی مەسەلەی دەستووریتییەکەی.

٢- دادگای باڵای دەستووریی چاودێریکردنی دەستووریی یاسا و ڕێساکان دەکات، ئەگەر هاتوو یەکێک لە لایەنەکانی داوا (اطراف الدعوى) لە کاتی تەماشاکردنی داوایەکەی لەبەردەم یەکێک لە دادگاکان یان ئەو لیژنانەی کە دەسەڵاتی دادوەرییان هەیە دەفعی بەنادروستی دەقێک لە یاسا یان ڕێسا پێشکەش کرد و دادگاکە یان لیژنەکە ئەو دەفعەی بەپەسەند زانی، دەبێ یەکلاکردنەوەی کێشەکە دوا بخات و ماوەیەکیش کە ■ سێ مانگ تێنەپەڕێت بۆ ئەو کەسە دیار بکات کە ئەو دەفعەی پێشکەش کردووە بۆ ئەوەی داواکەی لەبارەی نادروستێتیی ئەو دەقەی یاسا یان ڕێسایە لەبەردەم دادگای باڵای دەستووریدا بەرز بکاتەوە، بەڵام ئەگەر هاتوو لەم ماوەیەدا داواکەی بەرز نەکردەوە ئەوا دەفعەکەی بەنەبوو لە قەڵەم دەدرێ[٤١٦].

ئەمەو بڕیار و حوکمەکانی دادگای باڵای دەستووریی سەبارەت بەکێشەکانی دەستووریتیی یاسا و ڕێساکان سەپاون بۆ گشت دەسەڵاتەکانی دەوڵەت و هەموو کەسێک و هەروەها یەکجارەکین و تانەیان لێ نادرێت (نهائية وغير قابلة للطعن)[٤١٧].

---

٤١٥- ئەمەش دەقەکەیەتی: «یاسا چۆنێتی دامەزراندنی دادگای باڵای دەستووری ڕێکدەخات و ئەو مەرجانەش دیار دەکات کە دەبێ لە ئەندامەکاندا هەبن...».

٤١٦- ماددەی (٢٩)ی یاسای دادگای باڵای دەستوری.

٤١٧- ماددەی (٤٨)ی یاسای دادگای باڵای دەستوری.

هەروەها دەبێ ئەو حوکم و بڕیارانە لە ماوەی پانزە ڕۆژ لە دوای دەرچوونیاندا لە ڕۆژنامەی ڕەسمی بلاوبکرێنەوە و لە ڕۆژی دوایی لە دوای بلاوبوونەوەیاندا هیچی تر کار بەو دەقە یاسا و ڕێسا نادەستوورییانە ناکرێت کە دادگا بەنادەستووریی دایناوون. هەروەها ئەو حوکمانە سەبارەت بەنادەستووریتی یاسا و ڕێساکان بەشێوەیەکی وا جێبەجێ ناکرێت کە ناکامەکەی بۆ ڕابردوو بگەڕێتەوە، مەگەر تایبەت بێ بەدەقێکی سزادان، لەو حاڵەتەشدا، حوکمەکانی ئیدانەکردن کە پشتیان بەو دەقە یاساییانە بەستووە، هەڵدەوەشێنەوە و بەنەبوو دادەندرێن[418].

لەم دەقەدا بۆمان دەردەکەوێ کە بڕیارەکانی دادگای باڵای دەستووریی لە ڕۆژی دوای بلاوبوونەوەیان لە ڕۆژنامەی ڕەسمیدا بەرکار دەبن و ئیدی لەوکاتە بەدواوە کار بەو دەقە یاساییانە یان ڕێساییانە ناکرێت کە بەپێی ئەو حوکمە بەنادەستووریی لە قەڵەم دراون. ئەمەش خۆی لە خۆیدا ئەوە دەگەیەنێ کە بڕیار و حوکمەکانی دادگای باڵای دەستووریی بەشێوەیەکی وا جێبەجێ ناکرێ کە ناکامەکەی بۆ ڕابردوو بگەڕێتەوە، تەنها ئەوانە نەبێت کە تایبەتن بەنادەستووریتیی دەقەکانی یاسای سزادان، هەروەکو لە پاشبەندی ئەم دەقەدا ڕاشکاوانە ئەم حوکمەی داوە.

لە ڕاستیدا ئەم حوکمە لەگەڵ پرنسیپی «پیادەکردنی ئەو یاسایەی باشترە بۆ تاوانبار کاری پێدەکرێ» دەگونجێت کە لە بواری چەسپاندنی یاسای سزادان لە ڕووی کاتەوە وەک ڕیزپەڕێک لە پرنسیپی «نەگەڕانەوەی حوکمی یاسا بەسەر ڕابردوو (عدم رجعية القوانين)» کاری پێدەکرێت ئەگەر هاتوو سیفەتی تاوانی لەسەر ئەو کردارە لابرد کە لەلایەن تاوانبارەوە ئەنجام درابوو یان سزاکەی سووک کرد[419].

بەڕای ئێمە، یاسادانەری میسری، لە داڕشتنی دەقی ماددەی (49)ی یاسای دادگای باڵای دستووریی سەبارەت بەجیاکردنەوەی ئەو حوکمانەی کە تایبەتن بەنادەستووریی دەقە یاسا ناسزاییەکان لەگەڵ حوکمەکانی تر کە تایبەتن بەنادەستووریی دەقە یاسا سزاییەکان لەڕووی دیارکردنی کاتی کاریگەرکردنیانەوە سەرکەوتوو نەبووە. چونکە ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە ئەو حوکم و بڕیارانەی کە لەلایەن دادگاکانەوە سەبارەت بەچەسپاندنی دەقە

---

418- ماددەی (49)ی یاسای دادگای باڵای دەستووری.

419- بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: د. ابراهيم ابو الليل ود. محمد الالفي، المدخل الى نظرية القانون ونظرية الحق، منشورات جامعة الكويت، مطابع مقهوي، الكويت، ١٩٨٦، ل١٢٨.

یاسا ناسزاییەکانەوە کە بەر لە بڵاوبوونەوەی حوکمی دادگای باڵای دەستووریی لە ڕۆژنامەی ڕەسمیدا دەرچوونە، سەرەڕای ئەوەی کە پشتیان بەدەقی یاسای نادەستووریی بەستووە وەکو خۆیان بێننەوە. ئەمەش مانای ئەوەیە ئەو دەقە نادەستووریانەی لەو حوکمانەدانە کە پشتیان پێ بەستراوە سەرەڕای نادەستووریتییەکەیان بەڕەوا دابنرێن، ئەمەش خۆی لە خۆیدا وا دەکات چاودێری دادگا لەسەر دەستووریتیی یاساکان ناوەڕۆکەکەی لە دەست بدات و بێ سوود بێ، لەکاتێکدا هێنانەدی شەرعییەت وادەخوازێت کە دەقە یاساییە نادەستوورییەکان هیچ ئاکامێکیان نەبێ.

بۆیە باشتر وابوو، یاسادانەری میسری جیاوازی لە نێوان دەقی یاسا سزاییەکان و ناسزاییەکانی لەم ڕووەوە نەکردایە، چونکە ئەمە وادەکات دەسەڵاتی یاسادانان لە چاودێریکردنی ئەو یاسا نادەستوورییانەی کە بەر لە حوکمی دادگای باڵای دەستووریی دەریکردوونە و لەلایەن دەسەڵاتی جێبەجێکردنەوە کاریان پێکراوە ڕزگاری بێت مادام حوکمی باڵای دەستووریی بەنادەستووریتیی یاساکان دوای چەسپاندنیان دەردەچێ.

ئەمەو وێڕای ئەوەی هەندێ لایەنی کاری دادگا بنیات نەرە وەکو بڕیار و حوکمەکانی و بەتایبەتی ئەو حوکمانەی کە پێیان دەگوترێ (قرارات المبادیء)، واتە ئەوەی پرنسیپێکی نوێ دێنێتە کایەوە یان ئاراستەی نوێی دادگەری بنیات دەنێت، بەڵام سەرەڕای ئەوەش، حوکمەکانی دادگا بەشێوەیەکی گشتی سروشتێکی ئاشکراکەر (کاشف) یان هەیە نەک دروستکەر (منشیء)، بۆیە هیچ پێویستی بەم جیاوازییە نەدەکرد.

هەروەها لە میانی دەقی ماددەی (۲۹) کە لەسەرەوە ئاماژەمان پێی کردووە، بۆمان دەردەکەوێ کە دەستووری میسری دوو شێوازی بۆ چاودێریکردن لەسەر دەستووریتی یاسا و ڕێساکان پەسند کردووە. شێوازێکیان، بریتییە لە ئانە لێدان لە دەستووریتی یاسا و ڕێساکان لەکاتی تەماشاکردنی ئەو کێشەیەی کە بەرز بۆتەوە بۆ بەردەم دادگا لە ڕێگای ئەو دەفعەی کە لە لایەن دادگا یان لیژنەی خاوەن دەسەڵاتی دادوەری یان یەکێک لە لایەنەکانی داوا (احد اطراف الدعوی) پێشکەش دەکرێ، ئەوکاتە دادگا یان لیژنەکە لە ئاکامی ئەو دەفعەدا بینینی کێشەکە دوا دەخات و دەفعەکە بەنادەستووریتی یاسا یان ڕێساکە بۆ دادگای باڵای دەستووریی بەرز دەکاتەوە تاکو دەستووریتی یاسا و ڕێساکە یەکلا بکاتەوە.

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە دەستووری میسری کاری بەچاودێریتی مەرکەزی (الرقابة المرکزیة) کردووە و کەسان و گشت دەسەڵاتەکانی دەوڵەتی ناچار کردووە کە پێڕەوی

حوکمەکان و بڕیارەکانی دادگای ناوبراو بکەن. هەر بۆیە بڕیاری داوە کە حوکم و بڕیارەکانی دادگای ناوبراو لە ماوەی پانزە ڕۆژ لە ڕۆژی دەرچوونییەوە لە ڕۆژنامەی ڕەسمی بلاوبکرێتەوە. هەرچەندە ئەو حوکمەی کە دادگای ناوبراو دەریدەکات، دەقی یاسا یان ڕێسا نادەستوورییەکە هەڵناوەشێنێتەوە، بەڵام بڕیار بەنادەستووریتییەکەی دەدات. ئەمەش خۆی لەخۆیدا، کارپێنەکردنی لە داهاتوودا ڕادەگرێت.

بۆ بەدەرخستنی ڕۆڵی دادگای باڵای دەستووریی میسری لە پاراستن و زامنکردنی ئازادیی ڕۆژنامەگەریدا چەند حوکمێکی دادگای ناوبراو لە خوارەوە دەستنیشان دەکەین:

دادگای باڵای دەستووریی لە حوکمێکیدا جەختی لەسەر ئەوە کردۆتەوە کە دەبێ یاسادانەر لە دانانی یاساکاندا بۆ ڕێکخستنی ئازادیی ڕۆژنامەگەری پابەندی ئەو کۆتوبەندە بابەتییانە بێت کە دەستوور دەقنووسی کردوون. ئەمەش بەشێکی ئەو حوکمەیە «لە بنەڕەتدا دەسەڵاتی یاسادانەر لە ڕێکخستنی مافەکاندا، دەسەڵاتێکی خەمڵێنەرە (سلطة تقديرية) و چاودێریکردن لەسەر دەستووریتیی یاساکان لایەنی دروستیی بۆ دەرهێنانی یاساکە ناگرێتەوە، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە دەسەڵاتی یاسادانان لە دانانی یاساکاندا ڕەها بێت و پابەندی ئەو کۆتوبەندانە نەبێت کە دەستوور دایناون»[420].

ئەمەو دادگای باڵای دەستووریی تەنها بەوەندە نەوەستاوە جەخت لەسەر ڕێزگرتن و پابەندبوون بەو دەقە دەستوورییانەی کە ماف و ئازادییە گشتییەکان دەپارێزن بکات، بەڵکوو لە حوکمێکیدا کە لە ٦ی فەبرایەری ١٩٩٣دا دەریکردووە، حوکمی بەنادەستووریتی بڕگەی دووەمی ماددەی (١٢٣)ی یاسای دادبینیی تاوانکاری (الاجراءات الجنائية) داوە و تیایدا هاتووە: «داواکاری مافی مەدەنی داوایەکەی بۆ دادگای «سیدی جابر» لە ئەسکەندەریە دژی تاوانبار بەرز کردۆتەوە تیایدا ئیدعا دەکا کە تاوانبار لە چاپکراوەکەیدا بوختانی پێکردووە کە بەپێی ماددەی (٣٠٢، ٣٠٣، ٣٠٧)ی یاسای سزادان شایانی سزایە و داوای کردووە بەناچارکردنی داوالێکراو (المدعي عليه) بەقەرەبووکردنی ئەو زیانانەی لە ئاکامی ئەم بوختانەدا لە داواکار کەوتووە بەبڕی پێنج سەد هەزار جونەیهی میسری. هەروەها داواکار دەفعێکی سەبارەت بەسەروتانی مافی

---

٤٢٠- حوکمی دادگای باڵای دەستووری لە ٢١ یونیو ١٩٨٦ لە کێشەی ژمارە (٥٦)ی ساڵی شەشەم- دادوەری (دەستووری)، کۆدی حوکمەکانی دادگای باڵای دەستووری، بەشی سێیەم، ل ٣٥٣: بڕوانە: د. محمد باهي ابو يونس: التقييد القانوني لحرية الصحافة (دراسة مقارنة)، منشورات دار الجامعة الجديدة للنشر، الاسكندرية، ١٩٩٦، ل ١٤-١٥ ئاماژەی پێکراوە.

تاوانبار لە هێنانەوەی بەڵگە بۆ سەلماندنی راستیی ئەو رووداوانەی کە داویەتییە پاڵ داواکار پێشکەش دادگا کردووە. داواکار لەم دەفعەیدا پشتی بەبڕگەی دووەمی ماددەی (١٣٢)ی یاسای (الاجراءات الجنائیة) بەستووە کە ئەو تاوانبارەی کە بەتاوانی بوختان پێکردن لە رێگای چاپەمەنیدا دراوەتە دادگا ناچار دەکات کە لە یەکەمین وەڵامیدا (في اول استجواب له) یان لە ماوەی پێنج رۆژی دوای ئاگادار کردنەوەی بەئامادەبوون لەبەردەم دادگادا ئەو بەڵگانە پێشکەش بکات کە راستیی ئەو رووداوانە دەسەلمێنن کە خستوویانەتە پاڵ ئەو کەسەی فەرمانی گشتی پێ سپێردراوە.

لە بەرامبەر ئەمەدا، تاوانبار لەبەردەم دادگا تانەی لە نادەستووریتیی برگەی دووەمی ماددەی (١٣٢)ی یاسای (الاجراءات الجنائیة)دا. دادگای تایبەتمەند بەکێشەکەش بەهەند هەڵگرتنی دەفعەکەی نرخاند و رێگای پێدا کە داوایەکی دەستووریی بۆ ئەم مەبەستە بۆ دادگای باڵای دەستووریی بەرز بکاتەوە، ئەویش بەرزی کردەوە و دادگای باڵای دەستووریش حوکمی بەنادەستووریتیی برگەی ناوبراو دا کە داواکار لە دەفعەکەی پشتی پێ بەستبوو[٤٢١]. لە شیکردنەوەی ئەم حوکمەدا بۆمان دەردەکەوێ کە دادگای ناوبراو لەم حوکمەیدا پشتی بەدوو بەڵگە بەستووە کە ئەمانەی خوارەوەن:

یەکەم: ناکۆکی دەقی برگەی دووەمی ماددە (١٣٢)ی یاسای «الاجراءات الجنائیة» لەگەڵ دەقی ماددە (٤٧)ی دەستووردا کە کەفالەتی ئازادیی رادەربڕین و مافی رەخنەگرتنی کردووە[٤٢٢].

دووەم: ناکۆکی دەقەکە لەگەڵ ماددە (٦٧)[٤٢٣]و (٦٩)[٤٢٤]ی دەستوور کە جەختیان لەسەر مافی داکۆکیکردن کردۆتەوە.

لەبەرئەوەی بەڵگەی یەکەم پەیوەندییەکی راستەوخۆی بەباسەکەی ئێمەوە هەیە، بۆیە لە

---

٤٢١- د. عبدالحمید الشواربي: جرائم الصحافة والنشر، منشأة المعارف بالاسكندریة، ط٣، ١٩٧٧، ل٧٦ نقلا عن عبدالرحمن احمد حسین المختار: حریة الصحافة وتنظیمها الدستوري والقانوني في الیمن (دراسة مقارنة)، سەرچاوەی پێشوو ل٣٧.

٤٢٢- بڕوانە دەقی ماددەی ناوبراو کە لە برگەی (٤-٣) خاڵی یەکەم لقی (١) لەم تێزەدا ئاماژەمان پێی کردووە.

٤٢٣- ئەمەش دەقەکەیەتی: «تاوانبار بەبێ تاوان دادەنرێ تا ئەوکاتەی تۆمەتبارکردنەکەی لە دادگایەکی یاسایی دەسەلمێندرێ کە تیایدا زامنەکانی لەخۆداکۆکیکردنی بۆ دابین دەکرێ».

٤٢٤- ئەمەش دەقەکەیەتی: «مافی داکۆکیکردن بۆ کەسەکە بێت یان بەوەکالەت، کەفالەت کراوە».

خوارەوە ڕای دادگای باڵای دەستووریی سەبارەت بەو بەڵگەیە دەخەینە ڕوو کە دەڵێ:
«ڕەخنەگرتن لەوکەسانەی کە فەرمانی گشتییان پێ سپێردراوە هەرچەندە توندیش بێت لەژێر ئەو پاراستنە یاسایییەدا بمێنێتەوە کە دەستوور بۆ ئازادیی ڕادەربڕینی کەفالەت کردووە بەمەرجێک ناوەرۆکی ئەو ئازادییە تێکنەدات یان سنووری ئەو مەبەستانە کە مەبەست بووە لە دانپیانانیدا نەبەزێنێ. بۆیە ڕەوا نییە لە هەموو ڕووداوێکدا کە دەدرێتە پاڵ ئەو کەسانەی ئەرکی گشتییان پێ سپێردراوە گریمانەی ئەوە بکرێت کە ڕووداوێکی درۆیە یان نیازخراپی لەگەڵدایە. بەڵکوو دەبێ هەمیشە دەرفەت بەهەموو هاووڵاتییەک بدرێت بۆ ئەوەی گفتوگۆیان لەگەڵ بکات تاکو ڕاستی بەدەر کەوێت. جا ئەگەر دەستوور لە ماددەی (٤٧)دا بەدەستەواژەیەکی گشتی کەفالەتی ئازادیی ڕادەربڕینی کردبێت کە هەموو ڕایەکی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی بگرێتەوە، بەڵام سەرەڕای ئەمەش دەستوور مەبەستی لەمەدا بەدەرخستنی ڕەخنەی بنیاتنەرە بۆ زامنکردنی کاری نیشتمانی نەک ڕەخنەی ڕووخێنەر، چونکە بەبۆچوونی یاسادانەری دەستووریی، ئازادیی ڕەخنەگرتن - ئەگەر بنیاتنەر بێت -پێویستە و بەبێ ئەم ڕەخنەگرتنە کاری نیشتمانی ناپەتە دی. کەواتە پاراستنی ئازادی ڕادەربڕین لە ڕێگای دەستوورەوە وادەخوازێت کە دەرفەت بڕەخسێ بۆ ڕەخنەگرتن لەو کەسانەی کە بەکاری گشتی هەڵدەستن، بۆ ئەوەی هەموو کەسێک ئاگاداری ئەو زانیارییە پێویستانە بێت کە پەیوەندییان بەکاروبارە گشتییەکانەوە هەیە، نەک دانانی کۆسپ لەبەردەم گفتوگۆیەکی کراوەی ئازاددا (الحوار الحر المفتوح) تاکو یاسای سزادان کۆتوبەندی توند بخاتە سەر ئەو بەڵگانەی کە بەرپەرچی تۆمەتی ئەو ناوزڕاندنە دەدەنەوە کە لە ڕێگای چاپەمەنییەکاندا ڕوویانداوە بەچەشنێک بێتە مایەی بەفیڕۆدانی ئەو مافە لە پێشکەشکردنی ئەو بەڵگانەدا، ئەم دەقە یاساییەی کە تانەی لێ دراوە ئەم ڕێگایەی گرتۆتەبەر»[425]. لە میانی ئەم حوکمەی سەرەوەدا ئەم تێبینیانەی خوارەوە دەکەین:

١- دادگای باڵای دەستووریی زۆر بەپەرۆشەوەیە بۆ داکۆکیکردن لە ئازادیی ڕادەربڕین و مافی ڕەخنەگرتن. ئەمەشمان لەو پاراستنە یاساییەدا بۆ دەردەکەوێ کە بۆ ئازادیی ڕادەربڕینی دەستەبەر کردووە لە ڕێگای کاراکردنی ئەو پرنسیپە دەستوورییانەی کە کەفالەتی ئەم ئازادییە دەکەن کە زامنێکی زۆر گرنگن بۆ ئازادیی ڕۆژنامەگەری.

---

٤٢٥- د. شريف سيد كامل: جرائم الصحافة في القانون المصري، دار النهضة العربية، ط١، القاهرة، ١٩٩٤ ل ٢٠-٢٢-٢١ نقلا عن ميثم حنظل شريف: التنظيم الدستوري والقانوني لحرية الصحافة في العراق، سەرچاوەی پێشوو ل ٤٤-٤٥

٢- دادگای بالآی دەستووریی بەهەڵوەشاندنەوەی برگەی دووەمی ماددە (١٣٢)ی یاسای «الاجراءات الجنائية» جارێکی تر ئەوە دەسەلمێنێ کە دەبێ یاسادانەر لەکاتی دانانی یاساکانیدا ڕێز لەو حوکم و پرنسیپانە بگرێت کە لەناو دەستووردا دەقنووس کراون و لێیان لانەدات ئەگینا ڕووبەڕووی هەڵوەشانەوە دەبنەوە.

٣- هەروەها بەهەڵوەشاندنەوەی برگەی ناوبراو دادگای بالآی دەستووریی ئەو ترسەی لە دەروونی هاوولاتییان دەرکرد کە نابێ ڕەخنە لەو کەسانە بگرن کە بەکاری گشتی هەڵدەستن.

٤- لەم حوکمەی سەرەوەدا، ڕۆڵی چاودێری دادگەریان بۆ دەردەکەوێ لە چاودێریکردنی دەستووریێتی یاساکان بۆ پاراستن و زامنکردنی ئازادیی ڕۆژنامەگەری لە دەستدرێژی یاسادانەر لەو کاتەی کە کۆتوبەندی ئازادیی ڕۆژنامەگەری دەکات بەبیانووی ڕێکخستنی.

دادگای بالآی دەستووریی لە حوکمێکی تریدا، سەبارەت بەبێبەشکردنی بیانییان بەشێوەیەکی ڕەها لە دەرکردن یان بەشداریکردن لە دەرکردنی ڕۆژنامەدا، بڕیاری بەنادەستووریێتیی برگەی دووەمی ماددە (١٩)ی یاسای دەسەلاتی ڕۆژنامەگەری ژمارە (١٤٨)ی ساڵی ١٩٨٠ داوە، کە تایبەتە بەبێبەشکردنی بیانییان لە خاوەنێتیی پشکەکانی ئەو ڕۆژنامانەی کە لەلایەن کۆمەڵەی هەرەوەزی و کۆمپانیا هاوپشکەکان (شركات مساهمة) دەردەچن. ئەمەی خوارەوە بەشێکی ئەو حوکمەیە:

«... دەقی پێشوو لەگەڵ دەقی ماددە (٤٧)ی دەستوور ناکۆکە، بۆیە بەنادەستووریی دادەندرێت، چونکە دەستەواژەی (لە سنووری یاسادا) ئەوە ناگەیەنێ کە یاسادانەر ئازادە لە ڕێکخستنی ئەم ئازادییەدا و بۆی هەیە ئەوەی بیەوێ لێی بێبەش بکات و ئەوەی کە نەشیەوێ پێی ببەخشێت. هەرچەندە لەم بارەیەوە دەسەلاتێکی خەملاندنی هەیە، بەلام ئەمە قەت ئەوە ناگەیەنێت کە دەسەلاتەکەی دەسەلاتێکی ڕەهایە، بەڵکوو ئەو دەسەلاتەی لە سنووری ڕێکخستنی ئەم ئازادییە ڕادەوەستێ و ناگاتە بەفیڕۆدان و دەست بەسەراگرتنی ماف»[٤٢٦].

---

٤٢٦- حوکمی دادگای بالآی دەستووریی لە ١٩ مایۆ ١٩٩٠ کێشەی ژمارە (٩/٣٥) دادوەری (دەستووری) کۆدی حوکمەکانی دادگای بالآی دەستووریی بەشی (٤) ل ٢٥٦ د. محمد باهي ابو يونس: التقييد القانوني لحرية الصحافة (دراسة مقارنة)، سەرچاوەی پێشوو ل ٢٦٨ ئاماژەی پێ کردووە.

شایەنی ئاماژەپێکردنە (د. محەمەد باهی ئەبوو یونس) سەبارەت بەبڕی ئەو ئازادییەی کە بیانی بەپێی حوکمی ماددەی ناوبراو بۆی هەیە لە میسردا مومارەسەی بکات دەڵێ: «هەرچەندە یاسادانەر بۆی نییە ئەو کەسانە - مەبەستی بیانییەکانە - بەرەهایی لەو مافە بێبەش بکات، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە بۆیان هەبێ مومارەسەی هەمان بڕی ئەو ئازادییە بکەن کە هاووڵاتییان مومارەسەی دەکەن. چونکە مافی هاووڵاتییەتی وادەخوازێ کە ئەوان لەو ماف و ئازادییانەی کە لەسەر خاکی دەوڵەتی خۆیان مومارەسەی دەکەن جیابکرێنەوە بەچەشنێک بیانییان لەو ماف و ئازادییانەدا وەکو ئەوان نەبن»[427].

لە میانی ئەم حوکمانەی سەرەوەدا بۆمان دەردەکەوێت کە دادگای باڵای دەستووریی توانیویەتی ئازادیی ڕۆژنامەگەری لەو کۆتوبەندانە ڕزگار بکات کە لەلایەن یاسادانەرەوە لە ڕێگای دەرکردنی یاسای نادەستوورییەوە دەخرێنە سەری لە ڕێگای حوکمدان بەنادەستووریتی ئەو یاسایانە یان لە ڕێگای جەختکردن لەسەر پێویستی ڕێزگرتن لەو دەقانەی دەستوور کە پەیوەندییان بەم ئازادییەوە هەیە و نابێ یاسادانەر لەکاتی ڕێکخستنیدا سنوورەکەی ببەزێنێت. ئەمەش خۆی لەخۆیدا ئەوە دەگەیەنێ کە چاودێری دادگەری پاڵپشتێکی بەهێزە و زامنێکی کاریگەرە بۆ پاراستنی ئازادیی ڕۆژنامەگەری.

٢- چاودێری دادگەری لەسەر دەستووریتیی یاساکان لە دەستووری لوبنانی و دەستووری فەرەنسیدا

دەستووری لوبنانی ساڵی ١٩٢٦ی هەمووارکراو هەروەها دەستووری فەرەنسی ساڵی ١٩٥٨ی هەمواوکراو لەجیاتی چاودێریکردنی دادگەری کاریان بەچاودێریکردنی ڕامیاری کردووە بۆ چاودێریکردنی دەستووریتی یاساکان هەروەکو تۆزێکی تر لە خاڵی سێیەم لەکاتی باسکردنی پاراستنی نادادگەریدا بەدرێژی باسیان دەکەین.

٣- چاودێری دادگەری لەسەر دەستووریتیی یاساکان لە دەستووری عێراقیدا

دەستووری عێراقی ساڵی ١٩٧٠ چاوپۆشی کردووە لە دەستنیشانکردنی ئەو لایەنەی کە ئەرکی چاودێریکردنی دەستووریتی یاساکانی دەکەوێتە ئەستۆ[428]، بۆیە نە ئەم چاودێریکردنەی ڕێکخستووە، نە مومارەسەکردنیشی لەلایەن دادگاکانەوە یاساغ کردووە.

---

٤٢٧- د. محمد باهي ابو يونس، التقييد القانوني لحرية الصحافة (دراسة مقارنة)، سەرچاوەی پێشوو ل٢٦٩.

٤٢٨- دەستووری عێراقی ساڵی ١٩٢٥ کە ناسراوە بەیاسای بنەڕەتی، پێچەوانەی ئەم دەستوورەی ئێستا لە ماددەی (٥٨)ی هەموارکراودا چاودێریکردنی دەستووریتیی یاساکانی ڕێکخستووە و بۆ =

لەم حاڵەتەشدا، بۆ دەستنیشانکردنی ئەو لایەنەی کە ئەرکی چاودێریکردنی دەستووریێتیی یاساکانی دەکەوێتە ئەستۆ، دەبێ بگەڕێینەوە بۆ ڕەوتی یاسازانی (اتجاه الفقه) و ڕەوتی دادگا (اتجاه القضاء).

هەندێک پێیان وایە دوو لایەن بۆیان هەیە بەکاری چاودێریکردنی دەستووریێتیی یاساکان هەستن. لایەنی یەکەم بریتییە لە ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش بەو سیفەتەی کە لایەنی تایبەتمەندە بەدانانی ئەو یاسایانە[429]. لایەنی دووەمیش بریتییە لە دادگا بەو سیفەتەی کە وەک ئەرکێکی سەرەکی یەکلاکردنەوەی کێشەکانی لە ئەستۆیە. یەکێک لەو کێشانەش، کێشەی نادەستووریێتی و ناکۆکیی نێوان دەقەکانی یاسا و دەستوورە[430].

ئێمە لایەنی دووەمان پێ پەسەندە نەوەک لایەنی یەکەم و پشتگیری دەکەین، چونکە گۆمەڵەی یەکەم بۆ پشتگیری قسەکانیان پشتیان بەهیچ پاڵپشتێکی یاسایی و دەستووریی نەبەستووە، ئەمە لە لایەک، لە لایەکی تریشەوە هەرچەند، دەستوور لەلایەن

* ئەم مەبەستە ئەرکی ئەم چاودێریکردنەی بەدادگای باڵای دەستووریی سپاردووە کە دواتر بۆ ئەم مەبەستە دامەزرا.

هەروەها دەستووری ساڵی ١٩٦٨ لە ماددەی (٨٧)دا ئەرکی چاودێریکردنی دەستووریێتیی یاساکانی بەدادگای باڵای دەستووریی سپاردووە کە دواتر بەپێی یاسای ژمارە (١٥٩)ی ساڵی ١٩٦٨ دامەزرا، ئەمەش دەقەکەیەتی: «بەیاسایەک دادگای باڵای دەستووریی دادەمەزرێ، کاریشی لێکدانەوەی دەقەکانی ئەم دەستوورە و یەکلاکردنەوەی دەستووریێتیی یاساکان و لێکدانەوەی یاسا کارگێڕی و داراییەکان و یەکلاکردنەوەی سەرپێچیکردنی یاساکانە بەو ڕێسایانەی کە بۆ ئاسانکاری جێبەجێکردنیان دەردەچن و بڕیارەکانی ئەم دادگایەش سەپارەیە».

٤٢٩- أزهار عبدالكريم عبدالوهاب: الحقوق والحريات العامة في ظل الساتير العراقية، رسالة ماجستير، كلية القانون، جامعة بغداد، ١٩٨٣، ل ٢٤٧. هەروەها میثم حنظل شريف: التنظيم الدستوري والقانوني لحرية الصحافة في العراق (دراسة مقارنة)، سەرچاوەی پێشوو ل٤٨.

٤٣٠- بڕوانە علي محمد محمود ابو عال: مدى سلطة القاضي في الرقابة علي دستورية القوانين بطريق الدفع الفرعي (دراسة مقارنة)، رسالة ماجستير، كلية القانون، جامعة بغداد، ١٩٩٦ ل ٢٠٠. هەروەها عبدالرحمن احمد المختار: حرية الصحافة وتنظيمها الدستوري والقانوني في اليمن (دراسة مقارنة)، كلية القانون، جامعة بغداد، ٢٠٠٢ ل٤٢. هەروەها ازهار عبدالكريم عبدالوهاب: الحقوق والحريات العامة في ظل الدساتير العراقية، سەرچاوەی پێشوو ل ٢٤٧. هەروەها عبدالباقي البكري و زهير البشير: المدخل لدراسة القانون، منشورات بيت الحكمة، بغداد، ١٩٨٩ ل ١٠٦-١٠٧.

ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشەوە دەرچووە بەپێی ئەو دەسەڵاتەی کە بەخۆی داوە. لە هەمان کاتیشدا ئەو دەسەڵاتەی بەخۆی داوە کە هەمواری بکات یان هەڵیبوەشێنێتەوە، هەروەها مافی دەرکردنی یاسای بەخۆی داوە، بەم پێیە، ئەگەر بۆی دەرکەوت دەقێک لە یاسایەکدا لەگەڵ دەستوور ناگونجێت، بۆی هەیە ڕۆڵی چاودێریکردنی هەڵوەشانەوە (رقابة الالغاء) ببینێ و ئەو یاسایە هەڵوەشێنێتەوە یان هەمواری بکات. بەڵام سەرەڕای ئەمەش، ئەو ڕۆڵەی نابێت کە لایەنێکی تر دەیبینێت ئەگەر بەم کارە هەڵسێت. بەڵام کۆمەڵەی دووەم، هەرچەندە ئەوانیش پشتیان بەهیچ دەقێک نەبەستووە، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە دادگا دەسەڵاتی چاودێریکردنی دەستووریتیی یاساکانی نەبێت. چونکە ئەرکی سەرەکی دادگا بریتییە لە چەسپاندنی یاسا، هەر بەم بۆنەیەشەوە، بەپێی پرنسیپی (التدرج بين التشريعات) ئەرکی چاودێریکردنی دەستووریتیی یاساکانیشی لەپاڵ یەکلاکردنەوەی ئەو کێشانەی کە بۆی بەرز دەکرێنەوە دەکەوێتە ئەستۆ. چونکە بەپێی ئەم پرنسیپە، نابێ دادگا ئەو یاسایە جێبەجێ بکات کە لەگەڵ یاسایەکی لە خۆی بەرزتر ناکۆکە.

ئەمەو، بەڕای ئێمە، دەکرێ بێدەنگیی دەستووری عێراقی لە ئاست ئەمەدا لە کاتی پێویستیدا بەنیشانەی لارینەبوون دابنێین بەپێی ئەو پرنسیپەی کە دەڵێ: «بێدەنگی لەکاتی پێویستیدا نیشانەیە» یان «بێدەنگی نیشانەی ڕەزامەندییە».

کەواتە بابزانین چاودێریکردنی دەستووریتیی یاساکان لە واقیعدا چۆنە و هەڵوێستی دادگای عێراقیش لەم بارەیەوە چییە.

ئەوەی شایەنی باسە، لەوەتەی دەستووری عێراقی ساڵی ١٩٧٠ دەرچووە، دادگای عێراقی هیچ ڕۆڵێکی بۆ چاودێریکردنی دەستووریتیی یاساکان نەبینیوە، هەڵبەتە ئەمەش خۆی لەخۆیدا ئەوە دەگەیەنێ کە دادگای عێراقی ویستوویەتی لەم ڕووەوە دوورەپەرێز بووەستێت. هەرچەندە هیچ پاساوێک بۆ ئەم دوورەپەرێزییەی نییە.

بۆیە مادام دادگای باڵای دەستووریی یان ئەنجومەنی دەستووریی لە عێراقدا نییە، دەبوایە دادگاکان لە خۆیانەوە وەک دەسەڵاتێکی تایبەتمەند بەیەکلاکردنەوەی گشت کێشەکان - بەناکۆکی نێوان دەقەکانی یاسا و دەستووریشەوە - ئەم ڕۆڵەیان بدیتبایە. لە کاتێکدا هیچ دەقێکی دەستووریی یان یاسایی ئەم مافەی لێ یاساغ نەکردوون.

ب - چاودێری دادگەریی لەسەر شەرعیيەتی بڕیارەکانی ئیدارە

چاودێریکردنی دادگەریی لەسەر شەرعیيەتی بڕیارەکانی ئیدارە کە لەسەر بنچینەی «مەشروعیەت - ڕەوایەتی»[٤٣١] دامەزراوە لەو وڵاتانەی کە تیایدا دەسەڵاتی دادوەری پاک و سەربەخۆیە بەیەکێک لە زامنە سەرەکییەکانی پاراستنی ئازادیی ڕۆژنامەگەری و سەروەریی یاسا دادەنرێت[٤٣٢] و لە سایەیدا تاکەکانی کۆمەڵ بەرامبەر بەو دەستدرێژییانەی کە ئیدارە لە ئاکامی بەزاندنی سنووری دەسەڵاتەکەی دەیکاتە سەر مافەکانیان، هەست بەئاسوودەیی و ئارامیی دەکات، چونکە لە سایەی پرنسیپی «ڕەوایەتی» دا چاودێری ڕەوایەتیی بڕیارەکانی ئیدارە دەکات و ناچاری دەکات کە ڕێز لە بنچینە یاساییەکان بگرێت و وەکو خۆی کاریان پێ بکات.

وەکو دەزانین، یاسادانەر لە دانانی یاساکاندا جەخت لەسەر پرنسیپ و بنچینە گشتییەکان دەکات و ناچێتە ناو قوڵاییانەوە، بۆیە چاودێری دادگەریی بەسەر ئەو بڕیارانەی کە ئیدارە بۆ ڕێکخستنی ئازادیی ڕۆژنامەگەری دەریان دەکات ڕۆڵێکی بەرچاویان هەیە، چونکە پەیوەندییەکی بەهێز هەیە لە نێوان ئەو بڕیارانەی کە ئیدارە لە لایەک بۆ پاراستنی ئیزامی گشتی (النظام العام) دەریان دەکات و لەلایەکی تریشەوە بۆ ڕێکخستنی ڕۆژنامەگەری دەریان دەکات[٤٣٣].

لەبەر ئەمە، ئیدارە لە دەرکردنی بڕیارەکانیدا بۆ پاراستنی ئیزامی گشتی، ڕووبەڕووی ناکۆکییەکی گەورە دەبێتەوە لە نێوان پاراستنی ئیزامی گشتی و ئازادیی ڕۆژنامەگەریدا کە دەستوور کەفالەتی کردووە. لێرەدا ڕۆڵی چاودێری دادگەریمان لە پاراستنی مافی تاکەکانی کۆمەڵ لە گوزارشتکردنی بیروڕایان لە ڕێگای ڕۆژنامەگەریدا بەرامبەر بڕیارەکانی ئیدارە بۆ دەردەکەوێ.

ئەم چاودێرییەش لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر بەپێی ئەو سیستەمە دادگەرییە دەگۆڕێ

---

٤٣١- بەپێی ئەم پرنسیپە دەبێ کار و کردەوەکان (تصرفات)ی ئیدارە لەگەڵ بنچینە یاساییەکانی یاسا بەرکارەکاندا گونجاو بن.

٤٣٢- د. سامي جمال الدين: الرقابة على اعمال الادارة، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٥، وسمير خيري توفيق: مبدأ سيادة القانون، دار الحرية للطباعة، بغداد، ١٩٧٨ ل٥٥.

٤٣٣- مەبەستمان ئەو بڕیارانەیە کە پەیوەندییان بەلایەنی تەواو و وردەکارییەکانی ئازادیی ڕۆژنامەگەرییەوە هەیە، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە مبشر حنظل شريف: التنظيم الدستوري والقانوني لحرية الصحافة في العراق (دراسة مقارنة)، سەرچاوەی پێشوو ل ٥٠.

که پێڕەوی دەکات. بۆیە، ئەو وڵاتانەی کە پێڕەوی سیستمی تاک دادگایی (القضاء الواحد) دەکەن، تیایاندا دادگای ئاسایی مومارەسەی ئەم چاودێرییە دەکات. بەڵام لەو وڵاتانەدا کە پێڕەوی سیستمی جووت دادگایی (القضاء المزدوج) دەکەن، تیایاندا دادگای ئیداری مومارەسەی ئەم چاودێرییە دەکات.

لەبەر ئەو ڕۆڵەی کە ئەنجوومەنی دەوڵەتی میسری و ئەنجوومەنی دەوڵەتی فەرەنسی لە چاودێریکردنی شەرعییەتی بڕیارەکانی ئیداوە دیویانە، بۆیە لە چوارچێوەی لێکۆڵینەوەیەکی بەراووردا تیشک دەخەینە سەر ئەم چاودێرییە بەم شێوەیەی خوارەوە:

١- چاودێری دادگەری لەسەر ڕەوایەتی بڕیارەکانی ئیدارە لە یاسای میسردا

ئەنجوومەنی دەوڵەتی میسری (مجلس الدولة المصري) هەر لە دامەزرانیەوە لە ساڵی ١٩٤٦[٤٣٤] تاکو ئەمڕۆ بەکاری چاودێریکردنی ڕەوایەتی بڕیارەکانی ئیدارە هەستاوە و چاودێری ڕەوایەتی ئەو بڕیارانەی ئیدارەی کردووە کە تایبەت بوونە بەبنج و بنەوانەکانی ئازادیی ڕۆژنامەگەرییەوە، هەروەکو لەم حوکمانەی خوارەوەدا بۆمان دەردەکەوێ:

ئەنجوومەنی دەوڵەتی میسری (دادگای کارگێڕی) لە حوکمێکیدا جەختی لەسەر ئەوە کردۆتەوە کە نابێ ئیدارە ئاگاداری ڕۆژنامە بکاتەوە یان بەڕێگایەکی ئیداری ڕایبگرێت یان هەڵی بوەشێنێتەوە لەکاتێکدا کە هیچ یاسایەک دەرنەچووە بۆ ڕێکخستنی ئەو حاڵەتانەی کە ئەنجامدانی ئەم کارانەی تیا پێویستە بۆ پاراستنی نیزامی گشتی. ئەمەش بەشێکی ئەو حوکمەیە: «... کە ئازادیی ڕۆژنامەگەری یەکێکە لەو ئازادییە گشتیانەی کە دەستوور کەفالەتی کردووە، وە لەبەر ئەوەی ئاکامەکانی ئەم ئازادییە تەنها ئەو تاکەکەسە ناگرێتەوە کە مومارەسەی دەکات بەڵکوو ئاکامەکانی تاکەکانی ترو خودی کۆمەڵیش

٤٣٤- تاکو ساڵی ١٩٤٦ میسر پێڕەوی سیستمی تاک دادگایی دەکرد، بەڵام دوای ساڵی ١٩٤٦ بەدەرچوونی یاسای ژمارە (١١٢)ی ساڵی ١٩٤٦ چووە ڕیزی ئەو دەوڵەتانەی کە پێڕەوی سیستەمی جووت دادگایی دەکەن و بەپێی ئەو یاسایە ئەنجوومەنی دەوڵەتی میسری دامەزرا و تاکو ئێستا چەندین یاسا بۆ ڕێکخستن و پەرەپێدانی دەرچووە کە دواهەمینیان یاسای ژمارە (٤٧)ی ساڵی (١٩٧٢) ە، کە بەپێی حوکمی مادە (١٧٢)ی دەستووری ساڵی ١٩٧١ دەرچووە کە بەم شێوەیە دەقنووسی کردووە: «ئەنجوومەنی دەوڵەت دەستەیەکی دادوەری سەربەخۆیە و تایبەتمەندە بەیەکلاکردنەوەی کێشە ئیدارییەکان و داوا تەمێکەرەکان (الدعاوي التأديبية) و یاسا دەسەڵاتەکانی تری دیار دەکات» بڕوانە د. فاروق احمد الخماس: الرقابة على اعمال الادارة، سەرچاوەی پێشوو، ل١١٨.

دەگرێتەوە، بۆیە دەستوور ئەم ئازادییەی ڕەها نەکردووە، بەڵکوو ئەرکی ڕێکخستنەکەی بەیاسا سپاردووە، چونکە نابێ ئازادییە گشتییەکان کۆتبەند بکرێن یان ڕێکبخرێن مەگەر بەیاسا نەبێت...»[٤٣٥].

شایەنی ئاماژەبۆکردنە، ئەنجوومەنی دەوڵەتی میسری تەنها بەوە نەوەستاوە کە جەخت لەسەر ئازادیی ڕۆژنامەگەری بکات یان کۆتوبەند کردنی یاساغ بکات، بەڵکوو جەختی لەسەر ئەوە کردۆتەوە کە دەبێ گشت کاروکردەوەی ئیدارە بکەونە ژێر چاودێریی ئەوەوە. هەروەکو لەم حوکمەی دادگای ناوبراو بۆمان دەردەکەوێ: «... کار وکردەوەکانی ئیدارە لە ڕاگرتنی ڕۆژنامە یان هەڵوەشاندنەوەی یان لاربوون لە دەرچوونیدا کاری ئیدارین و دەبێ بەپێی حوکمەکانی دەستوور و یاسا و ڕێساکان ئەنجام بدرێن و هەر بڕیارێکیش لەم بارەیەوە ئەنجام بدات بەبڕیارێکی ئیداریی ئاسایی دادەندرێت و ئەم دادگایە تایبەتمەند دەبێ بەتەمەشاکردنی دروستیی و نادروستییەکەی و دادگا مافی چاودێریکردنی ئیداری هەیە بۆ ئەوەی بزانێ ئایا دەرکردنی ئەو بڕیارە لەگەڵ حوکمەکانی دەستوور و یاسا و ڕێساکان گونجاوە تاکو حوکم بەدروستییەکەی بدات یان لەگەڵ ئەم حوکمانەدا ناگونجێ تاکو حوکم بەپووچەڵکردنەوەی بدات...»[٤٣٦].

بەم پێیە، دادگای کارگێڕی بەبۆنەی تانەدان (الطعن) لە بڕیارێکی سەرۆک کۆمار ژمارە (٤٩٤)ی ساڵی ١٩٨١ کە تایبەتە بەهەڵوەشاندنەوەی گۆڤاری «الدعوة» و ڕۆژنامەی «الشعب» بەپێی حوکمی ماددە (٧٤)ی دەستوور لە حوکمێکیدا دەڵێ: «بڕیاردان بەهەڵوەشاندنەوەی گۆڤاری «الدعوة» و ڕۆژنامەی «الشعب» دەبێتە مایەی دەسبەسەراگرتنی ئازادیی ڕادەربڕین و مافی گوزارشتکردن لە ڕێگای کەناڵە ڕەواکانی گوزارشتکردن، لەوانەش کەناڵی ڕۆژنامەگەری، کە ئەو مافانەن کە هەموو هاووڵاتییەک بەپێی ماددە (٤٧)ی دەستوور هەیەتی و بۆ زامنکردنی ئەم دوو مافە ماددە (٤٨)ی دەستوور کەفالەتی ئازادیی ڕۆژنامەگەری کردووە و لە هەڵوەشاندنەوەی کارگێڕیش

٤٣٥- حوکمی دادگای کارگێڕیی ژمارە (٥٩٧) لە ٢٩ یونیۆ ١٩٥١ دەرچووە و لە کۆدی حوکمەکانی دادگای کارگێڕی ژمارە (٣٥٧)ی ساڵی پێنجەم ل ٩٩ بڵاوبۆتەوە. بڕوانە عبدالرحمن احمد المختار: حرية الصحافة وتنظيمها الدستوري والقانوني في اليمن (دراسة مقارنة)، سەرچاوەی پێشوو ل ٤٦.

٤٣٦- حوکمی دادگای کارگێڕیی ژمارە(٥/٥٨٧) لە ١٩٥١/٦/٢٩ لە د. حمدي ياسين عكاشة: القرار الاداري في قضاء مجلس الدولة، منشأة المعارف بالاسكندرية، ١٩٨٧، ل ٢١٢-٢١٣ وەرگیراوە.

دەپارێزێ هەرچەندە لە حاڵەتی پێویستیشدا بێت وەک کاتی شەڕ و حاڵەتەکانی نائاسایی، چونکە ئازادی ڕۆژنامەگەریی ئامانجی ڕەخساندنی کەش و هەوایەکی ئازادە بۆ پەرەپێدانی کۆمەڵ...»[٤٣٧].

لەم حوکمانەی سەرەوەدا ڕۆڵی دادگای کارگێڕیی میسریمان لە زامنکردنی ئازادیی ڕۆژنامەگەری لە ڕێگای چاودێریکردنی ڕەوایی بڕیارەکانی ئیدارە بۆ دەردەکەوێ کە چۆن بۆتە پاڵپشتێک بۆ ئازادیی ڕۆژنامەگەری و لە دەستدرێژیی ئیدارە دەیپارێزێت.

٢- چاودێری دادگەری لەسەر ڕەوایەتی بڕیارەکانی ئیدارە لە یاسای لوبناندا

سیستمی دادوەری لە لوبنان لەسەر بنەمای سیستمی جووت دادگایی دامەزراوە. بۆیە دوو لایەنی دادوەری لە لوبناندا هەیە، هەردووکیان لێکجیاواز و سەربەخۆن. لایەنێکیان تایبەتە بەیەکلاکردنەوەی ئەو کێشانەی کە لە نێوان تاکەکانی کۆمەڵ ڕوو دەدەن بێ ئەوەی ئیدارە لایەنێک بێت لە لایەنەکانی و پۆلێنیش کراوە بۆ چەند پۆلێک کە دادگای پیاچوونەوە (تمییز) لە سەرووی هەموویانەوە دێت. لایەنێکی تریشیان دادگای کارگێڕییە و تایبەتە بەیەکلاکردنەوەی ئەو کێشانەی کە لە نێوان تاکەکانی کۆمەڵ و ئیدارە ڕوو دەدەن، ئەنجوومەنی شورای دەوڵەت لە سەرووی ئەم دادگایەوەیە.

هەر لەو ڕۆژەوەی دەوڵەتی لوبنان دامەزراوە دادگای کارگێڕیی لوبنانی، تا دەرچوونی مەرسومی یاسایی ژمارە (١١٩)ی ساڵی ١٩٥٩ کە ئێستاکە کاری پێ دەکرێت، بەگەلێک قۆناغدا تێپەڕیوە و پێشکەوتنێکی زۆری بەخۆیەوە بینیوە[٤٣٨].

بەپێی ماددەی (٥٠) لە مەرسومی یاسایی ژمارە (١١٩)ی ساڵی ١٩٥٩ ئەنجوومەنی شورای لوبنانی تایبەتمەندە بەتەمەشاکردنی هەموو کێشە کارگێڕییەکان، ئەگەر یاسادانەر ئەرکی تەمەشاکردنەکەی بەدادگایەکی تر نەسپاردبێت[٤٣٩].

بەم پێیە، ئەنجوومەنی شورای لوبنانی لایەنی تایبەتمەندە بەتەمەشاکردن و

---

٤٣٧- بڕیاری دادگای کارگێڕی ژمارە (٣١٢٣) لە ١١ ئەبرایەر ١٩٨٣ لە د. محمد باهی ابو یونس: التقييد القانوني لحرية الصحافة (دراسة مقارنة)، سەرچاوەی پێشوو ل ٦٧٧ وەرگیراوە.

٤٣٨- د. محسن خليل: القضاء الاداري اللبناني ورقابته لاعمال الادارة. منشورات دار النهضة العربية، بيروت، لبنان، ١٩٧٨ ل١٩٩-٢٠٠.

٤٣٩- ئەمەش دەقەکەیەتی: «ئەنجوومەنی شورا دادگایەکی ئاساییە بۆ تەمەشاکردنی کێشە کارگێڕییەکان».

یەکلاکردنەوەی گشت ئەو کێشانەی کە ئیدارە لایەنێکە لە لایەنەکانی، تەنها ئەو کێشانە نەبێت کە ڕێزپەڕ کراون یان ئەرکی تەمەشاکردن و یەکلاکردنەوەیان بەمەرسومی یاسایی بەدادگایەکی تر سپاردرابێت.

هەروەها دادگای کارگێڕیی تایبەتی (المحكمة الادارية الخاصة) کە بەمەرسومی یاسایی ژمارە (٣)ی ساڵی ١٩٥٤ دامەزراوە، بەپێی حوکمەکانی ئەم مەرسومە تایبەتمەندە بەتەمەشاکردن و یەکلاکردنەوەی هەندێک کێشەی کارگێڕی کە لە دووتوێی مەرسومەکەدا دیارکراون. ئەم دادگایە بارەگایەکەی لە بەیروتە و لەشار و شارۆچکەکانی تردا نییە[٤٤٠].

بەپێی ماددەی دووەمی مەرسومی یاسایی ژمارە (٣)ی ساڵی ١٩٥٤ ئەم دادگایە تایبەتمەندە بەتەمەشاکردنی داوای قەرەبووکردنەوەی ئەو زیانانەی کە لە ئاکامی ڕاپەراندنی کارە گشتییەکان (اشغال عامة)دا لە خەڵک کەوتوون.

هەروەها ئەو کێشانەی کە پەیوەندییان بەگرێبەست و کڕین و فرۆشتن و ئەو ئەرکانەوە هەیە کە ئیدارە بۆ دابینکردنی بەڕێوەبردنی دەزگا گشتییەکان ئەنجامی داون. هەروەها ئەو کێشانەی کە پەیوەندییان بەموڵکە گشتییەکانەوە (الاملاك العامة) هەیە.

لەم دەقەدا بۆمان دەردەکەوێ کە دادگای کارگێڕیی تایبەتی، تەنها تایبەتە بەو کێشانەی کە بەشێوەیەکی دیاریکراو لە دەقی ماددەی ناوبراودا هاتووە و بۆی نییە بێ لەوانە سەیری هیچ کێشەیەکی تر بکات.

بۆیە، ئەنجومەنی شورای لوبنانی تایبەتمەندە بەتەمەشاکردن و یەکلاکردنەوەی گشت کێشەکانیتر، بەکێشەی ئازادیی ڕۆژنامەگەرییشەوە، ئەگەر هاتوو ئیدارە لە ڕێگای بڕیارە ناشەرعییەکانیدا دەستدرێژی بکاتە سەر.

دادگای کارگێڕیی تایبەتی، وەک دادگایەکی پلە یەک، تەمەشای ئەو کێشانەی سەرەوە دەکات و ئەنجومەنی شورای دەوڵەتیش تێیان هەڵدەچێتەوە.

کەواتە دادگای کارگێڕیی تایبەتی بۆی نییە تەمەشای داوای هەڵوەشانەوەی بڕیارە

---

٤٤٠- شایەنی ئاماژەبۆکردنە، ئەم دادگایە بەمەبەستی سووککردنی ئەرکی سەرشانی ئەنجومەنی شورا و یەکلاکردنەوەی کێشە کارگێڕییەکان بەخێرایی دامەزرا، چونکە لایەنەکانی کێشە گلەیی و گازاندەیەکی زۆریان لە ئەنجومەنی شورا هەبوو سەبارەت بەدواخستنی کێشەکانیان. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە د. محسن خليل: القضاء الاداري اللبناني ورقابته لاعمال الادارة، سەرچاوەی پێشوو ل ٣١٧.

ناشەرعییەکانی ئیدارە بکات[441]، بەڵکوو تەنها ئەنجوومەنی شورا بۆی هەیە تەمەشای بکات هەروەکوو لە دوا برگەی ماددەی دووەمی مەرسومی یاسایی ناوبراودا بۆمان دەردەکەوێ کە ئەمەش دەقەکەیەتی: «لە هەموو حاڵەتێکدا کێشەکانی دەستدرێژیکردنە سەر سنووری دەسەڵات (دەسەڵات بەزاندن) تەنها لەژێر دەسەڵاتی ئەنجوومەنی شورا دەمێنێتەوە.

بەم شێوەیە داوای هەڵوەشانەوە لە لوبناندا بەپلە یەک تەنها لەبەردەم ئەنجوومەنی شورا تەمەشا دەکرێت[442].

٣- چاودێری دادگەری لەسەر ڕەوایەتی بڕیارەکانی ئیدارە لە یاسای فەرەنسیدا

سیستمی دادوەری لە فەرەنسا لەسەر بنەمای جووت دادگایی دامەزراوە. واتە دوو جۆرە دادگا هەیە، یەکەمیان، دادگای ئاسایییە و دادگای پیاچوونەوە لە سەرووی هەموویانەوەیە و تایبەتمەندە بەیەکلاکردنەوەی ئەو کێشانەی کە لە نێوان تاکەکانی کۆمەڵ ڕوو دەدەن بێ ئەوەی ئیدارە لایەنێک بێت لە لایەنەکانی. دووەمیشیان، دادگای کارگێڕییە و ئەنجوومەنی دەوڵەت لە سەرووییەوەیەتی و تایبەتە بە یەکلاکردنەوەی ئەو کێشانەی کە ئیدارە لایەنێکە لە لایەنەکانی[443]. ئەنجوومەنی دەوڵەتی فەرەنسی ڕۆڵێکی بەرچاوی هەیە لە زامنکردنی ئازادیی ڕۆژنامەگەریدا، لە ڕێگای هەڵوەشاندنەوەی ئەو بڕیارە ناشەرعییانەی کە ئیدارە بۆ ڕێکخستنی ئەم ئازادییە دەریان دەکات.

لەم حوکمەی خوارەوەدا ڕۆڵی ئەنجوومەنی دەوڵەتی فەرەنسیمان لە چاودێریکردنی شەرعییەتی بڕیارەکانی ئیدارە لە بواری ڕۆژنامەگەریدا بۆ دەردەکەوێ.

ئەنجوومەنی دەوڵەتی فەرەنسی لە ١٩٦٠/٦/٢٤ لە کێشەی «Framper et societe Societe France Editions et publications» حوکمی داوە بەهەڵوەشانەوەی دوو بڕیاری کارگێڕی کە حاکمی ویلایەتی جەزایری ژێر دەسەڵاتی داگیرکەری فەرەنسی لە ١٩٥٦/١٢/٢٩ و ١٩٥٧/١/٦ دەری کردووە.

---

٤٤١- مەبەستمان ئەو داوایانەیە کە لە دژی ئیدارە لە ئاکامی بەزاندنی سنووری دەسەڵاتەکەی بەرز دەکرێتەوە.

٤٤٢- د. محسن خليل: القضاء الاداري اللبناني ورقابته لاعمال الادارة، سەرچاوەی پێشوو ل٢٢٢-٢٢٣.

٤٤٣- د. محسن خليل: القضاء الاداري اللبناني ورقابته لاعمال الادارة، سەرچاوەی پێشوو ل١٤٩.

بڕیاری یەکەمیان، تایبەتە بەگلدانەوە و دەستبەسەراگرتنی دوو ژمارەی ڕۆژنامەی «France Soir» کە لە ٣٠ و ١٩٥٦/١٢/٣١ دەرچوونە. بڕیاری دووەمیش تایبەتە بەگلدانەوە و دەستبەسەراگرتنی دوو ژمارەی ڕۆژنامەی «Le monde» و «France Soir» کە لە ٦ و ٧ /١/١٩٥٧ دەرچوونە.

ئەوەی شایەنی باسە، بەپێی ئەو دوو بڕیارە، حکوومەت دەستی بەسەر گشت ژمارەکانی ئەم ڕۆژنامانە داگرت لە سەرتاپای ویلایەتی جەزایر و بۆ داواکاری گشتی هەناردن.

حکوومەت لە دەرکردنی ئەو دوو بڕیارەیدا، پشتی بەمادده (١٠)ی یاسای دادبینی سزایی بەستبوو کە دەسەڵاتی گرتنەبەری گشت ڕێکایەکی پێویست بۆ ئاشکراکردنی کەتن و گەورەکەتن و سەرپێچییەکان (الجنایات و الجنح و المخالفات) بەپارێزگای پاریس و بەڕێوەبەری بەڕێوەبەرایەتییەکان دەدات. لە ئاکامی ئەمەشدا، هەردوو ڕۆژنامەی «Le monde» و «France Soir» دوو داوایان بۆ دادگا بەرز کردەوە. یەکەمیان بۆ قەرەبووکردنەوە بۆ دادگای ئاسایی لە ناوچەی (Seine) بەرزکرایەوە، دووەمیشیان بۆ دادگای کارگێری لە شاری جەزایر بەرزکرایەوە و تیایدا تانەی لە بڕیاری ئیدارە دابوو چونکە لە دەرکردنیدا دەسەڵاتی خۆی بەزاندبوو.

ئەنجوومەنی دەوڵەتی فەرەنسی بەر لە هەموو شتێ لەوەی کۆڵیوەتەوە کە ئایا ئەم کارەی کە حکوومەت پێی هەستاوە بۆ گلدانەوە و دەستبەسەراگرتنی ژمارەکانی ئەو دوو ڕۆژنامەیە، ئایا کارێکی ئیدارییە یان دادوەری؟ دوای ئەوەی کە بەکارێکی ئیداری داناوە، بڕیاری بەهەڵوەشاندنەوەی هەردوو بڕیارەکە داوە و ئەم پاساوانەشی بۆ هێناونەتەوە: «ئیدارە لەم بڕیارانەیدا سنووری دەسەڵاتی خۆی بەزاندووە، چونکە لە گلدانەوە و دەستبەسەراگرتندا مەبەستی یاساغکردنی بڵاوبوونەوەی گشت ژمارەکانی ڕۆژنامەیە نەک هەندێک لەو ژمارانە بۆ سەلماندنی تاوانەکان لەبەردەم دادوەری سزاییدا»[٤٤٤]. لەم حوکمەی سەرەوەدا، بۆمان دەردەکەوێ کە ئەنجوومەنی دەوڵەتی فەرەنسی جیاوازی کردووە لە نێوان کاری دادوەری و کاری کارگێڕییەوە بۆ موومارەسەکردنی دەسەڵاتی خۆی لە چاودێریکردنی شەرعییەتی بڕیارەکانی ئیدارەدا.

بۆیە گلدانەوە و دەستبەسەراگرتنی ژمارەکانی ئەو دوو ڕۆژنامەیەی بەکارێکی ئیداری داناوە، مادام ئیدارە لە بڕیارەکانیدا مەبەستی یاساغکردنی بڵاوبوونەوەی گشت ژمارەکان

٤٤٤- بڕوانە، میثم حنظل شریف: التنظیم الدستوري والقانوني لحریة الصحافة في العراق (دراسة مقارنة)، سەرچاوەی پێشوو ل٥١.

بووە نەک هەناردنی چەند ژمارەیەک بۆ داواکاری گشتی بەمەبەستی سەلماندنی تاوانەکان.
هەربۆیە بڕیاری داوە بەهەڵوەشاندنەوەی ئەو دوو بڕیارە ناشەرعییە، چونکە لەگەڵ حوکمی ماددە (١٠)ی یاسای دادبینی سزاییدا ناکۆکن.

لێرەدا ڕۆڵی ئەنجومەنی دەوڵەتی فەرەنسیمان لە پاراستنی ئازادیی ڕۆژنامەگەری لە دەستدرێژی ئیدارە بۆ دەردەکەوێ.

٤- چاودێری دادگەری لەسەر ڕەوایەتی بڕیارەکانی ئیدارە لە یاسای عێراقیدا

بەر لە دەرچوونی یاسای ژمارە (١٠٦)ی ساڵی ١٩٨٩ کە تایبەتە بەهەموارکردنی یاسای ئەنجومەنی شورای دەوڵەت ژمارە (٦٥)ی ساڵی ١٩٧٩، عێراق کاری بەسیستمی تاک دادگایی دەکرد، بۆیە، سەرەڕای ئەوەی یاسا بڕیاری دامەزراندنی دادگای کارگێڕی لە گشت ناوچەکانی تێهەڵچوونەوە لە گرژماری عێراقدا دابوو - لە ناوچەی بەغدا بەحوکمی یاسا و لە ناوچەکانی تریش بەپێی بەیاننامەی وەزیری داد[٤٤٥] - ئینجاش گشت دادگاکان ویلایەتی گشتییان هەبوو[٤٤٦].

کەواتە، لەو شوێنانەی کە دادگای کارگێڕییان تێدانەبوو، دادگا ئاساییەکان بەرۆڵی چاودێریکردنی شەرعییەتی بڕیارەکانی ئیدارە هەڵدەستان.

بەڵام دوای دەرچوونی یاسای ژمارە (١٠٦)ی ساڵی ١٩٨٩ کە تایبەتە بەهەموارکردنی یاسای ئەنجومەنی شورای دەوڵەت ژمارە (٦٥)ی ساڵی ١٩٧٩، عێراق چووە ڕیزی ئەو دەوڵەتانەی کە کار بەسیستمی جووت دادگایی دەکەن. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە تەنها دادگای کارگێڕی بۆی هەیە تەماشای کێشە کارگێڕییەکان بکات و یەکلایان بکاتەوە.

ئەوەی جێی سەرنجە، سەرەڕای ئەوەی عێراق بەهەموارکردنی یاسای ئەنجومەنی شورا چووە ڕیزی ئەو دەوڵەتانەی کە کار بەسیستمی جووت دادگایی دەکەن وەک فەرەنسا و میسر و لوبنان کە پێشتر لێکۆڵینەوەمان لەسەر کردوون، کەچی لە بواری زامنکردنی ئازادیی ڕۆژنامەگەری و چاودێریکردنی شەرعییەتی ئەو بڕیارانەی کە ئیدارە بۆ ڕێکخستنی ئازادیی ڕۆژنامەگەری دەریان دەکات تاکو ئێستا هیچ هەنگاوێک نەچۆتە

---

٤٤٥- بڕوانە دەقی ماددە (٢٤) و (٢٥) لە یاسای ڕێکخستنی دادوەریی ژمارە (١٦٠)ی ساڵی ١٩٧٩.

٤٤٦- ماددە (٣)ی یاسای ڕێکخستنی دادوەریی ژمارە (١٦٠)ی ساڵی ١٩٧٩ دەقنووسی کردووە کە: «ویلایەتی دادگا گشت کەسانی سروشتی و مەعنەوییە گشتی و تایبەتییەکان دەگرێتەوە تەنها ئەوانە نەبێت کە بەدەقێکی تایبەتی ڕیزپەڕ کراون».

پێشەوە. چونکە دەسەڵاتی دادگای کارگێڕی لەچاودێریکردنی ئەو بڕیارانەی ئیدارە کە بەپشت بەستن بەیاسای ژمارە (٢٠٦)ی ساڵی ١٩٦٨ دەردەچن، ڕووبەڕووی دەقی ماددە (٣٠) بڕگەی (ب) لە یاسای ناوبراو دەبنەوە کە مافی چاودێریکردنی ئەو بڕیارانەی لە دادگای کارگێڕی سەندۆتەوە کە بەپێی یاسای ناوبراو دەردەچن[447].

کەواتە، بۆ تانەگرتن لەو بڕیارانەی کە ئیدارە بەپێی یاسای چاپەمەنی دەریان دەکات، ئەو کەسەی بەرژەوەندی لەو تانە گرتنە دایە بۆی نییە پەنا بباتە بەر دادگای کارگێڕی، بەڵکوو بۆی هەیە ڕێگای بەرزکردنەوەی سکاڵای ئیداری (التظلمات الادارية) بگرێتەبەر، جا بۆ ئەم مەبەستەش، ئەو کەسەی داوایەکەی بۆ وەرگرتنی مۆڵەتی دەرکردنی ڕۆژنامە لەلایەن وەزیری ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندن ڕەت کراوەتەوە، بەپێی ماددە (٧)ی یاسای چاپەمەنی عێراقی بۆی هەیە لە ماوەی پانزە ڕۆژ، لە ڕۆژی ئاگادارکردنەوەی، لەبەردەم ئەنجوومەنی وەزیرانەوە تانەی لێ بدات[448]. بەڵام سەبارەت بەئیجرائات و سزاکانی تر کە ئیدارە لە دژی ڕۆژنامە و ڕۆژنامەنووسان دەریان دەکات، دەکرێ لەڕێگای بەرزکردنەوەی سکاڵای ئیدارییەوە تانەیان لێ بدرێ، هەرچەندە یاسای چاپەمەنی عێراقی ئەمەی دەقنووس نەکردووە[449]. لەم حاڵەتەشدا، ڕێگای سکاڵای ئیداری (التظلمات الادارية)ئەو ڕۆڵەی نامێنێ کە دادگای کارگێڕی لەپاراستنی ئازادیی ڕۆژنامەگەریدا دەیبینێ، چونکە ئیدارە لەیەک کاتدا هەم بەرەکان(خصم)دەبێت و هەمیش خۆی دادوەر دەبێت.

ئەمەو دەقی ماددە (٣٠) بڕگەی (ب) ناکۆکە لەگەڵ دەقی ماددە (٨)ی جاڕی جیهانیی مافی مرۆڤ[450] و بڕگە (ب)ی ماددە (٦٣) دەستوور کە کەفالەتی مافی دادبینیی بۆ هەموو هاووڵاتییان کردووە[451]. بۆیە، دەقی ناوبراو بەدەقێکی نادەستووری دادەندرێت، هەر لەم ڕوانگەیەشەوە داوا لە یاسادانەری عێراقی دەکەین کە ئەم دەقە هەڵبوەشێنێتەوە

---

٤٤٧- ئەمەش دەقەکەیەتی: «بەپێی حوکمەکانی ئەم یاسایە شکایەتەکانی تایبەت بەڕێوشوێن و سزا کارگێڕییەکان لەبەردەم دادگادا نابیسترێن».

٤٤٨- ئەمەش دەقەکەیەتی: «یحق لمن رفض طلبه وفق الفقرة (أ) من هذه المادة الاعتراض على قرار الوزير لدى مجلس الوزراء خلال خمسة عشر یوما من تأريخ تبلغه ويكون قرار المجلس نهائيا».

٤٤٩- د. عصام عبدالوهاب البرزنجي: مجلس شورى الدولة وميلاد القضاء الاداري العراقي، مجلة العلوم القانونية، المجلد التاسع، العدد (١-٢)، بغداد، ١٩٩١ ل١٥٠-١٥١.

٤٥٠- ئەمەش دەقەکەیەتی: «هەموو کەسێک بۆ داوەریکردن و پاراستنی مافە بنەڕەتییەکانی کە یاسا و دەستوور پێی داوە، لە دەستدرێژی کردنەسەر، مافی پەنابردنەبەر دادگا نیشتمانییەکانی هەیە».

٤٥١- ئەمەش دەقەکەیەتی: «مافی دادبینیی بۆ هەموو هاووڵاتییەک کەفالەت کراوە».

بۆ ئەوەی دادگای کارگێڕی ڕۆڵی خۆی لە پاراستن و کەفالەتکردنی ئازادیی ڕۆژنامەگەری لە دەستدرێژییەکانی ئیدارە وەکو پێویست ببینێ.

## ٥- چاودێری دادگەری لەسەر ڕەوایەتی بڕیارەکانی ئیدارە لە یاسای هەرێمی کوردستاندا

بەپێی یاسای دەسەڵاتی دادوەریی هەرێمی کوردستان ژمارە (١٤)ی ساڵی ١٩٩٢ی هەموارکراو لە هەرێمی کوردستاندا پێڕەوی سیستمی تاک دادگایی دەکرێت هەروەکو لە ماددەی سێیەمی ئەم یاسایەدا بۆمان دەردەکەوێ کە تیایدا هاتووە: «ویلایەتی دادگا گشت کەسانی سروشتی و مەعنەوی و لەگەڵیاندا حکومەتیش دەگرێتەوە و تایبەتمەند دەبێ بەیەکلاکردنەوەی گشت کێشە و تاوانەکان».

لەم دەقەی سەرەوەدا بۆمان دەردەکەوێ کە یاسادانەری کوردستان بەپێچەوانەی یاسادانەری میسری و لوبنانی و فەرەنسی و عێراقی، دانی بەسیستمی جووت دادگاییدا نەناوە، بۆیە ڕاشکاوانە لە ماددەی ناوبراودا ئەرکی یەکلاکردنەوەی گشت کێشەکانی - بەکێشە ئیدارییەکانیشەوە - بەدادگا ئاساییەکان سپاردووە کە دادگای پیاچوونەوە (تمییز) لە سەرووی هەموویانەوە دێت.

شایەنی ئاماژەبۆکردنە، هەرچەندە هەرێمی کوردستان کار بەسیستمی تاک دادگایی دەکات، بەڵام سەرەڕای ئەمەش، دەسەڵاتی دادگەری لە هەرێمی کوردستان لەچاو عێراق زیاتر ڕۆڵی خۆی، لە چاودێریکردنی ئەو بڕیارانەی کە ئیدارە بۆ ڕێکخستنی ئازادیی ڕۆژنامەگەری و جێبەجێکردنی یاسای چاپەمەنی لە هەرێمی کوردستاندا، دەبینێ. چونکە یاسای چاپەمەنی هەرێمی کوردستان ژمارە (١٠)ی ساڵی ١٩٩٢ بەپێچەوانەی یاسای چاپەمەنی عێراقی ژمارە (٢٠٦)ی ساڵی ١٩٦٨ هیچ دەقێکی وەهای تێدا نییە کە ڕێگا لە دادگا بگرێ بۆ بینینی ئەو داوایانەی دژی ئیدارە لە جێبەجێکردنی یاسای چاپەمەنی بەرز دەکرێنەوە. تەنانەت لە بڕگە (٤)ی ماددە (٥)ی یاسای چاپەمەنیدا ڕێگای بەو کەسە داوە کە داوایەکەی بۆ وەرگرتنی مۆڵەتی دەرکردنی ڕۆژنامە لەلایەن وەزیری ڕۆشنبیرییەوە ڕەت دەکرێتەوە، لە ماوەی (١٠) ڕۆژ لە ڕۆژی ئاگادارکردنەوەیەوە، لەبەردەم دادگای پیاچوونەوە تانەی لێ بدات[452]. ئەمەش خۆی لە خۆیدا،

---

٤٥٢- ئەمەش دەقەکەیەتی: «لە حاڵەتی ڕەتکردنەوەی داخوازییەکەدا، خاوەنی داخوازییە ڕەتکراوەکە بۆی هەیە لە ماوەی دە ڕۆژدا لەو ڕۆژەی پێی ڕادەگەیەنرێ، لەلای دادگای پیاچوونەوەی هەرێم، تانە لە بڕیاری وەزیردا و بڕیاری دادگاش بنبڕ دەبێ».

ئەوە دەگەیەنێ کە ئیدارە هیچ ئیمتیازێکی لە کەسانی تر لەم ڕووەوە زیاتر نییە.

هەڵبەتە ئەم هەڵوێستەی یاسادانەری کوردستان لەگەڵ جاڕی جیهانیی مافی مرۆڤ و بەیاننامەی ڕاگەیاندنی یەکێتیی فیدرالی و ئەو پرنسیپانەی لەخۆی گرتوون، هەروەها لەگەڵ هۆیەکانی دەرچواندنی یاسای ئەنجوومەنی نیشتمانیی کوردستانی عێراق گونجاوە، کە پێشتر ئاماژەمان پێی کردووە[453].

**سێیەم**: پاراستنی نادادگەری

ئەمجۆرە پارێزگارییە لە دەرەوەی دادگادا بەدوو شێوە مومارەسە دەکرێ. یان کەسانێک بەناوی گەل پێی هەڵدەستن، لەو حاڵەتەشدا پێی دەگوترێ «چاودێری ڕامیاری»، یانیش ئیدارە خۆی پێی هەڵدەستێ، لەو حاڵەتەشدا پێی دەگوترێ «چاودێری کارگێڕی».

لەبەر ڕۆشنایی ئەمە، لە خوارەوە لە دوو خاڵدا باسی چاودێری ڕامیاری و چاودێری کارگێڕی دەکەین:

١- چاودێری ڕامیاری

ئەم چاودێرییە دوو جۆری هەیە، چاودێری جەماوەری و چاودێری پەرلەمانی. یەکەمیان، ڕێکخراو و کۆمەڵە و سەندیکا و کەناڵەکانی ڕاگەیاندن و ڕۆژنامەکان دەگرێتەوە و لە ڕێگای دروستکردنی ڕای گشتییەوە پێی هەڵدەستن. دووەمیشیان، پەرلەمان لە ڕێگای تەمەشاکردنی ئەو سکاڵایانەی کە لەلایەن هاووڵاتییانەوە بۆی بەرزدەکرێتەوە پێی هەڵدەستێ[454].

لەبەر ئەوەی دەستووری فەرەنسی لەجیاتی دادگای باڵای دەستووریی، دانی بەئەنجوومەنی دەستووریی داناوە و ئەرکی چاودێریکردنی شەرعییەتی یاساکانی بەم ئەنجوومەنە سپاردووە، هەروەکو لە خاڵی (٤-٣ دووەم، ٢- چاودێری دادگەریی لەسەر دەستووریێتیی یاساکان لە دەستووری لوبنانی و دەستووری فەرەنسیدا) لەم تێزەدا ئاماژەمان پێی کردووە، بۆیە لە خوارەوە لە دوو خاڵدا بەدرێژی باسی ئەم چاودێرییە لە دەستووری فەرەنسی ساڵی ١٩٥٨ و دەستووری لوبنانی ساڵی ١٩٢٦ دا دەکەین:

---

٤٥٣- بڕوانە بڕگەی (٣-١-٦) لەم تێزەدا.

٤٥٤- د. فاروق احمد خماس: الرقابة علی اعمال الادارة، سەرچاوەی پێشوو ل٦٧-٦٩، وە. سامی جمال الدین: الرقابة علی اعمال الادارة، سەرچاوەی پێشوو ل ١٩٦-٢١٠.

٦ - چاودێری ڕامیاری لە یاسای فەرەنسیدا

بەپێی دەستووری ساڵی ١٩٥٦، لە فەرەنسا لەجیاتی دادگای باڵای دەستووریی، ئەرکی چاودێریکردنی دەستووریێتیی یاساکان بەئەنجوومەنی دەستووریی سپێردراوە.

ئەمەش مانای ئەوەیە، یاسادانەری فەرەنسی جیاواز لە یاسادانەری میسری، کاری بەسیستەمی چاودێری ڕامیاری کردووە، هەروەکو لە بابی حەوتەمی دەستووری ساڵی ١٩٥٨ بۆمان دەردەکەوێ کە لەژێر ناونیشانی (ئەنجوومەنی دەستووریی) لە ماددە (٥٦) تا (٦٣)ی بۆ ڕێکخستنی ئەم ئەنجوومەنە و چۆنێتی چاودێریکردنی دەستووریێتیی یاساکان تەرخان کردووە. بەم پێیە، ئەنجوومەنی دەستووریی ئەرکی چاودێریکردنی دەستووریێتیی یاساکانی لە ئەستۆ دایە، هەروەها چاودێری حکوومەتیش دەکات لە مومارەسەکردنی ئەو دەسەڵاتەی کە بۆ دانانی یاساو ڕێساکان بەپێی یاسا پێی دراوە[455].

دەستووری فەرەنسی ساڵی ١٩٥٨ لە ماددەی (٥٦)دا چۆنێتی پێکهێنان و دەسەڵاتەکانی ئەم ئەنجوومەنەی دەستنیشان کردووە. ئەم ئەنجوومەنە لە نۆ ئەندام و سەرۆک کۆمارەکانی پێشووی فەرەنسا پێکدێت. ئەم نۆ ئەندامانە بۆ ماوەی نۆ ساڵ لەو ئەنجوومەنە بەئەندام دەمێننەوە و جارێکی تر ئەندامێتییەکەیان نوێ ناکرێتەوە، بەڵام سەرۆک کۆمارەکانی پێشووی فەرەنسا، بۆ سوود وەرگرتن لە ئەزموون و سیاسەتەکەیان و ئەو شارەزاییەی کە لە ژیانی سەرۆکایەتیدا وەدەستیان هێناوە، بەحوکمی یاسا بەدرێژایی ژیانیان لەو ئەنجوومەنە بەئەندام دەمێننەوە.

ئەمەو، هەر یەکێک لە سەرۆک کۆمار و سەرۆکی کۆمەڵەی نیشتمانی (رئيس الجمعية الوطنية) و سەرۆکی ئەنجوومەنی پیران، بۆ ئەندامێتی ئەو ئەنجوومەنە هەڵدەبژێرن و هەر سێ ساڵ جارێکیش سێیەکی ئەندامان دەگۆڕدرێن، بەچەشنێک سەرۆک کۆمار سەرۆکی ئەو ئەنجوومەنە هەڵدەبژێرێ (دەستنیشان دەکات).

بێ گومان گرنگیی ئەو هەڵبژاردنەمان لەکاتی دەنگداندا بۆ دەردەکەوێ، کاتێک دژە دەنگەکان یەکسان دەبن، چونکە تەرجیحی ئەو لایەنە دەکرێ کە دەنگی سەرۆکی لەگەڵە[456].

---

٤٥٥- د. علي سبتي محمد: وسائل حماية المشروعية، سەرچاوەی پێشوو ل٣٩.

٤٥٦- ئەمەش دەقەکەیەتی بەزمانی فەرەنسی:

"Le Conseil constitutionnel comprend neuf membres , don't le mandat dure =

ئەنجوومەنی دەستووریی بۆ چاودێریکردنی دەستووریتیی یاساکان بەپێی ماددە (٦١)ی دەستوور، دوو جۆرە سانسۆر مومارسە دەکات. یەکەمیان، چاودێرییەکی پێویستە دوای ئەوەی پرۆژە یاسایەکان بەر لە دەرچوونیان و ڕێساکانی لیژنەکانی پەرلەمان بەر لە جێبەجێکردنیان بۆی بەرز دەکرێنەوە، دەبێ ئەنجوومەن لە خۆیەوە پێی هەستێ بۆ ئەوەی بڕیار بدات تا چ ڕادەیەک ئەو پرۆژە و لائیحانە لەگەڵ دەستوور گونجاون؟ دووەمیشیان، چاودێرییەکی جەوازییەو هەر یەکێک لە سەرۆک کۆمار و سەرۆک وەزیرانی یەکەم و سەرۆکی ئەنجوومەنی نوێنەران و سەرۆکی ئەنجوومەنی پیران[٤٥٧] بۆیان هەیە پرۆژەکانی یاسا بەر لە دەرچوونیان بەمەبەستی چاودێریکردنی دەستووریتییان بۆ ئەنجوومەنی دەستووریی بەرز بکەنەوە[٤٥٨].

---

= neuf ans et n,est pas renouvelable. Le Conseil constitutionnel se renouvelle par tiers tous les trois ans. Trois des membres sont nommes par le President de la Republique, trois par le President de l,Assemblee Nationale, trois par le President du Senat. En sus des neuf membres prevus ci-dessus, font de droit partie a vie au Conseil constitutionnel les anciens Presidents de la Republique. Le President est nomme pa. [illegible] President de la Republique

Il a voix preponderante en cas de partage"

٤٥٧- ئەم دەقــە لە ١٩٧٤/١١/٩ هەمــوارکــراوە و بەپێی ئەم هەمــوارە شەســت ئەندام [illegible] ئەندامــانی ئەنجـوومـەنی نوێنەران و ئەنجـوومـەنی پیـران بۆیان هەیە داوای هەناردنی ئەو پرۆژە یاسـایانە بۆ ئەنجوومەنی دەستووریی بکەن بۆ تەمشـاکردنی دەسـتووریتییان. بڕوانە: میثم حنظل شریف: التنظيم الدستوري والقانوني لحرية الصحافة في العراق (دراسة مقارنة)، سەرچاوەی پێشوو ل٣٩.

٤٥٨- ئەمەش دەقەکەیەتی بەزمانی فەرەنسی:

"Les lois organiques, avant leur promulgation, et les reglements des assemblees parlementaires, avant leur mise en application, doivent etre soumis au Conseil constitutionnel qui se prononce sur leur conformite a la Constitution

Aux memes fins, les lois peuvent etre deferees au Conseil constitutionnel, avant leur promulgation, par le President de la Republique, le Premier Ministre, le President de l,Assemblee Nationals, le president du Senat ou soixante deputes ou soixante senateurs.

Dans les cas memes cas , prevus auv deux alineas precedents , le Conseil constitutionnel doit statuer dans le delai d,un mois. Toutefois, a la demande du Gouvernement, a,il y a urgence, ce delai est ramene a huit jours.

Dans ces memes cas, la saisine du Conseil constitutionnel suspend le delai de promulgation"

ئەمەو، بەپێی مادده (٦٢)ی دەستووری فەرەنسی، ئەو بڕیارانەی کە ئەنجومەنی دەستووریی دەریان دەکات، بەهیچ شێوەیەک تانەیان لێ نادرێ و سەپاوەن بۆ دەسەلاتە گشتییەکان و گشت دەسەلاتە ئیداری و دادوەرییەکان، هەروەها ئەو دەقانەش کە نادەستوورین، نابێ دەربکرێن یان جێبەجێ بکرێن[٤٥٩].

ئەنجومەنی دەستووری فەرەنسی ڕۆڵێکی سەرەکی بینیوە لە پاراستن و زامنکردنی ئازادی ڕۆژنامەگەریدا و توانیویەتی متمانەی هاوولاتییان و کەمایەتییەکانی ناو پەرلەمان (الاقلية البرلمانية) کە پەنای دەبەنەبەر بۆ ساغکردنەوەی دەستوورکۆکی ئەو پرۆژە یاسایانەی کە گومان لە دەستووریتییەکەیان دەکرێت، وەدەست بهێنێت[٤٦٠].

بڕیاری ژمارە (١٨١)ی ئەنجومەنی دەستووریی فەرەنسی کە لە ١١/١٠/١٩٨٤ سەبارەت بەپرۆژەی یاسای هەموارکردنی سیستمی دەزگا ڕۆژنامەوانییەکان بەگشتی و چاودێریکردنی داهاتە داراییەکانی دەزگا ڕۆژنامەوانییەکان بەتایبەتی دەری کردووە باشترین بەلگەیە بۆ ئەو ڕۆڵە ئیجابییەی کە ئەنجومەنی دەستووریی لە چاودێریکردنی دەستووریتیی یاساکان لە فەرەنسا دەیبینێ[٤٦١].

خستنەڕووی پرۆژەی ئەم یاسایە لەلایەن حکومەتەکەی (Mauroy) لەساڵی ١٩٨٣ بووە مایەی وروژاندنی دەمەتەقێیەکی گەرم و دوای (٢١٨) کاتژمێر گفتوگۆکردن ئینجا لە دانیشتنێکی گشتیدا پەسند کراو ئەنجومەنی دەستوورییش هەر لە هەمان ڕۆژ لەسەر داوای (١٥٢) ئەندام لە ئەندامانی ئەنجومەنی پیران و (٩٩) ئەندام لە ئەندامانی ئەنجومەنی نوێنەران دانیشت و بەپێی برگەی دووەمی ماددەی (٦١)ی دەستووریی فەرەنسی لە ١١/١٠/١٩٨٤ لە کۆی (٤٥) ماددەی پرۆژەی یاسای ناوبراو، بڕیاری

---

٤٥٩- ئەمەش دەقەکەیەتی بەزمانی فەرەنسی:

"Une disposition declaree inconstitutionnel ne peut etre promulguee ni mise en pplication. Les decisions du Conseil constitutionnel ne sont susceptibles d.aucun recours. Elles s.imposent aux pouvoirs publice et a toutes les autorites administratives ■ juridictionnelles"

٤٦٠- میثم حنظل شریف: التنظیم الدستوري والقانوني لحریة الصحافة في العراق (دراسة مقارنة)، سەرچاوەی پێشوو ل٣٩.

٤٦١- میثم حنظل شریف: التنظیم الدستوري والقانوني لحریة الصحافة في العراق (دراسة مقارنة)، سەرچاوەی پێشوو ل٣٩.

بەهەڵوەشاندنەوەی گشت یان بەشێک لە ناوەڕۆکی (١٠) مادده لەو ماددانە دا. هەروەها بڕیاری بەدەستوورکۆکی ماددەکانی تر داو داتی بەوەنا کە دەکرێ ئەو ماددانەی تانەیان لێ نەدراوە لە ماددەکانی تر جیا بکرێنەوە، ئەمەش وایکرد کە ئەو یاسایە لە ٢٣/ ١٠/ ١٩٨٤ دەربچێت[٤٦٢].

ب - چاودێری رامیاری لە یاسای لوبنانی و عێراقیدا

دەستووری لوبنانی ساڵی ١٩٢٦ لە ماددەی (١٩)دا ئەرکی چاودێریکردنی رامیاری بەئەنجوومەنی دەستووریی سپاردووە. ئەم ئەنجوومەنە لەسەر داوای هەر یەکێک لە سەرۆک کۆمار و سەرۆکی ئەنجوومەنی نوێنەران و سەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیران یان ■ ئەندام لە ئەندامانی ئەنجوومەنی نوێنەران بەکاری چاودێریکردنی دەستوورکۆکی یاساکان هەڵدەستێ[٤٦٣].

بەڵام لە عێراقدا، ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش کە دەسەڵاتی دانان و هەمووارکردنی یاساکانی هەیە[٤٦٤] بۆیە مومارەسەی چاودێری رامیاری دەستوورکۆکی یاساکان لە عێراقدا دەکات و بۆی هەیە ئەو یاسایانەی کە لەگەڵ حوکمەکانی دەستوور ناکۆکن، هەموواریان بکات یان هەڵیان بوەشێنێتەوە[٤٦٥].

---

٤٦٢- میثم حنظل شریف: التنظیم الدستوري والقانوني لحریة الصحافة في العراق (دراسة مقارنة)، سەرچاوەی پێشوو ل ٣٩-٤٠.

٤٦٣- ئەمەش دەقەکەیەتی: «بۆ چاودێریکردنی دەستوورکۆکی یاساکان و یەکلاکردنەوەی ئەو کێشەو تانانەی کە لە ئاکامی هەڵبژاردنەکانی پەرلەمان و سەرۆکایەتی دێنە ئاراوە، ئەنجوومەنی دەستووریی دادەمەزرێ.

سەرۆک کۆمار و سەرۆکی ئەنجوومەنی نوێنەران و سەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیران یان ■ ئەندام لە ئەندامانی ئەنجوومەنی نوێنەران بۆ چاودێریکردنی دەستووریتیی یاساکان مافی سەردانی (بەسەرکردنەوە - مراجعة) ئەم ئەنجوومەنەی هەیە...».

٤٦٤- بڕوانە بڕگەی (أ) لە ماددەی (٤٢)ی دەستووری عێراقی ساڵی ١٩٧٠ کە ئەمەش دەقەکەیەتی: «ئەنجوومەنی سەرکردایەتیی شۆڕش مومارەسەی ئەم دەسەڵاتانەی خوارەوە دەکات:

أ- دەرکردنی ئەو یاسا و بڕیارانەی کە هێزی یاساییان هەیە... هتد».

٤٦٥- أزهار عبدالکریم عبدالوهاب: الحقوق والحریات العامة في ظل الدساتیر العراقیة، سەرچاوەی پێشوو ل ٢٤٧، و د. علي سبتي محمد: وسائل حمایة الشروعیة، سەرچاوەی پێشوو ل ٤٤-٤٦.

٢- چاودێری کارگێری

چاودێری کـارگـێـری بریتـیـیـه لەو خـۆرد چاودێرییـەی کـه ئـیـدارە پێی هەڵدەسـتێ بۆ چاودێریکردنی کارەکانی خۆی لە ڕووی گونجی و ناکۆکییەوە لەگەڵ یاسادا یان لەڕووی گونجانی لەگەڵ ئەو ئامانجەی لە پێناویدا دەرچووە[٤٦٦].

ئەم چاودێریکردنە لەلایەن ئیدارەوە لە ڕێگای پێداچوونەوەی ئەو کارانەی کە ئەنجامی داون دێتە دی. هەندێک جار لەو پێداچوونەوەیەدا ئیدارە بۆی دەردەکەوێ کە لە دەرکردنی هەندێک لە بڕیارەکانی سەرپێچی حوکمەکانی یاسای کردووە، بۆیە لەو بڕیارانەی پاشگەز دەبێتەوە و هەڵیاندەوەشێنێتەوە یانیش هەمواریان دەکات یا دەیانکێشێتەوە[٤٦٧].

کەواتە ئیدارە خۆی چاودێریکردنی ڕەوایەتی ئەو کـارانەی خـۆی دەکات بەرلەوەی لە ڕێگای چاودێری دادگەرییەوە تانەی ئەوەی لێبدرێ کە بڕیارێکی ناڕەوایە. جا لەبەرئەوەی ئامانجی ئیدارە لە کارەکانی، بەدیهێنانی بەرژەوەندیی گشتییە، بۆیە چاودێریی کارەکانی خـۆی تەنهـا لەڕووی گـۆنجی و نـاکـۆکـیـیـانەوە لەگـەڵ یاسـادا نـاکـات، بەڵکـو لەڕووی گونجاوێتیشیانەوە لەگەڵ ئەو ئامانجانەی کە بۆ هێنانەدیان.

بۆیە چاودێریکردنی کـارگـێـری، چاودێریکردنی ڕەوایەتی و چاودێریکردنی گـونجـانە (رقابة مشـروعيـة و رقابة ملائمة) لە هەمان کاتدا. ئەم چاودێریکردنەش یان بەشێوەیەکی لەخۆوەیە کە ئیدارە خۆی ئەنجامی دەدات، یانیش لەسەر داوای ئەو کەسەی کە لە ئاکامی ئەو بڕیارە کارگێرییەدا زیانی پێکەوتووە پێی هەڵدەستێ.

١- چاودێری خۆیەتی (رقابة تلقائية)

ئەمجۆرە چاودێریکردنە بریتییە لە پێداچوونەوەی ئیدارە بەکارەکانی خۆی لەخۆیەوە و لەبەر ڕۆشنایی گـۆنجی و نـاکـۆکـیـیـان لەگـەڵ دەقـەکـانی یاسـادا، یان گـونجـاوێتی و نەگـونجـاوێـتـیـیـان لەگـەڵ ئەو ئامـانجـەی کـە لە پێناویدا دەرچوونە، بڕیاری شـیـاو بەهەڵوەشاندنەوەیان یان هەموارکردنیان یان کێشانەوەیان دەردەکات.

---

٤٦٦- د. ماجد راغب الحلو: القضاء الاداري (مبدأ المشروعية - تنظيم القضاء الاداري)، منشورات دار المطبوعات الجامعية، اسكندرية، ١٩٨٥، ص٦٩، وسامي جمال الدين: الرقابة على اعمال الادارة، سەرچاوەی پێشوو ل٣٢٣.

٤٦٧- د.فاروق احمد خماس: الرقابة على اعمال الادارة، سەرچاوەی پێشوو ل٧٥

ئەم چاودێریکردنەش یان هەمان فەرمانبەر پێی هەڵدەستێ کە بڕیارەکەی دەرکردووە، لەم حاڵەتەشدا پێی دەگوترێ (خود چاودێری)، یانیش بەرپرسی ئەو فەرمانبەرە بەپێی ئەو دەسەڵاتەی پێی دراوە پێی هەڵدەستێ، لەم حاڵەتەشدا پێی دەگوترێ چاودێری سەرەوەیی (الرقابة الرئاسية). هەندێک جاریش لیژنەیەک یان دەستەیەکی تایبەتمەند لەلایەن ئیدارەوە بۆ ئەم مەبەستە دەستنیشان دەکرێ و پێی دەگوترێ (دەستەی چاودێریکردنی کارگێری) یان دیوانی سکاڵا (دیوان المظالم) یان هەر ناوێکی تر[٤٦٨].

٢- چاودێریکردن لەسەر سکاڵای کەسێک (الرقابة بنا و على التظلم)

ئەم چاودێریکردنە لەسەر سکاڵای کەسێک کە بۆ ئیدارە بەرزی دەکاتەوە، سەبارەت بەو زیانانەی کە لە ناکامی ئەو بڕیارەی کە ئیدارە دەریکردووە لێی کەوتووە، ئیدارە پێی هەڵدەستێ.ئەو کەسەی کە لە ناکامی ئەو بڕیارەی کە ئیدارە دەریکردووە، زیانی لێکەوتووە، سکاڵا نامەیەک (تظلم) بۆ ئیدارە بەرز دەکاتەوە و تیایدا داوای هەڵوەشاندنەوە یان هەموارکردن یان کێشانەوەی ئەو بڕیارە دەکات کە ناکۆکە لەگەڵ حوکمەکانی یاسادا. ئەگەر هاتوو سکاڵانامەکە بۆ هەمان ئەو فەرمانبەرە بەرزکرایەوە کە بڕیارەکەی دەرکردووە، پێی دەگوترێ سکاڵانامەی دانپاڵ (تظلم ولائي)، بەڵام ئەگەر بۆ بەرپرسی ئەو فەرمانبەرە بەرزکرایەوە، پێی دەگوترێ سکاڵانامەی سەرکردایەتی (تظلم رئاسي). هەندێک جاریش بۆ لیژنەیەکی تایبەتی بەرز دەکرێتەوە، کە بۆ ئەم مەبەستە دامەزراوە، لەو حاڵەتەشدا پێی دەگوترێ سکاڵانامەی ئیداری (تظلم اداري)[٤٦٩].

لێرەدا بۆمان دەردەکەوێ کە چاودێریکردنی کارگێڕی ئامانجی ڕێزگرتنە لە پرنسیپی ڕەوایەتی. بێ گومان، بۆ هێنانەدی ئەم ئامانجەش، هەڵدەستێ بەکەفالەتکردنی جێبەجێکردن و چەسپاندنی یاسا و پابەندبوون بەسنوورەکەی و زامنکردنی لانەدانی فەرمانبەران و کارمەندان لە حوکمی یاسادا لە مومارەسەکردنی کارەکانیاندا.

ئەمەش خۆی لەخۆیدا، دەبێتە مایەی پاراستنی ماف و ئازادییەکانی مرۆڤ - بە ئازادیی ڕۆژنامەگەرییشەوە - لەو هەڵانەی کە ئیدارە دەیان کات و دەبنە مایەی هەڕەشەکردن لەو مافانەیان.

---

٤٦٨- د.سامي جمال الدين: الرقابة على اعمال الادارة، سەرچاوەی پێشوو ل٢٢٤. و د. ماجد راغب الحلو: القضاء الاداري (مبدأ المشروعية - تنظيم القضاء الاداري)، سەرچاوەی پێشوو ل٦٩

٤٦٩- د.سامي جمال الدين: الرقابة على اعمال الادارة، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٢٤-٢٢٥

**چوارەم**: پاراستنی تاوانکاری (الحماية الجنائية)

١- سەروەریی یاسا

مەبەستمان لە سەروەریی یاسا، پابەندبوونی حوکمڕانان و تاکەکانی کۆمەڵە بەیاساوە[٤٧٠]. سەروەریی یاسا و مافەکانی مرۆڤ بەیەکەوە بەستراونەتەوە و بەهیچ شێوەیەک لە شێوەکان لە یەکتری جیا ناکرێنەوە، چونکە سەروەریی یاسا بەبێ ڕێزگرتنی مافەکانی مرۆڤ بوونی نییە و بەبێ سەروەریی یاساش مافەکان زامنبوونییان نییە[٤٧١]. ئینجا بۆ ئەوەی مافەکانی مرۆڤ زامن بن، دەبێ یاسا سەروەربێت، جا بۆ ئەوەی یاساش سەروەر بێت، دەبێ پێشێل نەکرێت و ڕێزی لێ بگیرێت، دەبێ حوکمڕانان و تاکەکانی کۆمەڵ وەکو یەک پابەندی بن.

بەڵام ئەگەر بێت و تەنیا تاکەکانی کۆمەڵ پابەندی بن و حوکمڕانان پابەندی نەبن، ئەوکاتە یاسا یەکێک لە گرنگترین سیفەتەکانی لەدەست دەدات کە ئەویش سیفەتی سەپاندنییە، چونکە بنچینەی یاسایی کە یەکەیەکە (وحدة) لەو یەکانەی کە یاسای لێ پێکدێت، بریتییە لە: بنچینەیەکی ڕەوشتیی کۆمەڵایەتیی گشتی و موجەڕەدە، پێوەندییەکانی نێوان کەسان لەناو کۆمەڵ ڕێک دەخات، بەستراوەتەوە بەسزایەکی ماددی، دەسەڵاتی تایبەتمەند بەسەر ئەو کەسەی دەسەپێنێ کە سەرپێچی دەکات[٤٧٢].

بۆیە لە حاڵەتی پابەندنەبوونی حوکمڕانان بەو بنچینە یاساییانە، دەبێتە مایەی نێزدیواجییەتی سروشتی سەپاوێتیی بنچینەی یاسایی. ئەمەش خۆی لەخۆیدا ناکۆکە لەگەڵ پرنسیپی یەکگرتوویی سیفەتەکانی بنچینەی یاسایی کە بنچینەیەکی یاسایی سەپاوەن[٤٧٣]. بۆیە ئەگەر تاکەکانی کۆمەڵ پابەندیان بن و حوکمڕانانیش پابەندیان نەبن، لەو حاڵەتەدا بەرامبەر حوکمی یاسا نین، بەڵکو حوکمی هێز.

---

٤٧٠- سمیر خیری توفیق: مبدأ سیادة القانون، سەرچاوەی پێشوو ل١١٧.

٤٧١- م. نجمەدین ئاکرەیی: سەروەریی یاسا و مافەکانی مرۆڤ. گۆڤاری تەرازوو، یەکێتیی مافپەروەرانی کوردستان دەری دەکات، ژمارە (١٥)ی مانگی (نیسان-مایس-حوزەیران)ی ساڵی ٢٠٠٢، ل٢٥

٤٧٢- کەمال سەعدی: چەمکی یاسا، بەپشتگیریی کۆلێژی ماف - زانکۆی سەلاحەددین چاپکراوە، چاپی یەکەم، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەددین، هەولێر، ١٩٩٩، ل١٥

٤٧٣- سمیر خیری توفیق: مبدأ سیادة القانون، سەرچاوەی پێشوو ل١٢٠-١٢١.

بەهەرحاڵ، سەروەریی یاسا، بەو بۆچوونەی سەرەوە، گرەنتییەکە لە گرەنتییەکانی پاراستنی ئازادیی ڕۆژنامەگەری. چونکە ڕۆژنامەنووس و ڕۆژنامەگەری لە موومارەسەکردنی ئازادییەکەیاندا پابەندی یاسای وڵاتەکەیان دەبن و لە چوارچێوەی ئەو یاسایەدا لێپرسینەوەیان لەگەڵ دەکرێت و ڕووبەڕووی سزایەکی زیاتر و قورستر لەوە نابنەوە.

بەپێچەوانەشەوە، ئەگەر یاسا سەروەر نەبێت، ئەوکاتە ڕۆژنامەنووس و ڕۆژنامە هەمیشە لە هەڕەشەی مەترسیی ڕووبەڕوو بوونەوەی سزایەکی قورستر لەو سزایەی کە لە یاسادا هاتووە، دەبنەوە. لەوانەیە لە هەندێ شوێن و هەندێ حاڵەتدا بگاتە ڕادەی گیان لەدەستدانی ڕۆژنامەنووس و داخستنی ڕۆژنامەکە هەروەکو لە زۆربەی وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ئەمە بەدی دەکەین، بۆ نموونە، لە جەزایر ساڵانە دەیان ڕۆژنامەنووس بەناپاسایی لەسەر ئازادیی وشە گیانیان لە دەست دەدەن[٤٧٤]. هەروەها داخستنی گشت ڕۆژنامە ئەهلییەکان لەلایەن حکوومەتی ئەریتیریاوە بەبیانووی پاراستنی بەرژەوەندیی یەکێتیی نیشتمانی[٤٧٥] و ڕاگرتنی ڕۆژنامەی (لوجورنال) و (دومان) و (الصحيفة الجديدة)ی مەغریبی لەلایەن وەزارەتی ناوخۆی مەغریبەوە.

هەروەها دەستبەسەرداگرتنی چەندین ڕۆژنامە لەلایەن حکوومەتی سوودانەوە[٤٧٦]. داخستنی ڕۆژنامەی (النبأ) و (اخر النبأ)ی میسریش[٤٧٧] و دەست بەسەرداگرتنی چەندین ژمارەی ڕۆژنامەی (القدس العربي) لەلایەن دەسەڵاتدارانی میسرییەوە[٤٧٨].

شایەنی ئاماژەبۆکردنە، یەکێتیی ڕۆژنامەنووسانی عەرەب لە کۆنگرەی نوێیەمیدا کە لە (٢٥-٢٧/تشرینی دووەمی ساڵی ٢٠٠٠)دا لە عەممانی پایتەختی ئوردن ئەنجامیان دا، داوای لە وڵاتە عەرەبییەکان کرد بەگێڕانەوەی ئەو ڕۆژنامانەی کە یاساغ کراون یان دەستیان بەسەردا گیراوە لەلایەن حکوومەتی وڵاتە عەرەبییەکانەوە[٤٧٩].

لێرەدا بۆمان دەردەکەوێ، کە هۆی سەرەکیی ئەم دەستدرێژییە بۆ سەر ئازادیی

---

٤٧٤- بڕوانە: الصحافة والمجزرة:
http://www.anp.org/arabiadex/aramediapressnethtm23/9/2001.

٤٧٥- بڕوانە: http://www.almashrekhtm2/12/2001.

٤٧٦- بڕوانە: http://www.sis.gov.eg/public/yearbook11/11/2001.

٤٧٧- بڕوانە: http://www.almashrek htm 2/12/2001.

٤٧٨- بڕوانە: http://www.sis.gov.eg/public/yearbook11/11/2001.

٤٧٩- بڕوانە: http://www.arabia.com6/10/2001.

ڕۆژنامەگەری لەو وڵاتانەدا دەگەڕێتەوە بۆ سەرپێچیکردن و هەتککردنی حورمەتی یاسا لەلایەن حوکمڕانانی ئەو وڵاتانەوە، ئەگینا خۆ بەپێی دستوور و یاسای هەندێ لەو وڵاتانەی کە لە سەرەوە ئاماژەمان پێ کرد ئازادیی ڕۆژنامەگەری تا ڕادەیەک ئازادە و ڕاگرتن و دەست بەسەرداگرتنی ڕۆژنامەش لەلایەن حکوومەتەوە یاساغە. کەچی سەرەڕای ئەمەش دوور لە دادگا و بەبێ بەڵگەی یاسایی لەلایەن حکوومەتەوە دەستدرێژییان کراوەتە سەر.

٢- یەکسانی لەبەردەم یاسادا

دەستووری هەموو وڵاتانی دنیا بەشێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا پرنسیپی (یەکسانی لەبەردەم یاسا)ی دەقنووس کردووە.

بەپێی ئەم پرنسیپە هەموو کەسێک یان هەموو هاووڵاتییەک یەکسانن لەبەردەم یاسادا. دەستووری میسری ساڵی ١٩٧١ دانی بەم پرنسیپە ناوە و لە ماددەی (٤٠)دا دەقنووسی کردووە: «هاووڵاتییان لەبەردەم یاسادا یەکسانن، هیچ جیاکارییەک بەهۆی ڕەگەز یان ڕەچەڵەک یان زمان یان ئایین یان باوەڕ لە نێوانیاندا نییە».

هەروەها دەستووری لوبنانی ساڵی ١٩٢٦ لە ماددەی (٧)دا دانی بەمە ناوە و دەقنووسی کردووە کە: «هەموو لوبنانییان بەرامبەر یاسا یەکسانن و وەکو یەک بەبێ جیاوازیکردن لە نێوانیاندا، سوود لە مافە شارستانی و ڕامیارییەکان وەردەگرن».

دەستووری فەرەنسی ساڵی ١٩٥٨، بەپێچەوانەی هەردوو دەستووری میسری و لوبنانی و سەرجەم دەستووری وڵاتانی دنیا، لەجیاتی دەقنووسکردنی ئەم پرنسیپە لە دووتوێی دەقەکانی دەستووردا، لە پێشەکییەکەیدا ئەمەی حەواڵەی جاڕنامەی مافەکانی مرۆڤ و هاووڵاتیانی ساڵی ١٧٩٨ کردووە[٤٨٠].

لە گەڕانەوەماندا بۆ ئەم جاڕنامەیە، دەبینین، لە ماددەی (٦)دا دانی بەم پرنسیپە ناوەو بەم شێوەیە دەقنووسی کردووە: «یاسا بریتییە لە ویست و ئارەزووی جەماوەر. هەرتاکێک لە تاکەکانی جەماوەر بۆی هەیە چ خۆی چ لە ڕێگای بریکارەکەی بەشداری بکات لە

٤٨٠- ئەمەش دەقەکەیەتی: «گەلی فەرەنسی بەشێوەیەکی ڕەسمی پابەندبوونی خۆی بەمافەکانی مرۆڤ و پرنسیپەکانی سەروەریی نیشتمانی بەو شێوەیەی کە جاڕنامەی ساڵی ١٧٨٩ ڕای گەیاندووە و پێشەکییەکەی دەستووری ساڵی ١٩٤٦ جەختی لەسەر کردۆتەوە و تەواوی کردووە ڕادەگەیەنێ». بڕوانە دەقە فەرەنسییەکەی لە بڕگەی (٤-٣) خاڵی یەکەم لقی (٣) پەراوێزی (٢٨٦) لەم تێزەدا.

داتانیــدا. جـا دەبێ ئەو یاســایە بۆ هەمــووان یەک بێت، واتە هەمــوو یەکــــــان بن لەبەردەمیدا»[٤٨١].

دەســتووری عێراقی ساڵی ١٩٧٠ لە بڕگەی (أ)ی ماددەی (١٩)دا وەکو دەستووری میسری و لوبنانی دانی بەم پرنســیپە ناوە، بۆ ئەم مەبەستەش جیاوازی کردووە لە نێوان هاووڵاتییان و بیانییاندا،ئەمەش دەقەکەیەتی: «هاووڵاتییان لەبەردەم یاسا یەکسانن...».

بەم پێیە، دەقەکانی دەســتووری زۆربەی وڵاتانی دنیا سەبارەت بەدانپێنان بەپرنسیپی «یەکسانی لەبەردەم یاسا» لە ناوەڕۆکەوە کۆکن لەگەڵ دەقەکانی جاڕنامەی جیهانیی مافەکانی مرۆڤ[٤٨٢] و بەڵێننامەی نێودەوڵەتی بۆ مافە مەدەنی و رامیارییەکان[٤٨٣].

---

٤٨١- ئەمەش دەقەکەیەتی بەزمانی ئەڵمانی:

Das Gesetz ist der Ausdruck des allgemeinen Willens. Alle Burger haben das Recht, personlich Vertreter an seiner Formung mitzuwirken. Es soll fur alle gleich sein, mag es "oder durch ihre beschutzen, mag es bestrafen. Da alle Burger in seinen Augen gleich sind, sind sie gleicherweise nach ihrer Fahigkeit zugelassen ohne einen" zu allen Wurden, Stellungen und Beamtungen anderen Unterschied als den ihrer Tugenden und ihrer Talente.

٤٨٢- بڕوانە دەقی ماددە (٧)ی جاڕنامەی مافەکانی مرۆڤ کە ئەمەش دەقەکەیەتی بەزمانی ئینگلیزی:

All are equal before the law and are entitled without any discrimination to equal protection of the law. All are entitled to equal protection against any discrimination in violation of this Declaration and against any incitement to such discrimination.

واتە «مرۆڤان هەموو لە بەردەم یاسادا یەکسانن و مافیان هەیە بەیەکسانی و بێ هیچ جیاوازییەک بپارێزرێن و هەموویان وەکو یەک مافی ئەوەیان هەیە دژی هەر جیاکارییەک بپارێزرێن کە پێچەوانەی ئەم جاڕەیە و دژی هەر هاندانێکیشە کە ئاوها جیاوازییەک ڕەچاو دەکات».

٤٨٣- بڕوانە دەقی بڕگەی (١) لە ماددە (٢)ی بەڵێننامەی نێودەوڵەتی تایبەتی مافە شارستانی و رامیارییەکان کە ئەمەش دەقەکەیەتی بەزمانی ئینگلیزی:

"Each State Party to the present Covenant undertakes to respect and to ensure to all individuals within its territory and subject to its jurisdiction the rights recognized in the present Covenant, without distinction of any kind, such as race, colour, sex, language, religion, political or other opinion, national or social origin, property, birth or other status"

واتە «هەموو دەوڵەتێک کە لایەنە لەم بەڵێنەی ئێستادا، بەڵێن دەدات کە ڕێز لەو مافانە بگرێت کە لەم بەڵێنەی ئێســتادا بڕیاریان لەسەر دراوە و دەســتەبەریان بکات بۆ هەموو کەسێک لە بواری هەرێمەکەی خۆیدا کە لەژێر سایەیدایە بەبێ هیچ جۆرە جیاکارییەک، سانیتر بەهۆی توخم یان ڕەنگ یان ڕەگەز یان ئایین یان بیروڕای سیاسی یان بنەچەی نەتەوەیی یان کۆمەڵایەتی یان خاوەنداری یان ڕەوشی لەدایکبوون و هیتریشەوە بێت».

## ٥- ماف و ئەرکەکانی ڕۆژنامەنووس و تاوانەکانی ڕۆژنامەگەری و ئەو بەرپرسیارێتییە تاوانکارییەی لێی دەکەوێتەوە

### ٥-١ ماف و ئەرکەکانی ڕۆژنامەنووس

ڕۆژنامەنووس بەپێی ئەو بنەمایانە کاردەکات کە ئەخلاقی پیشەکەی بۆی داناوە و لە یاسا و ڕێساکانیشدا بەرجەستە بووە. ئینجا لەبەر ئەو ڕۆڵە کۆمەڵایەتییە گرنگەی کە ڕۆژنامەنووس لە پرۆسەی گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتی و ئابووری و ڕامیارییەکان و دروستکردنی ڕای گشتیدا سروشتی پیشەکەی و ئەو یاسا و ڕێسایانەی کە کاروبارەکانی ڕێکدەخەن، کۆمەڵێک مافی بۆ دەستەبەر کردووە و لە بەرامبەر ئەمەشدا هەندێک ئەرکی بەسەردا سەپاندووە.

لەسەرەتاوە دابونەریتی ڕۆژنامەگەری ئەم ماف و ئەرکانەی دیارکردبوو، بەڵام لەبەرئەوەی ڕۆژنامەگەری پەیوەندییەکی پتەوی بەکۆمەڵ و بەرژەوەندییە باڵاکانی کۆمەڵەوە هەیە، بۆیە وێڕای ئەمە زۆربەی ئەو ماف و ئەرکانە لە یاسا و ڕێساکاندا دەقنووس کراون و جارێکی تر جەختیان لەسەر کراوەتەوە[٤٨٤] و لەبەرئەوەی یاسا نێودەوڵەتییەکان وەکو پرنسیپێکی بنەڕەتی، دانیان بەئازادیی ڕۆژنامەگەریدا ناوە، بۆیە دەبێ هەموو ڕۆژنامەنووسێک ئاگاداری ئەو یاسا نێودەوڵەتییانە بێت کە لە لایەن ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە لە ڕۆژی دامەزرانییەوە تاکو ئەمڕۆ دەرچوونە و لەسەر ئەم بنچینەیە بەرپرسیارێتیی زانینی ئەو یاسا و ڕێسایانە لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی و ناوچەییەوە لە ئەستۆ دەگرێ.

کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان لە جاڕنامەی مافەکانی مرۆڤ لە ماددەی(١٩)دا دانی ناوە بەمافی وەدەستخستن و وەرگرتن و بڵاوکردنەوەی زانیارییەکان هەروەها جارێکی تر لە پەیماننامەی نێودەوڵەتی مافە مەدەنی و ڕامیارییەکانی ساڵی ١٩٦٦ لە ماددەی(١٩)دا جەختی لەسەر ئەم مافە کردۆتەوە و بەهەندێک ئەرکی پێویست گرێیداوە

٤٨٤- بێ گومان، سەرپێچی کردنی ئەو ئەرکانە، ڕۆژنامەنووس ڕووبەڕووی سزای یاسایی و سزای پیشەیی دەکاتەوە. هەروەکو تۆزێکی تر لە کاتی باسکردنی بەرپرسێتیی یاسایی ڕۆژنامەنووسدا باسی لێوە دەکەین.

کە دەبێ ڕۆژنامەنووس لە مومارەسەکردنی پیشەکەیدا ڕەچاویان بکات، ئەگینا ڕووبەڕووی سزا دەبێتەوە[٤٨٥].

ئەوەی شایەنی باسە، هەرچەند ئەمڕۆ لە هەموو دەوڵەتێکدا، سەندیکا ڕۆژنامەوانییەکان لەڕێگای بەڵگەنامەی شەرەفی پیشەوە ئەو ماف و ئەرکانە دەستنیشان دەکەن، بەڵام وێڕای ئەمەش هەر دەزگایەکی ڕۆژنامەگەری و هەر ڕۆژنامەیەک بۆی هەیە بەڵگەنامەیەکی شەرەفی پیشەی تایبەت بەخۆی بۆ دەستنیشانکردنی ئەو ماف و ئەرکانە دەربکات[٤٨٦].

---

٤٨٥- ئەمەش دەقەکەیەتی بەزمانی ئینگلیزی:

"1- Everyone shall have the right to hold opinions without interference.

2- Everyone shall have the right to freedom of expression; this right shall include freedom to seek, receive and impart information and ideas of all kinds, regardless of frontiers, either orally, in writing or in print, in the form of art, or through any other media of his choice.

3- The exercise of the rights provided for in paragraph 2 of this article carries with it special duties and responsibilities.It may therefore be subject to certain restrictions, but these shall only be such as are provided by law and are necessary:

(a) For respect of the rights or reputations of others;

(b) For the protection of national security or of public order (ordre public), or of public health or morals"

واتە: ١- هەموو کەسێک مافی ڕاوەرگرتنی هەیە بێ دەستێوەردان.

٢- هەموو کەسێک مافی ئازادیی ڕادەربڕینی هەیە و ئەم مافە ئازادیی تۆژینەوە لە زانیاری و هزری هەر بابەتێک بێت و وەرگرتن و گواستنەوەی بێ گوێدانە سنوور و ئەویش بەزار بێت یان بەنووسین یان بەچاپکردن ساتێتر لە قاڵبێکی هونەریدا بێت یان بەهەر شێوازێکی تر کە خۆی پەسەندی بکات.

٣- کارپێکردنی ئەو مافانەی برگە (٢)ی ئەم ماددەیە، پابەندە بەئەرک و بەرپرسێتی تایبەتییەوە، لەبەرئەوە دەکرێ ملکەچی هەندێ کۆتوبەندی دیاریکراو بێت، بەڵام تەنها بەپێی دەقەکانی یاسا کە پێویستن بۆ ڕێزگرتن:

(I) ڕێزگرتنی مافەکان و ناوبانگی خەڵکی تردا؛

(II) پاراستنی ئاسایشی نیشتمانی یان ڕێرەوی گشتی یان خووڕەوشت و تەندروستیی گشتی".

٤٨٦- بڕوانە جاڕنامەی مافەکان و لێپرسراوێتییەکانی ڕۆژنامەنووسان (ڕێرسنی میونخ) کە لە ٢٤-١٩٧١/١١/٢٥ لەلایەن فیدراڵیەتی نێودەوڵەتی بۆ ڕۆژنامەنووسان و یەکێتی ڕۆژنامەنووسان لە ئەورووپا دەرچووە، هەروەها بڕوانە برگەکانی ئەخلاقی پیشەی ڕۆژنامەگەری کە کۆمەڵەی ئەمریکای

تەنانەت لەبەر ئەو رۆڵە تایبەتییەی کە رۆژنامەنووس لە گەڕان بەدوای هەواڵ لەنێو کۆمەڵدا دەیبینێ، وای لە رێکخراوە نێودەوڵەتییە ناحکومییەکان کردووە کە ئەوانیش بەدوری خۆیان لەمیانی بەڵگەنامەکانی مافی مرۆڤدا ئەم کارە ئەنجام بدەن[٤٨٧].

لە میسر، لە میانی یاسای رێکخستنی رۆژنامەگەری ژمارە(٩٦)ی ساڵی ١٩٩٦ بەشێوەیەکی تایبەتی دەستنیشانی ماف و ئەرکەکانی رۆژنامەنووسان کراوە، لە عێراقیش لە یاسای سەندیکای رۆژنامەنووسان ژمارە(١٧٨)ی ساڵی ١٩٦٩ی هەمواركراودا جەخت لەسەر گرنگترین ئەو ماف و ئەرکانە کراوەتەوە.

بەڵام لە هەرێمی کوردستانی عێراقدا، یاسای سەندیکای رۆژنامەنووسانی کوردستانی عێراق ژمارە(٤)ی ساڵی ١٩٩٨ بەشێکی زۆری ماف و ئەرکەکانی رۆژنامەنووسانی دیارکردووە. ئەمەو بێ لەو یاسایانەی سەرەوە، کە ئاماژەمان پێیان کرد، یاسای سزاکان و یاسای مافی دانەر و هەندێک یاسای تریش ئاماژەیان بەهەندێ ماف و ئەرکی تری رۆژنامەنووسان کردووە و تەنانەت سزای سەرپێچیکردنی ئەو ئەرکانەشیان دەستنیشان کردووە.

لە خوارەوە لە دوو خاڵدا باسی ماف و ئەرکەکانی رۆژنامەنووسان لە یاسای چاپەمەنی و یاسای سەندیکای رۆژنامەنووسانی کوردستان و یاسای بەراوردودا دەکەین. خاڵی یەکەم تەرخان دەکەین بۆ باسکردنی مافەکانی رۆژنامەنووس و خاڵی دووەمیش بۆ ئەرکەکانی رۆژنامەنووس:

---

پاکوور = = بۆ دەستەی نووسەران لەبەرچاوی گرتووە، هەروەها برگەکانی سیستمی کارکردەی (الفعل والعمل) یەکێتیی نیشتمانیی رۆژنامەنووسانی بەریتانی، هەروەها برگەکانی پەرستی رۆژنامەنووسانی یابانی کە ناسراوە بەپەرستی (ئیهۆن، شیمۆن، تیرگایا). بۆ زانیاری زیاتر لەبارەی ناوەرۆکی ئەو بەڵگەنامانە بڕوانە، د. صلاح عزیز ومحسن أديب: الدليل العلمي للصحفيين، منشورات منظمة ASK، السليمانية، ٢٠٠٣، ل ١٧-٢٩.

٤٨٧- بڕوانە ماددەی (١٠) بەڵگەنامەی ئەورووپا بۆ پاراستنی ماف و ئازادییە سەرەکییەکانی مرۆڤ کە لە ١٩٥٠/١١/٤ دەرچووە و لە ١٩٥٣/٩/٣ بەرکار بووە، هەروەها ماددەی(١٣) لە بەڵگەنامەی دەوڵەتە ئەمریکییەکان بۆ مافەکانی مرۆڤ کە لە ١٩٦٩/١١/٢٢ دەرچووە و لە ١٩٧٨/٧/١٨ بەرکار بووە، هەروەها ماددەی(٩) لە بەڵگەنامەی ئەفریقی بۆ مافەکانی مرۆڤ و گەلەکان کە لە ١٩٨١/٧/١٢ دەرچووە و لە ١٩٨٦/١٠/٢١ بەرکار بووە. بۆ زانیاری زیاتر لەبارەی ناوەرۆکی ئەو بەڵگەنامانە بڕوانە د. صلاح عزیز ومحسن نقيب: الدليل العلمي للصحفيين، سەرچاوەی پێشوو ل١٢-١٥.

### ٥-١-١ مافەکانی ڕۆژنامەنووس

لەبەر ئەو ڕۆڵەگرنگەی کە ڕۆژنامەنووس لەناو کۆمەڵدا وەک دەسەڵاتێکی چەماوەری و چاودێر بەسەر کاروبارەکانی حکومەت لە وڵاتە دیموکراتەکاندا دەیبینێ، بۆیە یاسادانەر لەو وڵاتانەدا بۆ ئاسانکاری ئیش وکارەکانی ڕۆژنامەنووسان بایەخێکی زۆریان بەڕۆژنامەنووس و مافەکانیان داوە.

لەڕاستیدا، سروشتی پیشەی ڕۆژنامەگەری وایکردووە کە ڕۆژنامەنووس هەمیشە هەندێک مافی لە هاووڵاتیانی تر زیاتر بێت. سەرەڕای ئەو مافانەی کە ڕۆژنامەنووس وەک مرۆڤێکی ئەندام لە کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی هەیەتی[٤٨٨]، یانیش وەکو هاوڵاتییەک بۆی دەستەبەر کراوە[٤٨٩]. لە هەموو وڵاتێکدا، لە ڕێگای ئەو یاسایانەی کە کاروبارەکانی ڕۆژنامەگەری ڕێکدەخەن[٤٩٠]، ماف بۆ ڕۆژنامەنووسان دەستەبەر دەکرێت.

---

٤٨٨- ئەو مافانە لە جاڕنامەی جیهانیی مافەکانی مرۆڤ و هەردوو بەڵێننامەی نێودەوڵەتی بۆ مافە مەدەنی و رامیارییەکان و مافە ئابووری و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگییەکاندا ڕیزبەند کراون.

٤٨٩- بەشێکی زۆری ئەو مافانە لە دەستووری هەموو وڵاتێکدا لەژێر ناونیشانی «ماف و ئازادییە گشتییەکان» یان هەر ناونیشانێکی تر دەقنووس کراون. بۆ نموونە، لە عێراقدا لە دەستووری ساڵی ١٩٧٠ لە بابی سێیەم لەژێر ناونیشانی «ماف و ئازادییە سەرەکییەکان» لە ماددەی (١٩)وە تاکو ماددەی (٣٦) دەقنووس کراون. هەروەها دەستووری میسری ساڵی ١٩٧١ لە بابی سێیەمدا لەژێر ناونیشانی «ماف و ئازادی و ئەرکە گشتییەکان» لە ماددەی (٤٠)وە تاکو ماددەی (٦٣)ی بۆیان تەرخانکردووە. هەروەها دەستووری لوبنانی ساڵی ١٩٢٦ فەسڵی دووەمی لەژێر ناونیشانی «ماف و ئەرکی لوبنانییەکان» لە ماددەی (٦)وە تاکو ماددەی (١٥)ی بۆ ئەم مەبەستە تەرخانکردووە. هەروەها دەستووری فەرەنسی ساڵی ١٩٥٨ لە دیباجەکەیدا لە میانی جاڕنامەی ساڵی ١٧٨٩ و دیباجەی دەستووری ساڵی ١٩٤٦دا جەختی لەسەر ئەو ماف و ئازادییە گشتییانە کردۆتەوە. لە هەرێمی کوردستانی عێراقیشدا، هەرچەندە پەرلەمانی کوردستان سیستمی فیدرالیزمی وەک ڕێگاچارەیەک بۆ کێشەی کورد هەڵبژاردووە، کەچی تاکو ئێستا دەستووری هەرێمی دانەناوە، بەڵام پارتی دیموکراتی کوردستان پرۆژەی دەستوورێکی بۆ عێراقێکی فیدراڵ و هەرێمی فیدراڵیی کوردستان لە ساڵی ٢٠٠٢ داناوە و بڵاوی کردۆتەوە و لە بابی دووەمی پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستاندا لەژێر ناونیشانی «ماف و ئەرکە سەرەکییەکان» لە ماددەی (٨)وە تاکو ماددەی (٢٤) جەختی لەسەر ئەو ماف و ئازادییە سەرەکیانە کردووە.

٤٩٠- وەک یاسای چاپەمەنی و یاسای دەسەڵاتی ڕۆژنامەگەری و یاسای سەندیکای ڕۆژنامەنووسان و هتد....

ئەم مافانەش، بەشێوەیەکی گشتی جیاوازییان هەیە لە مافی هاووڵاتییانی تر چونکە سروشتی پیشەی ڕۆژنامەگەری دیاتسەپێنێ و ڕۆژنامەنووس ناتوانێ وازیان لێ بهێنێت. هەروەکو پێش ئێستا ئاماژەمان پێ کرد.

لە خوارەوە لەبەر ڕۆشنایی یاسای سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی کوردستان ژمارە (٤)ی ساڵی ١٩٩٨ و یاسای بەراورددا تیشک دەخەینە سەر گرنگترین ئەو مافانە[٤٩١].

یاسای سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی کوردستان ژمارە (٤)ی ساڵی ١٩٩٨ لە فەسڵی چوارەمدا لەژێر ناونیشانی (ماف و پابەندییەکان) ماددەی نۆزدەیەمی بۆ مافەکانی ڕۆژنامەنووس تەرخان کردووە و بەم شێوەیەی خوارەوە ڕیزبەندی کردوون:

---

٤٩١- هەروەکو پێشتر ئاماژەمان پێی کرد، بێ لە یاسای سەندیکای ڕۆژنامەنووسان کە بەشێوەیەکی تایبەتی بایەخی بەمافەکانی ڕۆژنامەنووسان داوە، هەندێک یاسای تریش هەن جەختیان لەسەر هەندێک مافی هاوبەش لە نێوان ڕۆژنامەنووسان و کەسانی تر کردۆتەوە. یاسای مافی دانەر یەکێکە لەو یاسایانە کە هەندێک لەو مافانەی دەستووس کردووە. یاسای مافی دانەری عێراقی ژمارە (٣)ی ساڵی ١٩٧١ کە یاسایەکی بەرکارە لە هەرێمی کوردستانی عێراقدا، لە ماددەی(١٤)دا ڕێگای داوە بەهەموو کەسێک بەمەبەستی ڕۆشنبیرکردن و فێرکردن و هەواڵ، بەرهەمی کەسانی تر وەربگرێت و هەڵێنجێ، بەمەرجێک ئاماژە بەناوی دانەرەکەی بکات ئەمەش دەقەکەیەتی: «دانەر بۆی نییە دوای بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکەی لێکدانەوە و هەڵێنجانی کورت قەدەغە بکات ئەگەر هاتوو زانی بەمەبەستی ڕۆشنبیرکردن یان فێرکردن یان هەواڵ بوو مادام ئاماژە بەناوی دانەرەکەی دەکرێ ئەگەر هاتوو دیاربوو، وە بۆ ئەو سەرچاوەیەی کە لێی وەرگیراوە».

ئەم دەقەی سەرەوە کۆزکە لەگەڵ دەقی ماددەی (١٣) لە یاسای مافی دانەری میسری ژمارە (٣٥٤)ی ساڵی ١٩٥٤ و بڕگەی سێیەمی ماددەی (٤١) لە یاسای مافی دانەری فەرەنسی ساڵی ١٩٥٧ کە ئەمەش دەقەکەیەتی بەزمانی فەرەنسی:

"Art 41. Lorsque l'oeuvre a ete divulguee, l'anteur ne peut interdire:

3. Sous reserve que soient indiques clairement le nom de l'auteur [illegible] [illegible] source: les analyses [illegible] courtes citations justifiees par le caractere critique, polimique , pedagogique, scientifique ou.

information de l'oeuvre a laguelle elles sont incorporees; les revues de presse;'d"

واتە: «دانەر بۆی نییە دوای بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکەی ڕێگا لە کەسانی تر بگرێت لە شیکردنەوە و وەرگرتنی هەندێک نموونەی بچووک کە سروشتی ڕەخنەی جەدەلی یان پەروەردەیی یان زانستی یان لێکۆڵینەوەی ئەو بابەتانەی کە بەرهەمەکە لەخۆی گرتووە وای دەخوازێت. یان بڵاوکردنەوە بەمەبەستی هەواڵ لەژێر ناونیشانی لێکۆڵینەوەی ڕووداوەکان لە ڕێگای ڕۆژنامە و نێزکە و =

١- ڕۆژنامەنووس مامەڵەی کارمەندی لەگەڵدا دەکرێ لەلایەنی مۆڵەت پێدانی ئاسایی و نەخۆشییەوە.

٢- لەکاتی دامەزرانی لە هەر فەرمانگەیەکدا، ماوەی کارکردنی لە ڕۆژنامەنووسیدا بۆ سەر سووڕچە و بەرزکردنەوە و خانەنشینی دەخرێتە سەر ئیشەکەی.

٣- لەکاتی کارکردندا ئەگەر تووشی پەککەوتەییەک هات پێویستە ئەو لایەنەی کە کاری بۆ دەکا هاریکاری پێویستی بکا ئەمەش پەیوەندی بەمافی خانەنشینییەوە نییە.

٤- دەکرێ ڕۆژنامەنووسی خانەنشین بەپێی حوکمەکانی یاسای خانەنشینی ڕۆژنامەنووسان لە دامودەزگاکاندا کار بکا.

٥- پێویستە لەکاتی سکالا کردندا ئاگاداری سەندیکا بکرێتەوە کە لە دژی ڕۆژنامەنووس پێشکەش دەکرێ و لەکاتی تاوانی بیندراودا نەبێ، نابێ ڕۆژنامەنووس پرسیار و وەڵام و توێژینەوەی لەگەڵدا بکرێ بەتاوانێک کە دراوەتە پاڵی و پەیوەندی هەیە بەئەنجامدانی کارەکەیەوە تا سەندیکا ئاگادار نەکرێت.

---

=تەلەفزیۆنەوە، یان لە ڕێگای وتاردا لە دانیشتنە ڕامیاری و ئیداری و دادوەری و زانستییەکاندا، هەروەها لە ڕێگای ئەو وتارانەی کە لەو کۆبوونەوە گشتییانەدا پێشکەش دەکرێن کە مۆرکێکی ڕامیاری یان ئاهەنگی ڕەسمییان پێوەیە. مادام ئاماژە بەناوی دانەرەکەی و ئەو سەرچاوەیە دەگرێت کە لێی وەرگیراوە.

هەروەها بەپێی مادده (١٥)ی یاسای پاراستنی مافی دانەر، ڕۆژنامەنووس بۆی هەیە ئەو وتارانەی دەربارەی وتووێژی ئابووری و ڕامیاری و ئایینین کە پەیوەندییان بەڕای گشتی کۆمەڵەوە هەیە لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی تر وەربگرێ و دووبارە بڵاویان بکەنەوە بەمەرجێک بەڕاشکاوەیی و بەڕوونی ئاماژە بەسەرچاوەکەی بکەن. هەروەها لە ماددەی (١٦)دا هاتووە: «ڕۆژنامە و ئێزگە و تەلەفزیۆن بۆیان هەیە بەمەبەستی هەواڵ بەبێ ڕەزامەندی دانەرەکەی ئەو وتارانەی کە لە دانیشتنە ئاشکراکانی ئەنجومەنە ڕامیاری یان ئیداری یان دادوەرییەکانەوە پێشکەش دەکرێن بڵاویان بکەنەوە، هەروەها بۆیان هەیە ئەو وتارانەی کە لەو کۆبوونەوە گشتییانەی کە مۆرکێکی ڕامیارییان پێوەیە پێشکەش دەکرێن دووبارە بڵاو بکەنەوە مادام ئەم وتارانە ئاراستەی گەل کراون». کەواتە لەبەر ڕۆشنایی ئەم دوو ماددەیەدا بۆمان دەردەکەوێ کە ئەگەر هاتوو ئەو وتارانەی لە شوێنە گشتییەکان ئاراستەی گەل دەکرێن، دەکرێ لەلایەن ڕۆژنامەکانەوە کەڵکیان لێوەربگیرێ و بەبێ ڕەزامەندی دانەرەکەی دووبارە بڵاوبکرێتەوە، بەڵام دوای ئاماژەکردن بەناوی دانەرەکە و سەرچاوەکەی. دیارە هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە وتارەکە ئاراستەی گەل کراوە و مەبەستی ڕۆژنامەش وروژاندنی ڕای گشتییە، کەواتە هەردووکیان لەو مەبەستەدا یەک دەگرنەوە. بۆیە هیچ ناکۆکییەکی لێ بەدی ناکرێ.

بەڕای ئێمە، یاسادانەری کوردستان لەم حوکمەی سەرەوەدا، لە دانانی ئەو پاشپەندەی کە دەڵێ: «لەکاتی تاوانی بیندراودا نەبێ، نابێ ڕۆژنامەنووس پرسیار و وەڵام و لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا بکرێ بەتاوانێک کە دراوەتە پاڵی و پەیوەندی هەیە بەئەنجامدانی کارەکەیەوە تا سەندیکا ئاگادار نەکرێت»، سەرکەوتوو بووە، چونکە تاوانەکانی ڕۆژنامەگەری هەرچەندە بەشێکی زۆریان تاوانی بیندراون، بەڵام سەرەڕای ئەمە، هەندێکی تریان تاوانی نەبیندراون، وەک ئەو تاوانانەی کە لە ئاکامی بڵاونەکردنەوەی حوکمی دادگا سەبارەت بەیەکلاکردنەوەی ئەو کێشانەی کە لە ڕێگای ڕۆژنامەکاندا ڕوودەدەن، هەروەها ئەو تاوانانەی کە ■ ئاکامی بڵاونەکردنەوەی وەڵامی ئەو کەس و لایەنانەی کە لە ڕۆژنامەکاندا تانەوتەشەریان لێ دراوە یان لە ئاکامی خۆگێلکردن لە ڕاستکردنەوەی ئەو زانیارییە چەوتانەی کە لە ڕۆژنامەکاندا بڵاودەکرێنەوە، ڕوودەدەن.

٦- ئەوەی دەستدرێژی بکاتەسەر ڕۆژنامەنووس لەکاتی ئەنجامدانی یان بەهۆی کارەکەیەوە ئەو سزایەی دەدرێ کە بۆ ئەو کەسە دانراوە کە دەست درێژی دەکاتە سەر کارمەندی گشتی لەکاتی ئەنجامدانی فەرمان یان بەهۆی فەرمانەوە.

٧- ئەو ڕۆژنامەنووسەی بەهۆی یان لەکاتی ئەنجامدانی کارەکەیدا دەمرێ، بەپێی بڕیارێکی ئەنجوومەن بەگوێرەی پێڕەوی ناوخۆ نازناوی ئەندامی شەرەفی لە سەندیکادا پێدەدرێ.

ئەگەر بێت و سەرنجی ئەم ماددەیە بدەین و بەراوردی بکەین لەگەڵ فەسڵی دووەمی یاسای ڕێکخستنی ڕۆژنامەگەریی میسری ژمارە (٩٦)ی ساڵی ١٩٩٦ لەژێر ناونیشانی مافەکانی ڕۆژنامەنووسان لە ماددە/٦ تاکو ماددە/١٧ دەبینین جیاوازییەکی زۆر لەنێوانیاندا هەیە بەچەشنێک دەتوانین بڵێین ئەمانەی لە دەقی ماددە/ ١٩ی یاسای سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی کوردستان هاتووە مافی ناسەرەکین و یاسادانەری کوردستانی بەلایەنی مافە سەرەکییەکانی ڕۆژنامەنووسان نەچووە کە لە هەموویان گرنگتر مافی سەربەخۆبوون لە کار و پیشەکانیاندا و مافی دەستبەرکردنی زانیاری و ئامار و هەواڵ لە دەزگا حکومی و ناحکومییەکانەوە، هەروەها مافی وەرگرتنەوەی وەڵامی گشت ئەو پرسیارانەی هەبێ کە ئاراستەی لایەنە پەیوەندیدارەکانیان دەکات بەمەبەستی ڕاپەڕاندنی کارەکەی، هەروەها مافی ئامادەبوونی گشت کۆنگرە و کۆبوونەوە گشتییەکانی هەبێت، هەروەها نابێ زۆروزەنگ لە ڕۆژنامەنووس بکرێ سەرچاوەی زانیارییەکانی خۆی ئاشکرا

بکات یان گوشار بخریتەسەری بۆ ئەم مەبەستە و ئەمە و دەیان مافی تر کە لە دووتویی فەسڵی دووەمی یاسای ڕێکخستنی ڕۆژنامەگەریی میسری ناوبراو دێنە بەرچاو.

لە خوارەوە ئاماژە بەهەندێ لایەنی ئەم یاسایە دەکەین:

لە مادده/ ٦ داهاتووە: «ڕۆژنامەنووسان سەربەخۆن و بۆ ڕاپەڕاندنی کارەکانییان لە یاسا بەولاوە هیچ دەسەلاتێکیان بەسەرەوە نییە».

هەروەها لە مادده/٧ دا هاتووە: «نابێ ئەو بیروڕایەی لەلایەن ڕۆژنامەنووسەوە دەردەچێ یان ئەو زانیارییە دروستانەی بلاویان دەکاتەوە ببێتە هۆیەک بۆ نەهێشتنی ئاسایشی، هەروەها لە سنووری یاسا نەبێ نابێ زۆری لێ بگیرێت بۆ ئاشکرا کردنی سەرچاوەی زانیارییەکانی».

لە مادده/٨ داهاتووە: «ڕۆژنامەنووس مافی وەدەستهێنانی زانیاری و ئامار و هەواڵی ڕێگاپێدراوی هەیە بۆ بلاوکردنەوە لەسەرچاوەکانیدا بەپێی یاسا ئەو سەرچاوانە چی لایەنی حکومی بن، یان گشتیی. هەروەها ڕۆژنامەنووس بۆی هەیە ئەو شتانەی وەدەستی دەکەون بلاویان بکاتەوە.

بە بڕیارێکی لایەنی پەیوەندیدار کارگێڕییەک یان نووسینگەیەک لە هەر وەزارەتێک یان دەزگایەک یان دەستەیەکی گشتی دادەمەزرێ بۆ ئاسانکاری وەدەستهێنانی ئەم زانیارییانەی لە بڕگەی سەرەوە ئاماژەی پێ کراوە».

هەروەها لە مادده/١١ داهاتووە: «ڕۆژنامەنووس بۆ ڕاپەڕاندنی کارە ڕۆژنامەگەرییەکەی مافی ئامادەبوونی کۆنگرە و دانیشتن و کۆبوونەوە گشتییەکانی هەیە».

شایەنی باسە، ئەم چەند ماددەیەی سەرەوەمان تەنها بۆ نموونە هێنایەوە. ئەگینا ئەوانی تریش لە ڕووی ناوەرۆکەوە هیچیان لەمانە کەمتر نییە.

یاسادانەری عێراقی لە یاسای سەندیکای ڕۆژنامەنووسان ژمارە (١٧٨)ی ساڵی ١٩٦٩ی هەموارکراودا بەپێچەوانەی یاسادانەری میسری و کوردستان زیاتر جەختی لەسەر پابەندییەکانی ڕۆژنامەنووس کردۆتەوە نەک مافەکانی. بێ گومان ئەمەش ڕەنگدانەوەی سیاسەتی سەرکوتکەرانەی ئەو ڕژێمەیە، بۆیە سەیر نییە کە تەنها دان بەوە دابنێ کە ڕۆژنامەنووس مافی ئەوەی هەیە لەکاتی دامەزرانی لە هەر وەزیفەیەکدا، ماوەی کارکردنی لە ڕۆژنامەگەریدا بۆ خزمەتەکەی بگوێزێتەوە و بۆ سەرموچە و بەرزکردنەوەی

مووچە و خانەنشینبوون سوودی لێ وەربگرێت ئەگەر هاتوو وەزیفەکەی خەسڵەتێکی ڕۆژنامەگەری هەبێت[٤٩٢].

لەم ڕووەشەوە هەڵوێستی یاسادانەری کوردستانی لە یاسادانەری عێراقی باشترە، چونکە هیچ کۆت و بەندێکی لە بەردەم ئەم مافە دانەناوە، بۆیە بەپێی یاسای سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی کوردستان ڕۆژنامەنووس دوای دامەزرانی لە هەر وەزیفەیەکدا بێ گوێدانە ئەوەی ئایا ئەو وەزیفەیە خەسڵەتی ڕۆژنامەگەری هەیە یان نا، بۆی هەیە ماوەی کارکردنی پێشووی لە بواری ڕۆژنامەگەریدا بەمەبەستی سوود وەرگرتن بۆ سەر مووچە و بەرزکردنەوەی مووچە و خانەنشینبوون بۆ خزمەتی ئێستاکەی بگوێزێتەوە[٤٩٣].

یاسادانەری فەرەنسی و لوبنانی و کوردستانی بەپێچەوانەی یاسادانەری میسری لە دووتوێی یاساکانی چاپەمەنی و ڕۆژنامەگەریدا مافەکانی ڕۆژنامەنووسانیان ڕیزبەند نەکردووە.

بەڕای ئێمە، ئەم سێ یاسادانەرە لێرەدا مەبەستیان گەڕانەوە بووە بۆ بەڵگەنامە نێودەوڵەتییەکانی تایبەت بەئازادیی ڕۆژنامەگەری کە بەبەشێک لە یاسای ناوخۆ دادەندرێن و هێزی سەپاریان هەیە دوای ئەوەی ئەو دەوڵەتانە پەسندیان کردووە، هەربۆیە لەئاست ئەمەدا بێدەنگ بوونە تاکو حوکمەکانی تایبەت بەو مافانە یەک بخرێن و ڕووبەڕووی دووبارەبوونەوە یاخود ناکۆکی نەبن[٤٩٤].

شایەنی ئاماژەبۆکردنە، یەکێتیی ڕۆژنامەنووسانی عەرەبییش پرۆژەیەکی بۆ ئازادیی ڕۆژنامەگەری گەڵاڵە کردووە و تیایدا جەختی لەسەر چەندین مافی گرنگ بۆ ڕۆژنامەنووسان کردووە[٤٩٥]. لە ماددەی دووەمی ئەم پرۆژەیەدا هاتووە: «ئازادیی ڕۆژنامەگەری ئەمانەی خوارەوە دەگرێتەوە: مافی دەرکردنی ڕۆژنامە ؛ مافی ڕۆژنامەنووسان لە وەرگرتنی زانیارییەکان لە سەرچاوە جیاکان و شیکردنەوە و توانج

---

٤٩٢- بڕوانە دەقی ماددەی (٣٤) کە تیایدا هاتووە: «ماوەی کارکردن لە ڕۆژنامەگەریدا بەسوودی مارەسەکردنی پیشە دادەنرێت بەمەبەستی چەسپاندنی حوکمەکانی یاساکانی خزمەت لەکاتی دامەزراندندا لە وەزیفەیەک کە خەسڵەتێکی ڕۆژنامەگەری هەبێت».

٤٩٣- بڕوانە بڕگەی (٢) لە ماددەی (١٩).

٤٩٤- بڕوانە خاڵی (٥-١) پەراوێزی(٤٨٧) سەبارەت بەو بەڵگەنامە نێودەوڵەتییانە. هەروەها بڕوانە پەراوێزی (٤٨٦) سەبارەت بەپێرستی میونخ بۆ جاردانی ماف و بەرپرسیارێتیی ڕۆژنامەنووسان.

495- http://www.ahram.Org.eg/Lay/act/oc.htm23/9/2001.

لێدانیان : مافی ڕۆژنامەنووس بۆ پاراستنی نهێنی سەرچاوەی زانیارییەکانی:... هتد».

هەروەها لە ماددەی هەشتەمدا هاتووە: «دەستدرێژیکردنە سەر ئاسایشی ڕۆژنامەنووس بەهۆی دەبەکاربوونی بەکارێک لە کارەکانی پیشەکەی یاساغە».

هەروەها لە ماددەی دەیەمدا هاتووە: «ڕۆژنامەنووس مافی وەرگرتنی زانیاری و ئامارەکانی لە سەرچاوەکانیانەوە چ لەلایەن دەزگاکانی حکومەتەوە یان دەزگا گشتییەکانەوە هەیە و بۆی هەیە بڵاوشیان بکاتەوە. هەروەها مافی چاوخشاندنی بەگشت بەڵگەنامە ڕەسمییەکان هەیە. هەروەها مافی ئەوەی هەیە وەڵامی ئەو پرسیارانەی کە ئاراستەی لایەنە پەیوەندیدارەکانی دەکات وەربگرێتەوە».

هەروەها لە ماددەی پانزەمدا هاتووە: «ڕۆژنامەنووس لە سنووری ڕاپەڕاندنی کارەکەیدا مافی ئامادەبوونی کۆبوونەوە گشتییەکان و دانیشتنەکانی دادگاکان و دانیشتنەکانی ئەنجومەنی نوێنەرایەتی و ناوخۆ و کۆمەڵەی گشتیی سەندیکاکان و یەکێتییەکان و یانەکان و کۆمەڵەکان و دەزگا گشتییەکانی تری هەیە ئەگەر هاتوو ئەو دانیشتنانە یان ئەو کۆبوونەوانە بەپێی یاسا و ڕێساکان داخراو یان نهێنی نەبوون».

هەروەها لە ماددەی دوانزەمدا هاتووە: «ڕۆژنامەنووس تاکلایەنانە و بەویست و ئارەزووی خۆی مافی کۆتایی پێهێنانی گرێبەستی کارەکەی لە ڕۆژنامەدا هەیە...».

لە میانی بەراوردکردنی یاسای سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی کوردستان و پرۆژەی یاسای ڕۆژنامەنووسانی یەکێتیی ڕۆژنامەنووسانی عەرەبی و یاسای میسری و لوبنانی و فەرەنسی و عێراقیدا بۆمان دەردەکەوێ کە مافی وەرگرتنی زانیاری و هەواڵەکان لە دەزگا حکومی و ناحکومییەکان و مافی وەرگرتنەوەی وەڵامی ئەو پرسیارانەی کە ئاراستەی لایەنە پەیوەندیدارەکان دەکرێت، هەروەها مافی پاراستنی نهێنی سەرچاوەی زانیارییەکان بۆ ڕۆژنامەنووس گرنگترین ئەو مافانەن کە پێویستە بۆ ڕۆژنامەنووسان دەستەبەر بکرێن. بۆیە بۆ یاسادانەری کوردستان پێشنیار دەکەین کە چاوێکی تر بەیاسای سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی کوردستاندا بخشێنێتەوە و ئەم ڕا و سەرنجانەمان لەبارەی مافەکانی ڕۆژنامەنووسان لە هەمووارکردنی ئەم یاسایەدا لەبەرچاو بگرێت. چونکە ئەم مافانە پەیوەندییەکی پتەویان بەناوەرۆکی کاری ڕۆژنامەنووسەوە هەیە و بێ ئەمانە ناتوانێ وەکو پێویست کاری خۆی ئەنجام بدات و ئامانجیش بپێکێ.

حەیدەر حوسێن لەبارەی گرنگیی ئەم مافانەوە دەڵێ: «ڕۆژنامەنووس بۆ وەرگرتنی

زانیارییەکان لە دەزگاکانی حکوومەت ئەزیەتێکی زۆر دەچێژێ، ئەگەر بێت و ئەو دەزگایانە لەڕووی ڕۆژنامەنووس داخرابن، ئەی چۆن دەتوانێ زانیاری پێویست بۆ ڕاپەڕاندنی کارە ڕۆژنامەگەرییەکەی لەو دەزگایانە وەربگرێت؟»[٤٩٦].

ئەوەی شایەنی باسە، لە دەوڵەتە عەرەبییەکاندا سەرەڕای دەقنووسکردنی ئەم مافانە لە دەستوور و یاسا و ڕێساکانیاندا، کەچی تاکو ئێستا لەڕووی پراکتیکەوە، ئەم بابەتە وەکو مەرەکەبی سەر کاغەز ماوەتەوە و لەو دەوڵەتانەدا ئەم مافانە بەڕۆژنامەنووس ڕەوا نابینرێت. لەم بارەیەوە (سعید السلمی)[٤٩٧] دەڵێ: «دەکرێ بڵێین لەوەتەی نەتەوە یەکگرتووەکان لە ساڵی ١٩٩٣دا ڕۆژی ڕۆژنامەگەریی جیهانییان ڕاگەیاندووە، بارودۆخەکە هیچ گۆڕانی بەسەردا نەهاتووە، ئێستا ئاهەنگ بەبۆنەی ساڵی هەشتەمی ئەو ڕۆژەوە دەگێڕین، کە گرتم بڕیاری نەتەوە یەکگرتووەکان مانای وایە هەموو دەوڵەتە عەرەبییەکان ڕەزامەندییان لەسەر پیشان داوە و ئەو بەیاننامەیەی نەتەوە یەکگرتووەکان دوای بڕیاردان لەسەر ئەو ڕۆژە دەریکرد دەوڵەتانی هان داوە، کە ڕێز لە ئازادیی ڕادەربڕین و ئازادیی ڕۆژنامەگەری بگرن و مافی وەدەستهێنانی هەواڵ و زانیاری بەڕۆژنامەنووسی ببەخشن و بێ کۆت و بەند بڵاوی بکاتەوە، بەڵام - بەداخەوە - پیادەکردنەکە لەبارەی چیرۆکێکی ترەوە دەدوێ و دەگێڕێتەوە»[٤٩٨].

هەروەها لەبارەی ئەدرکاندن و پاراستنی نهێنیی سەرچاوەی زانیارییەکانی ڕۆژنامەنووسەوە[٤٩٩]، لویس دالکیشی بەڕێوەبەری ڕاگەیاندنی لیژنەی پەیامنێرانی ئازادیی ڕۆژنامەگەری دەڵێ: «لە کۆمەڵگەیەکی دیموکرات و ئازاددا، دەبێ ڕۆژنامەنووسان

---

٤٩٦- حیدر حسین الحمید: الصحافة بین الاعباء والضغوطات الخارجیة، تۆڕی ئینتەرنێت:
http://www.annabaa.org/nba46/sahafa.htm 29/9/2001.

٤٩٧- سعید السلمی، بەڕێوەبەری جێبەجێکاری هەڵبەندی ڕاگەیاندنی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و باکووری ئەفریقایە و لە لەندەن دادەنیشێت.

٤٩٨- کەناڵی ئەلجزیرە: بەرنامەی زیاتر لە ڕایەک، وەرگێڕانی ڕۆژنامەڤانی، گۆڤاری ڕۆژنامەڤانی ژمارە (٦-٧) ساڵی دووەم، پایز-زستان، ٢٠٠١-٢٠٠٢، ل٧٠.

٤٩٩- شایەنی باسە، بەپێی ڕاپۆرتێکی «لیژنەی پەیامنێران» فانیسا لیجیت ئەو ڕۆژنامەنووسە ئەمریکییەیە کە لەبەرئەوەی ڕەفزی کرد سەرچاوەی زانیارییە تایبەتییەکانی خۆی ئاشکرا بکات بۆیە چل و حەوت ڕۆژ لە بەندیخانە مایەوە، کە تاکو ئێستاکە زۆرترین ماوەیە ڕۆژنامەنووسێک لەسەر ئەم تۆمەتە لە بەندیخانە ماوەیەکی وا درێژ بمێنێتەوە. پێشتریش ولیام فاری پەیامنێری ڕۆژنامەی =

توانای پاراستنی سەرچاوە تایبەتییەکانی زانیارییەکانی خۆیان هەبێت. بەنێکارکردنی ئەم مافەی ڕۆژنامەنووسان، ڕۆژنامەی سەربەخۆ هەڕەشەی لەلادا دەکرێت کە بەپێی یەکەم هەمواری دەستووری ئەمریکی زامن کراوە»[٥٠٠].

شایەنی ئاماژەبۆکردنە، وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بایەخێکی زۆری بەمافی ڕۆژنامەنووس لە وەرگرتن و بڵاوکردنەوەی زانیاری و هەواڵەکان داوە و بۆ ئەم مەبەستەش لە ساڵی ١٩٦٦ کۆنگرێس یاسایەکی بۆ ئازادیی زانیارییەکان دەرکرد[٥٠١]. بەپێی ئەم یاسایە، ڕۆژنامەنووسان بەحوکمی یاسا بۆیان هەیە داوای بینین و پشکنینی ئەو بەڵگەنامانەی حکوومەت بکەن کە تایبەتن بەچالاکییەکانی حکوومەت[٥٠٢].

ئەمەو، ئەمڕۆ لە هەموو ویلایەتەکانی ئەمریکا، یاسایەک بەناوی (مافی تەماشاکردن – الحق في الاطلاع) هەیە[٥٠٣]. لەڕاستییدا، بوونی ئەم یاسایە و یاسایەکی تری هاوچەشن لە ئەمریکا کە ناسراوە بەیاسای (کۆبوونەوە کراوەکان – الاجتماعات المفتوحة) وایکردووە چاودێریکردنی جموجۆڵ و چالاکییەکانی حکوومەت کارێکی ئاسان بێت. بەپێی ئەم یاسایەی دوایی، دەبێت کۆبوونەوەکانی دامودەزگاکانی حکوومی ئاشکراو کراوە بێت و هەروەها کات وشوێنی بەستنیشیان لەلای هەمووان دیاربێت[٥٠٤].

مومارەسەکردنی مافی تەماشاکردن و پشکنینی بەڵگەنامەکانی فیدرالیش لەلایەن ڕۆژنامەنووسەوە لە ڕێگای پێشکەشکردنی داخوازییەکەوە دەبێت، ڕۆژنامەنووس پێشکەشی ئەو فەرمانبەرەی دەکات کە لەو دەزگا حکومییەدا بەرپرسی جێبەجێکردنی یاسای (foia)یە. بەم پێیە، ئەو ڕۆژنامەنووسە دەتوانێ تەماشای ئەو بەڵگەنامە

---

=ولوس ئەنجلوس» بۆ ماوەی چل و شەش ڕۆژ لە ساڵی ١٩٧٢ بەهەمان تۆمەت لە بەندیخانە مایەوە چونکە ڕەتیزی کرد سەرچاوەی بەڵگەنامەکانی کە تایبەت بوون بەدادگاییکردنی چارلز مانسۆن ئاشکرا بکات. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە:

http://www.cfp.org.news/documents/vlagltr.htm 8/10/2001.

500- http://www.cfp.org.news/releases/view.cg.2001/7/31./eggettxt8/10/2001.

٥٠١ – کورتکراوەکەی بریتییە لە (FOIA).

٥٠٢ – ریچارد. أي. بستید: الحق في الاطلاع (١-٢)، وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە عبدالرزاق عبدالله، گۆڤاری «گولان العربي» ژمارە(٦٥)، تشرینی یەکەم، ٢٠٠١، ل١٧.

٥٠٣ – ریچارد. أي. بستید: الحق في الاطلاع (١-٢)، سەرچاوەی پێشوو، ل١٨.

٥٠٤ – ریچارد. أي. بستید: الحق في الاطلاع (٢-٢)، وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە عبدالرزاق عبدالله، گۆڤاری «گولان العربي» ژمارە(٦٦)، تشرینی دووەم، ٢٠٠١، ل١٨.

حکوومییانە بکات و وێنەشیان لەبەر بگرێتەوە[٥٠٥].

لەڕاستیدا، مافی تەماشاکردن کۆکە لەگەڵ سروشتی ئازادیی ڕۆژنامەگەریدا، چونکە ئەو ئازادییەی کە ڕۆژنامەنووسان لە ڕادەربڕیندا هەیانە، بەشێکە لە مافێکی بنەڕەتی تر، ئەویش مافی هەموو کەسێکە لە بەئازادی تەماشاکردن و پشکنینی ڕووداوەکان، بۆ هەموو ئەو کاروبارانەی جێگای بایەخی ئەون، هەروەها مافی گوزارشتکردن و بڵاوکردنەوەی بیروڕای خۆی لەبارەی ئەو ڕووداوانەوە هەیە[٥٠٦].

بەڵام لە کوردستانی عێراقدا، هەروەکو لە کاتی باسکردنی مافەکانی ڕۆژنامەنووس لە یاسای سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی کوردستاندا ئاماژەمان پێی کرد، یاسادانەری کوردستان بەپێچەوانەی یاسادانەری ئەمریکی، مافی ڕۆژنامەنووسی لە تەماشاکردن و ئامادەبوونی کۆنگرە و کۆبوونەوە گشتییەکاندا فەرامۆش کردووە، لە کاتێکدا بوونی ئەم دوو مافە بۆ ڕۆژنامەنووس زۆر گرنگە، بۆ ئەوەی بەئاسانی و سەرکەوتووانە لە نزیکەوە چاودێریی جموجۆڵ و کاروبارەکانی حکوومەت بکات. بۆیە، شاراوەنییە، کە زۆرجاران هەندێ ڕۆژنامە و کەناڵەکانی ڕاگەیاندن یان ڕۆژنامەنووسان لە کوردستاندا گلەیی و گازاندە لە حکوومەتی هەرێمی کوردستان و دامودەزگاکانی بکەن بۆ دەرفەتنەدانی مومارەسەکردنی ئەم مافە کە مافێکی سەرەکییە بۆ ڕۆژنامەنووس[٥٠٧].

بۆیە، پێشنیار دەکەم، یاسادانەری کوردستان یاسای سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی کوردستان ژمارە (٤)ی ساڵی ١٩٩٨ هەموار بکات و دان بەهەندێک مافی تری پێویست بۆ ڕۆژنامەنووسانی کوردستان بنێت. لەو مافانەش مافی سەربەخۆبوونیان لە کار و

---

٥٠٥- ریچارد. أي. بستید: الحق في الاطلاع (٢-٢)، سەرچاوەی پێشوو، ل١٩.

٥٠٦- جوتیار محمد رشید صدیق: الحمایة الدولیة للصحفیین في مناطق النزاعات المسلحة، رسالة قدمت الی جامعة بغداد - کلیة القانون، عام ١٩٩٩، لنیل شهادة الماجستیر في القانون الدولي.

٥٠٧- سەبارەت بەنەبوونی مافی تەماشاکردن و ئامادەبوون لە کۆبوونەوە گشتییەکان لە کوردستاندا، ڕۆژنامەی هاوڵاتی ستوونێکی نووسیوە و تیایدا گلەیی و گازاندەیەکی زۆر ئاراستەی پەرلەمان و حکوومەتی هەرێمی کوردستان دەکات و دەڵێ: «ڕۆژی چواری مانگ ڕۆژێکی ئاسایی نەبوو لە مێژووی تازەی گەلی کوردستان... لەم ڕۆژەدا هیچ شتێک عەدالەتی تێدا نەبوو. هەر لە سەرەتاوە لە دەرگای نێو تەلارەکەوە بۆ ماوەی زیاتر لە بیست دەقیقە پەیامنێری هاوڵاتی ڕێگای پێنەدرا بچێتە ژوورەوە و ناسنامەکەیان لێ وەرگرت، لە کاتی کۆنگرە ڕۆژنامەنووسییەکەشدا دیسان ڕێگا نادرێت کەناڵە ناوخۆییەکان پرسیار بکەن....» بڕوانە «ڕۆژنامەی هاوڵاتی» ژمارە (٩٣) ڕۆژی دووشەممە ٢٠٠٢/١٠/٧، ل١٢.

پیشەکانیاندا، هەروەها مافی تەماشاکردن و وەرگرتنی زانیاری و هەواڵەکان لە دەزگا حکومی و ناحکومییەکان لەگەڵ مافی ئامادەبوون لە کۆنگرە و کۆڕ و کۆبوونەوە گشتییەکان، بۆ ئەوەی ڕۆژنامەنووس لە چاودێریکردنی کاروبارەکانی حکومەت کاراتر بێت.

## ٥-١-٢ ئەرکەکانی ڕۆژنامەنووس

هەروەکو لە خاڵی پێشوو ئاماژەمان پێی کرد، لەو دەوڵەتانەدا کە پێڕەوی سیستمی دیموکراسیەت دەکرێت و تیایاندا مافی مرۆڤ و دیموکراسییەت بەرقەرارە و یاسا سەروەرە، ڕۆژنامەنووس ڕۆڵێکی گرنگ لە وروژاندنی ڕای گشتی و چاودێریکردنی چالاکییەکانی حکومەت و پێشکەشکردنی زانیاری بەکۆمەڵانی خەڵک دەبینێ. جا بۆیە لە بەرامبەر ئەمەدا دەبێ لە مومارەسەکردنی کارەکانیاندا پابەندی کۆمەڵێک پێوەری یاسایی و سیستمی بن، لەکاتێکدا، ئیمڕۆ لەڕووی پێشکەوتنی تەکنەلۆژیاوە، جیهان لە گۆڕانێکی زۆر خێرادایە و وەرگرتن و بڵاوکردنەوەی زانیارییەکانیش لە تۆڕی ئینتەرنێت بەشێوەیەکی خێرا و بەربڵاو وادەخوازێت کە ڕۆژنامەنووسان لە هەموو کاتێک زیاتر بەوپەڕی هەستکردن بەبەرپرسیارێتیی ئەخلاقی و یاساییەوە بەکارەکانیان هەستن. ئەمەش خۆی لە خۆیدا، وادەخوازێ کە ڕۆژنامەنووس نەک تەنها پابەندی یاسا و ڕێسای دەوڵەتەکەی خۆی بێت، بەڵکو پابەندی بنەما و پرنسیپەکانی مافی مرۆڤ و ئەخلاقی پیشەکەی خۆشی بێت.

سەبارەت بەبنەما و پرنسیپەکانی مافی مرۆڤ، ئەوەندەی پەیوەندییان بەئەرک و پابەندییەکانی ڕۆژنامەنووسانەوە هەیە، دەتوانین بگەڕێینەوە بۆ دەقی ماددە (١٢)ی جاڕنامەی جیهانیی مافەکانی مرۆڤ کە لەم ڕووەوە بنچینەیەکی گشتی دارشتووە و دەڵێ: «نابێ ژیانی تایبەتی و خێزان و منداڵ و نامەگۆڕینەوەی هیچ کەسێک بخرێتەبەر دەستێوەردانێکی هەڕەمەکی ناو و ناوبانگیشی بزڕێت و هەموو کەسێک مافی ئەوەی هەیە کە یاسا لەو دەستێوەردان و هێرشانە بیپارێزێت»[٥-٨].

---

٨ - ٥- ئەمەش دەقەکەیەتی بەزمانی ئینگلیزی:

"No one shall be subjected to arbitrary interference with his privacy, family, home or correspondence, nor to attacks upon his honour and reputation. Everyone has the right to the protection of the law against such interference or attacks"

هەروەها لە دەقی ماددەی (٢٩)دا هاتووە: «١- هەموو کەسێک بەرامبەر بەو کۆمەڵگەیەی کە بەتەنیا لەوێ دەرفەت بەکەسایەتی ئەو دەدرێت کە گەشەیەکی ئازادیی تەواو بکات بەرپرسیارە.

٢- بۆ مسۆگەرکردنی دانپێدانان و ڕێزلێگرتنی ماف و ئازادییەکانی خەڵکی تر و بۆ وەدیهێنانی داخوازییە ڕەواکانی سیستمی گشتی و بەرژەوەندیی گشتی و ڕەوشت لە کۆمەڵگەیەکی دیموکراسیدا، هەموو کەسێک لە بەکارهێنانی ماف و ئازادییەکانیدا، تەنها ملکەچی ئەو کۆت و بەندانە دەبێت کە یاسا بڕیاری دەدات.

٣- نابێت بەهیچ شێوەیەک ئەم ماف و ئازادییانە دژ بەئامانج و پرنسیپەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان بەکار بهێندرێن»[٥٠٩].

هەروەها لە دەقی ماددە (٣٠)دا هاتووە: «نابێت هیچ دەقێکی ئەم بانگەوازە وا لێکبدرێتەوە کە ڕێگە دەداتە دەوڵەتێک یا کۆمەڵێک یا تاکەکەسێک کە مافی ئەوەیان هەبێت چالاکی یان کارێک بکەن بەمەبەستی تێکدانی ماف و ئازادییەکانی نێو ئەم جاڕنامەیە»[٥١٠].

هەروەها بەڵێنی نێودەوڵەتی مافەمەدەنی و ڕامیارییەکانی ساڵی (١٩٦٦)یش لە ماددەی (١٩)دا جەختی لەسەر ڕێزگرتنی ناو و ناوبانگ و مافەکانی مرۆڤ و پاراستنی ئاسایشی نیشتمانی و پێڕەوی گشتی و خووڕەوشتدا کردۆتەوە، هەروەکو لە خاڵی پێشوو ئاماژەمان پێی کرد.

---

٥٠٩- ئەمەش دەقەکەیەتی بەزمانی ئینگلیزی:

1- Everyone has duties to the community in which alone the free and full development of his personality is possible

2- In the exercise of his rights and freedoms, everyone shall be subject only to such limitations as are determined by law solely for the purpose of securing due recognition and respect for the rights and freedoms of others and of meeting the just requirements of morality, public order and the general welfare in a democratic society

3- These rights and freedoms may in no case be exercised contrary to the purposes and principles of the United Nations.

٥١٠- ئەمەش دەقەکەیەتی بەزمانی ئینگلیزی:

Nothing in this Declaration may be interpreted as implying for any State, group or person any right to engage in any activity or to perform any act aimed at the destruction of any of the rights and freedoms set forth herein

بێ لەم بنەما و پرنسیپانەی کە لە جاڕنامەی جیهانیی مافی مرۆڤ و بەڵێنی نێودەوڵەتی مافە مەدەنی و رامیارییەکاندا هاتوون، کۆمەڵێک بنەما و پرنسیپی تریش هەن لە دووتوێی پەیرەستی شەرەفی پیشەی ڕۆژنامەگەریدا هاتوون و دەبێ ڕۆژنامەنووس پابەندیان بێت ئەگینا ڕووبەڕووی سزا دەبێتەوە. هەر ڕۆژنامەیەک و هەر سەندیکایەکی ڕۆژنامەنووسان و هەر کۆمەڵە و ڕێکخراوێکی ڕۆژنامەنووسان بۆی هەیە پەیرەستێک (لائحة) بەو بنەما و پرنسیپە پیشەییانە دەربکات[511].

لە خوارەوە لەبەر ڕۆشنایی یاسای سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی کوردستان و یاسای بەراورددا، تیشک دەخەینە سەر گرنگترین ئەو ئەرکانە[512]:

یاسای سەندیکای ڕۆژنامەنووسان ژمارە(٤)ی ساڵی ١٩٩٨ ئەرکەکانی ڕۆژنامەنووسی لە فەسڵی چوارەمدا لەژێر ناوونیشانی (ماف و پابەندییەکان) لە ماددەی بیستەمدا

---

٥١١- وەک پەیرەستی میونخ و پەیرەستی کۆمەڵەی ئەمریکای باکوور بۆ دەستەی نووسەران و پەیرەستی یەکێتیی نیشتمانیی ڕۆژنامەنووسانی بەریتانی و پەیرەستی ڕۆژنامەنووسانی یابانی کە لە خاڵی پێشوو ئاماژەمان پێیان کردووە. بێ لەو کۆمەڵە و ڕێکخراوانەی سەرەوە، چەندانی تریش لەسەر ئاستی ناوخۆ و جیهانیدا هەن، لەوانە: ڕێکخراوی «سەکۆی ڕۆژنامەنووسی - منتدى الصحافة» لە ئەرلینگتۆن و «پەیمانگەی نێودەوڵەتی بۆ ڕۆژنامەگەری» کە بارەگایەکەی لە ڤییەننایە و «ڕێکخراوی عەرەبی بۆ ئازادیی ڕۆژنامەگەری - W .F.P.A» کە بارەگایەکەی لە ئینگلتەرایە و ڕێکخراوی «فیدرالیەتی نێودەوڵەتی بۆ ڕۆژنامەنووسان» لە جەزایر و «لیژنەی پاراستنی ڕۆژنامەنووسان - J.P.C» کە بارەگاکەی لە ئەمریکایە و دەزگای «سەکۆی ئازادی - Freedom Forum» و «سەکۆی سەربەستی - منتدى الحرية» و «لیژنەی پەیامنێران بۆ ئازادیی ڕۆژنامەگەری» لە ئەمریکا و «سەکۆی ڕۆژنامەنووسانی عەرەب - منتدى الصحفيين العرب» و بنکەی «پاراستنی ئازادیی ڕۆژنامەنووسان» لە ئوردن و ڕێکخراوی «پەیامنێرانی بێ سنوور - مراسلون بلا حدود» لە فەرەنسا و «یەکێتیی ڕۆژنامەنووسانی جیهانی» و هی دیکەش.

٥١٢- بێ لە یاسای سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی کوردستان، کە بەشێوەیەکی تایبەتی بایەخی بەئەرکەکانی ڕۆژنامەنووسان داوە، یاسای سزادانی عێراقییش کە یاسایەکی بکارە لە هەرێمی کوردستانی عێراقدا، گشت ئەو کردارانەی دەستنیشان کردووە کە لەلایەن ڕۆژنامەنووسەوە و لە ڕێگای ڕۆژنامەوە ئەنجام دەدرێت و بەتاوان دادەندرێ، لەگەڵ دیارکردنی سزای هەریەکێک لەو تاوانانە. هەروەکو تۆزێکی تر لە باسکردنی تاوانەکانی ڕۆژنامەگەریدا باسیان لێوە دەکەین.

هەروەها یاسای مافی دانەری عێراقییش لە ماددەی (١٤، ١٥، ١٦)دا جەختی لەسەر هەندێک لەو ئەرکانە کردۆتەوە، هەروەکو لە پەراوێزی مافەکانی ڕۆژنامەنووسدا ئاماژەمان پێی کردووە.

پەیڕەو کردووە[٥١٣] کە ئەمەش دەقەکەیەتی: «نابێ ڕۆژنامەنووس ئەم کارانە بکا:

١- ئەوەی دەسەڵاتەکانی لێکۆڵینەوە، یان دادگاکان کردوویانەتە نهێنی کە کار دەکاتە سەر ڕێڕەوی لێکۆڵینەوە یان دادگاییکردن.

٢- ئەنجامدانی ئەو پیشەیە بەبێ تازەکردنەوەی بەشداربوون لە سەندیکادا بەپێی ئەم یاسایە.

٣- بەکارهێنانی هەر هۆیەک یان ڕێگەیەک بەمەبەستی قازانجی ناڕەوا.

٤- وەرگرتنی پیتاک بەبێ ڕەزامەندیی ئەنجوومەن.

٥- ناوبانگ زڕاندنی پیشەکە و ئاشکراکردنی نهێنییەکانی یان هەڕەشەکردن لە هاونیشتمانییان بەهەر ڕێگا و شێوەیەک بێ لە شێوازەکانی ڕۆژنامەنووسی.

٦- شلۆقکردنی متمانەکردن بەسیستمی فیدرالی لە کوردستانی عێراقدا و شێواندنی ئاسایشی هاوڵاتییان بەڕێگای ڕاستەوخۆ بێ یان ناڕاستەوخۆ و هەروەها وروژاندنی غەریزەکانی جەماوەر بەهەر ڕێگایەک بێت.

٧- تۆزینەوەی وشەی نووسراو یان نێردراو بۆ مەبەستێکی تایبەتی و بۆ بەرژەوەندی تایبەتی و زیان بەخشین بەخەڵکی تر، یان خۆکردن بەکەسانی تر (انتحال صفة) یان هەڵگرتنی بیرۆکەیەک بۆ زیان گەیاندن بەڕەوشتی گشتی و نیزامی گشتی.

٨- بەهەڵەبردنی جەماوەر بەزانیاری نادروست و لێکدانەوەی ڕووداوەکان، بەجۆرێک دووربێ لە دەستپاکی یان بڵاوکردنەوەی نادڵنیایی لێیان.

٩- لەبەرنووسینەوە و وەرگرتن (اقتباس) لە بەرهەمی کەسانی تر بەبێ ئاماژەکردن بۆ خاوەنەکەی یان سەرچاوەکەی[٥١٤].

---

٥١٣- هەروەها یاسای چاپەمەنیی هەرێمی کوردستان ژمارە (١٠)ی ساڵی ١٩٩٣ی هەمواركراو لە بڕگەی یەکەمی ماددەی نۆیەمدا کردنی هەندێک کرداری لە ڕێگای چاپەمەنییەوە قەدەغە کردووە، ئەمەش دەقەکەیەتی: «بڵاوکردنەوەی هاندانی تاوان و ڕەفتاری تیرۆر و ڕەواجپێدان و فەراهەمکردنی ڕێگا و سەرمکیناتی تاوان و تیرۆر و شەڕەجوێن و تانە و تەشەری دژ بەکەسان و سووکایەتی کردن بەحورمەتی دین و مەزهەب و ئاداب و سیستمی گشتی، قەدەغەیە».

٥١٤- ئەمڕۆ لەسایەی تۆڕی ئینتەرنێتەوە بۆمان هەیە بچینە ناو دەیان شوێن لەسەر ئەم تۆڕی زانیارییەدا و بەئاسانی لە چەندین سەرچاوەوە بگەینە زانیارییە جۆراوجۆرەکان. بەڵام هەروەکو ڕۆبەرت ستیلیش دەڵێ: «گرنگ ئەوەیە لە بەکارهێنانی ئەم زانیاریانە بێ گەڕانەوە بۆ ⇐

١٠- قۆستنەوەی رۆژنامەنووسی بۆ تانەلێدان و سووکایەتی کردن بەپیرۆزی و رێوڕەسمە ئایینی و نیشتمانییەکان».

شایەنی ئاماژەپێکردنە، لە گەڕانەوەماندا بۆ دەقی مادەە بیست و پێنجی یاسای سەندیکای رۆژنامەنووسانی عێراقی ژمارە (١٧٨)ی ساڵی ١٩٦٩ی هەمواركراودا، كە تایبەتە بەئەرك و پابەندییەكانی رۆژنامەنووسان، بۆمان دەردەكەوێ، یاسادانەری كوردستان، لە رێكخستنی ئەرك و پابەندییەكانی رۆژنامەنووساندا، تارادەیەك لەژێر كاریگەریتی ئەو یاسایەدا بووە. بۆیە سەیر نییە كە بەشێكی ئەو ئەرك و پابەندیاتەی كە لە مادەی بیستەمدا ریزی كردوون، دەقاودەق یان بەدارشتنێكی جیاوازی كەمەوە وەكو ئەرك و پابەندییەكانی مادەی بیست و پێنجەمی یاسای سەندیكای رۆژنامەنووسانی عێراقی بن[٥١٥].

---

سەرچاوەکانیان، بەرهەڵستی ئیغراهووفان بکەین» بڕوانە رۆبرت ستیل و جای بلاک: القواعد الاخلاقیة لوسائل الاعلام ومابعدها، گۆڤاری «وسائل الاعلام والاخلاق»ی ئەلیکترۆنی، وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا، تۆڕی ئینتەرنێت:

http://www.usinfo.stategov.journals/itgic/401./ijga/htm1/10/2001

٥١٥- ئەمەش دەقەکەیەتی: «لایجوز للعضو:

١- مخالفة أو عرقلة تطبيق قانون النقابة ونظامها الداخلي والتعليمات الصادرة بموجبها.

٢- مزاولة المهنة دون تجديد اشتراك العضوية في النقابة بموجب هذا القانون.

٣- استخدام اية واسطة او اسلوب بقصد الربح غير المشروع.

٤- الاساءة الى سمعة المهنة وافشاء اسرارها.

٥- تجريح اعضاء اسرة الصحافة ورؤساء او مرؤوسين او الحيلولة دون حق أدبي او مادي تقرره القوانين او تقاليد المهنة لهم أو تكليفهم بأمور خاصة أو عامة تقلل من شأنهم أو تعرضهم لمخالفة هذا القانون.

٦- تهديد المواطنين بأية وسيلة أو اسلوب من اساليب الصحافة.

٧- التصريح او التلميح الثابت بما من شأنه ان يفيد جهة معادية.

٨- زعزعة الثقة بالبلاد سواء كان ذلك بطريق مباشر أو غير مباشر.

٩- استغلال وسائل النشر الصحفي للوشاية أو التشهير أو اتهام المواطنين بغير حق أو طعنهم بلا مبرر وطني او قانوني.

١٠- استغلال الكلمة المكتوبة او المرسومة استغلالا خاصا لمنفعة شخصية ضارة بالغير او انتحال صفة او فكرة او عمل للغير.

١١- اثارة غرائز الجمهور بأية وسيلة من وسائل الاثارة التي تتعارض مع الفن الصحفي =

لە هەندێ بڕگەدا، یاسادانەری کوردستان، چەند بڕگەیەکی دەقی ماددەی ناوبراوی یاسای عێراقی لێکداوە و بڕگەیەکی سەربەخۆی لێ دروست کردووە. تەنانەت لە داڕشتنەوەی هەندێک بڕگەدا، دووچاری ناکۆکیەک بووە لەگەڵ پرنسیپەکانی مافی مرۆڤ و دیموکراسییەتدا، هەروەکو لە خوارەوە و لە بەراوردکردنی بڕگەکانی ماددە بیستی یاسای سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی کوردستان و بڕگەکانی ماددەی بیست و پێنجەمی یاسای سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی عێراقدا بۆمان دەردەکەوێ.

بڕگە (٢)ی ماددە (٢٠)ی یاسای سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی کوردستان وەکو دەقی بڕگە (٢)ی ماددە (٢٥)ی یاسای سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی عێراقییە.

هەروەها بڕگە (٣)ی ماددە (٢٠)ی یاسای کوردستان وەکو دەقی بڕگە (٣)ی ماددە (٢٥)ی یاسای عێراقییە. بڕگە (٩)ی ماددە (٢٠)ی یاسای کوردستان وەکو بڕگە (١٧)ی ماددە (٢٥)ی یاسای عێراقییە. بڕگە (٨)ی ماددە (٢٠)ی یاسای کوردستان وەکو دەقی بڕگە (١٣)ی ماددە (٢٥)ی یاسای عێراقییە.

بڕگە (١٠)ی ماددە (٢٠)ی یاسای کوردستان وەکو دەقی بڕگە (٩)ی ماددە(٢٥)ی یاسای عێراقییە، بەڵام بەداڕشتنێکی جیاواز. بڕگە (٥)ی ماددە (٢٠)ی یاسای کوردستان وەکو دەقی بڕگە (٤)ی ماددە (٢٥)ی یاسای عێراقییە بەداڕشتنێکی جیاواز. بڕگە (٧)ی ماددە(٢٠)ی یاسای کوردستان وەکو دەقی بڕگە (١٠)ی ماددە(٢٥)ی یاسای عێراقییە، بەڵام پاشبەندی (زەرەرگەیاندن بەڕەوشت و تێزامی گشتی) بۆ زیادکردووە.

بڕگەی (١)ی ماددەی (٢٠)ی یاسای کوردستان کە لەسەرەوە ئاماژەمان پێیکردووە،

---

مومصلحة المجتمع.

١٢- مس الحريات الخاصة والعامة التي نص عليها القانون بالوسائل الصحفية.

١٣- تضليل الجمهور بالمعلومات غير الصحيحة وتصوير الوقائع تصويرا غير امين.

١٤- نشر الوقائع غير المؤكدة مالم يشر الى انها غير مؤكدة.

١٥- ترجيح جانب على اخر في قضية من القضايا التي لم يصدر فيها حكم السلطات المختصة بالوسائل الصحفية.

١٦- نشر المعلومات او البيانات المغلوطة وتجاهل تصحيحه فور الاطلاع على الحقيقة تأكيدا لاعتبار حق الرد حقا مقدسا.

١٧- اقتباس أي اثر من اثار الغير دون النص على اسم صاحبه او ذكر مصدره.

حوکمەکەی لەگەڵ واقیع و سروشتی پیشەی ڕۆژنامەگەریدا ناگونجێ، چونکە ڕۆژنامەنووس بەسروشت بۆ ئەنجامدانی کارەکەی بەدوای ڕاستیدا دەگەڕێت[٥١٦]. ئەمەش خۆی لە خۆیدا ئامانجی دەسەڵاتی لێکۆڵینەوە و دادگاکانە و هەردوولایان لەم حاڵەدا یەک دەگرنەوە. زۆرجاریش وارێک کەوتووە، دەسەڵاتی لێکۆڵینەوە و دادگاکان نەیانتوانیوە بگەنە ڕاستی و تاوانباری ڕاستەقینە مەگەر بەیارمەتی ڕۆژنامەگەرییەوە نەبێت. یاسادانەری عێراقی لەم ڕووەوە، لە یاسادانەری کوردستان سەرکەوتووتر بووە، کە دەڵێ: «نابێ هیچ ئەندامێک لەڕێگای ڕۆژنامەگەرییەوە لایەنێک بەسەر لایەنێکی تر پەسند بکات لەو کێشانەدا کە حوکمی دەسەڵاتە تایبەتمەندەکانی تیا دەرنەچووە»[٥١٧]. بۆیە، پێشنیار دەکەم یاسادانەری کوردستان هەمان هەنگاوی یاسادانەری عێراق لەم بارەیەوە بگرێتەبەر.

برگە (٦)ی ماددە(٢٠)ی یاسای کوردستان، بریتییە لە لێکدان و تێکەڵکردنەوەی هەردوو برگەی (١٣،١١)ی ماددە (٢٥)ی یاسای عێراقی بەدەسکارییەکی شێواوەوە[٥١٨].

برگە (٦)ی ماددەی ناوبراو دەڵێ نابێ ڕۆژنامەنووس متمانەی خەڵکی کوردستانی عێراق بەڕژێمی فیدراڵی کەم بکاتەوە. ئەمەش خۆی لە خۆیدا ناکۆکە لەگەڵ پرنسیپەکانی مافی مرۆڤ لە مافی چارەی خۆنووسیدا و دەستبەرداگرتنی مافێکی سەرەکی مرۆڤیشە لە بنەڕەتدا. بۆیە پێویستە ئەم حوکمە لابىردرێت.

هەروەها بەپێی هەمان برگە، نابێ ڕۆژنامەنووس عەریزەکانی جەماوەر بوروژێنێ. لە کاتێکدا، ئێمە دەزانین وروژاندنی هەندێ عەریزە لە هەندێ کات و ساتدا، نەوەک نابێ، بەڵکوو ئەرکێکی نیشتمانییشە.

---

٥١٦- ف. فریزر. بوند لەمبارەیەوە دەڵێ: «ئەرکی ڕۆژنامەنووس وەکو ئەرکی مێژوونووس وایە، کە دەبێ لە سەرووی هەموو شتەوە بەدوای ڕاستیدا بگەڕێت و ئەو شتانە پێشکەشی هەواڵێنی خۆی نەکات کە هونەری سیاسی پێشکەشیان دەکات، بەڵکوو ڕاستییان پێشکەش بکات» بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە ف. فریزر. بوند: مدخل الى الصحافة، سەرچاوەی پێشوو، ل٩٦-٩٧.

٥١٧- بڕوانە برگە (١٥)ی ماددە (٢٥)ی یاسای سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی عێراقی ژمارە (١٧٨)ی ساڵی ١٩٦٩ی هەمووارکراو.

٥١٨- بڕوانە دەقی برگە (١١) و (١٣)ی یاسای سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی عێراقی ژمارە (١٧٨)ی ساڵی ١٩٦٩ی هەمووارکراو لە برگەی (٥-١-٢) پەراوێزی ژمارە (٥٧٥) لەم تێزەدا.

بۆ نموونە، وروژاندنی غەریزەی خۆشەویستیی نیشتمان لە هەموو کاتێک ئەرکێکی نیشتمانییە بەگشتی و بەتایبەتیش لە کاتی پەلاماردانی دوژمن و داگیرکردندا.

بۆیە، باشتروابوو، یاسادانەری کوردستان ئەم حوکمەی وا بەرەهایی نەدابایە، بەڵکوو تەنها وروژاندنی ئەو غەریزانەی قەدەغە بکردبا کە دژ بەنیزامی گشتی و رەوشتی گشتی کۆمەڵن.

یاسادانەری میسری و لوبنانی و فەرەنسی، بەپێچەوانەی هەردوو یاسادانەری عێراقی و کوردستانی، لە جیاتی ئەوەی ئەو ئەرک و پابەندییانەی رۆژنامەنووسان لە ماددەیەکی سەربەخۆدا ریز بکەن، هەریەکەیان لە بەشێکدا بەچەند ماددەیەک لە میانی دەستنیشانکردنی تاوانەکانی رۆژنامەگەری و سزاکانیدا ئاماژەیان پێ کردوونە.

یاسادانەری میسری، لە یاسای رێکخستنی رۆژنامەگەری ژمارە(٩٦)ی سالی ١٩٩٦دا لەژێر ناونیشانی «ئەرکەکانی رۆژنامەنووسان» لە میانی دیارکردنی ئەو کردارانەی کە بەتاوانی رۆژنامەگەری دادەندرێت لەگەڵ سزاکانیان لە ماددەی (١٨)ەوە تاکو ماددەی (٣٤)ی بۆ ئەم مەبەستە تەرخان کردووە.

بەلام یاسادانەری لوبنانی، لە یاسای چاپەمەنی سالی ١٩٦٢ی هەموارکراودا، لە بابی یەکەمدا، لەژێر ناونیشانی «تاوانەکانی رۆژنامەگەری»دا حەوت فەسلی بۆ دەستنیشانکردنی ئەو ئەرکانە لەگەڵ سزاکانیان لە ماددەی (١)ەوە تاکە ماددەی (٢٥)ی تەرخان کردووە[٥١٩].

هەروەها یاسادانەری فەرەنسی، لە یاسای رۆژنامەگەری سالی ١٨٨١ی هەموارکراودا، بابی چوارەمی لەژێر ناونیشانی (ئەو کەتن و گەورەکەتانەی کە لە رێگای رۆژنامەگەری یان هەر هۆکارێکی تری بلاوکردنەوە دەکرێن) -DES CRIMES ET DELITS ET DE

---

٥١٩- ناونیشانی فەسلەکان بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

فەسلی یەکەم: خەبەردانی بەهەلە یان بەدرۆ

فەسلی دووەم: راستکردنەوە و وەلامدانەوە

فەسلی سێیەم: ئەو بابەتانەی بلاوکردنەوەیان قەدەغەیە

فەسلی چوارەم: هەرەشەکردن

فەسلی پێنجەم: زەمکردن و بوغزاندن و رق نیشاندان (الذم والقدح والتحقير)

فەسلی شەشەم: دەستدرێژیکردنە سەر کەرامەتی سەروو

فەسلی حەوتەم: هاندانی تاوان

LITS COMMIS PAR LA VOIE DE LA PRESSE OU PAR TPUT AUTRE MOYEN DE PUBLICATION کە لە پێنج فەسڵ پێک دێت، لە ماددەی (٢٣)ەوە تاکو ماددەی (٤١)ی بۆ ئەو ئەرک و پابەندی و سزا یاساییانە تەرخانکردووە[520].

شایەنی باسە، لەبەرئەوەی خاڵی (٥-٢)ی ئەم تێزەمان تەرخان کردووە بۆ تاوانەکانی رۆژنامەگەری و بەرپرسێتی تاوانکاری، بۆ ئەوەیش تووشی دووبارە بوونەوە نەبین، بۆیە بەباشمان زانی نەچینە ناو درێژەی باسی ئەرک و پابەندییەکانی رۆژنامەنووسان لە یاسای میسری و لوبنانی و فەرەنسیدا، لەکاتێکدا ئەو ئەرک و پابەندییانە لەمیانی تاوانەکانی رۆژنامەگەریدا لەو یاسایانەدا ئاماژەیان پێکراوە.

---

٥٢٠ - فەسڵەکانیش بەم ناونیشانانەی خوارەوەنە:

فەسڵی یەکەم: هاندانی بۆ کەتن و گەورەکەتن Provocation aux crimes ■ delits التحريض على الجرائم والجنح)

فەسڵی دووەم: کەتنی دژ بەشتی گشتی Delits contre la chose publique

فەسڵی سێیەم: کەتنی دژ بەکەسان Delits contre les personnes

فەسڵی چوارەم: کەتنی دژ بەسەرۆکی دەوڵەتان و دیپلۆماتکارانی بیانی

Delits contre les chefs dEtat et agents diplomatiques etrangers

فەسڵی پێنجەم: پارێزکاریی نهێنییەکانی بەرگری

publications interdites, immunites de la defense

## ٥-٢ تاوانەکانی ڕۆژنامەگەری و ئەو بەرپرسیارێتییە تاوانکارییەی لێی دەکەوێتەوە

تاوانەکانی ڕۆژنامەگەری بریتین لە ئەنجامدانی هەندێک کردار لە ڕێگای ڕۆژنامەگەرییەوە کە یاسا بەتاوانی داناون. یاسادانەر لەڕێگای دەقەکانی یاسای سزادان و یاسای ڕۆژنامەگەری و یاسای چاپەمەنی و یاسای مافی دانەر و یاسا تایبەتییەکانی تردا خەسڵەتی ناڕەوایەتی بەو کردارانە دەبەخشێت.

لەسەر ئەم بنچینەیە، تاوانبار (الجاني) دەکەوێتەبەر لێپرسینەوەی ئەو ئاکامە یاساییانەی کە لە کردارە ناڕەوایەکەی دەکەوێتەوە. جۆری ئەم بەرپرسیارێتییەش بەپێی ئەو بنچینە یاساییانە دەگۆڕێت کە خەسڵەتی ناڕەوایەتیان بەو کردارە بەخشیوە کە لێی دەکەوێتەوە. بەم پێیە، ئەو بەرپرسیارێتییەی کە لە ئاکامی سەرپێچیکردنی یاسای سزاداندا دێتە دی، پێی دەگوترێ بەرپرسیارێتیی تاوانکاری[٥٢١]، هەروەها سەرپێچیکردنی یاسای سزادان و یاسای مەدەنی، بەرپرسیارێتیی مەدەنی لێ دەکەوێتەوە[٥٢٢]، ئەمەو لە ئاکامی سەرپێچیکردنی یاسای سەندیکای ڕۆژنامەنووسان و دابونەریت و بنچینەکانی ئەخلاقی پیشەی ڕۆژنامەگەری بەرپرسیارێتیی پیشەیی دەکەوێتەوە[٥٢٣]. ئەمەو لەبەرئەوەی تاوانەکانی ڕۆژنامەگەری هەڕەشە لە نیزامی کۆمەڵایەتی و ڕامیاری دەوڵەت دەکەن بەم شێوەی کە لە ئاکامی بڵاوکردنەوە لە چاپکراوی خولەکیدا ڕوودەدەن و لەم حاڵەتەشدا تاوانەکانی ڕۆژنامەگەری لەوانەیە کاریگەرییان لە تاوانەکانی تری یاسا گشتییەکانی تر زیاتر بێ، چونکە زووتر و خێراتر بڵاودەبێتەوە.

بۆیە تاوانەکانی ڕۆژنامەگەری لەڕووی ڕایەڵەکانییەوە و ئەو بنچینانەی کە حوکمی بەرپرسیارێتییە یاساییەکەی دەکەن، پابەندی هەندێک بنچینەی یاسایی و حوکمی تایبەتین و جیاوازییان هەیە لەگەڵ تاوانەکانی تر.

---

٥٢١- ئەو هەڵەیەش کە لەلایەن ڕۆژنامەنووسەوە لە ئاکامی سەرپێچیکردنی بنچینەکانی یاسای سزاداندا ڕوودەدەن، پێی دەوترێ هەڵەی تاوانکاری.

٥٢٢- ئەو هەڵەیەش کە لەلایەن ڕۆژنامەنووسەوە لە ئاکامی سەرپێچیکردنی بنچینەکانی یاسای مەدەنی ڕوودەدەن، پێی دەگوترێ هەڵەی مەدەنی.

٥٢٣- ئەو هەڵەیەش کە لەلایەن ڕۆژنامەنووسەوە لە ئاکامی سەرپێچیکردنی یاسای سەندیکای ڕۆژنامەنووسان و دابونەریت و بنچینەکانی ئەخلاقیی پیشەی ڕۆژنامەگەری ڕوودەدەن، پێی دەگوترێ هەڵەی پیشەیی.

لەبەرئەوەی بەرپرسیاریەتی شارستانی شانبەشان یا وەکو پاشکۆی بەرپرسیاریەتی تاوانکاری دێت، بەواتایەکی تر، بەرپرسیاریەتی شارستانی لێرەدا نایەتە کایەوە بێ بەرپرسیاریەتی تاوانکاری. هەربۆیەش رایەلی هەلە تێکەلدەبێ لە هەردوو جۆری بەرپرسیارێتییەکەدا، بۆیە بەپێویستمان زانی، بەدرێژی تەنها باسی بەرپرسیاریەتی تاوانکاری بکەین.

لە خوارەوە لە دوو خالدا باسی تاوانەکانی رۆژنامەگەری و ئەو بەرپرسیارێتییە تاوانکارییەی لێی دەکەوێتەوە لە یاسا بەرکارەکانی کوردستان و بەراورددا دەکەین:

## ٥-٢-١ تاوانەکانی رۆژنامەگەری

### ٥-٢-١-١ پێناسەی تاوانەکانی رۆژنامەگەری

زۆربەی یاساکانی سزادان و یاساکانی رۆژنامەگەری و چاپەمەنی بایەخیان بەپێناسەی تاوانەکانی رۆژنامەگەری نەداوە[٥٢٤]، چونکە یاسادانەر هەرچەند هەوڵ و تەقەلا بۆ ئەم پێناسەکردنە بدات، هەر پێناسەیەکی ناتەواو دەبێت و ماهیەتی تاوانەکانی رۆژنامەگەری و رایەلەکانی بەتەواوەتی تێدا بەرجەستە ناکات، بۆیە یاسازانان چەندین پێناسەی جیاجیایان بۆ تاوانەکانی رۆژنامەگەری داناوە و سەرەرای جیاوازیشیان لەو پێناساناندا، کەچی لە ناوەرۆکدا یەک دەگرنەوە.

هەندێکیان پێناسەی دەکەن و دەڵێن: «تاوانەکانی رۆژنامەگەری بریتین لەو جۆرە تاوانانەی کە پەیوەندییان بەهزر و باوەر و مەزهەب و پرنسیپەکان بەهەموو جۆر و شێوەکانیانەوە هەیە، جا ئەو پرنسیپانە چ رامیاری بن یان ئابووری یان کۆمەلایەتی یانیش فەلسەفی بن»[٥٢٥].

هەروەها یاسازانی فەرەنسی پرۆفیسۆر بۆرگێن پێناسەی دەکات و دەڵێ: «تاوانەکانی

---

٥٢٤- یاسادانەری عێراقی یەکێکە لەوانەی کە پێناسەی تاوانەکانی رۆژنامەگەری نەکردووە تەنها لە ماددە (٨١)ی یاسای سزادانادا ئیکتیفای بەناوونیشانی «بەرپرسیارێتی لە تاوانەکانی بلاوکردنەوە» کردووە بێ ئەوەی پێناسەی ئەم تاوانانە بکات. تەنانەت واتای زاراوەی بلاوکردنەوەشی دیارنەکردووە، هەروەکو تۆزێکی تر لە باسکردنی بەرپرسیارێتیی تاوانکاریدا باس دەکرێ.

٥٢٥- د.عبدالله اسماعیل البستاني: حریة الصحافة، سەرچاوەی پێشوو، ل١٦٣.

ڕۆژنامەگەری بریتین لەو تاوانانەی کە پەیوەندییان بەبەکارهێنانی ڕاگەیاندن بەشێوەیەکی خراپ هەیە»[٥٢٦]. هەروەها هەندێکی تریش پێناسەی دەکەن و دەڵێن: «تاوانەکانی بڵاوکردنەوە ئەو تاوانانەن کە لە ڕێگای هۆکارەکانی ڕاگەیاندنەوە و لە ئاکامی بەکارهێنانی ئازادیی ڕاگەیاندن بەشێوەیەکی خراپ ڕوودەدەن»[٥٢٧].

لەم پێناسانەی سەرەوەدا بۆمان دەردەکەوێ، کە، پێناسەی یەکەمیان، تەنها باسی ناوەڕۆکی بڵاوکردنەوەی کردووە، بێ ئەوەی باسی ئەوە بکات کە ئەو هزر و باوەڕانە بەکارهێنانێکی خراپی ئازادیی بیر و ڕای لەخۆ گرتووە، هەروەها بەبێ ئەوەی ئەو هۆکارانەش دەستنیشان بکات کە ڕەنگبێت بەهۆیانەوە تاوانەکانی ڕۆژنامەگەری ڕووبدەن.

هەروەها، سەبارەت بەپێناسەی دووەمیشیان، ڕوون و ئاشکرا نییە و ئەویش هەروەکو پێناسەی پێشوو بەلای ناوەڕۆکی ئەو تاوانانە و ئەو هۆکارانەشدا نەچووە کە بەهۆیانەوە ئەنجام دەدرێن.

دەتوانین بڵێین، پێناسەی سێیەم، هەرچەندە تایبەتە بەتاوانەکانی بڵاوکردنەوە، بەڵام خۆی لە خۆیدا تاوانەکانی ڕۆژنامەگەریش دەگرێتەوە، چونکە ڕۆژنامەگەری کەناڵێکە لە کەناڵەکانی بڵاوکردنەوە و تاوانەکانی ڕۆژنامەگەریش لە ئاکامی بەکارهێنانی ئازادیی ڕۆژنامەگەری لە ڕێگای ڕۆژنامەگەرییەوە بەشێوەیەکی خراپ ڕوودەدەن. لە هەردوو پێناسەکانی تر باشترە،چونکە زۆربەی ڕەگەزەکانی تاوانەکانی ڕۆژنامەگەری لەخۆ گرتووە.

### ٥-٢-١-٢ سروشتی تاوانەکانی ڕۆژنامەگەری

یاسازانان بیروڕایان لەبارەی سروشتی تاوانەکانی ڕۆژنامەگەرییەوە لێک جیاوازە، هەندێکیان دەڵێن[٥٢٨]، تاوانەکانی ڕۆژنامەگەری تاوانێکی ئاساییە وەکو گشت تاوانەکانی تری یاسای گشتی و جیاوازییان لەگەڵ تاوانەکانی تری یاسای گشتی تەنها لە ڕووی ئەو هۆکارانەوەیە کە ئەو تاوانانەی پێ ئەنجام دەدرێن و جیاوازییان هەیە لەگەڵ ئەو هۆکارانەی کە تاوانەکانی تری پێ ئەنجام دەدرێت. بۆ نموونە، ڕۆژنامە و گۆڤار و ئێزگە و تەلەفزیۆن و ئینتەرنێت، بۆ ئەنجام دانی ئەم تاوانانە، شوێنی شیر و تیر و خەنجەر و چەقۆ و دەمانچە و تفەنگ و کەرەستەکانی تر دەگرنەوە.

---

٥٢٦- د.لطيفة حميد محمد: جرائم النشر في التشريع العراقي، سەرچاوەی پێشوو، ل٥١.

٥٢٧- د.ابراهيم الداقوقي: قانون الاعلام، سەرچاوەی پێشوو، ل٣٠١.

٥٢٨- د.ابراهيم الداقوقي: قانون الاعلام، سەرچاوەی پێشوو، ل٣٠١.

ئەو یاسازانانە پێیان وایە، ئەو هۆکاراتەی کە ئەو تاوانانەی پێ ئەنجام دەدرێت، هیچ لە سروشتی ئەو تاوانانە ناگۆرێت، تەنها ئەوندە تەبێت، بەکارهێنانی ئەم هۆکارانە لە سەپاندنی سزادا بەزەرفێکی توند (ظرف مشدد) دادەندرێت[٥٢٩].

بەرای ئەو یاسازانانە، یاسا هەندێک کردەوەی بەتاوان داناوە و سزاشی بۆ داناوە، لە کاتێکدا ئەنجامدانی ئەو کردارانە لە رێگای رۆژنامەگەرییەوە بێت یان لە رێگای هەر نامرازێکی تری بلاوکردنەوەوە بێت، لە سەپاندنی سزادا، بەزەرفێکی توند دادەندرێت[٥٣٠].

سەبارەت بەپابەندبوونی ئەو تاوانانە بەهەندێک حوکم و بنەمای تایبەتی، ئەو یاسازانانە دەلێن، ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە نابێ ئەو تاوانانە پابەندی هەندێک حوکمی تایبەتی بن کە زۆر یان کەم جیاوازییان لەگەڵ ئەو حوکمانەدا هەبێ کە تاوانەکانی تری یاسای گشتی پابەندیبوونە.

هەندێک یاسازانی تریش هەن[٥٣١]، دەلێن، تاوانەکانی رۆژنامەگەری سروشتێکی تایبەتییان هەیە، چونکە تەنها لە رێگای کردارێکی ماددییەوە روونادەن، بەڵکو لە ناکامی بلاوکردنەوەی بیروراو هزر بەنیازێکی خراپەوە روو دەدەن.

ئێمە پێمان وایە، تاوانەکانی رۆژنامەگەری جیاوازییەکی زۆریان لەگەڵ تاوانەکانی تری یاسای گشتی هەیە و جیاوازییان تەنها لەو نامرازانەدا نییە کە ئەو تاوانانەی پێ ئەنجام دەدرێت لەچاو تاوانەکانی تری یاسای گشتی، بەڵکو لە جیاوازی سروشت و ناکامەکانیاندایە. بۆ نموونە، تاوانەکانی رۆژنامەگەری بەپێچەوانەی تاوانەکانی تری یاسای گشتی هیچ ناکامێکی ماددی راستەوخۆیان لێ ناکەوێتەوە و لە دەستدرێژیکردنە

---

٥٢٩- یاسای سزادانی عێراقی لە برگەی یەکەمی ماددەی (٤٣٣)دا بلاوکردنەوەی بوختانپێکردنی لە چاپەمەنیدا بەزەرفێکی توند داناوە لە سەپاندنی سزای تاوانەکانی بوختانپێکردندا.
هەروەها یاسای سزادانی میسریش لە ماددەی (٣٠٧)دا ئەنجامدانی بوختانپێکردن (قذف)ی لە رێگای بلاوکردنەوە لە یەکێک لە رۆژنامەکان یان چاپەمەنییەکاندا بەزەرفێکی توند داناوە بۆ سەپاندنی سزای تاوانەکانی بوختانپێکردن.

٥٣٠- هەروەکو یاسادانەری عێراقیش لە یاسای سزادانی ژمارە (١١١)ی سالی ١٩٦٩ی هەمواركراودا ئەم رێگایەی گرتۆتەبەر.

٥٣١- د. شریف کامل، و د. عمر سالم، بروانە د.لطیفة: جرائم النشر في التشریع العراقي، سەرچاوەی پێشوو، ل٥٧.

سەر ئیعتباری ئەدەبی و ئاشکراکردنی نهێنی و چەواشەکردن و هاندان بەولاوە، مەگەر بەدەگمەن ئەگینا ڕەچاوی زیاتریان لێ ناکرێ. بۆیە بەتاوانی تایبەتی دادەندرێن و جیاوازییان لەگەڵ تاوانەکانی تر هەیە و ئەم جیاوازییەش دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازیی سروشتی ئەو تاوانانە لەچاو تاوانەکانی تر.

بۆیە، چوونە دەرەوەی هەندێک یاسادانەر لە بنەما گشتییەکان (القواعد العامة)ی تاوانەکانی یاسای گشتی، لە ڕێکخستنی تاوانەکانی چاپەمەنی و ڕۆژنامەگەریدا و خۆبەستنەوەیان بەهەندێک بنەمای تایبەتی شتێکی ئاسایە، بەڵکوو سروشتی ئەو تاوانانە دەیسەپێنێ و ئەو یاسادانەرانە مەبەستیان بووە، واز لەو بنەما گشتییانە بهێنن.

بۆ نموونە، هەندێک لەو یاسادانەرانە لەو بنەما گشتییە دەردەچن کە دەڵێ، دادگای تاوانی کەتن (جنحة) دادگایەکی تایبەتمەندە بەتەمەشاکردنی کێشەکانی تاوانی کەتن. بۆیە، لە یاساکانیاندا، دادگای تاوانی گەورەکەتنەکان (جنایات) تایبەتمەند دەکەن بەتەمەشاکردنی ئەو تاوانە کەتنانەی کە لە ڕێگای بڵاوکردنەوە و ڕۆژنامەگەرییەوە ڕوودەدەن[٥٣٢].

---

٥٣٢ - بڕوانە دەقی ماددە (٢١٥)ی یاسای (الاجراءات الجنائية)ی میسری ژمارە (٥٠)ی ساڵی ١٩٥٠ کە تیایدا هاتووە: «دادگای جوزئی (جزئي) حوکمی هەر کردارێک دەکات کە بەپێی یاسا بەسەرپێچی یان کەتن (جنحة) دادەندرێ، تەنها ئەو کەتنانە نەبێت کە لە ڕێگای ڕۆژنامەگەرییەوە ڕوودەدەن...». هەروەها لە ماددەی (٢١٦)ی هەمان یاسادا هاتووە: «دادگای کەتنە گەورەکان (الجنايات) حوکمی هەرکردارێک دەکات کە بەپێی یاسا بەگەورەکەتن داندراوە هەروەها ئەو کەتنانەش کە لە ڕێگای ڕۆژنامەگەرییەوە ڕوودەدەن».

یاسادانەری فەرەنسی یەکلاکردنەوەی ئەو سەرپێچییانەی کە لە ڕێگای ڕۆژنامەگەرییەوە ڕوودەدەن کردۆتە دەسەڵاتی دادگای کەتن(جنحة) تەنها ئەو سەرپێچییانە نەبێت کە بڕی غەرامەکەیان کەمە یانیش ئەو حاڵەتانەن کە لە ماددەی (٢٣)دا ئاماژەیان پێ کراوە، ئەمەش دەقەکەیەتی بەزمانی فەرەنسی:

"Article 23

Modifié par Loi 85-1317 13 Décembre 1985 art 18-I JORF 24 décembre 1985.

Seront punis comme complices d'une action qualifiée crime ou délit ceux qui, soit par des discours, cris ou menaces proférés dans des lieux ou réunions publics, soit par des écrits, imprimés, dessins, gravures, peintures, emblèmes, images ou tout autre support de l'écrit, de ■ parole ou de l'image vendus ou distribués, mis en vente ou exposés dans des lieux ou réunions publics, soit par des placards ou des affiches exposés au regard du public, soit par tout moyen de communication audiovisuelle, auront directement provoqué l'auteur ou les auteurs à com-

کەواتە، ئەو یاسادانەرانەی کە لە تاوانەکانی چاپەمەنی و ڕۆژنامەگەریدا ڕێگایان بە(التوقیف الاحتیاطي) نەداوە[533]. یاخود ئەو تاوانانەیان هەموو لە دووتوێی یاسای چاپەمەنی یان ڕۆژنامەگەریدا کۆکردۆتەوە[534]، لەبەر تایبەتمەندی ئەو تاوانانەمەیان کردووە و مەبەستیان بووە لە تاوانەکانی تری یاسای گشتی جیایان بکەنەوە.

بۆیە دەڵێین، لاداتی هەندێک یاسادانەر لە هەندێک بنەمای شێوەیی (قواعد شكلية) یان بنەمای بابەتی (قواعد موضوعية) سەبارەت بەهەندێک لە تاوانەکانی ڕۆژنامەگەری، یان کۆکردنەوەی ئەو تاوانانە لە دووتوێی یاسای چاپەمەنی و ڕۆژنامەگەریدا هەروەها ڕێگانەدانیان بە(التوقیف الاحتیاطي) لە تاوانەکانی

---

mettre ladite action, si la provocation a été suivie d'effet .

Cette disposition sera également applicable lorsque la provocation n'aura été suivie que d'une tentative de crime" prévue par l'article 2 du code pénal

یاسادانەری لوبنانی، جیاواز لە یاسادانەری میسری و فەرەنسی، لە برگەی یەکەمی ماددە (٢٨)ی یاسای ژمارە (٣٣٠)ی ساڵی ١٩٩٤دا دەسەڵاتی یەکلاکردنەوەی گشت تاوانەکانی چاپەمەنی و ڕۆژنامەگەری داوەتە دادگای تێهەڵچوونەوە بەپلەی یەکەم (محكمة الاستئناف بالدرجة الاولى) بەمەرجێک ئەو حوکمانە لە لایەن دادگای پیاچوونەوە (محكمة التمييز) تەمەشا بکرێتەوە. کە ئەمەش دەڵەکەیەتی: «دادگای تێهەڵچوونەوە بەپلەی یەکەم تەمەشای گشت ئەو کێشانە دەکات کە پەیوەندییان بەتاوانەکانی چاپەمەنییەوە هەیە و حوکمەکانیش لەلایەن دادگای پیاچوونەوە وەک لایەنێکی تێهەڵچوونەوە تەمەشا دەکرێتەوە...».

٥٣٣- بڕوانە برگەی دووەمی ماددە (٢٨)ی یاسای لوبنانی ژمارە (٣٣٠)ی ساڵی ١٩٩٤ کە ئەمەش دەڵەکەیەتی: «لە تاوانەکانی چاپەمەنیدا ڕێگا بە(التوقیف الاحتیاطي) نادرێت».

٥٣٤- بڕوانە یاسای چاپەمەنی لوبنانی ساڵی ١٩٦٢ی هەمووارکراو لە ماددەی (١)ەوە تاکو ماددەی (٢٧) کە بەپێی مەرسومی یاسایی ژمارە (١٠٤)ی ساڵی ١٩٧٧ وەک بەدیلێک بۆ ماددەی (٥٠) تاکو ماددە (٧٠)ی ئەو یاسایە دەرچووە و بەمەرسومی یاسایی ژمارە (٨٩)ی ساڵی ١٩٩١ و (٣٣٠)ی ساڵی ١٩٩٤یش هەموار کراوە. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە عادل بطرس: قانون الاعلام، الجزء الثالث، مطابع الغفالي، بیروت، لبنان، ١٩٩٥، ل ١٦٢ بەدواوە.

هەروەها یاسادانەری فەرەنسی لە یاسای ڕۆژنامەگەری ساڵی ١٨٨١ی هەموارکراودا بابی چوارەمی لەژێر ناونیشانی «ئەو تاوانانەی لە ڕێگای ڕۆژنامەگەری یان هەر هۆکارێکی تری بڵاوکردنەوە ئەنجام دەدرێن - DES CRIMES ET DELITS COMMIS PAR LA VOIE DE LA PRESSE OU PAR TOUT AUTRE MOYEN DE PUBLICATION»، لە ماددەی (٢٣) تاکو ماددەی (٤١) بۆ ئەم مەبەستە تەرخان کردووە.

ڕۆژنامەگەریدا ئەوە دەگەیەنێ کە ئەو تاوانانە سروشتێکی تایبەتییان هەیە و لە تاوانەکانی تری یاسای گشتی جیاوازن.

بۆ زیاتر ڕوونکردنەوە، ئەگەر بێت و لە ڕووی ڕایەڵەکانەوە سەیری تاوانە ئاساییەکانی یاسای گشتی بکەین، دەبینین، لە ڕووی ڕایەڵی شەرعییەوە بۆ تاوانە ئاساییەکان و تاوانە سەربازییەکان دابەش کراون. بەو پێیەی تاوانە ئاساییەکان لە یاسای سزادان و یاساکانی تری تەواوکەر دەنووس کراون و تاوانە سەربازییەکانیش لە یاسای سزادانی سەربازیدا دەنووس کراون[٥٣٥]. کەواتە دەکرێ ئەو تاوانانەی لە یاسای ڕۆژنامەگەریدا دەنووس دەکرێن، پێیان بڵێین تاوانەکانی ڕۆژنامەگەری. هەروەها لە ڕووی ڕایەڵی مەعنەویشەوە بۆ تاوانە بەئەنقەستەکان (الجرائم العمدية) و تاوانە نائەنقەستەکان (الجرائم غير العمدية) دابەش کراون[٥٣٦]. لە کاتێکدا، تاوانەکانی ڕۆژنامەگەری بەزۆری تاوانی بەئەنقەستن و بەدەگمەن بەهەڵە ڕوودەدەن، چونکە ڕایەڵی ماددی بۆ هاتنەدی بەرپرسێتی تاوانکاری لەم تاوانانەدا، بەس نییە، بەڵکوو بۆ هاتنەدی ئەم بەرپرسیارێتییە دەبێ مەبەستی تاوانکارییش هەبێ کە ڕایەڵی مەعنەوی نیشان دەدات، هەروەها ئەم تاوانانە بەپێچەوانەی تاوانە ئاساییەکان، لە ئاکامی کۆمەڵە کردارێکی هزرییەوە ڕوو دەدەن نەک ماددی، بۆیە ئاکامەکانیشیان بەزۆری لەسەر لایەنە هزری و مەعنەوییەکانەوە دەبێ نەک شتە ماددییەکان. هەروەها لەڕووی جۆری ئەو زیانانەش کە لێیان دەکەونەوە، دیسان لەگەڵ تاوانە ئاساییەکان جیاوازییان هەیە، چونکە بەزۆری زیانی مەعنەوییان لێ دەکەوێتەوە، هەندێ جار نەبێ کە بەشێوەیەکی لاوەکی زیانی ماددییان لێ دەکەوێتەوە، وەک تانەدان لەو کەلوپەل و حزمەتگوزارییانەی کە کۆمپانیایەک پێشکەشی جەماوەر دەکات، ئەگینا ڕاستەوخۆ زیانی ماددییان لێ ناکەوێتەوە.

لە کۆتاییدا، بەدڵنیاییەوە دەڵێین، تاوانەکانی ڕۆژنامەگەری لەبەر ئەو تایبەتمەندییەی هەیەتی بەتاوانی تایبەتی دادەندرێن. هەر بەم بۆنەیەوە داوا لە یاسادانەری هەرێمی کوردستان دەکەین، لە پێناو ڕەخساندنی دەرفەتێکی زیاتر بۆ ڕۆژنامەنووسان و ئازادکردنی ڕۆژنامەگەری لەو کۆت و بەندانەی کە دەبنە ئاستەنگ

---

٥٣٥- د. علي حسين الخلف و سلطان عبدالقادر الشاوي: المبادىء العامة في قانون العقوبات، مطابع الرسالة، الكويت، ١٩٨٢، ل٣٢١.

٥٣٦- د. علي حسين الخلف و سلطان عبدالقادر الشاوي: المبادىء العامة في قانون العقوبات، سەرچاوەی پێشوو، ل٣٢٣.

لەبەردەمیدا، ئەم تایبەتمەندییە لە یاسای چاپەمەنیدا لەبەرچاو بگیرێت و سزا ئازادیی ستینەکان لە چوارچێوەیەکی زۆر تەسکدا بهێڵێتەوە و لەجیاتی ئەوە جەخت لەسەر غەرامەی دارایی و قەرەبووی زیان لێکەوتوو بکاتەوە.

### ٥-٢-١-٣ رایەڵەکانی تاوانەکانی رۆژنامەگەری (ارکان جرائم الصحافة)

بەشێوەیەکی گشتی تاوان دوو رایەڵی هەیە[٥٣٧] کە بریتین لە رایەڵی ماددی- Element Materiel و رایەڵی مەعنەوی- .Element Moral[٥٣٨] بەم رایەڵانەش دەگوترێ، رایەڵە گشتییەکانی تاوان[٥٣٩]. بەڵام ئەو تایبەتمەندییەی کە گشت تاوانەکانی رۆژنامەگەری بەیەکەوە گرێدەداتەوە، بریتییە لە رایەڵی بەئاشکرایی، کە بەرای ئێمە رایەڵێکی نیزامییە، بۆیە ئێمە پشتگیری ئەو بۆچوونە ناکەین کە رایەڵی بەئاشکرایی لەم تاوانەدا بەبەشێک لە رایەڵی ماددی دەزانێ لەبەرئەوە هەڵوەستەیەک لەسەر ئەو رایەڵە گشتییانە دەکەین کە هاوبەشن لە نێوان تاوانەکانی رۆژنامەگەری و تاوانەکانی تردا، ئینجا بەخەستی لە رایەڵی بەئاشکرایی دەکۆڵینەوە، چونکە ئەم رایەڵە لە تاوانەکانی رۆژنامەگەریدا بەخەسڵەتێکی سەرەکی دادەندرێت.

لە خوارەوە لە سێ خاڵدا باسی ئەم رایەڵانە لە یاسای سزاداتی عێراقی و بەراوورددا دەکەین بەوسیفەتەی کە یاسایەکی بەرکارە لە هەرێمی کوردستانی عێراقدا:

---

٥٣٧- بڕوانە د.فخري عبدالرزاق الحديثي: شرح قانون العقوبات، القسم العام، مطبعة اوفست الزمان، بغداد، ١٩٩٢، ل١٧٧ بەدواوە.

٥٣٨- هەندێ یاسازان پێیان وایە تاوان سێ رایەڵی گشتی هەیە کە بریتین لە رایەڵی یاسایی و ماددی و مەعنەوی بڕوانە د. علي حسين الخلف وسلطان عبدالقادر الشاوي: المبادىء العامة في قانون العقوبات، سەرچاوەی پێشوو، ل١٣٧-١٣٨، بەڵام یاسای سزاداتی عێراقی لە کتابی یەکەم، بابی سێیەم، فەسڵی سێیەمدا لە ماددەی (٢٨-٣٨)دا ئەمەی یەکلاکردۆتەوەو بەدوو رایەڵی داناوە، رایەڵی ماددی و مەعنەوی.

٥٣٩- بۆیە پێیان دەگوترێ رایەڵە گشتییەکانی تاوان، چونکە گشت تاوانێک بێ دەرهاوێشتن (بدون استثناء) دەگرێتەوە، بەڵام ئەگەر تایبەت بوون بەتاوانێکی دیاریکراو، لەو حاڵەتەدا پێی دەگوترێ رایەڵە تایبەتییەکانی تاوان و تایبەت دەبن بەتاوانێکی دیاریکراو وەک تاوانی دزین و تاوانی نادەسپاکی و... هتد بڕوانە د. علي حسين الخلف وسلطان عبدالقادر الشاوي: المبادىء العامة في قانون العقوبات، مطبعة الرسالة، الكويت، ١٩٨٢، ل١٣٧.

یەکەم: ڕایەڵی ماددی

یاسای سزادان لەسەر پرنسیپێکی گرنگ دامەزراوە، ئەویش ئەوەیە، تەنها بیرکردنەوە و بڕیاری ناوناخ(القرار الكامن في النفس) لە ئەنجامدانی تاوان بەتاوان دانانرێ مەگەر ئەم بیرکردنەوەیە لە قەوارەیەکی ماددی و هەستپێکراوەوە بەرجەستە بێت کە پێی دەگوترێ ڕایەڵی ماددی تاوان[540]. ئەمەو یاسازانیی تاوانکاری (الفقه الجنائي) لەسەر پرنسیپی «هیچ تاوانێک بەبێ ڕەفتاری ماددی ڕوونادات» ڕێککەوتوون.

بێ گومان ئەمەش لەگەڵ پرنسیپێکی تری هاوچەشن دەگونجێ، ئەویش ڕێزگرتنە لە ژیانی تاکەکەس. واتە دەبێ واز لە تاکەکەس بهێندرێ بیر لە چی دەکاتەوە و باوەڕی بەچی هەیە و نابێ یاسا سزای بەسەردا بسەپێنێ مەگەر ئەو بیر و باوەڕەی کە یاسا ڕەتیدەکاتەوە و سروشتێکی ماددی هەستپێکراو وەرگرێت.

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ، ئەو هیوا و ئاوات و ئارەزوو و بیر و هزرانەی کە لەناو مێشکیدا دەخولێنەوە بەڕایەڵی ماددی دانانرێن هەتا ئەگۆڕێن بۆ چالاکییەکی ماددی هەستپێکراو لە واقیعدا. لەم بارەیەوە یاسای سزادانی عێراق پێناسەی ڕایەڵی ماددی تاوان دەکات و دەڵێ: «ڕایەڵی ماددی تاوان بریتییە لە ڕەفتارێکی تاوانکاری لە کردنی کردارێک یان نەکردنی کردارێک کە یاسا فەرمانی پێکردووە»[541].

لە شیکردنەوەی ئەم پێناسەیەدا بۆمان دەردەکەوێ، ڕایەڵی ماددی لە تاوانی تەواودا لە سێ ڕەگەز پێکدێت، کە بریتین لە ڕەفتاری تاوانکاری و ئەنجامی زیانبەخش و پەیوەندیی هۆکاری لەنێوان ڕەفتاری تاوانکاری و ئەنجامی زیانبەخشدا. لە خوارەوە لە سێ خاڵدا بەکورتی باسی هەر یەکێک لەو ڕەگەزانە دەکەین:

١- ڕەفتاری تاوانکاری

ڕەفتاری تاوانکاری ئەو چالاکییە ماددییە دەرەکییەیە کە تاوانی لێ پێکدێت[542].

---

٥٤٠- د. محمد زكي ابو عامر: قانون العقوبات اللبناني - القسم العام، الدار الجامعية للطباعة والنشر، بيروت، ١٩٨١، ل٧٥.

٥٤١- بڕوانە ماددەی (٢٨) لە یاسای سزادانی عێراقی.

٥٤٢- یاسای سزادانی عێراقی ژمارە (١١١)ی ساڵی ١٩٦٩ی هەمووارکراو لە بڕگەی (٤)ی ماددە (١٩)دا پێناسەی کرداری کردووە و دەڵێ: «هەموو ئەو کار و کردەوانەیە کە یاسا بەتاوانی دادەنێت جا چ پۆزەتیڤی یان نێگەتیڤی بێت وەک نەکردن و وازلێهێنان ئەگەر دەقێکی پێچەوانەی = ئەمە

تاوان بەگشتی پۆزەتیڤ دەبێت ئەگەر بێت و لە ناکامی چالاکییەکی پۆزەتیڤەوە بێتە دی، یانیش نێگەتیڤی دەبێت، ئەگەر بێت و لە ناکامی چالاکییەکی نێگەتیڤییەوە بێتە دی[٥٤٣]. تاوانی ڕۆژنامەگەریش وەکو گشت تاوانێکی تر، تەنها لە ڕێگای ڕەفتاری تاوانکاریی پۆزەتیڤەوە روو نادات، بەڵکو لە ڕێگای نەکردن و وازلێهێنانیشەوە ڕوودەدات. بۆ نموونە، تاوانی بوختانپێکردن و جوێنپێدان (تانە و تەشەردان لە خەڵکی)، تاوانێکی پۆزەتیڤە[٥٤٤]، بەڵام ڕاست نەکردنەوەی ئەو زانیارییە چەوتانەی کە لە ڕۆژنامەدا بڵاوکراونەتەوە، هەروەها بڵاونەکردنەوەی بەدواداچوونی ئەو بابەتانە لەلایەن خاوەنەکانیان یان ئەو کەسانەی پەیوەندییان پێوەهەیە، تاوانێکی نێگەتیڤە[٥٤٥].

---

دەرنەچێت و ڕەتینەکاتەوە - «کل تصرف جرمه القانون سواء کان ایجابیا ام سلبیا کالترك والامتناع مالم یرد نص علی خلاف ذلك».

٥٤٣- د. مصطفی ابراهیم الزلمي: المسؤولیة الجنائیة في الشریعة الاسلامیة ومقارنة بالقانون، ج ١، مطبعة اسعد، بغداد، ١٩٨٣، ل٣٣.

٥٤٤- ڕەفتاری تاوانکاری لە تاوانی بوختانپێکردندا، لە ناکامی خستنەپاڵەوەی ڕووداوێکی دیاریکراو دێتەدی کە دەدرێتە پاڵ کەسێکی دیاریکراو و لە شەرەف و کەرامەتی کەم بکاتەوە و ئەگەر ڕاستیش بێت ڕووبەڕووی سزای بکاتەوە و لەلای هاووڵاتییانیش ڕیسوای بکات. هەروەها لە تاوانی جوێنپێداندا، ڕەفتاری تاوانکاری لە ئاکامی ناوزڕاندن و هەست بریندارکردنی تاوان دەرهەلکراو المجني علیه دێتەدی، بۆ نموونە، ڕۆژنامەنووسێک یەکێک بەدڕندە یان بەگەمژەل دابنێ. هەروەها لە تاوانەکانی ئاشکراکردنی نهێنیدا، ڕەفتاری تاوانکاری لە ئاکامی ئاشکراکردنی ئەو زانیارییە نهێنییانەوە دێتەدی کە پەیوەندییان بەکاروباری سەربازی و سیاسەتی وڵاتەوە هەیە.

٥٤٥- ئەگەر هات و وەڵامەکە گەیشتە ڕۆژنامەکە و هەموو مەرجەکانی بابەتی و شێوەیی تێدابوو، دەبێ بڵاوی بکاتەوە و بۆی نییە بڵاوی نەکاتەوە و وازی لێ بهێنێ، ئەگینا بەئەنجامدەری تاوانی نەکردن و وازلێهێنانی بڵاوکردنەوەی وەڵام دادەنرێت. بڕوانە دەقی ماددە (٢٨)ی یاسای دەسەڵاتی ڕۆژنامەگەریی میسری ژمارە (٩٦)ی ساڵی ١٩٩٦ ئەمەش دەقەکەیەتی «اذا لم یتم التصحیح في المدة المحددة في المادة ٢٤ من هذا القانون یعاقب الممتنع عن نشره بالحبس مدة لاتقل عن ثلاثة اشهر وبغرامة لاتقل عن الف جنیه ولاتجاوز اربعة الاف جنیه او باحدي هاتین العقوبتین...».

هەروەها دەقی ماددە (١٣)ی یاسای ڕۆژنامەگەریی فەرەنسی کە ئەمەش دەقەکەیەتی:

Article 13

Modifié par Ordonnance 2000-916 19 Septembre 2000 art 3 JORF 22 septembre 2000 en vigueur le 1er janvier 2002.

Le directeur de la publication sera tenu d'insérer dans les trois jours de leur réception. les réponses de toute personne nommée ou désignée dans le journal ou =

**٢- ئەنجامی تاوانکاری**

مەبەست لە ئەنجامی تاوانکاری ئەو گۆڕانکارییەیە کە لە ئاکامی ڕەفتاری تاوانکاری لە جیهانی دەرەوەدا ڕوو دەدات بەچەشنێک دەبێتە مایەی دەستدرێژیکردنە سەر مافێک یان بەرژەوەندییەک کە یاسادانەر پاراستنی سزایی بۆ دەستەبەر کردبێت[٥٤٦].

هەرچەندە، بەرپرسیارێتیی تاوانکاری لەم ڕووەوە جیاوازی هەیە لەگەڵ بەرپرسیارێتیی شارستانیدا، لەکاتێکدا کە بەرپرسیارێتیی شارستانی لەگەڵ زیاندا بەبوون و بەنەبوون دەخولێتەوە، چونکە زیان ڕایەڵێکە لە ڕایەڵەکانی ئەو بەرپرسیارێتییە، کەچی بەپێچەوانەی ئەوە، ئەگەر زیانیش نەبێت، بەرپرسیارێتیی تاوانکاری هەر دێتەدی، چونکە، ئەو بەرپرسیارێتییە لەگەڵ هەڵە (خطا) بەبوون و بەنەبوون دەخولێتەوە[٥٤٧].

---

écrit périodique quotidien sous peine de 3750 euros d'amende sans préjudice des autres peines et dommages-intérêts auxquels l'article pourrait donner lieu.

En ce qui concerne les journaux ou écrits périodiques non quotidiens, le directeur de la publication, sous les mêmes sanctions, sera tenu d'insérer la réponse dans le numéro qui suivra le surlendemain de la réception.

معدل بموجب الامر المرقم ٩١٦-٢٠٠٠ الصادر في التاسع عشر من ايلول ٢٠٠٠ ٢٢ ايلول ٢٠٠٠ اعتبارا من ١ كانون الثاني ٢٠٠٢

«يلتزم رئيس التحرير بادراج خلال ثلاثة ايام من استلام اجوبة كل شخص معين او موظف في الجريدة او المنشور الدوري او اليومي تحت عقوبة ٣٧٥٠ يورو كغرامة بدون المساس بالعقوبات الاخرى والتعويضات القضائية التي يمكن ان تنص عليها المادة.

فيما يخص الجرائد والمنشورات الدورية غير اليومية، فان مدير النشر وبمقتضى نفس الاجراءات ملزم بنشر الرد في العدد اللاحق لليوم الذي يلي الاستلام. ينبغي ان يكون هذا النشر في نفس المكان وبنفس حجم الحروف للمقال الذي تمت به الاثارة (هيجان) وبدون أي (حشو) او اقحام».

٥٤٦- د.حسين خلف و سلطان عبدالقادر الشاوي: المبادئ العامة في قانون العقوبات، سەرچاوەی پێشوو، ل.١٤٠.

٥٤٧- بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەیەوە بڕوانە (د. مصطفى ابراهيم الزلمي) موانع المسؤولية الجنائية في الشريعة الاسلامية والتشريعات الجزائية العربية، ط١، منشورات الدار الجامعية للطباعة والنشر والترجمة، بغداد، ٢٠٠٥، ل.٣٠-٣٩.

٣- پەیوەندیی هۆکاری

مەبەست لە پەیوەندیی هۆکاری وەک ڕەگەزێک لە ڕەگەزەکانی رایەڵی ماددی تاوانی ڕۆژنامەگەری، ئەو پەیوەندییەیە کە ڕەفتاری تاوانکاری و ئەنجامە زیانبەخشەکەی بەیەکەوە دەبەستێتەوە، بەچەشنێک ئەوە بسەلمێنن کە ئەو ڕەفتارە تاوانکارییەی ڕووی داوە بۆتە هۆی ڕوودانی ئەنجامە زیانبەخشەکە[٥٤٨].

هەندێجار زیاتر لە هۆکارێک بۆ ڕوودانی ئاسانجی تاوانکاری لەگەڵ ڕەفتاری تاوانکاردا بەشداری دەکەن. لەو حاڵەتەشدا گرفتمان بۆ دێتە ڕێگاوە، ئەویش ئەوەیە، ئایا بەشداریکردنی ئەو هۆکارانە بەیەکەوە، پەیوەندی هۆکاری ناهێڵن یانیش وەکو خۆی دەیهێڵێتەوە؟

یاسازانی و دادگەری (الفقه والقضاء) بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە، چەند تیۆرێکیان داناوە، لەوانە تیۆری هۆکاری گونجاو (السبب الملائم) و تیۆری هاوسەنگی هۆکارەکان (تعادل الاسباب)[٥٤٩]. یاسادانەری عێراقی بۆ بەدەرخستنی پەیوەندیی هۆکاری لە نێوان ڕەفتاری تاوانکاری و ئەنجامی تاوانکاریدا کاری بەتیۆری هاوسەنگی هۆکارەکان کردووە[٥٥٠].

بەم پێیە ئەو کەسەی تاوانێکی ڕۆژنامەگەری ئەنجام دەدات، لێپرسینەوەی یاسایی لەگەڵ دەکرێت، ئەگەر بێت و ئەو تاوانەی ئەنجامی داوە، بەتەنها لە ئاکامی ڕەفتارە تاوانکارییەکەی ئەو ڕووی نەدابێ، بەڵکو پێشتر یان دواتر یان دەمودەست هۆی تر هەبووبێت و بەشدارییان لە ڕوودانی کردبێت.

دووەم: رایەڵی مەعنەوی

لەو کاتەی رایەڵی ماددی ڕەگەزە ماددییەکەی تاوان لەخۆ دەگرێت، رایەڵی مەعنەوییش ڕەگەزە دەروونییەکانی تاوان لەخۆ دەگرێت. چونکە تاوان بەتەنها قەوارەیەکی ماددی

---

٥٤٨- د.حسین خلف و سلطان عبدالقادر الشاوي: المبادي العامة في قانون العقوبات، سەرچاوەی پێشوو، ل١٤١.

٥٤٩- بۆ ناوەرۆکی ئەم تیۆرانە بڕوانە (د.فخري عبدالرزاق صلبي الحديثي): شرح قانون العقوبات - القسم العام، سەرچاوەی پێشوو، ل١٩٤ بەدواوە، هەروەها د.حسین خلف و سلطان عبدالقادر الشاوي: المبادي، العامه في قانون العقوبات، سەرچاوەی پێشوو، ل١٤٢ بەدواوە.

٥٥٠- بڕوانە دەقی ماددە (٢٩)ی یاسای سزادانی عێراقی.

نیيه، پێکهاتبێ له کار و ئاکامەکانی، بەڵکوو قەوارەیەکی دەروونیشه پێکهاتووه له ڕەگەزە دەروونییەکان و پێی دەگوترێ ڕایەڵی مەعنەوی[551].

جا پەیوەندیی دەروونی له نێوان تاوانکار (الجاني) و ئەو ڕەگەزە ماددییە ناڕەوایانه بەیەکێک لەم دوو شێوەیە خۆی دەنوێنێ، یان له شێوەی مەبەستی تاوانکاری ( القصد الجرمي) یان له شێوەی هەڵەی نامەبەست (الخطأ غير العمدي)[552].

جا لەبەرئەوەی تاوانەکانی ڕۆژنامەگەری بەگشتی تاوانی بەئەنقەستن[553] بۆیە بەدەگمەن پێشبینی دەگرێ ئەو تاوانانه له ڕێگای هەڵەی نامەبەستەوە ڕوودەدەن، بەڵکوو تاوانکار بەزۆری ویست و ئارەزووی خۆی ئاراستە دەکات بۆ بەدیهێنانی تاوانەکەی، بۆیه لەو تاوانانەدا، مەبەستی تاوانکاری ڕایەڵی مەعنەوی دەنوێنێ. جا لەبەرئەوە، له خوارەوە تەنها باسی مەبەستی تاوانکاری دەکەین.

یاسازانانی موسڵمان پێناسەی مەبەستی تاوانکارییان کردووه و دەڵێن: «مەبەستی تاوانکاری بریتییه له کردنی کارێک یان نەکردنی، هەروەها ڕازیبوون بەو ئاکامانەی لێی دەکەوێتەوە»[554].

(ئۆرتلانیش)ی یاسازانان پێناسەی مەبەستی تاوانکاریی کردووه و دەڵێ: «مەبەستی تاوانکاری بریتییه له ئاراستەکردنی کارێک یان نەکردنی بۆ هێنانەدی ئەو ئاماجه زیانبەخشەی که تاوانی لێ پێکدێت»[555].

هەروەها یاسادانەری عێراقییش پێناسەی کردووه و دەڵێ: «مەبەستی تاوانکاری

---

551- د. حسين خلف و سلطان عبدالقادر الشاوي: المبادیء العامة في قانون العقوبات، سەرچاوەی پێشوو، ل148.

552- مەبەستی تاوانکاری ڕۆڵێکی گرنگ دەبینێ له ڕووداني بەرپرسێتیی تاوانکاریدا. لەکاتێکدا له ڕووی حوکمدان بەقەرەبووکردنەوەدا له بەرپرسێتیی شارستانیدا ئەم ڕۆڵە نابینێت.

553- چونکه تاوانکار لەو تاوانانەدا بەئەنقەست دەستدرێژی دەکاتە سەر ئەو ماف و بەرژەوەندییانەی یاسا دەیانپارێزێ جا چ هی کەسان بێت یان هی کۆمەڵ. هەندێ جار نەبێت که له ئاکامی هەڵەیەکی چاپەمەنییەوە ڕوودەدەن بێ ئەوەی ڕۆژنامەنووسەکە دەستی تێدا هەبێت.

554- د. احمد الاشهب: المسؤولية الجنائية في الشريعة الاسلامية والقوانين الوضعية، منشورات جمعية الدعوة الاسلامية العالمية، ط1، بنغازي، 1994، ل79.

555- بڕوانه د. احمد الاشهب: المسؤولية الجنائية في الشريعة الاسلامية والقوانين الوضعية، هەمان سەرچاوە، ل79.

بریتییە لە ئاراستەکردنی ویست و ئارەزووی تاوانکار بۆ ئەنجامدانی ئەو کارەی تاوانی لێ پێکدێت بەمەبەستی بەدیهێنانی ئەنجامی ئەو تاوانەی کە روویداوە یان هەر ئەنجامێکی تاوانکاریی تر[٥٥٦].

لەم دەقەدا بۆمان دەردەکەوێ کە چەمکی مەبەستی تاوانکاری ئەوە دەگەیەنێ کە تاوانکار ئاگاداری ئەو رەگەزانەیە کە تاوانی لێ پێکدێت، هەروەها ویست و ئارەزووی خۆشی ئاراستە کردووە بۆ هێنانەدی و قبوڵکردنی ئەو رەگەزانە. هەرچەندە ئەو هۆیەی پاڵی بەتاوانکارەوە ناوە بۆ پێکانی تاوانەکەی بەشێک نییە لە رەگەزەکانی مەبەستی تاوانکاری، بەڵام لە هەندێ تاواندا نرخ بۆ ئەو هۆیە دادەنرێ کە پاڵی بەتاوانکارەوە ناوە بۆ ئەنجامدانی تاوانەکەی و دەبێتە بەشێکیش لە مەبەستی تاوانکاری و پێی دەگوترێ مەبەستی تایبەتی (القصد الخاص)[٥٥٧].

کەواتە، مەبەستە گشتییەکەی تاوانکاری (القصد الجرمي العام) مەرجە بۆ بوونی گشت تاوانەکانی رۆژنامەگەری و لە زۆربەی ئەو تاوانانەدا بەوەندە وازدەهێنرێ. بەڵام هەندێجار یاسادانەر هەندێ لەو تاوانانە بەو مەبەستە دەبەستێتەوە کە تاوانکار هەوڵی بۆ داوە یان ئەو هۆیەی کە پاڵی پێوە ناوە بۆ کردنی تاوانەکە[٥٥٨].

بۆ نموونە، تاوانی بڵاوکردنەوەی ئەو کاروبارانە، کە مەبەست لە بڵاوکردنەوەیاندا، کارتێکردن بێت لە دادوەر و شایەتەکان هەروەکو لە ماددە (٢٣٥)ی یاسای سزاداني عێراقیدا هاتووە کە ئەمەش دەقەکەیەتی: «ئەو کەسەی بەیەکێک لە رێگاکانی ئاشکرایی کاروبارێک بڵاوبکاتەوە لەوانەبێ کار لەو دادوەرانە بکات کە ئەرکی یەکلاکردنەوەی کێشەیەکی بەرزکراوەی بۆ لایەنێک لە لایەنەکانی دادگا پێ سپێردرابێت یان کارمەندانی دادگا یان فەرمانبەرانی لێکۆڵینەوە یان کارکردن لە شارەزایان یان ناوبژیوانان (المحكمين) یان ئەو شایەتانەی کە داوایان لێدەکرێ لەو کێشەیەدا شایەتی بدەن... بەگرتن بۆ ماوەیەک لە ساڵێک زیاتر نەبێ لەگەڵ غەرامەیەک لە سەد دینار زیاتر نەبێ یانیش بەیەکێک لەو دوو سزایە سزا دەدرێ».

---

٥٥٦- بڕوانە برگەی (١)ی ماددە (٣٣)ی یاسای سزادانی عێراقی ژمارە (١١١)ی ساڵی ١٩٦٩ی هەموارکراو.

٥٥٧- د.فخري عبدالرزاق الحديثي: شرح قانون العقوبات القسم العام، سەرچاوەی پێشوو، ل.٣٠٢

٥٥٨- بڕوانە ماددەی (٣٨) لە یاسای سزادانی عێراقی کە ئەمەش دەقەکەیەتی: «بایەخ بەهۆی کردنی تاوان نادرێ مەگەر یاسا پێچەوانەی ئەمە دەقنووس بکات».

بەم شێوەیە، لە تاوانەکانی ڕۆژنامەگەریدا، ئەگەر مەبەستی تاوانکاری بەهەردوو ڕەگەزەکەیەوە - ئاگاداری و ئیرادە (العلم والارادة) - هەبوو مانای ئەوەیە ڕایەڵی مەعنەوی هاتۆتە دی و ئەرکی سەلماندنی ئەمەش دەکەوێتە ئەستۆی ئەو دەسەڵاتەی کە تۆمەتەکە ئاراستە دەکات و دەبێ ئەو دادوەرەی کە کێشەکە یەکلا دەکاتەوە بەڵگەی بوونی مەبەستی تاوانکاری لەلایەن تاوانکارەوە بەدەربخات ئەگەر بیەوێ حوکم بەئیدانەکردنی بدات[559].

سێیەم: ڕایەڵی بەئاشکرایی (ركن العلانية)

بەئاشکرایی (علانية) لە ڕووی زمانەوانییەوە واتای بەدەرخستن و بڵاوکردنەوە دەگەیەنێت، بەڵام لەڕووی زاراوەییەوە بەمانای گەیاندنی زانیاری لەبارەی ڕووداوێک یان کردارێک بەخەڵک دەبەخشێت جا چ بەقسە بێت یان بەکردار یان بەنووسین یانیش بەهەر هۆکارێکی تری گەیاندن بێت.

هەندێ یاسازان بڵاوکردنەوە یان ئاشکرایی لە تاوانەکانی ڕۆژنامەگەری بەڕایەڵی ماددی دادەنێن بەبیانووی ئەوەی، گوایە بڵاوبوونەوە هۆی سەرەکییە لە سەپاندنی سزادا[560].

بەڵام هەندێکی تر بەڕایەڵێکی تایبەتی دادەنێن و دەڵێن یاسادانەر گرنگیانەی کردووە و بەنەبوونی ئەم ڕایەڵە تاوانی ڕۆژنامەگەری، بەو وەسفە یاساییەی کە بۆی کراوە، بوونی نییە[561]. بێ گومان، مەترسیی تاوانەکانی ڕۆژنامەگەری لەسەر بەهای باڵاو بەرژەوەندییە گشتییەکانی کۆمەڵ و تاکەکەس کە یاسا دەیانپارێزێت، تەنیا خۆی لە نووسین و ئەوانەی لە حوکمی ئەودانە نابینێتەوە، بەڵکوو خۆی لە ئەنجامدانی ئەو تاوانانە بەشێوەیەکی ئاشکراوە دەبینێتەوە. بۆیە، دەتوانین بڵێین، کرداری نووسین لە تاوانەکانی ڕۆژنامەگەریدا، ڕایەڵی ماددی دەنوێنێ، لەکاتێکدا، کرداری بڵاوکردنەوە، ڕایەڵی تایبەتی دەنوێنێ و بەنەبوونی ئەو ڕایەڵە تاوانی ڕۆژنامەگەری بوونی نییە.

---

559- مجموعة احكام محكمة النقض المصرية، قرار رقم ١٥٥ في ١٩٨٢/٤/١٣ بڕوانە: ميثم حنظل شريف: التنظيم الدستوري والقانوني لحرية الصحافة في العراق (دراسة مقارنة)، سەرچاوەی پێشوو، ل١٢٣.

560- د. عبدالله اسماعيل البستاني: حرية الصحافة، سەرچاوەی پێشوو، ل١٦٥، ود. محمد محي الدين عوض: العلانية في قانون العقوبات، مطبعة النصر، القاهرة، ١٩٥٥، ل٢، و ميثم حنظل شريف: التنظيم الدستوري والقانوني لحرية الصحافة، سەرچاوەی پێشوو، ل١١٧.

ئێمەش پشتگیری ئەو ڕایە دەکەین و دەڵێین، بڵاوکردنەوە و ئاشکرایی لە تاوانەکانی ڕۆژنامەگەریدا، ڕایەڵێکی تایبەتییە لەپاڵ هەردوو ڕایەڵی ماددی و مەعنەویدا و بەنەبوونی ئەم ڕایەڵە تاوانەکانی ڕۆژنامەگەری وەکو ئەو وەسفەی بۆی کراوە ڕوونادات چونکە بڵاوکردنەوە و ئاشکرایی مەرجێکی بنەڕەتە بۆ سەپاندنی سزا لە تاوانەکانی ڕۆژنامەگەریدا و یاسا هیچ کارێکی بەهێز و بیروڕا نییە هەرچەندی زیان بەخشیش بێت مەگەر بەئاشکرا گوزارشتی لێ بکرێت[563]. بۆ نموونە، لە تاوانەکانی بوختان پێ کردندا کە لە بڕگەی یەکەمی ماددەی (٤٣٣) و تاوانەکانی ئاشکراکردنی نهێنی کە لە بڕگەی یەکەمی ماددەی (٤٣٨)ی یاسای سزادانی عێراقیدا هاتووە، بڵاوکردنەوە و ئاشکرایی ڕایەڵێکی تایبەتییە لە ڕایەڵەکانی ئەم تاوانانە لەپاڵ هەردوو ڕایەڵی ماددی و مەعنەویدا و بەنەبوونی ئەم ڕایەڵە تاوانی بوختانپێکردنی ئاشکرا و ئاشکراکردنی نهێنی بەگوێرەی ئەو وەسفەی لە دەقی ئەو دوو ماددەیەدا بۆیان کراوە ڕوونادات. بەڵام ئەم بنچینەیە ڕەها نییە، بەڵکوو بڵاوکردنەوە و ئاشکرایی لە هەندێ تاواندا تەنها ڕۆڵی توندکردنی سزا دەبینێ هەروەکو لە ماددەی (٤٣٤)ی یاسای سزادانی عێراقیدا ئەم ڕۆڵەی بینیوە. ئەمەو هەندێک دەوڵەت لە یاساکانیاندا ئەو هۆکارانەیان دەستنیشان کردووە کە بەهۆیانەوە بڵاوکردنەوە و ئاشکرایی دێتەدی.

یاسادانەری میسری، لە ماددە (١٧١)ی یاسای سزادانی ژمارە (٥٧)ی ساڵی ١٩٣٨دا ئەم هۆکارانەی دەستنیشان کردووە و دەڵێ: «هەر یەکێک کەسێک یان زیاتر لە کەسێک هان بدات بۆ کردنی کەتنێکی گەورە (جینایەتێک) یان کەتنێک (جونحەیەک) چ بەقسە یان بەهاوارکردن یان بەکردەوە یان بەنووسین یان بەوێنە یان فۆتۆ یان بەهێما یان بەهەر ڕێگایەکی تر لە ڕێگاکانی ئاشکراکردن یان بەهەر هۆکارێکی تر لە هۆکارەکانی ئاشکرایی ئیغرا بکات بەبەشدار دادەنرێ لە کردنیدا، قسەکردن و هاوارکردن بەئاشکرا دادەنرێ ئەگەر هاتوو بەیەکێک لە ئامرازە میکانیکییەکان لە دانیشتنێک یان شوێنێکی گشتیدا دەرکێندرا...»[564].

لە دەقی ماددە (١٧١)دا بۆمان دەردەکەوێ کە یاسادانەری میسری سێ جۆرە هۆکاری

---

٥٦١- د. لطيفة حميد محمد، جرائم النشر في التشريع العراقي، سەرچاوەی پێشوو، ل٦٣

٥٦٢- احمد امين بك: شرح قانون العقوبات الأهلي، المجلد الاول، منشورات الدار العربية للموسوعات، بيروت، ١٩٨٢، ل١٥٦.

٥٦٣- ئەم دەقە بەرامبەر دەقی ماددە (٢٠٩)ی یاسای سزادانی لوبنانییە.

بۆ گوزارشتکردن و سێ ڕێگاشی بۆ بڵاوکردنەوە و ئاشکراکردن بەنموونە هێناوەتەوە[٥٦٤] ئەمەشمان لە دەستەواژەی (بەهەر هۆکارێک لە هۆکارەکانی گوزارشتکردن) و (بەهەر ڕێگایەک لە ڕێگاکانی نواندن) کە لە دەقی ماددەی ناوبراودا هاتووە بۆ دەردەکەوێ.

هەروەها یاسادانەری فەرەنسی لە یاسای ڕۆژنامەگەری ساڵی ١٨٨١ی هەموارکراودا لە ماددەی (٢٣)[٥٦٥]دا هۆکارەکانی ئاشکراکردنی بەم شێوەیەی خوارەوە دەستنیشان کردووە:

١- قسەکردن و هاوارکردن و هەڕەشەکردن لە کۆبوونەوە گشتییەکان و شوێنە گشتییەکاندا.

٢- بڵاوکردنەوە لە ڕێگای نووسین و چاپەمەنییە فرۆشراوەکان یان ئەوانەی کە بۆ فرۆشتن و دابەشکردن لە شوێنە گشتییەکان و کۆبوونەوە گشتییەکاندا نمایش کراون.

٣- بڵاوکردنەوە لە ڕێگای ئەو ڕێکلامانەی کە لە شوێنە گشتییەکاندا هەڵدەواسرێن و نمایش دەکرێن.

هەروەها یاسادانەری فەرەنسی سەبارەت بەهەندێک تاوانی ڕۆژنامەگەری، وەک تاوانەکانی خەبەردانی بەدرۆ کە لە ماددەی (٢٧)[٥٦٦]دا هاتووە، هەروەها تاوانی

---

٥٦٤- هەرچەندە د. عبدالحميد الشواربي پێی وایە یاسادانەری میسری ئەم هۆکار و ڕێگایانەی بەشێوەیەکی دیاریکراو (حصرا) هێناوەتەوە نەوەک بەنموونە و لەم بارەیەوە دەڵێ: «یاسای میسری لە ماددەی (١٧١)ی یاسای سزاداندا وەسیلەکانی ئاشکراکردنی بەشێوەیەکی دیاریکراو دەستنیشان کردووە» بڕوانە د. عبدالحميد الشواربي: جرائم الصحافة والنشر، سەرچاوەی پێشوو، ل١٨.

٥٦٥- بۆ دەقی ماددەی (٢٣)ی یاسای ڕۆژنامەگەری فەرەنسی بڕوانە بڕگەی (٥-٢-١-٢) پەراوێزی (٥٣٢) لەم تێزەدا.

٥٦٦- ئەمەش دەقەکەیەتی بەزمانی فەرەنسی:

Article 27

Modifié par Ordonnance 2000-916 19 Septembre 2000 art 3 JORF 22 septembre 2000 en vigueur le 1er janvier 2002.

La publication, la diffusion ou la reproduction, par quelque moyen que ce soit, de nouvelles fausses, de pièces fabriquées, falsifiées ou mensongèrement attribuées à des tiers lorsque, faite de mauvaise foi, elle aura troublé la paix publique, ou aura été susceptible de la troubler, sera punie d'une amende de 45000 euros.

Les mêmes faits seront punis 135000 euros d'amende, lorsque la publication, la diffusion ou la reproduction faite de mauvaise foi sera de nature à ébranler la discipline ou le moral des armées ou à entraver l'effort de guerre de la Nation.

نیهانەکردنی سەرۆکی ولات و سەرۆکی حکوومەت و وەزیری دەرەوەی ولاتە بیانییەکان کە لە ماددەی (٣٦)[٥٦٧]دا هاتووە، هەروەها تاوانی تانەوتەشەردان لەو سەفیر و وەزیرە مفەوەزانەی کە لەلایەن حکوومەتەکانییانەوە بۆ راپەڕاندنی کاری نیداری و دیلۆماتی بۆ فەرەنسا نێردراون کە لە ماددەی (٣٧)[٥٦٨]دا هاتووە، تەنها مەرجی بوونی رایەڵی بەئاشکرایی (علانیة)ی داناوە بەبێ ئەوەی ئەو هۆکارانە دەستنیشان بکات کە بەهۆیانەوە بلاوکردنەوەکە ئەنجام دەدرێت. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ئاشکرایی (علانیة) لەم تاوانانەدا لەرێگای یەکێک لەو هۆکارانەی کە لە ماددەی (٢٣)دا ئاماژەی پێ کراوە دێتە دی. ئەمەش خۆی لە خۆیدا ئەوە دەگەیەنێت کە دەقنووسکردنی ئەو هۆکارانە لە دووتوێی ماددەی ناوبراودا تەنها بۆ نموونەیە و دەکرێ لە رێگای هۆکاری تریشەوە بلاوکردنەوە ئەنجام بدرێت و ئاشکرایی بێتەدی وەکو پەخشی لاسلکی و تەلەفزیۆنی و ئینتەرنێت.

بەلام یاسادانەری عێراقی، لە برگەی سێیەمی ماددە (١٩)ی یاسای سزادانda[٥٦٩] بەم شێوەیەی خوارەوە هۆکارەکانی بەئاشکرایی (وسائل العلانیة)ی دەستنیشان کردووە:

---

٥٦٧- ئەمەش دەقەکەیەتی بەزمانی فەرەنسی:

"Article 36

Modifié par Ordonnance 2000-916 [illegible] Septembre 2000 art 3 JORF 22 septembre 2000 en vigueur le 1er janvier 2002.

L'offense commise publiquement envers les chefs d'Etats étrangers, les chefs de gouvernements ministres des affaires étrangères d'un gouvernement étranger sera punie d'une" étrangères et les amende de 45000 euros.

٥٦٨- ئەمەش دەقەکەیەتی بەزمانی فەرەنسی:

"Article 37

Modifié par Ordonnance 2000-916 19 Septembre 2000 art 3 JORF 22 septembre 2000 en vigueur [illegible] 1er janvier 2002.

L'outrage commis publiquement envers les ambassadeurs [illegible] ministres plénipotentiaires, envoyés, chargés d'affaires ou autres agents diplomatiques accrédités près du gouvernement de la République, sera puni d'une amende de 45000 euros.

٥٦٩- شایەنی ئاماژەبۆکردنە، حوکمەکانی ئەم یاسایە لە هەرێمی کوردستاندا کاریان پێدەکرێت تەنها ئەوانە نەبێت کە دوای راپەڕینی ساڵی ١٩٩١ داندراون یاخود هەمووارکراون. بۆیە سەبارەت بەباسکردنی رایەڵی ئاشکرایی لە تاوانەکانی رۆژنامەگەریدا پشت بەحوکمەکانی ئەم یاسایە دەبەستین.

١- کردەوە و ئیشارەت و جوڵانەوە.
٢- قسەکردن و هاوارکردن.
٣- رۆژنامەگەری و چاپەمەنی.
٤- نووسین و رەسم و وێنە و فیلم و ئارم.

هەروەها ئەو رێگایانەش کە بەئاشکرایی پێ دێتەدی، بەم شێوەیەی خوارەوە دەستنیشان کردووە:

١- ئاشکرایی کردەوە و ئیشارەت و جوڵانەوە (علانیة الاعمال والاشارات والحرکات).
٢- ئاشکرایی قسەکردن و هاوارکردن (علانیة القول والصیاح).
٤- ئاشکرایی نووسین و رەسم و وێنە و فیلم و ئارم.

لە دەقی ماددە (١٩)ی یاسای سزادانی عێراقیدا بۆمان دەردەکەوێ کە یاسادانەری عێراقی لە ئاماژەکردن بەو هۆکارانەی کە لە رێگایانەوە گوزارشت دەکرێت، هەروەها ئەو رێگایانەش کە بەئاشکرایی (علانیة)ی پێ دێتەدی، هەمان رێچکەی یاسادانەری میسری گرتۆتەبەر.

بەرای ئێمە، واچاکە یاسادانەری عێراقی خۆی لە ریزکردنی ئەو هۆکارانەی کە گوزارشتیان پێ دەکرێت هەروەها ئەو رێگایانەش کە ئاشکرایان (علانیة)ی پێ دێتەدی، دوور بخاتەوە و تەنها مەرجی بوونی رایەڵی بەئاشکرایی (علانیة) دابنێت، بێ ئەوەی ئەو هۆکارانە دەستنیشان بکات کە بەهۆیانەوە بڵاوکردنەوەکە ئەنجام دەدرێت یان ئاشکرا دەکرێت، یان بەراشکاوی بڵێ ئەم نموونانە وەکو نموونەی ئاشکرایی دێنینەوە. چونکە ئەمرۆ لەسایەی تەکنەلۆژیای نوێوە، دنیا زوو زوو داهێنانی نوێ لە بواری گەیاندن و رۆژنامەگەریدا بەخۆیەوە دەبینێ، بەجۆرێک ریزکردنی ئەم وەسیلانە لە رووی پراکتیکەوە هیچ بایەخی نابێت.

٥-٢-١-٤ ئەو تاوانانەی کە لە رێگای رۆژنامەگەرییەوە روودەدەن

تاوانەکانی رۆژنامەگەری، بریتین لەو تاوانانەی کە لە رێگای رۆژنامەگەرییەوە روودەدەن. جا یاسادانەر لە رێگای دەقەکانی یاسای سزادان یان یاسای رۆژنامەگەری و یاسای چاپەمەنی یان یاسا تایبەتییەکانی تردا خەسڵەتی ناڕەوایەتی بەم کردارانە دەبەخشێت. بەم پێیە، دەقنووسکردنی تاوانەکانی رۆژنامەگەری لە یاسای وڵاتێکەوە بۆ یاسای وڵاتێکی تر دەگۆڕێت.

یاسادانەری فەرەنسی و لوبنانی کاریان بەسیستمی یەکبوونی یاسا (وحدة التشريع) کردووە لە دەقنووسکردنی ئەو تاوانانەدا. جا یاسادانەری فەرەنسی بۆ ئەم مەبەستە، لە یاسای ڕۆژنامەگەریی ساڵی ١٨٨١ی هەموارکراودا لە بابی چوارەمدا لەژێر ناونیشانی «ئەو کەتن و گەورەکەتانەی کە لە ڕێگای ڕۆژنامەگەرییەوە یان هەر ڕێگایەکی تری بڵاوکردنەوەوە ڕوودەدەن» (DDELITS COMMIS PAR LA VES CRIMES ET OIE DE LA PRESSE OU PAR TOUT AUTRE MOYEN DE PUBLICA-TION) لە ماددەی (٢٣) تاکو ماددەی (٤١) دەستنیشان کردووە.

هەروەها یاسادانەری لوبنانی، لەژێر ناونیشانی «تاوانەکانی چاپەمەنی» ئەو تاوانانەی لە ماددەی (١) تاکو ماددەی (٢٥)ی مەرسومی یاسایی ژمارە (١٠٤)ی ساڵی ١٩٧٧ کە جێگای ماددەی (٥١) تاکو ماددەی (٧١)ی یاسای چاپەمەنی ساڵی ١٩٦٢ی گرتۆتەوە، دەستنیشان کردووە.

بەڵام یاسادانەری میسری، لە یاسای سزاداندا هەندێ تاوانی ڕۆژنامەگەری لە بابی چواردەی کتێبی دووەمدا لەژێر ناونیشانی «ئەو کەتنانەی لە ڕێگای ڕۆژنامەگەری و ڕێگاکانی ترەوە ڕوودەدەن» لە ماددەی (١٧١) تاکو ماددەی (٢٠١) دەقنووس کردووە و هەندێکی تریشی لە بابی حەوتەمی کتێبی سێیەمدا لەژێر ناونیشانی «تانەوتەشەر و جوێنپێدان و ئاشکراکردنی نهێنی - القذف والسب وافشا والاسرار» لە ماددەی (٣٠٢) تاکو ماددەی (٣١٠)، هەروەها لە بابی پانزەمی کتێبی دووەمدا لەژێر ناونیشانی «ئەو کەتنانەی پەیوەندییان بەئاینەوە هەیە» لە ماددەی (١٦٠) تاکو ماددەی (١٦١) دەقنووس کردووە.

هەروەها لە یاسای پارتە سیاسییەکانی ژمارە (٤٠)ی ساڵی ١٩٧٧ و یاسای پاراستنی بەرەی ناوخۆ و ئاشتیی کۆمەڵایەتی - حماية الجبهة الداخلية والسلام الاجتماعي) ژمارە (٣٣)ی ساڵی ١٩٧٨ و یاسای (حماية القيم من العيب) ژمارە (٩٥)ی ساڵی ١٩٨٠ کۆمەڵێک کرداری تری دەستنیشان کردووە کە بەتاوانی ڕۆژنامەگەری دادەندرێن[٥٧٠].

بەڵام یاسادانەری عێراقی، تاوانەکانی ڕۆژنامەگەری لە یاسای سزادان ژمارە (١١١)ی ساڵی ١٩٦٩ی هەموارکراو و یاسای چاپەمەنی ژمارە (٢٠٦)ی ساڵی ١٩٦٨ی

٥٧٠- بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەیەوە، بڕوانە شريف كامل: الجرائم الصحفية، ج ٢، شركة دار الاشعاع للطباعة، القاهرة، ١٩٨٦، ل٧-٨.

هەمواركراو و یاسای سەندیكای رۆژنامەنووسان ژمارە (١٧٨)ی ساڵی ١٩٦٩ی هەمواركراو و یاسای مافی دانەر ژمارە (٣)ی ساڵی ١٩٧١و چەندین یاسایتر دەقنووس كردووە. یاسای سزادانی عێراقی ژمارە ١١١ی ساڵی ١٩٦٩ هەمواركراو گشت ئەو كردارانەی دەستنیشان كردووە كەلەلایەن رۆژنامەنووسەوە و لە ڕێگای رۆژنامەوە ئەنجام دەدرێن و بەتاوان دادەندرێ لەگەڵ دیاركردنی سزای هەر یەكێك لەو تاوانانە.

لەبەر زۆری ئەو ماددانە، بەشێوەیەكی گشتی ناوی ماددەكان دەهێنین لەگەڵ كورتەیەكی ناوەرۆكەكانیان و لەسەر گرنگترینیشیان هەڵوستەیەك دەكەین.

شایەنی ئاماژەیە، ئەو ماددانەی كرداره تاوانكارییەكانی بلاوكردنەوەیان دیاركردووە بریتین لە ماددە: (٨١- ٨٤، ١٥٦ -١٧٠، ٢١١-٢١٣، ٢٢٤- ٢٢٩، ٢٣٥- ٢٣٦، ٣٧٢، ٤٠٣، ٤٣٣- ٤٣٧، ٤٧٦).

یاسادانەری عێراقی، لە ماددە (٨١) تاكو ماددەی (٨٤)ی تەرخان كردووە بۆ سزادانی سەرنووسەری رۆژنامە یان بەرپرسی لاپەڕە یان نووسەری بابەتی تاوانكاری بۆ ئەو تاوانانەی بلاوكردنەوە كە لە ڕێگای رۆژنامەوە ئەنجام دەدرێن.

هەروەها بۆ سزادانی ئەو كەسەی كە كتێبێك یان وێنەیەك یان هەر شێوازێكی تری رادەربڕین بێ لە دەرەوە دەهێنێ كە لە كردنی تاواندا بەكارهاتووە. هەروەها لە حاڵەتی دیار نەبوونی ئەو كەسەی كە ئەم شتانەی لە دەرەوە هێناوە، فرۆشیار و بلاوكەرەوەكەی لەگەڵ ئەو كەسەی كە لە دیواریشی داوە سزابار كردووە.

هەروەها ئەوەشی دیاركردووە كە وەرگێڕانی بابەتەكە یا وەرگیرانی لەسەرچاوەیەكی تری ناوەوە یان دەرەوەی وڵات بەرپرسیارێتیی بلاوكردنەوە ڕەش ناكاتەوە و هەردەمێنێ.

هەروەها بڕیاری داوە، ئەگەر حوكمی دادگا بەتۆمەتبار كردن لە گەورەكەتێك كە لە ڕێگای ڕۆژنامەوە ئەنجام درابێت دەرچوو ئەوا دادگا بۆی هەیە فەرمان بدات بەڕاگرتنی ڕۆژنامەكە بۆ ماوەیەك كە لە سێ مانگ زیاتر نەبێت.

هەروەها یاسادانەری عێراقی، لە ماددە (١٥٦) تاكو (١٧٠) بۆ دیاركردنی ئەو كردارە تاوانكارییانەی تەرخان كردووە كە لە ڕێگای بلاوكردنەوەوە دژی ئاسایشیی وڵات دەكرێن.

هەروەها لە ماددە (٢١١)دا بلاوكردنەوەی هەواڵی درۆ یان دەنگوباسی دەسكرد و ساختەكاری كە بەدرۆ درابێتە پاڵ كەسێك بەتاوان داناوە ئەگەر هاتوو بێتە هۆی

شێواندنی ئاسایشیی گشتی یان زیان گەیاندن بەبەرژەوەندیی گشتی.

هەروەها لە مادده (٢١٢)دا هاندانی خەڵکی بۆ ئەنجامدانی کەتنی کوشتن یان دزین یان تێکدان یان سووتان یان هەر کەتنێکی تر کە ببێتە هۆی شێواندنی ئاسایشیی گشتی بەتاوان داناوە هەتا ئەگەر هاتوو ئەم هاندانەش هیچ ئاکامێکی نەبێت.

هەروەها لە مادده (٢١٣)دا هاندانی خەڵکی و بڵاوکردنەوەی گیانی یاخی بوون لە رێزگرتنی یاسا، یان جوانکردنی کارێک لەبەرچاوی خەڵک کە لە هەقیقەتدا کەتنە یان گەورەکەتن بێت بەتاوان داناوە.

هەروەها لە مادده (٢٢٤) تاکو ٢٢٩ تەرخانکردووە بۆ دەستنیشانکردنی ئەو کردارە تاوانکاریيانەی لە رێگای بڵاوکردنەوە دژ بەدەسەڵاتی گشتی و فەرمانبەران و ئەو کەسانە دەکرێن کە خزمەتگوزاری گشتیيان پێ سپێردراوە.

لە مادده (٢٢٩)دا هاتووە: «هەر کەسێک سوکایەتی یا هەڕەشە لە فەرمانبەرێک یا هەر کەسێک بکات کە ئەرکی خزمەتگوزاریی گشتی پێ سپێردرابێ یا سوکایەتی یا هەڕەشە لە ئەنجومەنێک یا دەستەیەکی رەسمی یا دادگایەکی دادبینی یا کارگێرێک لەکاتی ئەرکی خۆیدا یا بەهۆی ئەرکەکەیەوە بکات بەگرتن سزا دەدرێت».

هەروەها لە بابی چوارەم دا لەژێر ناونیشانی (تاوانەکانی دژ بەڕەوتی دادپەروەری)دا مادده (٢٣٥) و (٢٣٦)ی تەرخانکردووە بۆ ئەو تاوانانەی کە لە رێگای بڵاوکردنەوەدا دژ بەڕەوتی دادپەروەری ئەنجام دەدرێن.

هەروەها مادده (٤٣٣) تاکو (٤٣٧)ی بۆ تاوانەکانی تانەوتەشەر و جنێوپێدان و ئاشکرا کردنی نهێنی تەرخان کردووە و لە حاڵەتی ئەنجامدانی ئەم تاوانانە بەرێگایەک لە رێگا ئاشکراکان سزایەکی توندی بۆ داناوە کە بڵاوکردنەوە لە رۆژنامەدا یەکێکە لەو رێگایانە.

بەلام یاسای چاپەمەنی ژمارە (٢٠٦)ی ساڵی ١٩٦٩، لە ماددەی (١٦) و(١٧)دا، ئاماژەی بەکۆمەڵێک بابەت کردووە کە بڵاوکردنەوەیان لە رۆژنامە و چاپەمەنییەکاندا قەدەغەیە[٥٧١]، هەروەها سزای سەرپێچیکردنیشیانی لە ماددەی (٢٨)دا دیارکردووە، کە بریتییە لە زیندانیکردن بۆ ماوەیەک لە (٣٠) رۆژ زیاتر نەبێت یان غەرامەیەک لە

٥٧١- بۆ ناوەرۆکی ماددەی (١٦) و(١٧)ی یاسای چاپەمەنی عێراقی بڕوانە خاڵی (٣-٤-٤) لەژێر ناونیشانی «ئاگاکاری و راگرتن و هەڵوەشاندنەوە لە یاسای چاپەمەنیی عێراقیدا» لەم تێزەدا.

(٥٠) دینار زیاتر نەبێ، یانیش هەردوو سزاکان بەیەکەوە، بەڵام ئەگەر هاتوو سزای کردەوەکە لە هەر یاسایەکی دیکە توندتر بوو. لەو حاڵەتەدا حوکمەکانی ئەو یاسایەی دوایی دەسەپێ.

هەروەها یاسای سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی عێراقی ژمارە (١٧٨)ی ساڵی ١٩٦٩ی هەموارکراو، لە ماددەی (٢٥)دا، کۆمەڵێک کردەوەی دەستنیشان کردووە، کە ئەنجامدانیان لەلایەن ڕۆژنامەنووسەوە، بەرپرسیارییەتی تاوانکاری و پیشەییان لێ دەکەوێتەوە[٥٧٢].

هەروەها یاسای مافی دانەری عێراقی ژمارە (٣)ی ساڵی ١٩٧١ لە ماددەی (٤٥)دا ئەو کردارانەی دیارکردووە کە ئەنجامدانیان بەتاوانی تەقلیدکردن دادەندرێت، هەروەها سزاکەشی دیارکردووە[٥٧٣].

ئەمەو، یاسادانەری هەرێمی کوردستان، سەرەڕای ئەوەی هەندێک ئەرکی خستۆتە ئەستۆی ڕۆژنامەنووس لە ماددەی (٢٠)ی یاسای سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی کوردستان ژمارە (٤)ی ساڵی ١٩٩٨[٥٧٤] و ماددەی (٩)ی یاسای چاپەمەنیی ژمارە (١٠)ی ساڵی ١٩٩٣ی هەموارکراودا[٥٧٥] هاتووە کەچی سزا تاوانکارییەکانی دەستنیشان نەکردووە، بۆیە دەبێ بگەڕێینەوە بۆ بنەما گشتییەکانی یاسای سزادانی ژمارە (١١١)ی ساڵی ١٩٦٩ی هەموارکراو و یاسای مافی دانەریی ژمارە (٣)ی ساڵی ١٩٧١، کە دوو یاسای بەرکارن لە هەرێمی کوردستانی عێراقدا.

یاسای سزادانی عێراقی ژمارە (١١١)ی ساڵی ١٩٦٩ ماددەی (٤٣٣-٤٣٦)ی بۆ تاوانەکانی تانە و تەشەر و جوێنپێدان (جرائم السب والقذف) تەرخانکردووە. چونکە ئەم دوو تاوانە زۆر پێک دەچن و هەردووکیان دەبنە مایەی ناو و ناوبانگ زڕاندن و لەکەدارکردنی شەرەف و کەرامەتی ئەو کەسەی کە تاوانەکەی دەرهەق دەکرێ. هەروەها لەو

---

٥٧٢- بۆ دەقی ئەم ماددەیە، بڕوانە خاڵی (٥-١-٢) لەژێر ناونیشانی «ئەرکەکانی ڕۆژنامەنووس» پەراوێزی (٥١٥) لەم تێزەدا.

٥٧٣- بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەیەوە، بڕوانە (کمال سعدي مصطفى): حق الملكية الادبية والفنية في القانون العراقي والمقارن، سەرچاوەی پێشوو، ل١٨٣ بەدواوە.

٥٧٤- بۆ دەقی ئەم ماددەیە بڕوانە خاڵی (٥-١-٢) لەژێر ناونیشانی «ئەرکەکانی ڕۆژنامەنووس» لەم تێزەدا.

٥٧٥- بۆ دەقی ئەم ماددەیە، بڕوانە بڕگەی (٥-١-٢) لەم تێزەدا.

تاوانانەن کە لە ڕێگای قسە یان وێنە یان نووسینەوە ئەنجام دەدرێن و بۆ توندکردنی سزاکەشیان مەرجە بەڕێگایەک لە ڕێگایەکانی ئاشکرایی ئەنجامدرابێت. بەڵام سەرەڕای ئەمە، لەڕووی بابەتی خستنەپاڵەکەوە (موضوع الاسناد) لەیەکتر جیاوازن، لەکاتێکدا بابەتی خستنەپاڵەکە لە تاوانی تانەوتەشەردا «ڕووداوێکی دیاریکراوە» کەچی لە تاوانی جوێنپێداندا «ڕووداوێکی نادیاریکراوە و بەشێوەیەک لە شێوەکان شەرەف و کەرامەت لەکەدار دەکات»[576].

جێی سەرنجە، ئەم جیاوازییەی نێوان تاوانی تانەوتەشەر و تاوانی جوێنپێدان وایکردووە کە تاوانی یەکەم ترسناکتر بێت لە تاوانی دووەم. چونکە خەڵک زیاتر باوەڕ بەو ڕووداوە دیاریکراوانە دەکەن کە دراونەتەپاڵ کەسانێک نەک ڕووداوە گشتییەکان، چونکە مەزەندەی بوونی هەندێک بەڵگە دەکەن لە دانەپاڵی ئەو ڕووداوانەدا. لەکاتێکدا لە حاڵەتی جوێنپێداندا زیاتر بۆ ئەوە دەچن کە دانەپاڵی ئەو ڕووداوانە گوزارشت لە ڕق وکینە بکات. ئەم جیاوازییەش وایکردووە کە سزای تاوانی تانەوتەشەر لە سزای جوێنپێدان قورستر بێت، هەروەها هۆیەکانی ڕێگاپێدانیشیان لەیەکتر جیاواز بێت.

یاسادانەری فەرەنسی، لە یاسای ڕۆژنامەگەریی ساڵی ١٨٨١دا لە بابی چوارەمدا لەژێر ناونیشانی «ئەو کەتن و گەورەکەتنانەی کە لە ڕێگای ڕۆژنامەگەرییەوە یان هەر ڕێگایەکی تری بڵاوکردنەوە ڕوودەدەن» لە ماددە (٢٩-٣٥)دا حوکمەکانی ئەو دوو تاوانەی دەقنووس کردووە.

بەڵام یاسادانەری میسری، لەجیاتی ئەوەی لە بابی چوارەد و لە کتێبی دووەمدا دەقنووسی بکات، کە تایبەتە بەم کەتنانەی کە لە ڕێگای ڕۆژنامەگەری و هەر ڕێگایەکیتری بڵاوکردنەوەوە ئەرخانکراوە، لە بابی حەوتەمی کتێبی سێیەمدا لەژێر ناونیشانی «تانەوتەشەر و جوێنپێدان و ئاشکراکردنی نهێنی» لە ماددە (٣٠٢-٣١٠) ئەو تاوانانەی ڕێکخستووە.

---

٥٧٦- د. محمود نجيب حسني: شرح قانون العقوبات - القسم الخاص - جرائم الأعتداء على الاشخاص، منشورات دار النهضة العربية، مطبعة جامعة القاهرة والكتاب الجامعي، القاهرة، ١٩٧٨، ل٦٠٥، هەروەها بڕوانە: مصطفى مجدي هرجة: التعليق على قانون العقوبات في ضوء الفقه والقضاء - القسم الخاص، الكتاب الثالث، ط١، منشورات منشأة المعارف بالأسكندرية، ١٩٨٨، ل٥٥.

بۆ ئاشنابوونی زیاتر بەتاوانەکانی تانەوتەشەر (جريمة القذف) کە گرنگترین تاوانە لەو تاوانانەی کـە لە ڕێگای ڕۆژنامـەگـەرییـەوە ڕوودەدات و تاکـو ئێستـا لە هەرێمی کوردستاندا، دەیان کێشە دژی ڕۆژنامەنووسان، سەبارەت بەو تاوانە بۆ دادگاکان بەرز بۆتەوە، هەروەکو دەشزانین ڕوودانی زۆربەی ئەو تاوانانە لەبەر لێکحالینەبوونی ڕۆژنامەنووسان و هاووڵاتییانەوە و نەزانینی سنووری ئازادیی ڕۆژنامەگەرییەوە ڕوویان داوە، بۆیە بەپێویستی دەزانین لە خوارەوە بەتەنها باسی ئەو تاوانە و هۆیەکانی ڕێگاپێدانی لە یاسای سزادانی عێراقیدا بکەین:

٥-٢-١-٤-١: تاوانی تانەوتەشەر (جريمة القذف أو التشهير)

جۆن. ئار. بیتنەر لە پێناسەکردنی تانەوتەشەردا دەڵێ: «تانەوتەشەر بریتییە لە چاپکردنی بابەتێک کە ناسنامەی کەسێک دەستنیشان دەکات و ناو و ناوبانگی لەکەدار دەکات، بەچەشنێک ڕووبەڕووی ڕقلێبوونەوە و بەکەمزانین و ناڕەزایی دەکات لەلایەن خەڵکەوە»[577].

هەروەها (د. محمود نجیب حسنی) دەڵێ: «بەو حاڵەتە دەگوترێ تانەوتەشەر، کە کەسێک بەئاشکراو بەئەنقەست ڕووداوێکی دیاریکراو بداتەپاڵ کەسێکی ترەوە، بەچەشنێک ئەگەر بێت و دەربکەوێ ئەو ڕووداوە ڕاستە، دەبێتە هۆی ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو کەسەی کە ڕووداوەکەی دراوەتەپاڵ، بۆ سزایەکی یاسایی یانیش بەکەمزانینی لەلایەن خەڵکەوە»[578].

لەم دوو پێناسەیەی سەرەوەدا بۆمان دەردەکەوێت، پەیوەندییەکی بەهێز هەیە لە نێوان تاوانی بوختانپێکردن و تاوانی تانەوتەشەردا. بەچەشنێک هەندێک هەن، دەڵێن: «بوختانپێکردن پەیوەندییەکی پتەو و بەهێزی هەیە بەتانەوتەشەرەوە، ئەمە وای کردووە کە هەردوو چەمکی بوختانپێکردن و تانەوتەشەر لەجیاتی یەکتری بەکاربهێندرێن، چونکە ئەو کەسەی لە بەشێکی ڕادیۆیی یا تەلەفزیۆنیدا، بوختانی پێ دەکرێت، بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی بەر تانەوتەشەر دەکەوێت»[579].

---

٥٧٧- جون. ار. بيتنر: مقدمة في الاتصال الجماهيري، سەرچاوەی پێشوو، ل٦١٥.

٥٧٨- د. محمود نجيب حسني: شرح قانون العقوبات - القسم الخاص - جرائم الأعتداء على الاشخاص، سەرچاوەی پێشوو، ل٥٠٥.

٥٧٩- جون. ار. بيتنر: مقدمة في الاتصال الجماهيري، سەرچاوەی پێشوو، ل٦١٥.

شایەنی ئامـاژەبۆکـردنە. یاسـادانەری وڵاتانی عـەرەبی و یاسـادانەری عـێـراقـیـش. جیاوازییـان نەکردووە لە نێوان تاوانی تانەوتەشـەر و تاوانی بوختان پێ کردندا. بۆیە هەر لەمیـانی باسکردنی تاوانی بوختـان پێ کردندا، باسی تاوانی تانەوتەشـەریشـیان کردووە. بەڵام، لە وڵاتەیەککگرتووەکانی ئەمریکا و ئینگلتـەرەدا، تاوانی تانەوتەشەریان لە تاوانی بوختـانپێـکردن جودا کـردۆتەوە و بەیاسـایەکی تایبـەتی لەژێر ناوی «یاسـای تەشـهیر» ڕێکیان خستووە.

یاسـای سـزادانی عـێـراقی ژمـارە (١١١)ی سـاڵی ١٩٦٩ی هەمـوارکـراو، مـاددەی (٤٣٣)ی بۆ تاوانی تانەوتەشەر تەرخانکردووە و تیایدا دەڵێ: «١- تانەوتەشـەر بریتـیـە لە لکاندنی ڕووداوێکی دیاریکراو بەکـەسـێکەوە بەیەکـێک لە ڕێگاکـانی ئاشکرایی بەچەشـنێک ئەگەر هاتوو ڕاست دەربچێت و ببێتە مایەی ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو کـەسـەی کە تانەوتەشـەرەکەی لێدراوە بۆ سزا یان بەکەمزانینی لەلایەن هاونیشـتمانانییەوە.

ئەو کەسـەی تانە وتەشەر لە کـەسـێک دەدات، بەزیندانیـکردن یان بەغـەرامـەکـردن یان بەهەردووکـیان سزا دەدرێت. بەڵام ئەگەر هاتوو تانەوتەشـەرەکە لەڕێگای ڕۆژنامـەگەری یان چاپەمـەنی یان یەکـێک لە ڕێگاکانی ڕاگەیاندنی ترەوە ئەنجامدرا، ئەوا بەبارودۆخێکی توند دادەندرێت.

٢- لە ئەنجامدەری تانەوتەشـەر قـبووڵ ناکرێ بەڵگە بۆ ئەو ڕووداوانە بێنێتـەوە کە داویتەپاڵ ئەو کـەسـەی تانەوتەشـەری لێدراوە، مـەگەر تانەوتەشـەرەکە ئاڕاسـتەکرابێت بۆ فـەرمانبـەرێک یان ئەو کـەسـەی کە ئەرکی خزمـەتگوزاریی گـشـتی لە ئەسـتۆ بێت یان سیفـەتی نوێنەرایەتیی گـشـتی هەبێت یان ئەرکـێکی لەو ئەرکـانە لەئەسـتۆبێت کە پەیوەندیـیان بەبەرژەوەندییەکـانی جەماوەرەوە هەیە، جا ئەو ڕووداوەی کە ئەنجامدەری تانەوتەشـەرەکە داویەتییە پاڵ یەکێک لەو کەسـانە، ئەگەر پەیوەندی بەوەزیفـەکەیان یان کـارەکـەیانەوە هەبێت، ئەگـەر هاتوو بەڵگەی بۆ ئەو ڕووداوانە هێنایەوە کـە داویەتییەپاڵیان، لەم حاڵەتەدا تاوانەکە نامێنێ»[٥٨٠].

---

٥٨٠- ئەمەش دەقەکەیەتی بەزمانی عەرەبی: «١- القذف هو اسناد واقعة معينة الى الغير بأحدى طرق العلانية من شأنها لو صحت أن توجب عقاب من اسندت اليه أو احتقاره عند اهل وطنه.
ويعاقب من قذف غيره بالحبس وبالغرامة أو بأحدى هاتين العقوبتين.
واذا وقع القذف بطريق النشر في الصحف او المطبوعات او بأحدى طرق الاعلام الاخرى عد ذلك =

لەم دەقەی سەرەوەدا بۆمان دەردەكەوێ، تاوانی تانەوتەشەر وەكو گشت تاوانەكانی تری ڕۆژنامەگەری و بڵاوكردنەوە سێ ڕایەڵی هەیە، ڕایەڵی ماددی و ڕایەڵی مەعنەوی و ڕایەڵی ئاشكرایی. هەروەها لە ڕووی سزاوە، تانەوتەشەر لە ڕێگای بڵاوكردنەوە و غەیری بڵاوكردنەوەوە جیاوازییان لەگەڵ یەكتریدا هەیە. لە خوارەوە لە سێ خاڵدا باسی تاوانی تانەوتەشەر دەكەین، خاڵی یەكەم تەرخان دەكەین بۆ ڕایەڵەكانی و خاڵی دووەمیش بۆ سزاكەی و خاڵی سێیەمیش بۆ هۆیەكانی ڕێگاپێدانی:

یەكەم: ڕایەڵەكانی

لە پێناسەی تاوانی تانەوتەشەردا كە لە برگەی یەكەمی ماددەی (٤٣٣)دا هاتووە كە پێشتر ئاماژەمان پێی كرد، بۆمان دەردەكەوێ كە تاوانی تانەوتەشەر سێ ڕایەڵی هەیە، ڕایەڵی ماددی و ڕایەڵی مەعنەوی، ڕایەڵی بەئاشكرایی.

١- ڕایەڵی ماددی

تەنها بیركردنەوە لە ئەنجامدانی تاوان، بەتاوان دانانرێ، مەگەر ئەم بیركردنەوەیە لە تەوارەیەكی ماددیی هەستپێكراوەوە بەرجەستە نەبێت كە پێی دەگوترێ ڕایەڵی ماددی تاوان. واتە ئەو هیوا و ئاوات و ئارەزوو و بیر و هزرانەی كە لەناو مێشكدا دەخولانەوە بەڕایەڵی ماددی دانانرێن هەتا نەبنە چالاكییەكی هەستپێكراو لە واقیعدا. بۆیە ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ یاسای سزادانی ژمارە (١١١)ی ساڵی ١٩٦٩ دەبینین لە ماددەی (٢٨)دا بەم شێوەیەی خوارەوە پێناسەی ڕایەڵی ماددیی تاوانی كردووە و دەڵێ: «ڕایەڵی ماددیی تاوان بریتییە لە ڕەفتارێكی تاوانكاری لە كردنی كردارێك یان نەكردنی كردارێك كە یاسا فەرمانی پێكردووە».

لەم ماددەیەدا بۆمان دەردەكەوێ كە ڕایەڵی ماددیی لە تاوانی تەواودا لە سێ ڕەگەز پێكدێت، بریتین لە ڕەفتاری تاوانكاری و ئەنجامی زیانبەخش و پەیوەندیی هۆكاری لەنێوان ڕەفتاری تاوانكاری و ئەنجامی زیانبەخشدا.

---

= ظرفا مشددا.

٢- ولایقبل من القاذف اقامة الدلیل علی ماأسنده الا اذا كان القذف موجها الی موظف او مكلف بخدمة عامة او الی شخص ذي صفة نیابیة عامة او كان یتولی عملا یتعلق بمصلحة الجمهور وكان ماأسنده القاذف متصلا بوظیفة المقذوف او عمله فأذا اقام الدلیل علی كل ماأسنده انتفت الجریمة».

له تاوانی تانەوتەشەردا، رایەڵە ماددییەکە بریتییە لە لکاندنی رووداوێک بەکەسێکەوە بەچەشنێک ئەو رووداوەی کە دراوەتە پاڵ ئەو کەسە، رووداوێکی دیاریکراو بێت، هەروەها ئەگەریێت و راست دەربچێ، ببێتە مایەی سزادانی ئەو کەسە کە تانەوتەشەری لێدراوە، یانیش ببێتە مایەی بەکەمزانینی لەلایەن خەڵکەوە. هەروەکو لە پێناسەی تاوانی تانەوتەشەردا بۆمان دەردەکەوێ کە لە ماددەی (٤٣٣)ی یاسای سزاداندا هاتووە: «تانەوتەشەر بریتییە لە لکاندنی رووداوێکی دیاریکراو بەکەسێکەوە...»[٥٨١]. هەڵبەتە، مەبەست لە لکاندنی رووداوێکی دیاریکراو بەوکەسەی کە تانەوتەشەری لێدراوە، دەبێ بەوپەری تەئکیدەوە بێت.

بێ گومان، مەرجیش نییە، رووداوی تانەوتەشەرەکە ببێتە مایەی سەپاندنی سزا بەسەر ئەو کەسەی کە تانەوتەشەری لێدراوە یان بەکەمزانینی لەلایەن خەڵکەوە، بەڵکوو ئەوەندە بەسە کە ئەگەر بێت و راست بوایە ئەم ئاکامەی لێ بهاتایەتە دی. ئەمەشمان لەم دەستەواژەیە بۆ دەردەکەوێت کە لە برگەی یەکەمی ماددەی (٤٣٣)دا هاتووە کە دەڵێ: «ئەگەر هاتوو راست دەربچێت و ببێتە مایەی رووبەرووبوونەوەی ئەو کەسەی کە تانەوتەشەری لێدراوە بۆ سزا یان بەکەمزانینی لەلایەن هاونیشتمانانییەوە».

شایەنی ئاماژەبۆکردنە، لە تانەوتەشەردا، ئەنجامدەری تانەوتەشەرەکە دەست دەکات بەلکاندنی رووداوەکە بەکەسێکی ترەوە لەسەر زاری خۆی یان زاری کەسێکی ترەوە یان گێرانەوەی گوایە پڕوپاگاندەیە یانیش بەئاشکرا بیخاتە پاڵی یان بەشێوەیەکی نائاشکرا بەئاماژە (تلمیح) بیداتە پاڵییەوە، هیچ لە سروشتی تانەوتەشەرەکە ناگۆڕێت[٥٨٢].

---

٥٨١- ئەم دەقە بەرامبەر دەقی ماددە (٣٠٢)ی یاسای سزادانی میسرییە کە ئەمەش دەقەکەیەتی: «یعد قذفا كل من اسند لغيره بواسطة احدى الطرق المبينة بالمادة (١٧١) من هذا القانون امورا لو كانت صادقة لأوجبت عقاب من اسندة اليه بالعقوبات المقررة لذلك قانونا أو اوجبت احتقاره عند اهل وطنه». هەروەها دەکەوێتە بەرامبەر دەقی ماددە (٥٨٢) و (٥٨٣)ی یاسای سزادانی لوبنانی کە ئەمەش دەقەکەیەتی: المادة (٥٨٢) «يعاقب على الذم بأحد الناس المقترف بأحدى الوسائل المذكورة في المادة ٢٠٩ بالحبس حتى ثلاثة اشهر وبالغرامة حتى مئة ليرة أو بأحدى هاتين العقوبتين ويقضي بالغرامة وحدها اذا لم يقع الذم علانية». المادة (٥٨٣) «لايسمح لمرتكب الذم تبريرا لنفسه بأثبات حقيقة الفعل موضوع الذم او اثبات اشتهاره».

٥٨٣- د. عبدالحميد الشواربي: جريمة القذف والسب في ضوء القضاء والفقه، منشورات دار المطبوعات الجديدة بالاسكندرية، ١٩٨٥، ل٨٣.

هەروەها دەبێ ئەو ڕووداوەی کە لەلایەن تاوانبارەوە دراوەتە پاڵ تاوان دەرهەق کراوەوە دیاریکراو بێت، ئەگینا بەتاوانی تانەوتەشەر دانانرێت، بەڵکوو بەتاوانی جوێنپێدان دادەنرێت[٥٨٣].

مەبەستیش لە ڕووداو هەموو ڕووداوێکی پۆزەتیڤی یان نێگەتیڤی و ماددی یان ئەدەبییە کە دەبێتە مایەی ناو و ناوبانگ زڕاندن[٥٨٤]. ئەو تانەوتەشەرەش کە مەحکوم کراوە ئەوەیە کە کردەوەیەکی لەخۆگرتووە کە یاسا بەتاوانی داناوە و سزاشی بۆ دیارکردووە. بێ گومان پێش ئەوەی ڕووداوەکە دیاریکرێت، دەبێ ئەو کەسە دیاریکرێت، کە تاوانەکەی دەرهەق کراوە، جا گرنگ نییە ناوی بەڕاشکاوی هاتبێت یان نەهاتبێت، کەسێکی سروشتی بێت یان مەعنەوی گشتی بێت یا تایبەتی، چونکە تانووتدان لە کەسانێکی نادیاریکراو یا مەزهەب ڕامیاری و ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان بەتانەوتەشەر دانانرێن.

هەندێک یاسازانان دەڵێن، مەرجە ئەو کەسەی تانەوتەشەری لێدراوە لە ژیاندا مابێ، چونکە شەرەف و کەرامەت بەشێکە لە کەسایەتی و لەبەرئەوەی کەسایەتیش بەمردن کۆتایی دێت، بۆیە ئەو مافەش بەدەوری خۆی کۆتایی پێدێت[٥٨٥].

هەروەها لە یاسای سزادانی میسریدا، هەرچەندە دەقێکی یاسایی ڕوون و ئاشکرای تێدا نییە تانەوتەشەری دەرهەق بەمردووان بەتاوان دانابێت و سزاشی بۆ دانابێت، هەروەها یاسای ڕێکخستنی دەسەڵاتی ڕۆژنامەگەریی ژمارە (٩٦)ی ساڵی ١٩٩٦یش هیچ دەقێکی ئاشکرای لەبارەیەوە تێدا نییە، بەڵام لە فەصڵی سێیەمدا لەکاتی دەستنیشانکردنی ئەرکەکانی ڕۆژنامەنووسی، لە ماددەی (٢٤)دا بەشێوەیەکی زمنی مافی وەڵامدانەوە و ڕاستکردنەوەی ئەو زانیارییانەی کە لە ڕۆژنامەدا دەرهەق بەمردووان بڵاودەکرێنەوە بەمیراتگرەکان داوە لەمیانی بەکارهێنانی دەستەواژەی «ئەو کەسەی

---

٥٨٣- د. عبدالحمید الشواربي: جريمة القذف والسب في ضوء القضاء والفقه، سەرچاوەی پێشوو، ل٨٣.

٥٨٤- د. عبدالحمید الشواربي: جرائم الصحافة والنشر، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٢.

٥٨٥- بڕوانە (د. محمود نجيب حسني) شرح قانون العقوبات - القسم الخاص - جرائم الاعتداء على الاشخاص، سەرچاوەی پێشوو، ل٥٢٣، هەروەها (احمد امين) شرح قانون العقوبات -القسم الخاص-، ط٣، منشورات مكتبة النهضة، بيروت- بغداد، بلا سنة الطبع، ل٥٥٥، هەروەها (د. عبدالحميد الشواربي)، جريمة القذف والسب في ضوء القضاء والفقه، سەرچاوەی پێشوو، ل٨٥.

پەیوەندیدارە- ذوي الشأن» کە لە دووتوێی دەقی ماددەکەدا هاتووە[٥٨٦]. هەروەها لە ماددەی (٢٨)دا ئەو سزایەی دەستنیشانکردووە کە دەسەپێندرێ بەسەر ئەو کەسەی کە لە ماددەی ناوبراودا هاتوون، ئەگەر هاتوو لێنەگەڕا وەڵامی ڕاستکردنەوەی زانیارییەکە بڵاوبکرێتەوە، لەوحاڵەتەشدا بەندینشین دەکرێ بۆ ماوەیەک کە لە سێ مانگ کەمتر نەبێت لەگەڵ غەرامەیەکیش کە لە هەزار جونەیهی میسری کەمتر نەبێت و لە چوار هەزار جونەیهیش ڕەت نەکات، یا بەیەکێک لەو دوو سزایە[٥٨٧].

کەواتە بەڕای ئێمە، دەقنووسەکردنی ئەم مافە -مافی میراتگران لە وەڵامدانەوە و ڕاستکردنەوەدا- ئەوە ناگەیەنێت کە ئەم مافەیان نەبێت، چونکە وێڕای دەقنووسکردنی دەستەواژەی «ئەو کەسەی پەیوەندیدارە» لە ماددەی (٢٤)دا کە پێشتر ئاماژەمان پێی کرد، مومارەسەکردنی ئەم مافە لەلایەن میراتگرانەوە پشت بەبنەما گشتییەکان دەبەستێت، هەروەها بێبەشکردنی میراتگران لەو مافە، دەبێتە هۆی ئازادکردنی ڕۆژنامەکان بۆ تانەوتەشەرداڵ لە مردووان و شێواندنی یاداشتەکانیان (تشويه ذكراهم).

بەڵام یاسای چاپەمەنیی عێراقی ژمارە (٢٠٦)ی ساڵی ١٩٦٨ی هەمواركراو، بەڕاشکاوییەوە لە بڕگەی (أ)ی ماددەی (١٥)دا مافی وەڵامدانەوە و ڕاستکردنەوەی بەکەسوکاری مردووەکە تا پلەی چوارەم داوە، ئەگەر هاتوو مردووەکە تانەوتەشەری لێدرابوو[٥٨٨]. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە یاسادانەری عێراقی مافی وەڵامدانەوەی تەنها نەبەخشیوە بەمیراتگرەکان، بەڵکو بەکەسوکاری مردووەکانیشی تا پلەی چوارەم بەخشیوە.

---

٥٨٦ - ئەمەش دەقەکەیەتی: «يجب على رئيس التحرير أو المحرر المسؤول ان ينشر بناء على طلب ذي شأن تصحيح ماورد ذكره من الوقائع أو سبق نشره من تصريحات في الصحف في غضون ثلاثة ايام التالية لاستلامه التصحيح أو في اول عدد يظهر من الصحيفة بجميع طبعاتها ايهما يقع اولا وبما يتفق مع مواعيد طبع الصحيفة ويجب ان يكون النشر في نفس المكان وبنفس الحروف التي نشر بها المقال او الخبر او المادة الصحفية المطلوب تصحيحها».

٥٨٧ - ئەمەش دەقەکەیەتی: «اذا لم يتم التصحيح في المدة المحددة في المادة (٢٤) من هذا القانون يعاقب الممتنع عن نشره بالحبس مدة لاتقل عن ثلاثة اشهر وبغرامة لاتقل عن الف جنيه ولايتجاوز اربعة الاف جنيه او باحدى هاتين العقوبتين...».

٥٨٨ - ئەمەش دەقەکەیەتی: «أ- على مالك المطبوع الدوري أن ينشر مجانا الرد الوارد اليه ممن قذف في مطبوعه أو شهر به واذا كان القذف أو التشهير يتعلق بمتوفي فلأقربائه حتى الدرجة الرابعة مثل هذا الحق...».

لەکاتێکدا، یاسادانەری فەرەنسی لە یاسای ڕۆژنامەگەریی ساڵی ١٨٨١ی هەموارکراودا لە ماددەی (٣٤)دا بەڕاشکاوییەوە بەدەری خستووە کە تانەوتەشەردان لە مردووان بەتاوان دابنرێت مەگەر شەرەف و کەرامەتی میراتگرەکان لەکەدار بکات، لەوحاڵەتەشدا میراتگر بەتاوانەرهەتکراو (مجني عليه) دادەنرێت کە لە ئاکامی ئەو تانەوتەشەرەدا زیانی لێکەوتووە، هەروەها یاسادانەری لوبنانی لە ماددە (٥٨٦)ی یاسای سزاداندا هەڵوێستەکەی نزیکە لە هەڵوێستی یاسادانەری فەرەنسی[589]. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، ئەگەر هاتوو تانەتەشەرەکە ناو و ناوبانگی میراتگرەکانی زڕاند یان شەرەف و کەرامەتی لەکەدارکردن و زیانی پێگەیاندن ئەوکاتە میراتگرەکان بۆیان هەیە داوای سزادانی ئەنجامدەرەکەی بکەن، ئەمەش لەبەرئەوە نییە تانەتەشەری لە میراتگرەکان داوە، بەڵکو لەبەرئەوەی تانەوتەشەرەکە ئاکامێکی نێگەتیڤی بۆسەر شەرەف و کەرامەت و ناو و ناوبانگی ئەوان هەبووە و زیانی لێداون.

٥٨٩- ئەمەش دەقی ماددە(٣٤)ی یاسای ڕۆژنامەگەریی فەرەنسییە:

Article 34

Modifié par Loi 29 Septembre 1919 JORF 1er octobre 1919.

Les articles 29, 30 et 31 ne seront applicables aux diffamations ou injures dirigées contre la mémoire des morts que dans le cas où les auteurs de ces diffamations ou injures auraient eu l'intention de porter atteinte à l'honneur ou à la considération des héritiers, époux ou légataires universels vivants.

Que les auteurs des diffamations ou injures aient eu ou non l'intention de porter atteinte à l'honneur ou à la considération des héritiers, époux ou légataires universels vivants, ceux-ci pourront user, dans les deux cas, du droit de réponse prévu par l'article 13.

واتە «لاتنطبق المادة التاسعة والعشرون والمادة الثلاثون والمادة الواحدة والثلاثون فيما يخص التشنيع او السب الموجهة ضد ذكرى الموت، الا في حالة قيام اصحاب هذا التشنيع والسبات بغاية المساس بشرف او مكانة الورثة او الازواج او الاوصياء الاحياء عامة شاء اصحاب التشنيع ام لم يشاؤا المساس بشرف او اعتبار الورثة او الازواج او الاوصياء الاحياء عامة بحق لهؤلاء في الحالتين حق الرد المنصوص عليه بالمادة الثالثة عشر». ئەمەش دەقی ماددە (٥٨٦)ی یاسای سزادانی لوبنانییە: «تتوقف الدعوى على اتخاذ المعتدي عليه صفة المدعي الشخصي اذا وجه الذم او القدح الى ميت جاز لاقربائه حتى الدرجة الرابعة دون سواهم استعمال حق الملاحقة، هذا مع الاحتفاظ بحق كل قريب او وريث تضرر شخصيا من الجريمة».

لە میانی ئەم دەقانەی سەرەوەدا بۆمان دەردەکەوێ، کە لە عێراقدا، دەقێکی یاسایی نییە تانەوتەشەری دەرهەق بەمردووان خۆی لە خۆیدا (بذاتە) بەتاوان دانابێت، یانیش ڕێگای پێدابێت. هەروەها یاسادانەری هەرێمی کوردستان لە ئاستی ئەمەدا بێدەنگ بووە و نە لە دوور و نەلە نزیکەوە باسی نەکردووە. لە کاتێکدا، یاسای ڕۆژنامەگەریی فەرەنسی تانەوتەشەری دەرهەق بەمردووان خۆی لە خۆیدا بەتاوان داتەناوە، مەگەر شەرەف و کەرامەتی میراتگرەکان لەکەدار بکات، هەروەکو پێشتر ئاماژەمان پێی کرد.

بۆ بەرپەرچدانەوەی ڕای ئەو یاسازانانە کە دەڵێن: «شەرەف و کەرامەت بەشێکە لە کەسایەتی و لەبەرئەوەی کەسایەتیش بەمردن کۆتایی دێت، بۆیە ئەو مافەش بەدەوری خۆی بەمردن کۆتایی پێدێت»، دەڵێین، چۆن هەندێک لە یاسازانانی موسڵمان دوای مردنی مرۆڤ و کۆتایی هاتنی کەسایەتییەکەی بەشێوەیەکی ڕاستەقینە (حقیقی)، کەسایەتییەکەی بەشێوەیەکی ئیعتیباری بۆ دوای مردنی درێژ دەکەنەوە، بەمەبەستی وەرگرتنەوەی مافەکانی و دانەوەی قەرزەکانی، بەپێی ئەو بنەما شەرعییەی کە دەڵێ: «هیچ میراتێک نییە دوای دانەوەی قەرز نەبێت- لاترکة الا بعد سداد الدیون»، دەبوایە ئەوهاش لە حاڵەتی تانەوتەشەر لێداندا کەسایەتییەکەی بۆ دوای مردنی درێژ بکرێتەوە، چونکە شەرەف و کەرامەت و ناو و ناوبانگ بەشێکە لە کەسایەتی و لێی جودا ناکرێتەوە، لێرەشدا بەلایەنە مەعنەوییەکەی مافی دانەر دەچێت، کە بەپێی بیروڕای هەندێک یاسازانان و لایەنگرانی سیستمی یەکگرتوو (النظام الموحد)Systme Unitair و بەپشت بەستن بەم سیستمە لایەنە مەعنەوییەکەی مافی دانەر دەبەستەوە بەکەسایەتی دانەرەکە و دوای مردنیشی لێی جودا ناکەنەوە و ئەم لایەنە مەعنەوییەش لایەنێکی بنەڕەتە لە مافی دانەردا لەپاڵ لایەنی دارایی کە لایەنێکی لاوەکییە[٥٩٠].

هەر لەسەر ئەم بنچینەیە، یاسادانەری ڕووسیی یەکێتیی سۆڤیێتیی پێشوو، ڕێگای بەدانەر داوە چۆن بۆی هەیە وەسیەت بۆ میراتگرەکانی بکات، ئەوهاش بۆی هەیە بێ لە میراتگرەکانی وەسیەت بۆ کەسانی تریش بکات، بۆ بەکارهێنانی گشت یا بەشێک لەو دەسەڵاتانەی کە یاسا بۆ پاراستنی کەلەپوورە هزرییەکەی (اثارة الفکریة) پێی بەخشیوە.

---

٥٩٠- بۆ زانیاری زیاتر لەمبارەیەوە بڕوانە، کمال سعدي مصطفی: حق الملکیة الأدبیة والفنیة في القانون العراقي والمقارن، رسالة ماجستیر في القانون، قدمت الی کلیة القانون والسیاسة بجامعة صلاح الدین- اربیل، عام ١٩٩٦، ل ٥٢-٥٥.

بەڵام ئەگەر وەسیەتی نەکردبوو یا بەر لە مردنی کەسێکی تری ڕانەسپاردبوو بۆ پاراستنی کەلەپووری هزرییەکەی، لەم حاڵەتەدا مافی دانەر بۆ میراتگرەکانی دەگوێزرێتەوە[٥٩١].

هەروەها یاسای سزادانی عێراقی لە کتابی دووەمدا، لە فەسڵی سێیەمدا دەستدرێژی کردنی بۆسەر ڕێزی مردووان و گۆڕەکانیان بەتاوان داناوە[٥٩٢].

کەواتە، لەبەر ڕۆشنایی ئەم دەقە، دەتوانین بڵێین، مادام دەستدرێژیکردنەسەر ڕێزی مردووان و گۆڕەکانیان بەتاوان داندراوە، کەواتە تانەوتەشەردان لە خودی مردووەکان لەپێشترە لە دەستدرێژیکردنەسەر ڕێزی گۆڕەکانیان، چونکە ئەگەر لەبەر خودی مردووەکە نەبێ، ئەو گۆڕە چ ڕێزێکی دەبێ؟ بەواتایەکی تر، ئەو گۆڕانە بەهۆی تەرمی ئەو مردووانەی تیایدا نێژراون ڕێزیان لێ گیراوە، بۆیە بەڕای ئێمە تانەوتەشەردان لە مردووان یا هەر دەستدرێژییەک بۆسەر ناو و ناوبانگ و یادیان، پێویستە بەتاوان دابندرێت و بۆ ئەم مەبەستەش دەبێ کەسایەتیی یاساییان بۆ دوای مردنەکەیان درێژ بکرێتەوە بەمەبەستی وەرگرتنی قەرەبوو و سەپاندنی سزا بەسەر دەستدرێژیکەر. جا گرنگ نییە مردووەکە میراتگری هەبێت یا نەبێت وەیان داوا بۆ دادگا بەرز بکاتەوە، بەڵکوو داواکاری گشتی بۆی هەبێت ئەو داوایە بۆ دادگا بەرز بکاتەوە، چونکە دەستدرێژیکردنەسەر ڕێزی مردووان، دەستدرێژییە بۆسەر بەرژەوەندییە گشتییەکانی کۆمەڵ.

جا لەبەرئەوەی مافی دانەر لە پاراستنی کەلەپووری هزرییەکەی بەمافی میرات لێ گیراو (المورث) دەچێت، لە پاراستنی ناو و ناوبانگ و یادی لە هەر دەستدرێژییەک کە لە ماوەی ژیانیدا یا لەدوای مردنیدا دەکرێتە سەری، چونکە مافەکە بەشێکە لە کەسایەتی دانەرەکە لە حاڵەتی یەکەمدا و کەسایەتی میراتلێگیراوەکە لە حاڵەتی دووەمدا. لە هەردوو حاڵەتیشدا تەمسیلی لایەنە مەعنەوییەکەی خاوەنەکەی دەکات و دوای مردنیشیان لێیان جیا ناکرێتەوە. جا ئەگەر یاسا پاراستنی یاسایی بۆ کەلەپووری هزری دانەر لە دوای مردنیشیدا دەستەبەر کردبێت، کە بەشێکە لە لایەنە مەعنەوییەکەی مافی دانەر، خۆ پاراستنی شەرەف و کەرامەت و ناو و ناوبانگ و یادەکەی لە دوای مردنی لەو

---

٥٩١- المادة (٤٨١) من القانون المدني لجمهورية روسيا الاتحادية الاشتراكية السوفيتية لعام ١٩٦٤ (النص الرسمي) ترجمة (د. ثروت انيس الاسيوطي)، دار تقدم موسكو، ١٩٧٣.

٥٩٢- بڕوانە دەقی ماددە (٣٧٣) کە تیایدا هاتووە: «يعاقب بالحبس مدة لاتزيد على سنتين وبغرامة لاتزيد على مائتي دينار أو بإحدى هاتين العقوبتين. من انتهك أو دنس حرمة قبر او مقبرة او نصب لميت او هدم او اتلف او شوه عمدا شيئا من ذلك».

لەپێشترە. جا ئەگەر پێشگیری دانەر کرابێت بۆ پاراستنی کەلەپووری هزرییەکەی و لەم ڕوانگەیەوە مافی ئەوەی پێدرابێت یەکێک لە میراتگرەکانی یا هەر کەسێکی تر بێ لە میراتگرەکانی بەر لە مردنی ڕابسپێرێ بۆ داکۆکیکردن لەو مافەی لە هەر دەستدرێژییەکدا کە دەکرێتەسەری، وابزانم هەقی خۆیەتی مافی ئەوەشی پێبدرێت یەکێک لە میراتگرەکانی یا هەر کەسێکی تر بێ لەوان لەسەر ڕاسپاردەی خۆی بێت یا نەبێت، لە دوای مردنیدا داکۆکی لە پاراستنی ناو و ناوبانگ و یادەکەی بکەن. لەکاتێکدا ئەگەر میراتلێگیراو (المورث) هیچ وەسییەتی لەمبارەیەوە بۆ میراتگرەکانی یا کەسێکی تر بێ لەوان نەکرد، لەو حاڵەتەدا دەوڵەت جێگای ئەوان دەگرێتەوە و بۆی هەیە بەپێی ئەو بنچینە شەرعییەی کە دەڵێ: «دەوڵەت میراتگری ئەو کەسەیە کە میراتگری نییە- الدولة وارث من لاوارث لە»[٥٩٣] داوا لە دژی ئەو کەسانەی کە دەستدرێژی دەکەنەسەر ناو و ناوبانگ و یادی مردووان و ڕێزی لەکەدار دەکەن و تانەوتەشەری لێ دەدەن،، بۆ دادگا بەرز بکاتەوە، هەروەها لەسەر بنچینەی ئەو زیانە مەعنەوییەی کە لە ئاکامی دەستدرێژیکردنەسەر یادی مردووەکە کە لە خودی مردووەکە کەوتووە، دوای ئەوەی کەسایەتییە یاساییەکەی بەشێوەیەکی ئیعتباری بۆ دوای مردنی درێژ دەکرێتەوە، دەوڵەت بۆی هەیە بەپێی ئەو بنچینەیەی کە لەسەرەوە ئاماژەمان پێی کرد، وەک میراتگرێک قەرەبووی ئەو زیانانە وەربگرێتەوە دوای ئەوەی دەبنە بەشێک لە ڕەگەزە پۆزەتیڤەکانی ئەستۆی دارایی (الذمة المالية) میرات لێ گیراوەکە. لە لایەکی تریشەوە، دەکرێ لە ڕێگای مافی گشتی (حق العام)ەوە ئەم کێشەیە چارسەر بکرێ.

لەکۆتاییدا، لەبەر ڕۆشنایی ئەم بەڵگانەی سەرەوە دەڵێین، ئێمە لەگەڵ ئەو ڕایە نین کە دەڵێ «مەرجە ئەو کەسەی کە تانەوتەشەری لێدراوە لە ژیاندا مابێ» یا «تانەوتەشەردان لە مردووان بەتاوان دانانرێ، مەگەر شەرەف و کەرامەتی میراتگرەکان لەکەدار بکات، لەو حاڵەتەشدا خودی میراتگرەکە بەتاواندەرهەقکراو دادەنرێ، کە لە ئاکامی ئەو تانەوتەشەرەدا زیانی لێکەوتووە» ، بۆیە داوا لە یاسادانەری هەرێمی کوردستان دەکەین،

٥٩٣ - یاسای باری کەسایەتیی عێراقی ژمارە (١٨٨)ی ساڵی ١٩٥٩ی هەمووارکراو لە ماددەی (٨٨)دا ئەو کەسانەی پۆلێن کردووە کە مافی وەرگرتنی میراتیان هەیە، ئەمەش دەقەکەیەتی: «میراتگرەکان بەمجۆرەی خوارەوە پۆلێن دەکرێن: ١- میراتگرەکان بەخزمایەتی و هاوسەرێتیی ڕاستەقینە. ٢- ئەوکەسەی دان بەڕەچەڵەکی دانراوە. ٣- وەسیەتبۆکراو بەهەموو ماڵەکە. ٤- بەیتولمالی موسڵمانان».

پاراستنی یاسایی بۆ ناو و ناوبانگ و یادی مردووان بۆ خودی مردووەکان دابین بکات، کە بەشێکە لە لایەنە مەعنەوییەکەی کەسایەتییان.

۲- ڕایەڵی مەعنەوی

لەبەرئەوەی تاوانی تانەوتەشەر لە بنەڕەتدا تاوانێکی بەئەنقەستە، بۆیە ڕایەڵە مەعنەوییەکەی خۆی لە «مەبەستی تاوانکاریدا» دەنوێنێ[٥٩٤]. جا هەرکاتێک تانەتەشەرچی (القاذف) ئەو هەواڵەی بڵاوکردەوە کە تانەتەشەری لەخۆگرتووە و بشزانێ نەگەریێت و ڕاست بێت دەبێتە مایەی سزادانی تانەوتەشەرلێدراو (المقذوف) یان بەکەمزانینی لەلایەن خەڵکەوە، وادادەنرێ کە مەبەستی تاوانکاری لە بڵاوکردنەوەی ئەو هەواڵەدا هەبووە، جا گرنگ نییە مەبەستی لەمەدا زیانگەیاندن بوو بێت بەتانەوتەشەرلێدراوەکە یانیش نیازی پاک بوو بێت[٥٩٥]. هەرچەندە دادوەر بۆی هەیە لە مەبەستی ئەنجامدەرەکە بکۆڵێتەوە بۆ سووککردنی سزاکە نەک بۆ نەهێشتنی تاوانەکە، چونکە تانەوتەشەر خۆی لە خۆیدا زیانبەخشە و لە هەموو حاڵەتێکدا دەبێتە مایەی لەکەدارکردنی ناو و ناوبانگی تاواندەرهەقکراو[٥٩٦].

کەواتە بوونی مەبەستی تایبەتیی تاوانکاری (القصد الجنائي الخاص) مەرج نییە بۆ بوونی تاوانی تانەوتەشەر، ئەگەر هاتوو ئەو کەسەی تانەوتەشەری لێدراوە یەکێک نەبوو لەو کەسانەی کە لە بڕگەی دووەمی ماددەی (٤٣٣)ی یاسای سزادانی ساڵی ۱۹۶۹دا ڕیزبەر کراون، بەڵکوو تەنها مەبەستی گشتیی تاوانکاری لە ڕوودانی تاوانەکەدا هەبێت بەسە، کە بریتییە لە بڵاوکردنەوەی ئەو هەواڵەی کە تانەوتەشەری لەخۆ گرتووە، کە دەزانێت نەگەریێت و ڕاست بێت دەبێتە مایەی سزادانی تاواندەرهەقکراو یان بەکەمزانینی لەلایەن خەڵکەوە. جا نیازپاکی ئەنجامدەری تانەوتەشەرەکە هیچ کاردانەوەیەکی بەسەر بوونی ئەم مەبەستە نابێت ئەگەر هاتوو ئەو دەستەواژانەی کە بەکاری هێناوون خۆی لە خۆیدا نابڕووبەر بێت[٥٩٧].

---

٥٩٤- د. محمود نجيب حسني: شرح قانون العقوبات -القسم الخاص- جرائم الاعتداء على الاشخاص. سەرچاوەی پێشوو، ٥٦٣.

٥٩٥- احمد امين: شرح قانون العقوبات -القسم الخاص-. سەرچاوەی پێشوو، ل. ٥٣٤

٥٩٦- احمد امين: شرح قانون العقوبات -القسم الخاص-، سەرچاوەی پێشوو، ل. ٥٣٤

٥٩٧- المستشار معوض عبدالتواب: القذف والسب والبلاغ الكاذب، دار المطبوعات الجامعية، اسكندرية. ١٩٨٨، ل٥٤.

دادگای پیاچوونەوەی میسری (محكمة النقض المصرية) لەمبارەیەوە لە بڕیارێکیدا دەڵێ: «لە تاوانی تانەوتەشەردا، یاسا، بوونی مەبەستێکی تایبەتی تاوانکاری نەویستووە، بەڵکوو بەبوونی مەبەستێکی گشتیی تاوانکاری وازیهێناوە کە هەرکاتێک تانەوتەشەرچی هەواڵێکی لەو هەواڵانەی تانەوتەشەریان لەخۆگرتووە بڵاوکردەوە ئەم مەبەستە دێتەدی، چونکە ئەو دەزانێ ئەگەر ئەو هەواڵە ڕاست بێت دەبێتە مایەی سزادانی تانەوتەشەرلێدراو یان بەکەمزانینی لەلایەن خەڵکەوە، جا بۆ بوونی ئەم مەبەستە، نیازپاکی تانەوتەشەرچی هیچ ناکامێکی نابێت، واتە ئەگەر هاتوو لەو باوەڕەدابووبێ کە ئەو هەواڵە کە تانەوتەشەری لەخۆگرتووە و داویەتییەپاڵ تاوانەدرهەڵکراو ڕاست بێت»[598]. کەواتە، گریمانەی بوونی مەبەستی تاوانکاری لە تاوانی تانەوتەشەردا دەکرێت، هەرکاتێک ئەو دەستەواژانەی کە لەلایەن ئەنجامدەرەکەوە بەکارهاتبوون، ئەگەرێت و خۆی لە خۆیدا نابڕووبەر بێت[599]، لەم حاڵەتەشدا هیچ پێویست بەسەلماندنی بوونی مەبەستە تاوانکارییەکە ناکات، بەڵکوو تاوانبار بۆی هەیە لەجیاتی ئەوە، نیازپاکی خۆی بسەلمێنێ[600]. بەڵام تاوانبار بۆی نییە لەهەموو حاڵەتێکدا نیازپاکی خۆی بسەلمێنێ لەڕێگای سەلماندنی ڕاست و دروستیی ئەو ڕووداوانەی کە داویەتییە پاڵ تاوانەدرهەڵکراو، تەنها لەو حاڵەتەدا نەبێت کە لە بڕگەی دووەمی ماددەی ناوبراودا ڕیزبەر کراون کە پێشتر ئاماژەمان پێی کرد. هەروەها پاساو هێنانەوە گوایە ئەو کەسەی تانەوتەشەری لێدراوە دەست پێشخەر بووە لەو دەمەقاڵەیەدا و تاوانباری ئیستفزاز کردووە، ئەمە تاوانی تانەوتەشەرەکە ڕەش ناکاتەوە بەڵکوو تەنها بەبارودۆخێکی سووککەرەوە دادەندرێت و دەبێتە مایەی سووککردنی سزاکە.

---

598- نقض ٢٢ مايو سنة ١٩٣٩ مجموعة القواعد القانونية، ج ٤ رقم ٣٩٨، ص٧[illegible] لە (د. محمود نجيب حسني): شرح قانون العقوبات - القسم الخاص - جرائم الاعتداء على الاشخاص، سەرچاوەی پێشوو، ل٦٣٥-٦٤٥ وەرگیراوە.

599- دادگای پیاچوونەوەی عێراقی (محكمة التمييز العراقي) لە بڕیارێکیدا دەڵێ: «دادگا ڕێنوێ بەپسپۆڕان دەکات بۆ بڕیاردان ئایا ئەو دەستەواژانەی کە تاوانبار بەکاری هێناون تانەوتەشەریان دەرهەق بەداخوازکار تێدایە یان نا؟ ئینجا بڕیاری خۆی لەبەر ڕۆشنایی ئەوەدا دەردەکات» بڕیاری دادگای پیاچوونەوەی عێراقیی ژمارە (٢٠)ی ١٩٧٤/٣/٥ بڕوانە ابراهيم المشاهدي: المبادئ القانونية في قضاء محكمة التمييز، القسم الجنائي، مطبعة الجاحظ، بغداد، ١٩٩٠، ل٢٢٩.

600- احمد امين: شرح قانون العقوبات -القسم الخاص-، سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٣٥.

### ٣- ڕایەڵی بەئاشکرایی

بەئاشکرایی لە ڕووی زاراوەییەوە بەمانای گەیاندنی زانیاری دێت لەبارەی ڕووداوێک یان کردارێکی دیاریکراوەوە بەخەڵک بەقسە بێت یان بەکردار یان بەنووسین یانیش بەهەر هۆکارێکی تری گەیاندن بێت. لە تاوانی تانەوتەشەردا، بڵاوکردنەوە و ئاشکرایی ڕایەڵێکی تایبەتییە لە ڕایەڵەکانی ئەم تاوانە لەپاڵ هەردوو ڕایەڵی ماددی و ڕایەڵی مەعنەویدا و بەنەبوونی ئەم ڕایەڵە تاوانی تانەوتەشەری ئاشکرا بەگوێرەی ئەو وەسفەی لە دەقی ماددەی (٤٣٣)دا بۆی کراوە، ڕوونادات. هەرچەندە تاوانی تانەوتەشەر هەمیشە تاوانێکی بەئەنقەستە و لە بنەڕەتدا دەبێ بەشێوەیەکی ئاشکرا ڕووبدات، بەڵام سەرەڕای ئەمە. یاسادانەری عێراقی لە دەستنیشانکردنی سزای تانەوتەشەردا جیاوازیی کردووە لە نێوان تانەوتەشەری ئاشکراو تانەوتەشەری نائاشکرادا، هەروەکو تێزێکی تر لەکاتی باسکردنی سزای تاوانی تانەوتەشەردا بۆمان دەردەکەوێت.

یاسای سزادانی ژمارە (١١١)ی ساڵی ١٩٦٩ی هەمووارکراو لە برگەی سێیەمی ماددەی (١٩)دا بەم شێوەیەی خوارەوە هۆکارەکانی بەئاشکرایی (وسائل العلانیة)ی دەستنیشانکردووە[٦٠١]:

١- کردەوە و نیشارەت و جووڵانەوە ئەگەر هاتوو لە ڕێگایەکی گشتی یان شوێنێکی گشتیدا ڕوویدا بەچەشنێک ئەو کەسانەی کە لەو شوێنەن بتوانن بیبینن.

٢- قسەکردن و هاوارکردن لە شوێنەگشتییەکان بەچەشنێک ئەو کەسەی کە لەو شوێنەیە بتوانێ گوێی لێ بێت.

---

٦٠١- ئەمەش دەقەکەیەتی بەزمانی عەرەبی: «٣- العلانیة: تعد وسائل العلانیة:

١- الأعمال او الاشارات او الحركات اذا حصلت في طريق عام او في محفل عام او مكان مباح او مطروق او معرض لانظار الجمهور او اذا حصلت بحيث يستطيع رؤيتها من مكان في مثل ذلك المكان او اذا نقلت اليه بطريقة من الطرق الیتیة.

٢- القول او الصياح اذا حصل الجهر ■ او ترديده في مكان مماذكر او اذا حصل الجهر به او ترديده بحيث يستطيع سماعه من كان في مثل ذلك المكان او اذا اذيع بطريقة من الطرق الالیة وغيرها بحيث يسمعه من لادخل له في استخدامه.

٣- الصحافة والمطبوعات الأخري وغيرها من وسائل الدعاية والنشر.

د- الكتابة والرسوم والصور والشارات والافلام ونحوها اذا عرضت في مكان مماذكر او اذا وزعت او بيعت الى اكثر من شخص او عرضت للبيع في أي مكان».

٣- رۆژنامەگەری و چاپەمەنی و کەناڵەکانی تری ڕاگەیاندن.

٤- نووسین و ڕەسم و وێنە و فیلم و نارم، ئەگەر هاتوو لە شوێنە گشتییەکاندا نمایش کرا یان دابەش کرا یان بەزیاتر لە کەسێک فرۆشرا یان لە هەر شوێنێک بۆ فرۆشتن نمایش کرا. کەواتە، ئەگەر هاتوو تانەوتەشەرەکە بەئاشکرایی بەڕێگایەک لەو ڕێگایانەی سەرەوە ڕوویدا، ئەوا بەتانەوتەشەری ئاشکرا دادەندرێت و لەو حاڵەتەشدا سزایەکەی لە سزای تانەوتەشەری نائاشکرا توندتر دەبێت. جا ئەگەر هاتوو تاوانەکە لە ڕێگای ڕۆژنامەگەرییەوە ڕوویدا، ئەوا بەتاوانی ڕۆژنامەگەریی دادەندرێت، بەڵام ئەمە هیچ لە سروشت و سزای تاوانەکە ناگۆڕێت، چونکە ڕۆژنامەگەری بەهەموو جۆرەکانییەوە (چاپکراو، بیستراو، بینراو، بیستراووبینراو، ئینتەرنێت) هۆکارێکە لە هۆکارەکانی بەئاشکرایی.

دووەم: سزای تاوانی تانەوتەشەر

لە برگەی یەکەمی ماددە (٤٣٣)ی یاسای سزادانی عێراقیدا هاتووە: «ئەو کەسەی تانەوتەشەر لە کەسێک بدات بەزیندانیکردن یان غەرامەکردن یان بەهەردووکیان سزا دەدرێت، بەڵام ئەگەر هاتوو تانەوتەشەرەکە لەڕێگای ڕۆژنامەگەریی یان چاپەمەنیی یان یەکێک لە ڕێگاکانی ڕاگەیاندنی ترەوە ئەنجامدرا، ئەوا بەبارودۆخێکی توند دادەندرێت».

لەم دەقەدا بۆمان دەردەکەوێت، یاسادانەری عێراقی جیاوازیی کردووە لە نێوان تانەوتەشەر لە ڕێگای بڵاوکردنەوە و غەیری بڵاوکردنەوەدا، بۆیە لە حاڵەتی ئەنجامدانی لەڕێگای بڵاوکردنەوەدا سزاکەی توند کردووە.

کەواتە، لە حاڵەتی ئەنجامدانی تانەوتەشەرەکە بەڕێگایەک لە ڕێگاکانی غەیری بڵاوکردنەوەوە، دادگا بۆی هەیە ئەنجامدەری تانەوتەشەرەکە سزا بدات بۆ ماوەیەک کە لە سێ مانگ کەمتر نەبێت و لە پێنج ساڵیش زیاتر نەبێت[٦٠٢]، لەگەڵ غەرامەیەک کە لە

٦٠٢- بڕوانە دەقی ماددە(٢٦)ی یاسای سزادانی عێراقی کە تیایدا هاتووە «الجنحة هي الجريمة المعاقب عليها باحدى العقوبتين التاليتين: ١- الحبس الشديد أو البسيط اكبر من ثلاثة اشهر الى خمس سنوات. ٢- الغرامة» شایەنی ئاماژەبۆکردنە، سزای ئەو غەرامەیەی کە لە برگەی دووەمی ماددەی ناوبراودا هاتووە بەپێی بڕیاری ئەنجوومەنی سەرکردایەتیی شۆڕش ژمارە (٥)ی ١٩٩٨/٦/١٧ گۆڕاوە بۆ گرتن (الحبس) بڕوانە ڕۆژنامەی «الوقائع العراقية» ژمارە (٣٧٠٦) لە ١٩٩٨/١/٢٦.

نیو دینار کەمتر نەبێت و لە پێنج سەد دیناریش زیاتر نەبێت[٦٠٣]. بەڵام لە حاڵەتی ئەنجامدانی تاوانەکەی تانەوتەشەرەکە بەڕێگایەک لە ڕێگاکانی بڵاوکردنەوە، بۆی هەیە سزایەکەی توندتر بکات بەچەشنێک ماوەی زیندانیکردنەکە بگەیەنێتە ■ ساڵ[٦٠٤].

سێیەم: هۆیەکانی ڕێگاپێدانی

مەبەستمان لە تانەوتەشەری ڕێگاپێدراو، ئەو تانەوتەشەرەیە کە لە بنەڕەتدا بەتاوان داندراوە و گشت رایەڵەکانیشی هەنە، هەروەها لە بنەڕەتدا یاسا سزای بۆ داناوە، بەڵام ئەگەر روویدا، لەبەر هەندێک ئیعتبار، لە هەندێک حاڵەتی دیاریکراودا، ئەنجامدەرەکەی سزا نادرێت.

یاسای سزادانی عێراقی لە ماددەی (٤١)دا پرنسیپێکی گشتی بۆ ڕێگادان بەتانەوتەشەر داناوە، ئەمەش دەقەکەیەتی: «بەتاوان دانانرێت ئەگەر هاتوو کردەوەکە لە ناکامی بەکارهێنانی مافێک کە یاسا دانی پێدانابێت ڕوویدات...». بەپێی ئەم دەقە، لە هەندێ حاڵەتدا، تانەوتەشەرەکە ڕوودەدات، مەبەستی تاوانکاریشی لەگەڵدایە، بەڵام بەمەبەستی مومارەسەکردنی مافێک کە یاسا دانی پێداناوە تانەوتەشەرەکە ڕێگای پێ دەدرێت و ئەنجامدەری تانەوتەشەرەکەش لە سزا دەبەخشرێت.

کەواتە، هەر کاتێک هۆیەک لە هۆیەکانی ڕێگاپێدانی تانەوتەشەرەکە و مەرجەکانی

---

٦٠٣- بڕوانە ماددە (٩١)ی یاسای سزادانی عێراقی کە تیایدا هاتووە: «عقوبة الغرامة هي الزام المحكوم عليه بأن يدفع الى الخزينة العامة المبلغ المعين في الحكم وتراعي المحكمة تقدير الغرامة حالة المحكوم عليه المالية والاجتماعية وما افاده من الجريمة او كان يتوقع افادته منها وظروف الجريمة وحالة المجنى عليه. ولايقل مبلغ الغرامة عن نصف دينار ولايزيد على خمسمائة دينار مالم ينص القانون على خلاف ذلك». شایەنی ئاماژەبۆکردنە، بڕی ئەو غەرامەیەی کە لە ماددەی ئاماژەپێکراودا هاتووە بەپێی بڕیاری ئەنجومەنی سەرکردایەتیی شۆڕش ژمارە (٢٠٦)ی ١٩٩٤/١١/٢٢ گۆڕاوە و کەمترین بڕی بۆتە (٢٠١) دینار و زۆرترینیش (١٠٠٠) دینار لە تاوانەکانی کەتن دا، بڕوانە ڕۆژنامەی «الوقائع العراقية» ژمارە (٣٥٤٠) لە ١٩٩٤/١٢/٥.

٦٠٤- بڕوانە دەقی ماددە (١٣٦)ی یاسای سزادانی عێراقی کە تیایدا هاتووە: «اذا توافر في جريمة ظرف من ظروف المشددة يجوز للمحكمة ان تحكم على الوجه الاتي: ١-...... ٢- اذا كانت العقوبة السجن المؤقت او الحبس جاز الحكم بأكثر من الحد الأقصى للعقوبة المقررة للجريمة بشرط عدم تجاوز ضعف هذا الحد على ان لاتزيد مدة السجن المؤقت في أي حال خمس وعشرين سنة ومدة الحبس على عشر سنوات...».

هەبوون، ناکامێکی ڕاستەوخۆی بەسەر ڕێگاپێدانی ئەو تانەتەشەرەوە دەبێت. جا دەکرێ تانەوتەشەرەکە بەمەبەستی بەرگری لەخۆکردنی ڕەوا بێت، ئەگەر هاتوو، ئەو کەسەی کە بەرگری لەخۆی دەکات (المدافع) بۆ بەرپەرچدانەوەی تانەوتەشەری دەستدرێژیکەر (المعتدي) تانەوتەشەرەکەی ئاراستەی ئەو کردبێت. یانیش لە کاتی بەرگریکردنی لە مافی خۆیدا، لەبەردەم دادگا یا دەسەڵاتی لێکۆڵینەوە یا دەسەڵاتەکانی تردا، لەو سنوورەی کە داکۆکیکردنەکە پێویستی پێیەتی. تانەوتەشەرەکەی ئاراستەی نەیارەکەی (خصمە) کردبێت[605]، یانیش لەکاتی بەرگریکردنی لە مافی خۆیدا، لەبەردەم دادگا یا دەسەڵاتەکانی لێکۆڵینەوە یا دەستەکانی تردا، لەو سنوورەی کە داکۆکیکردنەکە پێویستی پێیەتی، تانەوتەشەرەکەی ئاراستەی نەیار (خصم)ەکەی کردبێت.

هەروەها ئەو کەسەی کە تاوانی تانەوتەشەر ئەنجام دەدات. ئەگەر هاتوو لە حاڵەتی تووڕەبووندا، لە ناکامی ئەو دەستدرێژییە نارەوایەی کە کراوەتە سەری، ئەمەی ئەنجامدا لەسزا دەبەخشرێت[606]. هەروەها، یاسادانەری عێراقی لە بڕگەی دووەمی ماددەی (٤٣٣)ی یاسای سزاداندا ڕێگای بەتانەوتەشەر داوە ئەگەر هاتوو بۆ فەرمانبەرێک یان ئەو کەسەی ئەرکێکی گشتی پێ سپێردراوە یان سیفەتی بریکاری گشتی تیابێت یان ئەرکێکی لەو ئەرکانە لە ئەستۆدابێت کە پەیوەندی بەجەماوەرەوە هەیە، ئاراستە کرا، بەو مەرجەی تانەوتەشەرەکە پەیوەندی هەبێت بەفەرمانی یان کاری ئەو کەسەی کە تانەوتەشەرەکەی لێدراوە، هەروەها ئەنجامدەری تانەوتەشەرەکە ڕاستی و دروستیی ئەو ڕووداوانە بسەلمێنێ کە داویەتییەپاڵ یەکێک لەو کەسانە[607].

٦٠٥- بڕوانە دەقی ماددەی (٤٢)ی یاسای سزادانی عێراقی کە تیایدا هاتووە: «لاجريمة اذا وقع الفعل استعمالا لحق الدفاع الشرعي...».

٦٠٦- بڕوانە دەقی ماددە (٤٣٦)ی یاسای سزادانی عێراقی کە تیایدا هاتووە: «١- لاجريمة فيما يسنده احد الخصوم او من ينوب عنهم الى الاخر شفاها او كتابة من قذف وسب اثناء دفاعه عن حقوقه امام المحاكم وسلطات التحقيق او الهيئات الاخرى وذلك في حدود مايقتضيه هذا الدفاع ٢- ولاعقاب على الشخص اذا كان قد ارتكب القذف او السب وهو في حالة غضب فور وقوع اعتداء ظالم عليه».

٦٠٧- ئەمەش دەقەکەیەتی: «ولايقبل من القاذف اقامة الدليل على ماسنده الا اذا كان القذف موجها الى موظف او مكلف بخدمة عامة او الى شخص ذي صفة نيابية عامة او كان يتولي عملا يتعلق بمصلحة الجمهور وكان ماسنده القاذف متصلا بوظيفة المقذوف او عمله فاذا اقام الدليل علي كل ماسنده انتفت الجريمة».

شایەنی ئاماژەبۆکردنە، تەنها لەو حاڵەتانەی سەرەوە ڕێگا بەتانەوتەشەر نادرێت، بەڵکو ئەوانە بەشێکن لەو حاڵەتانەی کە سەرچاوە گشتییەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ ماددە (٤١)ی یاسای سزادانی عێراقی کە پێشتر ئاماژەمان پێی کرد و دەکرێ گەلێک جیبەجێکردنی دیکەی لێ هەڵێنجێن، لەوانە دەکرێ تانەوتەشەرەکە بەمەبەستی داکۆکیکردنی ڕەوابێت یان بەمەبەستی بەکارهێنانی دەسەڵاتی یاسایی بێت یان بەکارهێنانی حەسانەی پەرلەمانی بێت یان بەمەبەستی بڵاوکردنەوەی ڕووداوەکانی دادگا بێت یان تانووت لێدان بێت لە کردەوەی فەرمانبەران و ئەو کەسانەی کە لە حوکمی ئەودانە، لە هەموویان گرنگتر، دەکرێ بەمەبەستی بڵاوکردنەوەی هەواڵ بێت یان بەمەبەستی ڕەخنەگرتنی بابەتیانە بێت. لەبەر گرنگی مافی بڵاوکردنەوەی هەواڵەکان و مافی ڕەخنەگرتن. لەخوارەوە لە دوو خاڵدا بەدرێژی باسیان دەکەین:

١- مافی بڵاوکردنەوەی هەواڵەکان

یەکێک لە مافە سەرەکییەکانی ڕۆژنامەگەری بڵاوکردنەوەی هەواڵە، ئەم مافە، لە لایەکەوە پەیوەندی بەئازادیی ڕۆژنامەگەرییەوە هەیە و لەلایەکی تریشەوە پەیوەندی بەمافی جەماوەرە هەیە لە ئاگاداربوونی ئەو ڕووداوە گرنگانەی کە لە دەوروبەریدا ڕوودەدەن.

کەواتە، ناکرێ هەواڵی ئەو ڕووداوانە کە ڕۆژانە لە دەوروبەرمان ڕوودەدەن، لە ڕای گشتی بشارینەوە، یان داوا لە جەماوەر بکەین کە هیچ شتێک لەو ڕووداوانە نەزانێ کە لە کۆمەڵگاکەیدا ڕوودەدەن و پەیوەندییان بەئاسایش و سەقامگیرییەوە هەیە[٦٠٨]. بەڵام دەبێ ڕۆژنامەنووس لە بڵاوکردنەوەی هەواڵەکاندا، مافی هەردوولا لەبەرچاو بگرێت. مافی هاوولاتی لە شەرەف و کەرامەتدا کە یاسا گرێنانەی بوونی کردووە، ئەگەر هاتوو تۆمەتبار (متهم) بوو، بەبێ تاوان دادەندرێت تاکو تاوانەکەی لەلایەن دادگاوە دەسەلمێندرێت. هەروەها مافی لە تایبەتمەندێتیدا (حقه في الخصوصية)، واتە نابێ ژیانی تایبەتی ئاشکرا بکرێت.

هەروەها مافی کۆمەڵ لە ئاگادارکردنەوەی جەماوەرەکەی لەو ڕووداوانەی کە لە

---

٦٠٨- د. جمال الدين العطيفي: الأساس القانوني لاباحة القذف في حالة نشر اخبار الجرائم والتحقيقات الجنائية. مجلة القانون والأقتصاد، العدد الثالث. السنة التاسعة والثلاثون، سبتمبر ١٩٦٩ . مطبعة جامعة القاهرة، ل٢.

دەوروبەریدا ڕوودەدەن ■ بەشێوەیەکی باش لە بەڕێوەچوونی دادپەروەری و ئاسایشی دڵنیا بێت کە مافێکی بنەڕەتییە لە کۆمەڵگەی دیموکراتیدا[٦٠٩].

جا ئەو هەواڵانەی کە ڕۆژنامە و گۆڤارەکان بڵاویان دەکەنەوە، بێ گومان ئەگەر هاتوو سروشتێکی ڕەسمییان هەبێت، ڕێگایان پێ دەدرێت، وەک ئاگادارییەک یان ئاگاکارییەکی ڕەسمی یان حوکمێکی دادگا، ئەوا، هەرچەندە تانەوتەشەرئامێز بێت و بێتە مایەی ئازاردانی کەسێکیش، بەتاوان دانانرێ. چونکە، لەلایەکەوە بڵاوکردنەوەی ئەو بابەتانەی کە گونجاون لەگەڵ یاسادا بەتاوان دانانرێت، و لەلایەکی تریشەوە، لەزۆر حاڵەتدا، ڕۆژنامە ناچارە ئەو هەواڵە بڵاوبکاتەوە و ئەم کارەشی، ڕاپەڕاندنی ئەرکێکی یاساییە[٦١٠].

بەهەرحاڵ، بڵاوکردنەوەی هەواڵەکان لە هەر بوارێک بێت، دەبێ هەندێک مەرجی دیاریکراوی تیابێت، تاکو بەماف دابندرێت. ئەم مەرجانەش ئەمانەی خوارەوەن:

1- دەبێ هەواڵەکە ڕاست بێت

ڕاستگۆیی لە بڵاوکردنەوەی هەواڵدا، مەرجە بۆ بەدیهێنانی ئەو بەرژەوەندییە کۆمەڵایەتییەی کە پشتی پێ بەستراوە بۆ ڕێگادان بەبڵاوکردنەوەی هەواڵەکان، چونکە کۆمەڵ هیچ سوودێک لە بڵاوکردنەوەی هەواڵی نادروست وەرناگرێت، بەڵکوو بەرژەوەندییەکەشی بەهۆی ئەوەوە دەکەوێتە هەڕەشەوە. جا ڕاستی و دروستیی هەواڵ وادەخوازێت ئەو ڕووداوەی کە لەخۆی گرتووە، خۆی لە خۆیدا ڕاست بێت، هەروەها لەڕووی دانەپاڵییەوە بەوکەسەی کە دراوەتەپاڵیشی پێویستە ڕاست بێت[٦١١].

جا بۆ ئەوەی ڕۆژنامەنووس لە بڵاوکردنەوەی هەواڵەکان نەکەوێتە هەڵەوە، باشترین شت ئەوەیە، ڕووداوەکان وەکوخۆی بگێڕێتەوە، هەروەکو لەسەر زاری (هوار دکۆسل)دا

---

٦٠٩- د. جمال الدين العطيفي: الأساس القانوني لاباحة القذف في حالة نشر اخبار الجرائم والتحقيقات الجنائية، سەرچاوەی پێشوو، ل٣، هەروەها د. ابراهيم الداقوقي: قانون الأعلام، سەرچاوەی پێشوو، ل٣٤٢.

٦١٠- المستشار معوض عبدالتواب: القزف والسب والبلاغ الكاذب، سەرچاوەی پێشوو، ل١١٩.

٦١١- د. محمود نجيب حسني: شرح قانون العقوبات - القسم الخاص - جرائم الاعتداء على الاشخاص، سەرچاوەی پێشوو، ل٦٢٦، هەروەها المستشار معوض عبدالتواب: القزف والسب والبلاغ الكاذب، سەرچاوەی پێشوو، ل١١٩-١٢٠.

هاتووه، هەروەها پێرەوی ئەو پرنسیپە بکات کە دەڵێ: «هەر کاتێک گومانت لە شتێک پەیداکرد وازی لێ بێنە»[٦١٢].

هەر لەم رووەوە (لویس د. بۆماردی) سەرنووسەری ئەستۆشیدپرێس دەڵێ: «ئەگەر هاتوو یەکێک لەو بابەتانەی کە نیازمان وایە بڵاوی بکەینەوە ئەگەری ئەوەی لێ کرا کە دەبێتە مایەی تانەوتەشەر، دەبێ خۆمان ئامادە بکەین بۆ وەڵامدانەوەی هەندێک پرسیار، کە بەدەستەواژەی «ئەگەر هاتوو» دەست پێدەکات، لەوانە، ئەگەر هاتوو داوایەکمان لە دژ بەرزکرایەوە، ئایا دەتوانین پشت بەو سەرچاوانە ببەستین کە زانیارییەکانمان لێی وەرگرتووە؟»[٦١٣].

II- دەبێ هەواڵەکە سروشتێکی کۆمەڵایەتی هەبێت

بوونی سروشتێکی کۆمەڵایەتی گرنگە بۆ ئەو هەواڵەی کە لە رۆژنامەدا بڵاودەکرێتەوە، چونکە ئەو سروشتە کۆمەڵایەتییە مەرجە بۆ ئەوەی بڵاوکردنەوەی هەواڵەکە لە بەرژەوەندیی کۆمەڵدا بێت، بۆیە ئەو کەسەی کە رووداوێک بڵاودەکاتەوە کە دەستدرێژی بۆسەر ژیانی تایبەتیی کەسێک تیایە و لە بەرژەوەندی کۆمەڵدا نییە، ناتوانێ کەڵک لە رێگاپێدانی یاسایی وەربگرێت بۆ رزگاربوون لەو تاوانە تانەوتەشەرەی کە لە ناکامی بڵاوکردنەوەی ئەو هەواڵە روودەدات.

V- دەبێ نمایشکردنی هەواڵەکە بابەتییانە بێت

پێویستە رۆژنامەنووس لە بڵاوکردنەوەی هەواڵدا بابەتییانەبێت و قەوارەیەکی لەخۆی گەورەتری پێ نەبەخشێت و موبالەغەی تێدا نەکات و خوێنەر چەواشە نەکات بەلێکدانەوەی رووداوەکان، بەجۆرێک دووربێ لە دەستپاکی یان بڵاوکردنەوەی نادڵنیایی لێیان.

VIII- دەبێ بڵاوکردنەوەی هەواڵەکە بەنیازی پاک بێت

مەبەستمان لەمە ئەوەیە، دەبێ رۆژنامەنووس لە بڵاوکردنەوەی هەواڵەکاندا ئامانجی بەدیهێنانی بەرژەوەندیی کۆمەڵ بێت نەک تۆڵەسەندنەوە و تانەوتەشەردان لە خەڵکی.

٦١٢- د. سليمان جازع الشمري، الصحافة والقانون، منشورات الدار الدولية للنشر والتوزيع، القاهرة، مصر، بلاسنة النشر، ل١٢٤.

٦١٣- د. سليمان جازع الشمري: الصحافة والقانون، سەرچاوەی پێشوو، ل١٢٥.

شایەنی ئامـاژەبۆكـردنە، هەندێجـار، ڕۆژنامـەنووس لە بڵاوكـردنەوەی هەواڵەكـاندا دەكەوێتە هەڵەوە، جا ئایا تا چ ڕادەیەک دەتوانێ سـوود لەمە وەربگرێت بۆ ڕزگاربوون لە بەرپرسیارییەتی یاساییدا؟!

بێ گـومـان ئەگـەر هاتوو لەو باوەڕەدا بوو بێت كـە ئەو هەواڵە ڕاسـتـە و بەمەبەسـتی خزمەتكردنی بەرژەوەندیی گـشـتی بڵاوی كـردبێـتـەوە، ئەوا دەتوانێ سـوود لەو هەڵەیە وەربگرێت بۆ ڕزگـاربوون لە بەرپرسـیـاریـەتی یاسـایی ئەگـەر هاتوو لە وەرگـرتنی ئەو هەواڵەدا پشتی بەبەدواگەڕانی ئاسـایی (التحري المعتاد) هەر كـەسـێک كە لەشوێنی ئەودابێت بەسـتـبێت، هەروەها ئەگەر هاتوو هەواڵەكە هیچ بایەخێكی كۆمەڵایەتی نەبوو بێت، بەڵام ڕۆژنامەنووسەكە لەو باوەڕەدابووبێت كە بایەخی كۆمەڵایەتی هەیە[٦١٤].

دادگای «عابدین»ی تاوانكاریی میسری لە حوكمێكیدا دەڵێ: «لە بڵاوكردنەوەی ئەو ڕووداوانەی كـە دەرهەق بەهاووڵاتـیـیـان بەتانەوتەشـەر دادەنرێن و ڕۆژنامـەنووس بڵاویكردوونەتەوە، هەركـاتێک بـسـەلمێندرێت، ڕۆژنامەنووسـەكە لەو باوەڕەدابووە كە ئەو ڕووداوانە ڕاسـتن. هەروەها لە بڵاوكردنەوەیاندا مەبەستی خزمەتكردنی گشتی بووە، هیچ پاساوێک بۆ تۆمەتباركردنی نابێ، چونكە مەبەستی تاوانكاریی نەبووە»[٦١٥].

## ٢- مافی ڕەخنەگرتن

مـافی ڕەخنەگـرتن شـێـوەیەكـە لە شـێـوەكـانی ئازادیی بیروڕادەربڕین، كـە دەوڵـەت بەهاووڵاتـیـیـان دەدات تا لەڕێگای گـوزارشـتكردن لە بیروڕاكـانـیـانەوە بەشـێـوەیەكی ناڕاسـتەوخۆ بەشداری بكەن لە چارەسـەركردنی ئەو كێشـانەی كە ڕووبەڕووی كۆمەڵ دەبنەوە و دەبنە ئاسـتەنگ لەبەردەمیدا، ئەویش بەدەسـتنیشـانكردنی لایەنە نێگەتیڤەكانی ئەو كاروبارانە دەبێت كە مایەی بایەخپێدانی كۆمەڵن بۆ دۆزینەوەی ڕێگاچارەیان، هەروەها بۆ ئەوەی جارێكی تر لە داهاتوودا ڕوونەدەنەوە.

هەروەها ڕەخنەگرتن مافێكە لەو مافانەی كە یاسا دانی پێداناوە لەمیانی كەفالەتكردنی ئازادیی بیـروڕادەربڕین و كـەفـالەتكردنی تۆژینـەوەی زانسـتـی و داهێناندا، چونكە

---

٦١٤- د. محمود نجيب حسني: شرح قانون العقوبات -القسم الخاص- جرائم الاعتداء على الاشخاص، سەرچاوەی پێشوو، ل٦٢٦.

٦١٥- جزائية عابدين ١٣ دیسمبر ١٩٠٥ (الحقوق ٢١ص ٤٤ بروانە (احمد امين) شرح قانون العقوبات -القسم الخاص-، سەرچاوەی پێشوو، ل٥٣٥.

ڕەخنەگرتن بنچینەی تۆژینەوە و داهێنانە، جا ڕەخنەگرتن لە دانانی بەماف پشت بەگرنگێتیی ئەو بەرژەوەندییە دەبەستێ کە بۆ کۆمەڵ دەیهێنێتە دی[٦١٦]. دەستووری عێراقی ساڵی ١٩٧٠ لە ماددەی (٢٦) و (٢٧)دا بەشێوەیەکی زمنی دانی پێدانراوە. لە ماددەی (٢٦)دا دەقنووسی کردووە و دەڵێ: «دەستوور کەفالەتی ئازادیی بیروڕا دەکات...»، هەروەها لە بڕگە (ج)ی ماددەی (٢٧)دا دەڵێ: «دەوڵەت کەفالەتی ئازادیی تۆژینەوەی زانستی دەکات و لە گشت چالاکییە هزری و زانستییەکاندا داهێنان و سەرکەوتن پاداشت و هان دەدات»[٦١٧].

هەروەکو لەسەرەوە ئاماژەمان پێی کرد، بۆیە ڕەخنەگرتن بەماف داندراوە تاکو لە ڕێگای ئەوەوە خزمەتی بەرژەوەندیی گشتی بکەین. لە بەدیهێنانی ئەم ئامانجەش، بەرژەوەندیی تاکەکەس وادەخوازێت ناو و ناوبانگ و شەرەف و کەرامەتی پارێزراوبێت، هەروەکو چۆن دارایی و لەشیان پارێزراوە.

جا یاسای سزادان لە ڕێگای یاساغکردنی تانەوتەشەردا ناو و ناوبانگ و شەرەف و کەرامەتی تاکەکەس دەپارێزێت. جا لەبەرئەوەی ڕەخنەگرتن لە کردەوە و بیروڕای کەسانی تر، ڕەخنەگرتنە لە خودی کەسانی خاوەنی ئەو کردەوە و بیروڕایانە، بۆیە، ئەمە خۆی لە خۆیدا دەستدرێژیکردنە بۆسەر ناو و ناوبانگ و ئیعتباریان، وێڕای ئەوەی هەر خۆی ڕەخنە تانەوتەشەر پێکدەهێنێ[٦١٨].

بەڵام سەرەڕای ئەوەش، بەرژەوەندیی کۆمەڵ وادەخوازێت کە دان بەئازادیی بیروڕادەربڕین دابنرێت بەمەبەستی بەدیهێنانی بەرژەوەندیی گشتی و پێشخستنی کۆمەڵ لە ڕێگای تۆژینەوە و داهێنانداکە لە ڕێگای ڕەخنەگرتنی بنیاتنەر و بابەتییانەوە دێتەدی. لەم حاڵەتەشدا، دەبێ پابەندی دوو بنچینە بین، یەکەمیان بەدیهێنانی بەرژەوەندیی

---

٦١٦- د. محمود نجيب حسني: شرح قانون العقوبات -القسم الخاص- جرائم الاعتداء على الاشخاص، سەرچاوەی پێشوو، ل٦٢٦-٦٣٧.

٦١٧- دەستووری میسری ساڵی ١٩٧١ لە ماددەی (٤٧)دا بەراشکاوییەوە دانی بەمافی ڕەخنەگرتن ناوەو دەڵێ: «النقد الذاتي والنقد البناء ضمان لسلامة البناء الوطني» هەروەها لە ماددەی (٤٩)دا جارێکی تر بەشێوەیەکی زمنی جەختی لەسەرکردۆتەوە و دەڵێ: «تكفل الدولة للمواطنين حرية البحث العلمي والابداع الادبي والفني والثقافي».

٦١٨- د. عبدالحميد الشواربي: جرائم الصحافة والنشر، سەرچاوەی پێشوو، ل٩١.

تاکەکەسە، هی دووەمیشیان بەدیهێنانی بەرژەوەندیی کۆمەڵە. جا لەبەرئەوەی بەرژەوەندیی کۆمەڵ لەپێشترە، بۆیە دەیخەینە پێش بەرژەوەندیی تاکەکەسەوە[٦١٩].

یاسای سزادانی عێراقی ساڵی ١٩٦٩ لە ماددەی (٤١)دا بۆ ڕێگادان بەرەخنەی تانەوتەشەرئامێز، پرنسیپێکی گشتی داناوە و دەڵێ: «ئەگەر هاتوو کردەوەکە لە ئاکامی بەکارهێنانی مافێک کە یاسا دایپێدانابێت ڕوویدات بەتاوان دانانرێت»[٦٢٠].

دادگای پیاچوونەوەی میسری لە حوکمێکیدا پێناسەی ڕەخنەی ڕەوا (ڕێگاپێدراو)ی کردووە و دەڵێ: «ڕەخنەی ڕێگاپێدراو بریتییە لە دەربڕینی بیروڕا لەبارەی فەرمانێک یان کارێکەوە بەبێ ئەوەی بەمەبەستی ناو و ناوبانگ زڕاندن و دەستدرێژی بۆ سەر خاوەنی ئەو فەرمانە یان ئەو کارەی تیابێت. ئەگەر هاتوو ڕەخنەکە ئەو سنوورەی بەزاند دەبێ خاوەنەکەی سزابدرێت چونکە، تاوانی تانەوتەشەری ئەنجام داوە»[٦٢١].

لەم پێناسەیەی سەرەوەدا بۆمان دەردەکەوێ، دەبێ ئەم مەرجانەی خوارەوە لە ڕەخنەدا هەبێ تاکو بەڕەخنەی ڕەوا دابنرێت:

أ- دەبێ ئەو ڕووداوەی ڕەخنەی لێگیراوە، ڕووداوێکی ڕاستەقینەبێت، یانیش ڕەخنەگر وابزانێت ڕووداوێکی ڕاستەقینەیە،

واتە نابێ ڕووداوەکە بەدرۆ هەڵبەسترابێت یان شێواو بێت، هەروەها دەبێ ڕەخنەگر ڕەخنەکەی ئاراستەی ڕووداوەکە بکات نەک خاوەنی ڕووداوەکە تەنها لەو حاڵەتەدا نەبێت ئەگەر هاتوو سروشتی ڕووداوەکە وابخوازێت. بەڵام ئەگەر هاتوو هەندێ ڕووداوی لەخۆیەوە هەڵبەست یان هەندێ ڕووداوی ڕاستەقینەی شێواند یان ڕووداوەکانی بەجۆرێکی وا لێکداوە کە دووربێت لە دەسپاکی و بووە مایەی چەواشەکردنی خوێنەر و دووربێت لە بابەتییانە و بێلایەنی، یان ڕای گشتی چەواشە بکات، دەکەوێتە بەر لێپرسینەوەی یاساییەوە[٦٢٢].

---

٦١٩- د. عبدالحميد الشواربي: جرائم الصحافة والنشر، سەرچاوەی پێشوو، ل٩١.

٦٢٠- جێی سەرنجە، یاسای سزادانی میسری لە ماددەی (٦٠)دا هەمان پرنسیپی بۆ ڕێگادانی ڕەخنەی تانەوتەشەرئامێز داناوە و دەڵێ: «لاتسري احكام قانون العقوبات على كل فعل ارتكب بنية سليمة عملا بحق مقرر بمقتضى الشريعة».

٦٢١- (محكمة النقض المصرية، جلسة ١٩٣٨/١/١٠ رقم ٢٤٨ سنة ٨ ق) بڕوانە (د. عبدالحميد الشواربي) جريمة القذف والسب في ضوء القضاء والفقه، سەرچاوەی پێشوو، ل١٥٨.

٦٢٢- المستشار معوض عبدالتواب: القذف والسب والبلاغ الكاذب، سەرچاوەی پێشوو، ل١٢٢.

شایەنی ئاماژەبۆکردنە، ئەو دەستەواژانەی کە ڕەخنەگر بلاویان دەکاتەوە هی خۆی بێت یان هی کەسانی تر بێت، وەکویەکە، چونکە دووبارە بلاوکردنەوەی نووسینێک کە تاوانی لەخۆگرتبێت، وەکو بلاوکردنەوەیەکی سەرلەنوێیە، بۆیە هیچ کەسێک بۆی نییە بۆ خۆدزینەوە لە بەرپرسیاریەتی یاسایی پاساو بەوە بهێنێتەوە گوایە ئەو دەستەواژانەی کە لەناو نووسینەکەدا هاتوون، پێشتر لە ڕۆژنامەیەکی تردا بلاوکراوەتەوە. چونکە ئەو کەسەی نووسینێک لە ڕۆژنامەیەک وەردەگرێت و دووبارە بلاویدەکاتەوە، پێویستە بەر لەوەی دووبارە بلاویبکاتەوە یان ڕەخنەی لێ بگرێت، لێی بکۆڵێتەوە ئایا ئەو نووسینە بوونی هەیە یان نا؟ هەروەها ئایا دەسکاری کراوە یان نا؟[623].

هەروەها لەوانەیە ئەو ڕووداوەی ڕەخنەی لێگیراوە، ڕووداوێکی ڕاستەقینە نەبێت، بەڵام ئەگەر هاتوو ڕەخنەگر ئەوەی سەلماند کە لەو باوەڕەدابووە کە ڕووداوێکی ڕاستەقینەیە و نەیزانیوە بەدرۆ هەڵبەستراوە، دەکرێ لەسەر بنەمای «نیازپاکی» بەبێ تاوان دابندرێت[624].

II- دەبێ ڕووداوەکە بایەخێکی کۆمەڵایەتی هەبێت

بۆ مافی ڕەخنەگرتن وەک مافێکی یاسایی ئەوەندە بەس نییە ڕەخنەکە ئاراستەی ڕووداوێکی ڕاستەقینە کرابێت، بەڵکو دەبێ ئەو ڕووداوە بایەخێکی کۆمەڵایەتی هەبێت، ئەمە مەرجێکە لە مەرجەکانی ڕەخنەی بنیاتنەر، بەڵام ئەگەر هاتوو ڕووداوەکە بایەخە کۆمەڵایەتییەکەی لەدەستدا، ئەوکاتە هیچ پاساوێک بۆ ڕەخنەلێگرتنی نامێنێ، چونکە ڕەخنە ئەرمانێکی کۆمەڵایەتی هەیە، ئامرازێک نییە بۆ تانەوتەشەردان لە خەڵکی[625].

کەواتە، ڕەخنەی بنیاتنەر، ئەو ڕەخنەیەیە کە ئاراستەی ئەو ڕووداوانە دەکرێ کە جەماوەر بایەخیان پێ دەدات، بەڵام ئەگەر هاتوو، ڕووداوەکە ئەو بایەخەی نەبوو، ئەوکاتە ڕەخنەکەش ئەم سیفەتە لەدەست دەدات. جا ناکرێ لەپەنای ڕەخنەوە دەستدرێژی بکرێتە

---

٦٢٣- محكمة النقض المصرية، الطعن رقم ١٠٢٧ لسنة ٣٠ ق جلسة ١٩٦٠/١٢/٢٠ س١١ ص٩٢٩ بڕوانە: (المستشار معوض عبدالتواب) القذف والسب والبلاغ الكاذب، سەرچاوەی پێشوو، ل١٣٣.

٦٢٤- د. عبدالحميد الشواربي: جرائم الصحافة والنشر، سەرچاوەی پێشوو، ل٩٣.

٦٢٥- طارق احمد فتحي سرور: الحماية الجنائية لأسرار الأفراد في مواجهة النشر، منشورات دار النهضة العربية، القاهرة، ١٩٩١، ل١٦١.

سەر ژیانی تایبەتیی خەڵکی مەگەر پەیوەندی هەبێت بەکاروباری ژیانی گشتییەوە، لەم حاڵەتەشدا نابێ ڕەخنەکە لەم سنوورە بچێتە دەرەوە[٦٢٦].

شایەنی باسە، کۆمەڵ هیچ سوودێک لەوە وەرناگرێت، ڕەخنەگر خۆی لە قەرەی ژیانی تایبەتیی کەسێک بدات، بەڵکوو بەپێچەوانەوە نیگەران دەبێ، چونکە ڕەوشتی کۆمەڵایەتی ڕێگانادات دەستدرێژی بکرێتە سەر ژیانی تایبەتیی کەسێک و خەڵکی لێ ئاگادار بکرێتەوە و بیروڕای لەسەر ئاڵوگۆڕ بکرێت[٦٢٧].

بێ گومان، هەر ڕووداوێک پەیوەندی بەبەرژەوەندیی گشتییەوە هەبێت، جێگای بایەخی کۆمەڵ دەبێت و دەکرێ ڕەخنەی لێ بگیرێت، لەم ڕووەوە دادگای پیاچوونەوەی میسری لە بڕیارێکیدا دەڵێ:

«ڕەخنەی ڕێگاپێدراو بریتییە لە دەربڕینی بیروڕا لەبارەی فەرمانێکەوە یان کارێکەوە بەبێ ئەوەی دەستدرێژی بکرێتە سەر خاوەنی ئەو فەرمانە یان ئەو کارە بەمەبەستی ناوزڕاندنی. دادگا لە حوکمەکەیدا ئەمەی لەبەرچاوی خۆی نەگرتووە. چونکە ڕەخنەکە ئاڕاستەی ڕووداوێکی گشتی کراوە کە بریتییە لە سیاسەتی داودەرمانی پزیشکی لە وڵاتدا. کە ئەمەش کێشەیەکی گشتییە و جێگای بایەخی جەماوەرە. جا لەبەرئەوەی دەستەواژەی وتارەکە لەگەڵ بارودۆخی ئێستا دەگونجێت و مەبەستیشی بەرژەوەندیی گشتییە و ڕەخنەگر مەبەستی نەبووە تانەوتەشەر لە کەسێکی دیاریکراو بدات، بۆیە ئەمە بەڕەخنەی ڕێگاپێدراو دادەندرێت، چونکە پەیوەندی هەیە بەئازادیی بیروڕا و یاسا کەفالەتی کردووە»[٦٢٨].

٧- بەکارهێنانی دەستەواژەی گونجاو

ڕەخنەی بنیاتنەر و بابەتییانە ئەو ڕەخنەیەیە کە ڕەخنەگر تیایدا بۆ پێکانی ئامانجەکەی دەستەواژەی گونجاو بەکاردەهێنێت و بەپێی تواناش لە دەستەواژەی توندوتیژ دوور بکەوێتەوە و لەپەنای ڕەخنەوە هەستی کەس بریندار نەکات و تیر وتوانجیان تێنەگرێت.

جا پێوەری دەستەواژەی گونجاو بریتییە لە پێویستێتی ئەم دەستەواژەیە بۆ

---

٦٢٦- طارق احمد فتحي سرور: الحماية الجنائية لأسرار الأفراد في مواجهة النشر، سەرچاوەی پێشوو، ل١٦١.

٦٢٧- المستشار معوض عبدالتواب: القذف والسب والبلاغ الكاذب، سەرچاوەی پێشوو، ل١٢٤.

گوزارشتکردن له بیروڕای نووسەرەکەی بۆ هێنانەدی ئەو واتایەی کە لە نووسینەکەیدا مەبەستییەتی[929].

جێی سەرنجە، «گونجاویتیی دەستەواژە» مەسەلەیەکی ڕێژەییە و بەستراوەتەوە بەجۆر و بارودۆخی ئەو ڕووداوەی کە ڕەخنەکەی ئاراستە دەکرێت و بەپێی ئەو بارودۆخە گونجاویتی نێوان دەستەواژە و ئەو بیروڕایەی کە تەعلیقی لێدەدرێ هەڵدەسەنگێندرێت[930].

دادگای فەرەنسی لەساڵی ۱۹۹۳ ئەو ڕۆژنامەنووسانەی لە تاوانی تانەوتەشەری بەئاشکرا بەخشی بۆ ئەو تانەوتەشەرانەی کە داهوویانە پاڵ سیاسەتمەدارێک گوایە: «مرۆڤێکی هەڵپەرستە و بەپێی بارودۆخ بەرگی خۆی دەگۆڕێت و لەگەڵ خودی خۆی دژوارە و هیچ نرخێک بۆ باوەڕە ڕاستەقینەکەی خۆی دانانێت» دادگای ناوبراو دووپاتی کردۆتەوە کە ئەو دەستەواژانەی کە لەم وتارەدا بەکارهاتوونە، سنووری مافی ڕۆژنامەنووسییان لە ڕەخنەگرتنی ڕەفتاری گشتی و بەرنامەی سیاسەتمەدار بەتایبەتی لە کاتی هەڵبژاردندا نەبەزاندووە[931].

VIII- دەبێ ڕەخنەگر نیازی پاک بێت

بۆ ئەوەی، ڕەخنە، ڕەخنەیەکی ڕەوابێت و ڕێگای پێبدرێت، دەبێ ڕەخنەگر لە ڕەخنەکەیدا نیازی پاک بێت، ئەمەش بەبوونی ئەم دوو مەرجانەی خوارەوە دێتەدی:

۱- دەبێ ڕەخنەگر لە ڕەخنەکەیدا ئامانجی خزمەتکردنی بەرژەوەندیی گشتی بێت

لەڕێگای ئەم مەرجەوە ئەو مەبەستە دێتەدی کە لە پێناویدا دان بەمافی ڕەخنەگرتن نراوە کە بریتییە لە خزمەتکردنی بەرژەوەندیی گشتی لەڕێگای گوزارشتکردن لە بیروڕایەکی بنیاتنەر، کە سوودی بۆ کۆمەڵ هەبێت، جا چ بۆ کاری چاک ئامۆژگاری بکرێت یانیش بۆ دوورکەوتنەوە لەکاری خراپ وریا بکرێتەوە[932].

---

۶۲۸- المستشار معوض عبدالتواب: القذف والسب والبلاغ الكاذب، سەرچاوەی پێشوو، ل۱۳٤.

۶۲۹- طارق احمد فتحي سرور: الحماية الجنائية لأسرار الأفراد في مواجهة النشر، سەرچاوەی پێشوو، ل۱۹٥.

۶۳۰- لطيفة حميد محمد: جرائم النشر في التشريع العراقي، سەرچاوەی پێشوو، ل۱٤٥.

۶۳۱- لطيفة حميد محمد: جرائم النشر في التشريع العراقي، سەرچاوەی پێشوو، ل۱٤٥.

۶۳۲- طارق احمد فتحي سرور: الحماية الجنائية لأسرار الأفراد في مواجهة النشر، سەرچاوەی پێشوو، ل۱٦۷.

٢- دەبێ ڕەخنەگر لە ڕەخنەکەیدا باوەڕی بەڕاستیی ئەو ڕەخنەیە هەبێت کە گرتوویەتی

واتە دەبێ ڕەخنەگر لە ناخەوە باوەڕی بەڕاستی و دروستیی ئەو ڕایە هەبێت کە دەریدەبڕێت، هەڵبەتە ئەمەش لەو دەستەواژانەدا دەردەکەون کە ڕەخنەگر بەکاری هێناون، هەروەها لەو ئامانجەشدا بەدەردەکەوێ کە ڕەخنەگر مەبەستی بووە.

لە بنەڕەتدا گریمانە دەکرێ کە ڕەخنەگر ڕاستگۆیە و نیازیشی پاکە لە ڕەخنەکەیدا، بەڵام ئەگەر هاتوو ئەو دەستەواژانەی کە بەکاری هێنابوون، دەستەواژەی توندوتیژ بوون یان بابەتی نەبوون یانیش ڕەخنەگر خۆی لەو باوەڕەدابووە کە ئەو بیروڕایەی دەریدەبڕێت ڕاست نییە، ئەوە مانای ئەوەیە ڕەخنەگر نیازخراپ بووە لە ڕەخنەکەیدا. لەم حاڵەتەشدا، ئەرکی سەلماندنی نیازخراپییەکەی دەکەوێتە ئەستۆی ئەو کەسەی کە تۆمەتباری دەکات[٦٣٣].

گرنگترین گەرینە (قرینة) بۆ سەلماندنی نیاز خراپیی ڕەخنەگر، توندوتیژی ئەو دەستەواژانەیە کە لە ڕەخنەکەدا بەکارهاتوون بێ ئەوەی پێویست بێت، بەتایبەتی نەگونجانیان لەگەڵ ئامانجی ڕەخنەکە، هەرچەندە مەرجیش نییە تەنها لە ڕێگای ئەو دەستەواژانەی کە لە وتارەکەدا بەکارهاتوون، نیازخراپیی ڕەخنەگرمان بۆ دەربکەوێ، بەڵکوو دەکرێ بەهەر ڕێگایەکی تر بگەینە ئەم مەبەستە، لەوانە هەوڵدانی ڕەخنەگر بۆ وەدەستهێنانی سوودێک یان دارایییەک بەرامبەر ڕاگرتنی هەڵمەتی ڕەخنەگرتنەکە یان بوونی ناکۆکی لەنێوان ڕەخنەگر و ئەو کەسەی ڕەخنەکەی ئاراستە کراوە[٦٣٤].

شایەنی ئاماژەبۆکردنە، نیازپاکی هۆیەکی گشتییە لە هۆیەکانی ڕێگادان بەهەموو تاوانێک لەوانە تاوانی ئابڕووتکاندن، ئەگەر هاتوو ئەنجامدەر نیازی پاک بووبێت یان لەو باوەڕە دابووبێت ئەو کردارەی کە ئەنجامی دەدات ڕەوایە، هەروەها بۆ ئەم مەبەستە پشتی بەهەندێک پاساوی ماقوڵ بەستبێت[٦٣٥].

---

٦٣٣- د. محمود نجیب حسني: شرح قانون العقوبات - القسم الخاص - جرائم الاعتداء على الاشخاص، سەرچاوەی پێشوو، ل٦٤٥.

٦٣٤- د. محمود نجیب حسني: شرح قانون العقوبات - القسم الخاص - جرائم الاعتداء على الاشخاص، سەرچاوەی پێشوو، ل٦٤٠، هەروەها طارق احمد فتحي سرور: الحماية الجنائية لأسرار الأفراد في مواجهة النشر، سەرچاوەی پێشوو، ل١٦٩.

٦٣٥- د. عبدالحميد الشواربي: جرائم الصحافة والنشر، سەرچاوەی پێشوو، ل٩٧.

### ٥-٢-٢ بەرپرسیارێتیی تاوانکاری[٦٣٦]

چەمکی بەرپرسیارێتیی تاوانکاری بەشێوەیەکی گشتی بریتییە لە پابەندبوونی کەسێک بە لە ئەستۆگرتنی ئاکامەکانی ئەو کارانەی کە دەیانکات و یاسا بەتاوانی

---

٦٣٦- ڕۆژنامەنووس و دەزگای ڕۆژنامەوانی، بێ لە بەرپرسێتیی تاوانکاری ڕووبەڕووی بەرپرسێتیی مەدەنی و پیشەییش دەبنەوە. بەم پێیە، ئەو ڕۆژنامەنووسەی سەرپێچیی حوکمەکانی یاسا دەکات، ئەگەر هاتوو لە ئاکامی هەڵە تاوانکارییەکەی زیانی بەکەسێک گەیاند، ڕووبەڕووی بەرپرسیارێتییەکی شارستانی دەبێتەوە و دەبێ قەرەبووی زیان لێکەوتوو بکاتەوە بۆ ئەو زیانە ئەدەبی و ماددییانەی کە لێیداوە. لەم ڕووەوە یاسای مەدەنیی عێراقی ژمارە (٤٠)ی ساڵی ١٩٥١ لە ماددەی (٢٠٥)دا دەقنووسی کردووە و دەڵێ: «مافی قەرەبووکردنەوە، زیانی ئەدەبییش دەگرێتەوە، هەر دەستدرێژییەک بۆسەر ئازادی یان شەرەف یان ناموس یان ناوبانگ یان پلەی کۆمەڵایەتی یان ئیعتیباری دارایی کەسان وادەکا کە دەستدرێژیکەر بەرپرس بێت لە قەرەبووکردنەوە...» هەروەها لە ماددەی (٢٠٤)دا دەقنووسی کردووە: «هەر دەستدرێژییەک بۆ سەر خەڵکی کە ببێتە مایەی هەر زیانێکی تر بێ لەو زیانانەی لە ماددەکانی تردا ئاماژەیان پێکراوە دەبێ قەرەبووبکرێتەوە» دەبێ هەرسێ پایەکانی بەرپرسیارییەتی کەمتەرخەمی (اركان المسؤولية التقصيرية) (هەڵە، زیان، پەیوەندی هۆکاری) ئامادەبن بۆ حوکمدانی قەرەبووکردنەوە بەپێی ئەم دوو ماددەیە، بۆ زانیاری زیاتر لەم ڕووەوە بەگشتی و لەبارەی بنچینەی ئەم بەرپرسیارییەتییە بەتایبەتی بڕوانە (جبار صابر طه): اقامة المسؤولية المدنية عن العمل غير المشروع على عنصر الضرر، منشورات جامعة صلاح الدين، اربيل، ١٩٨٤، ل٢٩٥ بەدواوە.

هەروەها، یاسای چاپەمەنیی عێراقی ژمارە (٢٠٦)ی ساڵی ١٩٦٨ی هەمووارکراو لە بڕگەی (١)ی ماددەی (٢٩)دا ئەو کەسانەی دەستنیشان کردووە کە دەبێ قەرەبووی زیان لێکەوتوو بکەنەوە، ئەمەش دەڵەکەیەتی: «١- خاوەنی چاپکراوی دەوری و سەرنووسەر و وتارنووس لێپرسراو دەبن لەو تاوانانەی لەم یاسایەدا هاتوون و دەبێ پێکەوە ئەو قەرەبووەی دادگا بەسەریاندا دەیسەپێنێ بیدەن».
هەروەها لە بڕگەی (١)ی ماددەی (٣٠)دا ئەو ماوەیەی دیارکردووە کە دەبێ زیان لێکەوتوو تیایدا داوای قەرەبووکردنەوەی زیانەکانی بکات، بەپێچەوانەوە مافی داواکردنی دەسووتێ، ئەمەش دەڵەکەیەتی: «سەبارەت بەو تاوانانەی کە لەم یاسایەدا دەقنووس کراون، دوای تێپەڕبوونی سێ مانگ لە ڕۆژی بڵاوبوونەوەوە نابێت نە داوا بەرزبکرێتەوە، نە داوای قەرەبووکردنەوە بکرێتەوە».
شایەنی ئاماژەبۆکردنە، یاسای چاپەمەنیی هەرێمی کوردستان ژمارە (١٠)ی ساڵی ١٩٩٣ی هەمووارکراو لە ماددەی (١٠)دا ئەو کەسانەی دیارکردووە کە بەرپرسیارییەتی یاساییان دەکەوێتە ئەستۆ، بەم شێوەیە: «خاوەنی ئیمتیاز یان سەرنووسەر و وتارنووس لە چاپکراوی دەوریدا و پێشکەشکەری چاپکراوی نادەوری، لە حاڵەتی سەرپێچیکردنی حوکمەکانی ئەم یاسایەدا. بەپێی =

داناون. جا بۆ ئەوەی کەسێک بەرپرسیارێتییەکی تاوانکاریی تاوانبار بێت، دەبێ وشیار

= یاسا ڕەچاوکراوەکان دەکەونە بەر لێپرسینەوەی یاساییەوە.

ئەمە و لە بڕگەی دووەمی ماددەی (٦١)دا ماوەی بەسەرچوونی ئەو داوایانەی دیار کردووە، ئەمەش دەقەکەیەتی: «ئەو داوایانەی لە بڕگەی یەکەمی ئەم ماددەیەدا هاتوونە، دوای تێپەڕبوونی شەش مانگ بەسەر بڵاوبوونەوەیان لە چاپکراوی دەوریدا یان دەستکردن بەدابەشکردنی لە چاپکراوی نادەوریدا لەلایەن دادگاکانەوە نابیسترێن».

ئەمە و دادگا بەگوێرەی بڕی ئەو زیانانەی لە زیان لێکەوتوو کەوتووە و ئەو دەستکەوتانەی بەهۆی کارە نارەواکەوە لە دەستی چووە قەرەبووەکە دەخەمڵێنێ هەروەکو لە ماددەی (٢٠٧)ی یاسای مەدەنیی عێراقیدا هاتووە کە ئەمەش دەقەکەیەتی: «دادگا لە هەموو حاڵەتێکدا بەگوێرەی بڕی ئەو زیانانەی لە زیانلێکەوتوو کەوتووە و ئەو دەستکەوتانەی لەدەستی چووە بەمەرجێک ئەنجامێکی سروشتی کارە نارەوایەکە بێت، قەرەبووەکە دەخەمڵێنێ». لەبارەی چۆنێتی خەمڵاندنی قەرەبوو بڕوانە (د. سعدون العامري): تعويض الضرر في المسؤولية التقصيرية، منشورات مركز البحوث القانونية التابعة لوزارة العدل، بغداد، ١٩٨١، ل١٤٣ بەدواوە، هەروەها د. محمد ابراهيم الدسوقي: تقدير التعويض بين الخطأ والضرر، منشورات مؤسسة الثقافة الجامعية، الاسكندرية، بلا سنة الطبع، ل٨٥ بەدواوە.

هەروەها ڕۆژنامەنووس ڕووبەڕووی بەرپرسیارێتییەکی پیشەیی دەبێتەوە، ئەگەر هاتوو سەرپێچی حوکمەکانی یاسای سەندیکا و ئەو بنەما گشتییانە بکات کە ئەخلاقی پیشەی ڕۆژنامەگەرییان ڕێکخستووە.

سەندیکای ڕۆژنامەنووسان لە ڕێگای (لیژنەی ڕێککاری - لجنة الانضباط)ەوە لەو سەرپێچییانە دەکۆڵێتەوە کە لەلایەن ڕۆژنامەنووسەوە ڕوویان داوە.

دوای ساغ بوونەوەی ئەو سەرپێچییانە، لەبەر ڕۆشنایی ئەو ڕاسپاردەیەی کە لەلایەن لیژنەی ڕێککارییەوە بۆ ئەنجومەنی سەندیکا بەرز دەکرێتەوە، یەکێک لەم سزایانەی خوارەوە ئاراستەی ڕۆژنامەنووسی سەرپێچیکەر دەکات:

١- ووریاکردنەوە (التنبيه): بەنووسراوێک ئاراستەی ڕۆژنامەنووس دەکرێ و سەرنجی بۆ ئەوە ڕادەکێشرێ کە لێی ڕوویداوە و داوای لێ دەکرێ کە لە داهاتوودا ڕوونەداتەوە.

٢- ئاگادارکردنەوە (الانذار): لە کاتی دووبارەکردنەوەی ئەو سەرپێچییانەی کە لە بڕگەی سەرەوە دیارکراون لە لایەن ڕۆژنامەنووسەوە، ئاگادار دەکرێتەوە کە جارێکی تر دووبارەی نەکاتەوە.

٣- نەهێشتنی ئەندامانی پیشەکەی بۆ ماوەیەک کە [illegible] ساڵێک تێنەپەڕێ.

٤- دەرکردنی کاتیی: ناوی لە تۆماری گشتی دەسڕێتەوە و تا دوو ساڵی بەسەردا تێنەپەڕێ، نابێ جارێکی دیکە ناوی تۆمار بکرێتەوە.

ئەمە و، ئەو ڕۆژنامەنووسەی سزای دەرکردنی دەرحەق دراوە، بۆی هەیە لەماوەی پانزە ڕۆژ لە مێژووی=

و ناگادار (مدرك) و لێهاتوو بێت بۆ لە ئەستۆگرتنی ئاکامەکانی کردەوە تاوانییەکانی (افعال الجرمیة)[٦٣٧].

بەڵام بەرپرسیارێتیی تاوانکاری لە بواری رۆژنامەگەریدا، بریتییە لەو بەرپرسیارێتییەی کە لە ئاکامی سەرپێچیکردنی یاسای چاپەمەنی و یاساکانی تری پەیوەندیدار بەکاروباری رۆژنامەگەری و هەندێ حوکمی یاسای سزادان لەم بارەیەوە، لەلایەن رۆژنامەنووسەوە دێتەدی.

بەم پێیە، لە پراکتیزەکردنی بەرپرسیارێتیی تاوانکاری لە تاوانە ئاساییەکاندا هیچ گرفتێکمان نابەتەرێ، چونکە بەرپرسیارێتیی تاوانکاری لەو تاوانانەدا بەپێی بڕی بەشداربوونی تاوانکار وەک بکەرێک (فاعل) یان بەشداربوویێک لە هێنانەدی تاوانەکە دیاردەکرێت، بەڵام لە رێکخستنی حوکمەکانی بەرپرسیارێتیی رۆژنامەگەریدا، چەندین گرفتمان دێتەرێ، لەوانە چۆنێتی دەستنیشانکردنی ئەو کارەی بەتاوان دادەندرێ، ئایا کاری نووسینەکەیە یان کاری بڵاوکردنەوەکەیە یان هەردووکیانە؟ هەروەها چۆنێتی دۆزینەوەی وتارنووس (کاتب المقال) لە حاڵەتێکدا ئەگەر هاتوو رۆژنامەکە لە بڵاوکردنەوەی وتارەکەدا پێڕەوی سیستمی بێناوی (نظام اللاأسمیة)ی کردبێ[٦٣٨]، کە

---

= ناگادارکردنی بەبڕیارەکە، لەلای دادگای پیاچوونەوە (التمییز) تانە لە بڕیاری ئەنجوومەنی سەندیکا بدات.

لەم حاڵەتەشدا، تاوەکو سزایەکە پلەی بنبڕی (الدرجة القطعیة) وەرنەگرێت جێبەجێ ناکرێت. بڕوانە دەقی ماددە (٢١)ی یاسای سەندیکای رۆژنامەنووسانی کوردستان ژمارە (٤)ی ساڵی ١٩٩٨ بەرامبەر بەماددە (٢٦)ی یاسای سەندیکای رۆژنامەنووسانی عێراقیی ژمارە (١٧٨)ی ساڵی ١٩٩٨ی هەمواركراو.

هەرچەندە یاسای عێراقی جیاوازی هەیە لەگەڵ یاسای کوردستان لە رووی توندیی ئەو سزایانەوە. بۆیە دوای دوورخستنەوەی کاتی، یەکسەر حوکمی بەدەرکردنی یەکجارەکی رۆژنامەنووس لە پیشەکەیدا دلوە.

٦٣٧- د.مصطفى العوجي: القانون الجنائي العام، المسؤولیة الجزائیة، ج ٢، مؤسسة نوفل، بیروت، لبنان، ل١٩٨٥، ل١٢.

٦٣٨- یەکێک لەو مافە ئەدەبییانەی کە دانەر(مؤلف) هەیەتی، ئەوەیە، بۆی هەیە بەرهەمەکەی بەناوی خۆی یان بەناوی خوازرا و یان بەبێ ناو بڵاوبکاتەوە. بڕوانە کمال سعدي مصطفى: حق الملكیة الادبیة والفنیة في القانون العراقي والمقارن، رسالة ماجستیر في القانون، قدمت الى كلیة القانون والسیاسة - جامعة صلاح الدین- اربیل، عام ١٩٩٦، ل١١٤، هەروەها بڕوانە ماددە (٨)ی =

بەزۆری وا لێک دەدرێتەوە ئەو وتارە بێناوانە گوزارشت لە بۆچوونی ڕۆژنامەکە بکەن نەک خاوەن وتارەکە. گرفتێکی تریش پەیوەندی هەیە بەچۆنێتی لێک جوداکردنەوەی ئەنجامدەرە ئەسڵییەکان و بەشداربووەکان لە تاوانی ڕۆژنامەگەریدا. چونکە کەسانێکی زۆر لە ئامادەکردن و بڵاوکردنەوەی چاپکراوەکە بەشداری دەکەن و ڕۆڵی هەر یەکێکیشیان لەوەی تر جیاوازە[٦٣٩]، سەلماندنی بەرپرسێتی کەسێک یان کەسانێک لە ڕوودانی تاوانی ڕۆژنامەگەریدا مەسەلەیەکی ئاسان نییە.

جا لەبەرئەوە، زۆربەی یاساکانی سزادان و ئەو یاسایانەی کاروباری ڕۆژنامەگەرییان لە دەوڵەتە جیاجیاکان ڕێکخستووە، هەندێ بنەمای تایبەتییان بۆ دەستنیشانکردنی بەرپرسیارێتی تاوانکاری لە تاوانەکانی ڕۆژنامەگەری داناوە. لەوانە، پرنسیپی بەرپرسیارێتیی لە ئاکامی کاری کەسانی تردا (المسؤلية عن افعال الغير)، لەو حاڵەتەدا سەرنووسەر یان بەرپرسی لاپەڕە یان خاوەنی ڕۆژنامە و چاپکراوە دەورییەکە ناو و ناسنامەی وتارنووسەکە ئاشکرا ناکات، چونکە یاسا وادەخوازێ کە کەسێک ئەرکی کەسێکی تر لە ئەستۆ بگرێت کە نایەوێ ناو و ناسنامەکەی ئاشکرا بکات بۆ ئەوەی بدرێتە دادگا، ئەگەر هاتوو ئەو بابەتەی کە بڵاوی کردۆتەوە بەتاوان داندرابێت و یاساش سزای بۆ دانابێت. لێرەوە، یاسای چاپەمەنی و ڕۆژنامەگەری زۆربەی وڵاتانی دنیا جەختیان لەسەر ئەوە کردۆتەوە کە دەبێ کەسێک بەرپرسێتی ئەو بابەتەی لە ڕۆژنامە و چاپکراوە دەورییەکاندا بڵاودەبنەوە لە ئەستۆی خۆی بگرێت، ئەو کەسەش یان خاوەنی ئەو چاپکراوەیە یان سەرنووسەرەکەیەتی یانیش بەرپرسی لاپەڕەکەیە، هەندێ جاریش سکرتێر یان بەڕێوەبەری نووسین بەرپرسیارێتیی تاوانکاری لەجیاتی کەسێکی تر لەئەستۆ دەگرن.

---

=یاسای مافی دانەری فەرەنسی ساڵی ١٩٥٧ کە ئەمەش دەقەکەیەتی بەزمانی فەرەنسی:
La qualite dauteur appartient. sauf preuve contraire, a celui ou a ceux sous le nom de qui loeuvre estdivulguee

واتە: «ئەو کەسەی یان ئەو کەسانەی بەرهەمەکەی بەناوی خۆی بڵاودەکاتەوە بەدانەر دادەندرێ، مەگەر بەڵگەیەکی پێچەوانەی ئەمە بێتە ئاراوە».

٦٣٩- شایەنی ئاماژەبۆکردنە، هەریەکێک لە دانەر و خاوەن ئیمتیاز و سەرنووسەر و بەڕێوەبەری نووسینی ڕۆژنامە و بەرپرسی لاپەڕە و چاپکەر و ئەو کەسەی دەیهێنێ و ئەو کەسەش کە دەیفرۆشێ یان دابەشی دەکات یان هەڵیدەواسێ، ڕۆڵی خۆیان هەیە لە ڕۆژنامەکەدا و بەرپرسیارێتیی یاساییان بەگوێرەی ئەو ڕۆڵانەیە کە هەیانە.

ئەگەر بێت و تەمەشای یاسای چاپەمەنی و ڕۆژنامەگەری و یاساکانی تری پەیوەندیداری دەوڵەتان بکەین، دەبینین، بۆ دەستنیشانکردنی بەرپرسیارێتیی تاوانکاری لە تاوانەکانی ڕۆژنامەگەریدا، پێڕەوی هەندێک سیستمیان کردووە کە یاسازانەکان بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە دایان ناون. لەخوارەوە لە خاڵێکی سەربەخۆدا باسیان دەکەین:

**٥-٢-٢-١ سیستمەکانی بەرپرسیارێتیی تاوانکاری لە تاوانەکانی ڕۆژنامەگەریدا**

بۆ دەستنیشانکردنی ئەو بەرپرسیارەتییە تاوانکارییەی لە تاوانەکانی ڕۆژنامەگەری دەکەوێتەوە، یاسادانەران پێڕەوی هەندێک سیستمیان کردووە کە لەلایەن یاسازانانەوە بۆ ئەم مەبەستە داندراون. لە خوارەوە لە سێ خاڵدا باسیان بڵاو دەکەینەوە:

**یەکەم: بەرپرسیارییەتی هاوبەش (المسؤولیة التضامنیة)**

بەپێی ئەم سیستمە، لە یەک کاتدا، زیاتر لە کەسێک بەرپرسیارییەتی تاوانکارییان لە تاوانی ڕۆژنامەگەریدا دەکەوێتە ئەستۆ. ئەم سیستمە لەسەر ئەو بنەمایە دامەزراوە کە سەرنووسەر یان بەڕێوەبەری بەرپرس یان بەرپرسی لاپەڕە یان ئەو کەسەی ڕۆژنامە و چاپکراوە دەورییەکە بڵاو دەکاتەوە، هەردەم بەرپرسە لە تاوانی ڕۆژنامەگەریدا بەو سیفەتەی کە ئەنجامدەری ئەو تاوانانەیە، چونکە ئەو تاوانە ڕووناداتت مەگەر لە ئەنجامی ئەو بڵاوکردنەوەیە نەبێت کە یەکێک لەوان ئەنجامی دەدات[640]. چونکە هەر یەکێک لەوانە سەرپەرشتی ئامادەکردن و بڵاوکردنەوەی گشت ئەو بابەتانە دەکەن کە ڕۆژنامە و چاپکراوی دەوری ڕۆژانە وەری دەگرێ و بەبێ ڕەزامەندی ئەوان هیچ شتێک بڵاوتابێتەوە. جا ئەگەر یەکێکی تر لەگەڵ یەکێک لەوانە لەم بڵاوکردنەوەیەدا بەشداری کرد، جا چ ئەنجامدەر بێت یان هاوبەش بێت، بەپێی بنەما گشتییەکان بەرپرس دەبێت[641]. یاسای چاپەمەنیی هەرێمی کوردستان[642] و یاسای چاپەمەنیی عێراقی[643] و یاسای

٦٤٠- د. لطیفة حمید محمد: جرائم النشر في التشریع العراقي، سەرچاوەی پێشوو، ل١٢٢.

٦٤١- میثم حنظل شریف: التنظیم الدستوري والقانوني لحریة الصحافة في العراق، سەرچاوەی پێشوو، ل١٢٥.

٦٤٢- بڕوانە دەقی ماددەی (١٠) لە یاسای چاپەمەنیی هەرێمی کوردستان ژمارە (١٠)ی ساڵی ١٩٩٣ی هەمووارکراو لە بڕگەی (٥-٢-٢) پەراوێزی (٦٣٦) لەم تێزەدا.

٦٤٣- بڕوانە دەقی ماددە (٢٩) لە یاسای چاپەمەنیی عێراقی ژمارە (٢٠٦)ی ساڵی ١٩٦٨ی هەمووارکراو لە بڕگەی (٥-٢-٢) پەراوێزی (٦٣٦) لەم تێزەدا.

چاپەمەنیی میسری ساڵی ١٩٣٦ی هەموارکراو[٦٤٤] و یاسای چاپەمەنیی لوبنانی[٦٤٥] لە ڕێکخستنی بەرپرسیارییەتی تاوانکاریدا، کاریان بەم سیستمە کردووە.

دووەم: بەرپرسیارییەتی دامەزراو لەسەر کەمتەرخەمی (المسؤولية المبنية على الاهمال)

بەپێی ئەم سیستمە، سەرنووسەر یان بەڕێوەبەری نووسین یان بەڕێوەبەری بەرپرس یان بەرپرسی لاپەڕە یان ئەو کەسەی ڕۆژنامەکە یان چاپکراوە دەورییەکە بلاودەکاتەوە لە ناکامی کەمتەرخەمیکردنی لەو کارەیدا کە یاسا بۆی داناوە بەرپرسیارییەتیی تاوانکاری دەکەوێتە ئەستۆ[٦٤٦].

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ، ئەو کەسانە لە ناکامی کەمتەرخەمی کردن لە چاودێریکردنی ئەو بابەتانەی کە لە ڕۆژنامە یان چاپکراوە دەورییەکەیاندا بلاودەبێتەوە کە بەتاوان دانراون بەرپرسیارییەتیی تاوانکاریان دەکەوێتە ئەستۆ. ئەم بەرپرسیارییەش لەسەر بنەمای بەرپرسیارییەتێکی گریمانەکراو (المسؤولية المفترضة)ی یەکێک لەو کەسانە لە ئەرکە یاساییەکانیاندا دامەزراوە[٦٤٧].

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، ئەم سیستمە بەپێچەوانەی سیستمەکانی تر، دانی بەدوالیزم (دووفاقی)ی تاوان (ازدواجية الجريمة) ناوە، بۆیە سەرنووسەر یان هەر یەکێک لەو ناوبراوانەی سەرەوە بەرپرسیارییەتی تاوانکاری لە ناکامی تاوانێکی تایبەتییەوە دەکەوێتە ئەستۆ جیاوازی هەیە لەگەڵ خودی تاوانە ڕۆژنامەگەرییەکە و ئەو بەرپرسیارییەتییەش لەسەر بنەمای کەمتەرخەمیکردن لە پێشەدا دێتە دی، واتە سەرپێچیکردنی ئەو ئەرکانەی کە یاسا دایناون و ڕەچاوکردنیان دەبێتە مایەی ڕوونەدانی تاوانەکە. بۆ نموونە، ئەگەر بێت و سەرنووسەر یان هەر یەکێک لەو کەسانەی لە سەرەوە ئاماژەمان پێکردن، کەمتەرخەمی لە کارەکانیاندا نەکەن، ئەوا ئاگاداری ناوەڕۆک و سروشتی تاوانکاری ئەو بابەتانە دەبن کە بۆ ڕۆژنامە یان چاپکراوە دەورییەکەیان هەناردراوە و ڕێگا نادەن چاپ و بلاوبکرێتەوە، لەو حاڵەتەشدا تاوانەکە ڕوونادات.

---

٦٤٤- بڕوانە ماددەی (١٩) لە یاسای چاپەمەنیی میسری ژمارە (٢٠)ی ساڵی ١٩٣٦ی هەموارکراو.

٦٤٥- بڕوانە ماددەی (٢٦) لە یاسای چاپەمەنیی لوبنانی ساڵی ١٩٦٢ی هەموارکراو.

٦٤٦- د. عبدالحميد الشواربي: جرائم الصحافة والنشر، سەرچاوەی پێشوو، ل٨٠.

٦٤٧- میشم حنظل شريف: التنظيم الدستوري والقانوني لحرية الصحافة في العراق، سەرچاوەی پێشوو، ل١٢٦.

شایەنی ئاماژەبۆکردنە، بەرپرسیتیی سەرنووسەر یان هەر یەکێک لەو کەسانەی کە ئاماژەمان پێکردوون، لە ڕووی گرێمانەکردنی هەڵەکردنەکەی لەلایەن یاسادانەرەوە، لە بەرپرسیارییەتی مەتبوع دەچێت[٦٤٨]، کە لەسەر هەڵەی گرێمانەکراوی مەتبوعەوە دامەزراوە. ئەمەش پێچەوانەی بنەما گشتییەکانە، چونکە بەپێی بنەما گشتییەکان بەرپرسیارێتیی تاوانکاری پشت بەهەڵەی گرێمانەکراو نابەستێت لە هێنانەدی بەرپرسیارێتیی تاوانکاریدا[٦٤٩].

سێیەم: بەرپرسیارییەتی پۆلێنکراو (المسؤولية المبنية على التتابع)

ئەم سیستمە لەسەر بنەمای دەستنیشانکردن و پۆلێنکردنی ئەو کەسانە دامەزراوە کە بەرپرسیارن لە تاوانی ڕۆژنامەگەریدا، بەچەشنێک، وەک ئەنجامدەری تاوانەکە، لێپرسینەوە لەگەڵ یەکێکیان ناکرێت، مەگەر ناسینی ئەو کەسە لە تواناداا نەبێ کە لە پۆلێنەکە لە پێشەوەی ئەودایە[٦٥٠].

بەم پێیە، لە تاوانێکی ڕۆژنامەگەریدا، ئەگەر ئەزاندرا دانەرەکەی کێیە، لەو حاڵەتەدا خاوەنی ڕۆژنامەکە بەرپرسیار دەبێ، ئەگەر خاوەنەکەی دیارنەبوو، سەرنووسەرەکەی بەرپرسیار دەبێ، ئەگەرنا بەڕێوەبەری نووسین، ئەگەرنا بەرپرسی لاپەرە، ئەگەرنا ئەو کەسەی چاپی کردووە، ئەگەرنا ئەو کەسەی بڵاویکردۆتەوە، ئەگەرنا فرۆشیارەکەی، ئەگەرنا ئەو کەسەی دابەشی دەکات یان هەڵی دەواسێ بەتەنها بەرپرسیارێتییە تاوانکارییەکەی دەکەوێتە ئەستۆ.

یاسای ڕۆژنامەگەری فەرەنسی ساڵی ١٨٨١ی هەمووارکراو لە ماددەی (٤٢)دا کاری بەم سیستمە کردووە و دەڵێ: «ئەو کەسانەی تاوانێکی ڕۆژنامەگەری ئەنجام دەدەن، وەک ئەنجامدەرێکی بنەڕەتی (فاعل اصلي) بەپێی ئەم پۆلێنەی خوارەوە سزا دەدرێن:

یەکەم: بەڕێوەبەری چاپخانە یان بەڕێوەبەری بڵاوکردنەوە، پیشەیان یان ناونیشانیان

---

٦٤٨- بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە (د. محمد الشيخ عمر)، مسؤلية المتبوع، مطابع سجل العربي، ١٩٧٠، ل٧٠-٧٣.

٦٤٩- بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە (د. مصطفى ابراهيم الزلمي): موانع المسؤلية الجنائية في الشريعة الاسلامية والتشريعات الجزائية العربية، ط١، منشورات الدار الجامعية للطباعة والنشر والترجمة، بغداد، ٢٠٠٢، ل٣٢.

٦٥٠- د. لطيفة حميد محمد: جرائم النشر في التشريع العراقي، سەرچاوەی پێشوو، ل١٢٥.

هەرچییەک بێت، یان بەڕێوەبەری هاریکار (المدیر المشارك) لەو حاڵەتانەی کە لە بڕگەی دووەمی ماددەی شەشەمدا هاتووە[٦٥١].

---

٦٥١- ئەمەش دەقەکەیەتی بەزمانی فەرەنسی:

"Modifié par Loi 86-897 1er Aout 1986 art 9 JORF 2 août 1986.

Toute publication de presse doit avoir un directeur de la publication.

Lorsqu'une personne physique est propriétaire ou locataire-gérant d'une entreprise éditrice au sens de la loi n !897-86 du 1er août 1986 portant réforme du régime juridique de la presse ou en détient la majorité du capital ou des droits de vote, cette personne est directeur de la publication . Dans les autres cas, le directeur de la publication est le représentant légal de l'entreprise éditrice .Toutefois, dans les sociétés anonymes régies par les articles 118 à 150 de la loi 66-537 du 24 juillet 1966 sur les sociétés commerciales, le directeur de la publication est le président du directoire ou le directeur général unique.

Si le directeur de la publication jouit de l'immunité parlementaire dans les conditions prévues à l'article 26 de la Constitution et aux articles 9 et 10 du Protocole du 8 avril 1965 sur les privilèges et immunités des communautés européennes, l'entreprise éditrice doit nommer un codirecteur de la publication choisi parmi les personnes ne bénéficiant pas de l'immunité parlementaire et, lorsque l'entreprise éditrice est une personne morale, parmi les membres du conseil d'administration, du directoire ou les gérants suivant la forme de ladite personne morale.

Le codirecteur de la publication doir être nommé dans le délai d'un mois à compter de la date à partir de laquelle le directeur de la publication bénéficie de l'immunité visée à l'alinéa précédent.

Le directeur et, éventuellement, le codirecteur de la publication doivent être majeurs, avoir la jouissance de leurs droits civils et n'être privés de leurs droits civiques par aucune condamnation judiciaire.

Toutes les obligations légales imposées au directeur de la publication sont applicables au codirecteur de la publication.

* (1) NOTA: selon les termes de l'article 22 de la loi 86-897 du 1er août 1986, dans tous les juillet 1881, les mots "directeur de la publication" sont substitués au"articles de la loi du 29 mot "gérant"*.

واتە: دەبێ هەموو چاپکراوێکی دەوری بەڕێوەبەری بڵاوکردنەوەی هەبێت. کاتێک کەسێک خاوەنی دەزگایەکی بڵاوکردنەوە بوو یان بەوەکالەت کرێچی بوو ، بەپێی حوکمەکانی یاسای ژمارە (٨٦-٨٩٧) کە لە ١٩٨٦/٨/١ دەرچووە، کە تایبەتە بەهەمووارکردنی سیستمی یاسایی بڵاوکردنەوە، یان خاوەنی زۆربەی سەرمایە یان مافی دەنگدان بێت، ئەو کەسە بەڕێوەبەری بڵاوکردنەوەیە. بەڵام لە حاڵەتەکانی تردا، نوێنەری یاسایی دەزگاکە بەڕێوەبەری بڵاوکردنەوەیە. بەڵام لە دامەزراوە-

دووەم: دانەران بەهۆی هەڵەکانیانەوە.

سێیەم: خاوەن چاپخانەکان بەهۆی هەڵەی دانەرەکانەوە.

چوارەم: فرۆشیار و دابەشکەران (الباعة والموزعون) و ئەو کەسانەی جاری دەدەن بەهۆی هەڵەی خاوەن چاپخانەکانەوە»[٦٥٢].

کەواتە، بەپێی ئەم پۆلێنکردنە، دانەر وەک ئەنجامدەرێکی بنەڕەتی ڕووبەڕووی لێپرسینەوە نابێت، مەگەر نەزانرێ بەڕێوەبەری چاپخانە یان بەڕێوەبەری بڵاوکردنەوە کێیە. ئەم بنەمایە لەسەر هەموو کەسەکانی تر دەچەسپێ کە لە دوای ئەوانەوە لە پۆلێنەکەدا ناویان هاتووە.

---

ـەهاوبەشدارەکاندا (المؤسسات المساهمة)دا کە بەپێی برگەی ١١٨ تاکو ١٥٠ لە یاسای ژمارە ٥٣٧-٦٦ی ١٩٦٦/٧/٢٤ لەبارەی دەزگا بازرگانییەکان بەڕێوەدەچن، سەرۆکی ئەنجومەنی کارگێڕی یان بەڕێوەبەری گشتی، بەڕێوەبەری بڵاوکردنەوەیە.

وە ئەگەر هاتوو بەڕێوەبەری بڵاوکردنەوە حەسانەی دبلۆماسی هەبوو لەو حاڵەتانەی کە برگەی ٢٦ی دەستوور و برگەی نۆیەم و دەیەمی ئەو پرۆتۆکۆڵەی کە لە ١٩٦٥/٤/٨ لە بارەی حەسانەو ئیمتیازەکانی کۆمەڵەی ئەورووپییەوە ئیمزا کراوە. دەبێ دەزگای بڵاوکردنەوە شەریکێک بۆ ئیدارەی بڵاوکردنەوەکە دابمەزرێنێ، لە نێوان ئەو کەسانەدا هەڵدەبژێردرێ کە حەسانەی پەرلەمانییان نییە. جا ئەگەر هاتوو دەزگای بڵاوکردنەوەکە کەسایەتییەکی مەعنەوی هەبوو، یەکێک لە نێوان ئەندامانی ئەنجومەنی کارگێڕی یان بریکارەکان بەپێی ئەو شێوەیەی کە کەسایەتی مەعنەوی دەیخوازێت.

دەبێ لە ماوەی دوو مانگ لەو ڕۆژەی کە بەڕێوەبەری ئیدارەی بڵاوکردنەوەکە کە لە سەرەوە ئاماژەی پێ کراوە بەڕێوەبەرێکی شەریک بۆ ئیدارەی بڵاوکردنەوەکە دابمەزرێت. جا دەبێ بەڕێوەبەر هەروەها شەریکی بەڕێوەبەری بڵاوکردنەوە لێهاتوو (بالغ) بێت و مافە مەدەنییەکانی هەبێت و نابێ لە مافە نیشتمانییەکانی لەبەر هەر ئیدانەیەکی یاسایی بێبەش کرابێت».

٦٥٢- ئەمەش دەقەکەیەتی بەزمانی فەرەنسی:

"Modifié par Ordonnance 26 Aout 1944 ART 15 JORF 30 août 1944.

Modifié par Loi 52-336 25 Mars 1952 ART 4 JORF 26 mars 1952.

Seront passibles, comme auteurs principaux des peines qui constituent la répression des crimes et délits commis par la voie de la presse, dans l'ordre ci-après savoir:

1 !Les directeurs de publications ou éditeurs, quelles que soient leurs professions ou leurs dénominations, et, dans les cas prévus au deuxième alinéa de l'article 6, de les codirecteurs de la publication;

2- A leur défaut, les auteurs;

3- A défaut des auteurs, les imprimeurs;

4- A défaut des imprimeurs, les vendeurs, les distributeurs [illegible] afficheurs"

سەبارەت بەمە، لە پاشبەندی ماددەی ناوبراوەوە هاتووە: «بەرپرسێتی ئەو کەسانەی کە لە برگەی دووەم و سێیەم و چوارەمی ئەم ماددەیەدا هاتوون لە حالەتێکدا دەبێ کە بەڕێوەبەری چاپ و بڵاوکردنەوە نەبێ»[٦٥٣].

هەروەها یاسای سزادانی عێراقی ژمارە (١١١)ی ساڵی ١٩٦٩ی هەمواركراویش کاری بەم سیستمە کردووە و دەڵێ: «ئەگەر هاتوو نووسینەکە یان ڕەسمەکە یان ڕێگاکانی تری گوزارشتکردن کە لە ئەنجامدانی تاوانەکەدا بەکار هاتبوو، لە دەرەوەی وڵات داندرابێ یان بڵاوکرابێتەوە یان نەتوانرێ ئەنجامدەری تاوانەکە بناسرێ، ئەو کەسەی کە هێناویەتی و ئەو کەسەش کە چاپی کردووە وەک بکەرێکی ئەسڵی سزا دەدرێن.

ئەگەر نەتوانرا ئەمەش بزانرێ، ئەوکاتە ئەو کەسەی دەیفرۆشێ یان دابەشی دەکات یان هەڵی دەواسێ سزا دەدرێ...»[٦٥٤].

هەرچەندە ئەم سیستمە بەوە لە سیستمەکانی تر جیا دەکرێتەوە، کە ئاسانە لە جێبەجێکردندا و کاری دادوەر لە دەستنیشانکردنی ئەو کەسەی بەرپرسیارە لە تاوانی ڕۆژنامەگەریدا ئاسان دەکات. بەڵام سەرەرای ئەمەش هەندێ کەموکوڕی تێدایە و دووریشە لە واقیع. بۆ نموونە، پێوەری دەستنیشانکردنی ئەو بەرپرسیارێتییە بەپێی ئەم سیستمە بریتییە لە ئامادەبوون و ئامادەنەبوونی کەسێک لەو کەسانەی کە لە پۆلێنەکەدا ناویان تۆمار کراوە. ئەمەش لەگەڵ ئەو بنەما گشتییانەدا ناگونجێ کە دەڵێ دەبێ بەرپرسیارێتیی تاوانکاری بەپێی گرنگی ئەو ڕۆڵە دەستنیشان بکرێ کە تاوانکار لە کردنی تاوانەکەیدا دەیبینێ.

هەروەها، جێبەجێکردنی ئەم سیستمە بەشێوەیەکی ڕەها، جۆرە ناکۆکییەک لەگەڵ پرنسیپی «کەسایەتی بەرپرسیارییەتیی تاوانکاری - شخصية المسؤولية الجزائية» لە لایەک و پرنسیپی «هیچ بەرپرسێتییەکی تاوانکاری بەبێ هەڵە نییە» دروست دەکات. چونکە ڕێکەوت ڕۆڵی خۆی دەبینێ لە لێپرسینەوەی ئەو کەسانەی کە ناویان لە کۆتایی

٦٥٣- ئەمەش دەقەکەیەتی بەزمانی فەرەنسی:

Dans les cas prévus au deuxième alinéa de l'article 6, la responsabilité subsidiaire des personnes visées aux paragraphes 2°, 3° et 4° du présent article joue comme s'il n'y avait pas de directeur de la publication, lorsque, contrairement aux dispositions de la présente loi, un codirecteur de la publication n'a pas été désigné.

٦٥٤- بڕوانە ماددەی (٨٢) لە یاسای سزادانی عێراقی.

پۆلینەکەدا هاتووە، بەبێ ئەوەی مەبەستی تاوانکارییان لا هەبووبێت.

بۆیە بەڕای ئێمە باشتروایە لەجیاتی ئەمە بگەڕێینەوە بۆ بنەما گشتییەکانی بەرپرسیارییەتی تاوانکاری، چونکە لە واقیع نزیکترە و دادپەروەرانە تریشە[٦٥٥].

## ٥-٢-٢-٢ حوکمەکانی بەرپرسیارییەتی تاوانکاری لە تاوانەکانی ڕۆژنامەگەریدا

### یەکەم: حوکمەکانی بەرپرسیارییەتیی تاوانکاری لە یاسای میسریدا

یاسادانەری میسری بەپێی ماددەی (١٩٥ و ١٩٦ و ١٩٧) یاسای سزادان، حوکمەکانی بەرپرسیارییەتیی تاوانکاری لە تاوانەکانی ڕۆژنامەگەری ڕێکخستووە و بۆ ئەم مەبەستە لە ماددەی (١٩٥)[٦٥٦]دا بڕی لە دانەر[٦٥٧]ی ئەو بابەتە ڕۆژنامەگەرییەی تاوانەکەی لێ کەوتۆتەوە، سەرنووسەر و بەرپرسی ئەو لاپەڕەیەشی خەتابار کردووە کە بابەتەکەی لێ بڵاوبۆتەوە و بۆ ئەم مەبەستە دانەر و سەرنووسەر و بەرپرسی لاپەڕەی بەئەنجامدەری بنەڕەتی داناون و ڕێگای داوە داوای سزادان دژی هەموو یان هەر یەکێک لەوانە بۆ دادگا بەرزبکرێتەوە. بەڵام ئەگەر هاتوو سەرنووسەرەکە خۆی دانەرەکە بوو، لەو حاڵەتەدا، داوایەکە تەنها دژی ئەو بەرز دەکرێتەوە، چونکە هەردوو خەسڵەتی دانەری و سەرنووسەری تێدایە. بەڵام سەبارەت بەخاوەنی ئیمتیازی ڕۆژنامەکە، ئەگەر هاتوو بەتەواوی دەستی لە ئەنجامدانی تاوانەکە وەردابێت، بەئەنجامدەری بنەڕەتی دادەنرێت و

---

٦٥٥- لەم ڕووەوە، خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا لە ئایەتی (١٦٤)ی سوورەتی (الانعام) دەفەرمووێ: «وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى» واتە «هیچ کەسێک تاوان و گوناحی کەسێکی تری لە ئەستۆ نابێ» ئەمەو لە چەندین شوێنی تریشدا جەختی لەسەر ئەم حوکمە کردۆتەوە، لەوانە، ئایەتی (١٧) لە سوورەتی (الاسراء) و ئایەتی (١٨) لە سوورەتی (فاطر) و ئایەتی (٧) لە سوورەتی (الزمر) و ئایەتی (٣٨) لە سوورەتی (النجم).

٦٥٦- ئەمەش دەقەکەیەتی: «مع عدم الاخلال بالمسؤولية الجنائية بالنسبة لمؤلف الكتابة أو واضع الرسم أو غير ذلك من طرق التمثيل، يعاقب رئيس تحرير الجريدة او المحرر المسؤول عن قسمها الذي حصل فيه النشر اذا لم يكن ثمة رئيس تحرير بصفته فاعلا اصليا للجرائم التي ترتكب بواسطة صحيفته».

٦٥٧- زاراوەی دانەر هەموو کەسێک دەگرێتەوە کە بەرهەمێکی عەقڵی داهێنەرانەی لە زادەی مێشکی خۆیەوە دانابێت، جا ئەو بەرهەمە هەر چ جۆرێک بێت و بەچ شێوەیەک گوزارشتی لێکرابێت. بڕوانە د. توفيق حسن فرج و د. محمد يحيى مطر: الاصول العامة للقانون، الدار الجامعية للطباعة والنشر، بيروت، ١٩٨٩، ل٢٣٢.

دەکەوێتە بەر لێپرسینەوەی تاوانکارییەوە. بەڵام ئەگەر هاتوو بەتەواوەتی لە ئەنجامدانی تاوانەکەدا دەستی تێوەرنەدابێت، لەو حاڵەتەدا، تەنها بەرپرسیارییەتییەکەی سەبارەت بەقەرەبووکردنەوەی زیانەکە بەخەرجییەکانی دادگایشەوە، لەگەڵ بەڕێوەبەری بەرپرسی ڕۆژنامەکە و وتارنووسەکە بەرپرسیارییەتییەکەی هاوبەش دەبێت[٦٥٨].

لێرەشدا بۆمان دەردەکەوێ کە یاسای سزاداتی میسری لەم حوکمەیدا پەیڕەوی تیۆری (بەرپرسیارییەتی هاوبەش)ی کردووە.

دادگای پیاچوونەوە (محكمة النقض)ی میسری لە حوکمێکیدا سەبارەت بەبەرپرسیارییەتی سەرنووسەر لە تاوانەکانی ڕۆژنامەگەریدا دەڵێ: «بەرپرسیارییەتی سەرنووسەر بەرپرسیارییەتییەکی گریمانەکراوە و دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سیفەتە و ئەو فەرمانەی کە لە ڕۆژنامەکەدا هەیەتی و هەرکاتێک بسەلمێنرێ بەم ئەرکە هەڵدەستێ، ئەم بەرپرسیارییەتییەی ▪کەوێتە ئەستۆ، هەرچەندە بەڕێکەوت بەشێوەیەکی تەواو سەرپەرشتی لەسەر ئەو ژمارەیە یان ئەوەی تر نەکردبێ، چونکە مەبەستی یاسادانەر لە دانپێدانانی ئەم بەرپرسیارییەتییە گریمانە کراوە، گریمانەکردنی ئاگایی سەرنووسەرە لەو بابەتانەی بەرەزامەندی ئەو لە ڕۆژنامەکەیدا بڵاودەکرێنەوە واتە یاسادانەر گەرێنەیەکی یاسایی دەرهەق داناوە، گوایە ئاگادارە لەو بابەتانەی کە لەو ڕۆژنامەیەدا بڵاودەکرێنەوە کە ئەو سەرپەرشتی لەسەر دەکات، کەواتە بەرپرسیارییەتییەکەی لە ئاکامی گریمانەکردنی ئەم ئاگادارییە گریمانەکراوە...»[٦٥٩]. هەروەها بەپێی ماددەی (١٩٦)[٦٦٠]ی یاسای سزادان

٦٥٨- محمد سعيد مجذوب: الحريات العامة وحقوق الانسان، ط١، مطبعة جروس برس، لبنان، بيروت، ١٩٨٦، ل١٧٨.

٦٥٩- قرار محكمة النقض المصرية رقم (٤٨٢) السنة ٣٤ ق جلسة ١٩٦٤/١١/٩٧ بروانە حسن الفكهاني وعبدالمنعم حسني: الموسوعة الذهبية للقواعد القانونية التي قررتها محكمة النقض المصرية، ج ٦، منشورات الدار العربية للموسوعات، القاهرة، ١٩٨١، ص٦٨٧-٦٨٨.

٦٦٠- ئەمەش دەقەکەیەتی: «في الاحوال التي تكون فيها الكتابة او الرسم او الصور او الصور الشمسية او الرموز او طرق التمثيل الاخرى التي استعملت في ارتكاب الجريمة قد نشرت في الخارج، وفي جميع الاحوال التي لايمكن فيها معرفة مرتكب الجريمة يعاقب بصفتهم فاعلين اصليين، المستوردون والطابعون فان تعذر ذلك فالبائعون والموزعون والملصقون، وذلك مالم يظهر من ظروف الدعوى انه لم يكن في وسعهم معرفة مشتملات الكتابة او الرسم او الصور او الصور الشمسية أو الرموز او طرق التمثيل الاخرى».

لە حاڵەتی بڵاوبوونەوەی ئەو بەرهەمە لە دەرەوەی وڵات کە تاوانەکەی لێ دەکەوێتەوە، لە دەقی ماددەی ناوبراو بۆمان دەردەکەوێ کە یاسای سزاداتی میسری لەم حوکمەیدا لەو حاڵەتە کە نەزانراوێ ئەو کەسەی تاوانەکەی کردووە کێیە، یانیش ئەو بابەتەی تاوانەکەی لێ ڕوودارە لە دەرەوەی وڵات بڵاوبووبێتەوە، پەیڕەوی تیۆری (بەرپرسیاریەتی بنیادنراو لەسەر یەک بەدوای یەکی)ی کردووە و بۆ ئەم مەبەستەش ئەو کەسانەی کە ڕۆژنامەکە دەهێننە ناو وڵاتەوە یان چاپی دەکەن بەئەنجامدەری ئەسڵی داناوە، ئەگەر زانرا کێنە، بەڵام ئەگەر نەزاندرا ئەو کەسانە کێنە، لەو حاڵەتەدا فرۆشیار و دابەشکەر و ئەو کەسانەی هەڵیدەواسن بەئەنجامدەری ئەسڵی دادەندرێن.

لەم حاڵەتەشدا، داوای سزادان دژی کۆمەڵەی دووەم بەسیفەتی ئەنجامدەری ئەسڵی بۆ دادگا بەرزناکرێتەوە ئەگەر زاندرا کۆمەڵەی یەکەم کێن (ئەگەر بەکۆمەڵەی یەکەم زاندرا). بەڵام ئەگەر هاتوو داوای سزادان دژی دانەر یان سەرنووسەر یان بەرپرسی لاپەڕە وەک ئەنجامدەری ئەسڵی بەرزکرایەوە، ئەمە ڕێگا لەوە ناگرێت کە بەپێی بنەما گشتییەکان (القواعد العامة) داوای سزادان دژی کەسەکانی هەردوو کۆمەڵەی سەرەوە بەپێی پۆلینیان بۆ دادگا بەرز بکرێتەوە، بەڵام لەم حاڵەتەدا، ئەو داوایە دژی ئەوان بەسیفەتی ئەنجامدەری ئەسڵی بەرزناکرێتەوە، بەڵکوو بەسیفەتی هاوبەشیکردن لە ئەنجامدانی تاوانەکە بەرزدەکرێتەوە[661].

هەروەها لە ماددەی (١٩٧)[662]دا بەرپرسیاریەتی ئەو کەسانەی دیارکردووە، کە ئەو بابەتانەی لە میسر یان لە دەرەوەیدا بڵاودەکرێنەوە وەردەگێڕن یان وەردەگێڕن یان لە پڕۆپاگاندە و گێڕانەوەی سەرزاری کەسانی دیکە وەردەگرن.

دووەم: حوکمەکانی بەرپرسیاریەتیی تاوانکاری لە یاسای لوبنانیدا

یاسادانەری لوبنانی لە ماددەی (٢٦)ی مەرسومی یاسایی ژمارە (١٠٤)ی ساڵی

---

٦٦١- د. رياض شمس: حرية الرأي وجرائم الصحافة والنشر، ج ١، مطبعة دار الكتب المصرية، القاهرة، ١٩٤٧، ل٤٦.

٦٦٢- ئەمەش دەقەکەیەتی: «لايقبل من احد للافلات من المسؤولية الجنائية مما نص عليه في المواد السابقة، ان يتخذ لنفسه مبررا او ان يقيم لها عذرا من ان الكتابات او الرسوم او الصور او الصور الشمسية او الرموز او طرق التمثيل الاخرى انما نقلت او ترجمت عن نشرات صدرت في مصر او في الخارج او انها لم تزد على ترديد اشاعات او روايات عن الغير».

١٩٧٧[٦٦٣]دا بەرپرسیاریەتیی تاوانکاری لە تاوانەکانی ڕۆژنامەگەری ڕێکخستووە، ئەمەش دەقەکەیەتی: «١- ئەو سزایانەی کە بەهۆی ئەنجامدانی تاوانەکانی ڕۆژنامەگەرییەوە حوکمیان لەسەر دەدرێت، دەکەوێتە ئەستۆی بەڕێوەبەری بەرپرس (المدير المسؤول)[٦٦٤] و وتارنووس (كاتب المقال) بەسیفەتی ئەنجامدەری ئەسڵی. جا حوکمەکانی یاسای سزادان کە پەیوەندییان هەیە بەبەشداریکردن (الاشتراك) یان دەستتێوەردانی تاوانکاری (التدخل الجرمي)ەوە لەم بوارەدا جێبەجێ دەکرێت. بەڵام خاوەن ئیمتیازی ڕۆژنامەکە تەنها بەهاوکاریکردن، بەرپرسیایەتیی مەدەنیی مافە کەسییەکان (الحقوق الشخصية) و خەرجییەکانی دادگاییکردنەکەی دەکەوێتە ئەستۆ و بەرپرسیایەتیی تاوانکاری ناکەوێتە ئەستۆ، مەگەر دەستتێوەردانی فیعلی لە ئەنجامدانی تاوانەکەدا بسەلمێندرێ.

٢- ئەو حەسانەیەی کە ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەران لە کاتی ماوەی نوێنەرایەتییەکەی هەیەتی، بەڕێوەبەری بەرپرس و خاوەنی ئیمتیازی چاپکراوەکە، لە حاڵەتی بڵاوکردنەوەی گوتە و قسەدەربڕینەکانی ئەندامی ئەنجومەن، لە بەرپرسیایەتی نابەخشێت...»[٩٦٥].

لەم دەقەی سەرەوەدا ئەم تێبینییانەی خوارەوە دەکەین:

---

٦٦٣- ئەم مەرسومە یاساییە کە لە ڕۆژنامەی ڕەسمیی ژمارە (٣٠)ی ساڵی ١٩٧٧ بڵاوکراوەتەوە، حوکمی تاوانەکانی ڕۆژنامەگەری لە ماددەی (٥١) تاکو ماددەی (٧٠)ی یاسای چاپەمەنیی ساڵی ١٩٦٢ هەمووارکردوە، ئەو حوکمانەی کە لەژێر ناونیشانی (تاوانەکانی چاپەمەنی) لەو مەرسومەدا هاتوون، جێگای ئەوانیان گرتۆتەوە.

٦٦٤- لەلای ئێمە زیاتر بەبەڕێوەبەری نووسین یان سکرتێری نووسین ناوزەد دەکرێت.

٦٦٥- ئەمەش دەقەکەیەتی: «١- ان العقوبات التي يقضى بها بسبب الجرائم المرتكبة بواسطة المطبوعات الصحفية تقع على المدير المسؤول و كاتب المقال كفاعلين اصليين. وتطبق في هذا المجال احكام قانون العقوبات المتعلقة بالاشتراك او التدخل الجرمي. اما صاحب المطبوعة الصحفية فيكون مسؤولا مدنيا بالتضامن عن الحقوق الشخصية ونفقات المحاكمة ولايترتب عليه مسؤولية جزائية الا اذا ثبت تدخله الفعلي في الجريمة المرتكبة.
٢- ان الحصانة التي يتمتع بها عضو المجلس النيابي اثناء مدة نيابته لاتعفي المدير المسؤول وصاحب المطبعة من المسؤولية في حال نشر اقوال وتصاريح لعضو المجلس وتقع تحت طائلة قانون المطبوعات لجهة النشر».

١- یاسادانەری لوبنانی جیاوازی کردووە لە نێوان بەڕێوەبەری بەرپرس و وتارنووس لەلایەک و خاوەنی ئیمتیازی ڕۆژنامەکە لە لایەکیترەوە.

سەبارەت بەبەرپرسیاریەتیی تاوانکاری بەڕێوەبەری بەرپرس و وتارنووس، یاسادانەری لوبنانی لەو حوکمەدا، کاری بەتیۆری (بەرپرسیاریەتیی هاوبەش) کردووە و هەردووکیان بەئەنجامدەری ئەسلی داناوە بۆ ئەو تاوانانەی کە لە ڕێگای ڕۆژنامەوە ئەنجام دەدرێن.

بەڵام سەبارەت بەخاوەن ئیمتیازی ڕۆژنامەکە، لە نێوان دوو حاڵەتدا جیاوازی کردووە، یەکەمیان، ئەگەر هاتوو بەتەواوی دەستی لە ئەنجامدانی تاوانەکە وەردابێت، لەو حاڵەتەشدا بەئەنجامدەری بنەڕەتی دادەندرێت و دەکەوێتە بەر لێپرسینەوەی تاوانکاریەوە. دووەمیان، ئەگەر هاتوو بەتەواوەتی لە ئەنجامدانی تاوانەکەدا دەستی تێوەرنەدابێت، لەو حاڵەتەشدا، تەنها بەرپرسیاریەتییەکەی سەبارەت بەقەرەبووکردنەوەی زیانەکە بەخەرجییەکانی دادگایشەوە. لەگەڵ بەڕێوەبەری بەرپرسی ڕۆژنامەکە و وتارنووسەکە بەرپرسیاریەتییەکەی هاوبەش دەبێت.

٢- ئەم دەستەواژەیەی خوارەوە، لەبارەی بەرپرسیاریەتیی تاوانکاری بەڕێوەبەری بەرپرس و وتارنووسەوە لە دەقی ماددەی ناوبراودا هاتووە «حوکمەکانی یاسای سزادان کە پەیوەندییان بەبەشداریکردن یان خۆتێهەڵقورتانی تاوانکاریەوە هەیە لەم بوارەدا جێبەجێ دەکرێت»[٦٦٦].

لێرەدا بۆمان دەردەکەوێ، یاسادانەری لوبنانی، لەو حوکمەدا، ئەو بنەما یاساییەی سەبارەت بەسەلماندن ئاوەژوو (قلب) کردۆتەوە کە دەبێ بەڕێوەبەری بەرپرس بێتاوانیی خۆی سەبارەت بەو وتارەی کە تاوانەکەی لێکەوتۆتەوە بسەلمێنێ، تاوەکو بەبێ تاوان دابندرێت، بەڵکوو لەجیاتی ئەوە دەرفەتێکی باشتری بۆ ڕەخساندووە و هیچ بەرپرسیاریەتییەکی ناکەوێتە ئەستۆ و هیچ حوکمێکیشی لە دژدا دەرناچێت، مەگەر ئەو کەسەی تاوانی دەداتە پاڵ بەرپرسیاریتییەکەی بەپێی بنچینەکانی بەشداریکردن و دەستتێوەردانی تاوانکاری بسەلمێنێت[٦٦٧].

---

٦٦٦- ئەمەش دەقەکەیەتی: «تطبق في هذا المجال احكام قانون العقوبات المتعلقة بالاشتراك او التدخل الجرمي».

٦٦٧- سەبارەت بەحوکمەکانی بەشداریکردن و دەستتێوەردانی تاوانکاری لە یاسای لوبنانیدا بڕوانە د. محمد زكي ابو عامر: قانون العقوبات اللبناني - القسم العام، منشورات الدار الجامعية للطباعة والنشر، بيروت، ١٩٨١، ل٢٧٥ بەدواوە.

کەواتە، دەتوانین بڵێین بەرپرسیاریەتی بەڕێوەبەری بەرپرسی ڕۆژنامە، بەحوکمی یاسا نایەتەدی، بەڵکوو تەنها بەبوونی مەرجەکانی بەشداریکردن و دەستێوەردانی تاوانکاری کە لە یاسای سزاداندا دیارکراون، دێتەدی.

٣- ئەو حەسانە پەرلەمانییەی کە پەرلەمانتار هەیەتی، بەڕێوەبەری بەرپرسی ڕۆژنامە و وتارنووس سوودی بڵاوەرناگرێت، بۆ ڕزگاربوون لەو بەرپرسیارێتییە تاوانکارییەی کە لە ئاکامی گۆتە و قسەدەربڕینەکانی پەرلەمانتار ڕووبەڕووی دەبێتەوە.

بەمانایەکی تر، تەنها پەرلەمانتار بۆ ڕزگاربوون لەو بەرپرسیارێتییە تاوانکارییەی کە لە ئاکامی ئەو گۆتە و تەسریحاتانەیدا کە لە ڕێگای ڕۆژنامەوە دەیاندات دێتەدی، سوود لەو حەسانە پەرلەمانییە دەبینێ کە هەیەتی، بەڵام بەڕێوەبەری بەرپرسی ڕۆژنامە هیچ سوودێکی بڵاوەرناگرێت بۆ ڕزگاربوون لەو بەرپرسیارێتییە و دەکەوێتەبەر لێپرسینەوە ئەگەر هاتوو بڵاوکردنەوەی ئەو گۆتە و قسەدەربڕینانە تاوانی لێ کەوتەوە.

٤- یاسای لوبنانی لە ئاست بەرپرسیاریەتیی تاوانکاری ئەو کەسەی کە ڕۆژنامەکە چاپ دەکات یان دەیفرۆشێ یان دابەشی دەکات یان هەڵیدەواسێت، بێدەنگ بووە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە دەبێ بگەڕێینەوە بۆ بنەما گشتییەکانی بەرپرسیاریەتیی تاوانکاری، لەم حاڵەتەشدا، بەرپرسیاریەتی ئەو کەسانە لەسەر بنچینەی هەڵەی نامەبەست (خطأ غير عمدي) دەبێ کە لە ئاکامی کەمتەرخەمی کردن لە ئەرکێکی یاساییەوە دێتەکایەوە، نەک لە ئاکامی ئەنجامدانی تاوانێکی ڕۆژنامەگەرییەوە کە یەکێک لە مەرجەکانی ئەوەیە، نیەتی تاوانکاری لەلای ئەنجامدەرەکەیەوە هەبێت بەپێچەوانەی ئەم حاڵەتە، کە نیەتی تاوانکاری لەلای ئەنجامدەرەکەیەوە نییە، بەڵکوو تەنها لە ئەرکە یاساییەکەیدا کەمتەرخەمییەک هەیە.

سێیەم: حوکمەکانی بەرپرسیاریەتیی تاوانکاری لە یاسای فەرەنسیدا

یاسادانەری فەرەنسی لە ماددەی (٤٢) و (٤٣)ی یاسای ڕۆژنامەگەری ساڵی ١٨٨١ی هەمووارکراودا حوکمەکانی بەرپرسیاریەتیی تاوانکاریی تاوانەکانی ڕۆژنامەگەری ڕێکخستووە.

لە ماددەی (٤٢)دا پێڕەوی تیۆری «بەرپرسیاریەتی پۆلێنکراو» کردووە و بۆ ئەم مەبەستە ئەو کەسانەی ڕیزکردووە کە یەک بەدوای یەک بەپێی ئەو پۆلێنەی بۆیان کراوە بەرپرسیاریەتیی تاوانکارییان دەکەوێتە ئەستۆ، بەچەشنێک ئەو کەسەی لە پۆلی پێشەوە

دێت، ئەگەر زانرا کێیە، بەسیفەتی ئەنجامدەری بنەڕەتی بەرپرسیار دەبێت و ئەوانی تریش بەسیفەتی شەریک بەرپرسیار دەبن. بەڵام ئەگەر نەزانرا ئەو کەسە کێیە، ئەوکاتە ئەو کەسەی لە پۆلی دوای ئەو دێت، بەسیفەتی ئەنجامدەری بنەڕەتی بەرپرسیار دەبێت و ئەوانی تریش بەسیفەتی شەریک بەرپرسیار دەبن و بەم شێوەیە تا دەگاتە ئەو کەسانەی لە پۆلی دواوە ناویان هاتووە.

ئەو کەسانەش بریتین لە بەڕێوەبەری چاپخانە یان بەڕێوەبەری بڵاوکردنەوە و دانەران و خاوەن چاپخانەکان و فرۆشیار و دابەشکەر و ئەو کەسانەی جاڕی دەدەن[٦٦٨].

کەواتە، بەڕێوەبەری چاپخانەو بەڕێوەبەری بڵاوکردنەوە بۆ ئەو تاوانە ڕۆژنامەگەرییانەی ئەنجام دەدرێن، بەسیفەتی ئەنجامدەری بنەڕەتی سزا دەدرێن و ئەوانی تریش بەسیفەتی شەریک بەپێی بنەما گشتییەکان سزا دەدرێن، بەڵام ئەگەر هاتوو ئەوانەی پۆلی یەکەم دیارنەبوون، لەو حاڵەتەدا، بەسیفەتی ئەنجامدەری بنەڕەتی لێپرسینەوە لەگەڵ دانەر دەکرێت و بەسیفەتی شەریکیش لەگەڵ ئەوانی دوای ئەو دەکرێت، جا ئەگەر نەزانرا دانەرەکە کێیە، ئەوکاتە، بەسیفەتی ئەنجامدەری ئەسڵی لێپرسینەوە لەگەڵ ئەو کەسە دەکرێت کە ڕۆژنامەکەی چاپکردووە، ئەگەر نەزانرا ئەویش کێیە، ئەوکاتە فرۆشیار و دابەشکەر و ئەو کەسانەی جاڕییان داوە بەسیفەتی ئەنجامدەری ئەسڵی لێپرسینەوەیان لەگەڵ دەکرێت.

ئەمەو ئەو کەسانەی لە پلەی دواییەوە دێن، سەرەڕای لێپرسینەوە لەگەڵ کەسانی پێش ئەوان، ڕزگارییان نابێت لە لێپرسینەوە، ئەگەر نیازپاکی (حسن النیة)ی خۆیان بەبەڵگە بسەلمێنن، ئەگینا بەپێی بنەما گشتییەکان بەسیفەتی شەریک دەکەونە بەر لێپرسینەوە.

شایەنی ئاماژەبۆکردنە، بەڕێوەبەری چاپخانە و بەڕێوەبەری بڵاوکردنەوە و دانەران لەم پۆلێنەدا، بەهۆی هەڵەکانییانەوە بەرپرس دەبن، بەڵام خاوەنی چاپخانەکان بەهۆی هەڵەی دانەرەکانەوە بەرپرسیارییەتییان دەکەوێتە ئەستۆ، لە کاتێکدا فرۆشیار و دابەشکەر و ئەو کەسانەی جاڕی دەدەن، بەهۆی هەڵەی خاوەن چاپخانەکانەوە بەرپرسیار دەبن.

جێی سەرنجە، یاسادانەری فەرەنسی، دەزگای بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامەگەری ناچارکردووە کە شەریکێک بۆ ئیدارەی بڵاوکردنەوەکە دابمەزرێنێ، ئەگەر هاتوو بەڕێوەبەری

---

٦٦٨- بڕوانە دەقی ماددە ٤٢١ی ناوبراو لە بڕگەی (٥-٢-٣-١) خاڵی سێیەم پەراوێزی (٦٥١) لەم تێزەدا.

بڵاوکردنەوەکە ئەو حەسانە دیپلۆماسییەی کە لە مادده (٢٦)[٦٦٩]ی دەستووری فەرەنسی ساڵی ١٩٥٨و ماددەی نۆیەم و دەیەمی پرۆتۆکۆلی ١٩٦٥/٤/٨ لەبارەی حەسانەو ئیمتیازەکانی کۆمەڵەی ئەورووپییەوە هەبوو.

هەڵبەتە یاسادانەری فەرەنسی بۆیە ئەم مەرجەی داناوە، تاکو دەزگای بڵاوکردنەوەی رۆژنامەگەری بۆ خۆدزینەوە لە بەرپرسیاریەتیی تاوانکاری، سوود لەو حەسانە دیپلۆماسییە وەرنەگرێت کە بەڕێوەبەری بڵاوکردنەوە هەیەتی.

هەروەها لە دەقی ماددەی (٤٣)دا هاتووە: «ئەگەر هاتوو زانرا بەڕێوەبەری بڵاوکردنەوە

---

٦٦٩- ئەمەش دەقەکەیەتی بەزمانی فەرەنسی:

Art. 26; Aucun membre du Pariement ne peut etre poursuivi, recherche, arrete, detenu ou juge a l.occasion des opinions ou votes emis par lui dans l.exercice de ses fonctions.

Aucun membre du Parlement ne peut, pendant la duree des sessions, etre poursuivi ou arrete en matiere criminelle ou correctionnelle quavec lautorisation de l.assemblee don't il fait partie, sauf le cas de flagrant delit.

Aucun membre du Parlement ne peut, hors session, etre arrete qu.avec Lautorisation du burean de Passemblee don't il fait partie, sauf le cas de flagrant delit, de poursuites autorisees ou de condamnation definitive.

La detention ou la poursuite d.un membre du Parlement est suspendue si l.assemblee don't il fait partie le requiert.

واتە: «- نابێ لێکۆڵینەوە لەگەڵ هیچ ئەندامێکی پەرلەمان بکرێت یان تۆژینەوەی لێبکرێت یان بگیرێت یان دادگایی بکرێت بەهۆی ئەو بیروڕایانەی کە دەریاندەبڕێت یان لە ئەنجامدانی کارە پەرلەمانییەکەیدا دەنگیان لەسەر دەدات.

- نابێ لێکۆڵینەوە لەگەڵ هیچ ئەندامێکی پەرلەمان بکرێت یان لە کاتی خولەکانی کۆبوونەوەدا بەهۆی کەتنێکەوە یان گەورە کەتنێکەوە بگیرێت ئەگەر بەرەزامەندی ئەو ئەنجوومەنەوە نەبێت کە تیایدا ئەندامە. تەنها لە حاڵەتی کەتنێکی بینراودا نەبێت.

- نابێ هیچ ئەندامێک لە ئەندامانی پەرلەمان بگیرێت لە دەرەوەی خولەکانی کۆبوونەوەدا تەنها بەرەزامەندیی نووسینگەی ئەو ئەنجوومەنە نەبێت کە تیایدا ئەندامە. تەنها حاڵەتی گرتنی لەسەر کەتنێکی بینراودا نەبێت یان ئەو لێکۆڵینەوەیە کە رێگای پێدراوە یان بەیەکجاری ئیدانە کرابێت ناگرێتەوە.

- ئەگەر هاتوو ئەو ئەنجوومەنەی کە ئەوی تێدا ئەندامە داوایکرد، گرتنی ئەندام یان بەردەوامبوون لە دادبینیی (تیجرائاتی) تاوانکاری دژی ئەو رادەگیرێت».

یان شەریکەکەی یان ئەو کەسەی بڵاوی دەکاتەوە کێنە، بەسیفەتی ئەنجامدەری ئەسڵی لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکرێت. بەڵام دانەر بەسیفەتی شەریک لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکرێت»[٦٧٠].

لەم دەقەدا، جارێکی تر، یاسادانەری فەرەنسی جەختی لەسەر تیۆری «بەرپرسیارییەتی پێیادنراو لەسەر یەک بەدوای یەکی» کردۆتەوە و بۆ ئەم مەبەستە بەڕێوەبەری بڵاوکردنەوەی بەبەرپرسی یەکەم داناوە ئەگەر هاتوو زانرا کێیە، دوای ئەو ئینجا دانەر دێت.

جا ئەگەر دژی هەردووکیان داوا بۆ دادگا بەرزکرایەوە، لەو حاڵەتەدا، یەکەمیان بەئەنجامدەری بنەڕەتی دادەندرێت و ئەوەی دووەمیشیان بەشەریک دادەندرێت.

بەڕای ئێمە، یاسادانەری فەرەنسی، لەم حوکمەیدا بۆیە بەڕێوەبەری بڵاوکردنەوەی بەئەنجامدەری ئەسڵی داناوە و دانەریشی بەشەریک داناوە، چونکە تاوانی ڕۆژنامەگەری لە ئاکامی بڵاوکردنەوەدا ڕوودەدات نەک خودی نووسینەکە، بۆیە بەڕێوەبەری بڵاوکردنەوە بەئەنجامدەری ئەسڵی دادەندرێت، چونکە کردەیەکی لە کردەکانی تاوانی ڕۆژنامەگەری ئەنجامداوە، کەچی دانەر بەشەریک دادەندرێت، چونکە لە ئەنجامدانی تاوانەکە

---

٦٧٠- ئەمەش دەقەکەیەتی بەزمانی فەرەنسی:

Article 43

**Modifié par Ordonnance 26 Aout 1944 art 15 JORF 30 août 1944.**

**Modifié par Loi 52-336 25 Mars 1952 art 5 JORF 26 mars 1952.**

Lorsque les directeurs ou codirecteurs de la publication ou les éditeurs seront en cause, les auteurs seront poursuivis comme complices.

Pourront l'être, au même titre et dans tous les cas, les personnes auxquelles l'article 60 du Code pénal pourrait s'appliquer. Ledit article ne pourra s'appliquer aux imprimeurs pour faits d'impression, sauf dans ■ cas ■ les conditions prévus par l'article 107 du Code pénal sur les attroupements ou, à défaut de codirecteur de la publication, dans le cas prévu au deuxième alinéa de l'article 6.

Toutefois, les imprimeurs pourront être poursuivis comme complices si l'irresponsabilité pénale du directeur ou du codirecteur de la publication était prononcée par les tribunaux. En ce cas, les poursuites sont engagées dans les trois mois du délit ou, au plus tard, dans les trois mois de la constatation judiciaire de l'irresponsabilité du directeur ou du codirecteur de la publication.

بەنووسینەکەی بەشداری کردووە. هەرچەندە ئێمە لەگەڵ ئەو بۆچوونەی یاسادانەری فەرەنسیدا نین و پێمان وایە ڕۆڵی دانەر لە ئەنجامدانی تاوانی ڕۆژنامەگەریدا لە ڕۆڵی بەڕێوەبەری بڵاوکردنەوە کەمتر نییە، ئەگەر زیاتریش نەبێت. بۆیە باشتر وابوو دانەریش بەئەنجامدەری بنەڕەتی دابنرێت.

**چوارەم: حوکمەکانی بەرپرسیارییەتیی تاوانکاری لە یاسای عێراقیدا**

یاسادانەری عێراقی لە ماددەی (٨١-٨٣)ی یاسای سزادانی ژمارە (١١١)ی ساڵی ١٩٦٩ی هەموارکراو و برگە (أ)ی ماددەی (٢٩)ی یاسای چاپەمەنیی ژمارە (٢٠٦)ی ساڵی ١٩٦٨ی هەموارکراودا حوکمەکانی بەرپرسیارییەتیی تاوانکاری ڕێکخستووە.

لە ماددەی (٨١)دا[٦٧١] بێ لە دانەر، سەرنووسەری ڕۆژنامەشی خەتابار کردووە و بەئەنجامدەری بنەڕەتی داناوە و سزای بۆ هەردووکیان بڕیوەتەوە. بەڵام ئەگەر هاتوو ڕۆژنامەکە، سەرنووسەری نەبوو، لەو حاڵەتەدا بەرپرسی ئەو لاپەڕەیەی بابەتە تاوانکارییەکەی تیا بڵاوبۆتەوە لەگەڵ دانەری بابەتەکە بەهاوکاری لەبەردەم دادگا بەرپرسیاردەبن و سزا دەدرێن.

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە یاسادانەری عێراقی هەمان ڕەوتی یاسادانەری میسری گرتۆتەبەر لە پەیڕەوکردنی تیۆری بەرپرسیارییەتیی هاوبەش بۆ دانانی دانەر و سەرنووسەر یان بەرپرسی لاپەڕە بەئەنجامدەری بنەڕەتیی ئەو تاوانانەی کە لە ڕێگای ڕۆژنامەگەرییەوە دەکرێن.

هەروەها بەپێی حوکمی ماددە (٨٣)[٦٧٢] یاسای سزادان، ئەو بەرهەمەی کە تاوانەکەی لێ دەکەوێتەوە، ئەگەر هاتوو لە دەرەوەی وڵات داندرابێت یان بڵاوکرابێتەوە

---

٦٧١- ئەمەش دەقەکەیەتی: «مع عدم الاخلال بالمسؤولية الجزائية بالنسبة الى مؤلف الكتاب او واضع الرسم الى غير ذلك من طرق التعبير يعاقب رئيس تحرير الصحيفة بصفته فاعلا للجرائم التي ارتكبت بواسطة صحيفته واذا لم يكن ثمة رئيس تحرير يعاقب المحرر المسؤول عن القسم الذي يحصل فيه النشر...».

٦٧٢- ئەمەش دەقەکەیەتی: «اذا كانت الكتابة او الرسم او طرق التعبير الاخرى التي استعملت في ارتكاب الجريمة قد وضعت او نشرت خارج البلاد او لم يمكن معرفة مرتكب الجريمة عوقب المستورد والطابع بصفتهما فاعلين».
فان تعذر ذلك فالبائع والموزع والملصق وذلك مالم يظهر من ظروف الدعوى انه لم يكن في وسعه معرفة مشتملات الكتابة او الرسم او طرق التعبير الاخرى».

یانیش نەزاندرێ ئەو کەسەی تاوانەکەی کردووە کێیە، لەو حاڵەتەدا، ئەو کەسانەی ڕۆژنامەکە دەهێننە ناو وڵاتەوە یان ئەو کەسانەی چاپی دەکەن، ئەگەر زانرا کێن، بەئەنجامدەری تاوانەکە دادەندرێن و لەسەر ئەو بنچینەیە سزا دەدرێن. بەڵام ئەگەر هاتوو نەزاندرا ئەو کەسانە کێن، لەو حاڵەتەدا فرۆشیار و دابەشکەر و ئەو کەسانەی هەڵیدەواسن بەئەنجامدەری تاوانەکە دادەندرێن.

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە یاسای سزادانی عێراقی لەم حوکمەیدا، سەبارەت بەدەستنیشانکردنی بەرپرسیارییەتی ئەو کەسانەی کە ڕۆژنامەکە دەهێننە ناو وڵاتەوە یان چاپیدەکەن یان دەیفرۆشن یان دابەشیدەکەن یان هەڵیدەواسن، هەمان ڕەوتی یاسای سزادانی میسری گرتۆتەبەر[٦٧٣] لە پەیڕەویکردنی تیۆری «بەرپرسیارییەتیی پۆلێنکراو».

بەم پێیە، داوای سزادان دژی ئەو کەسانەی کە ڕۆژنامەکە دەهێننە ناو وڵاتەوە یان چاپیدەکەن، بەسیفەتی ئەنجامدەری بنەڕەتی بۆ دادگا بەرزدەکرێتەوە ئەگەر زاندرا کێن، بەڵام ئەگەر نەزاندرا کێن، لەوحاڵەتەدا داوای سزادان دژی ئەو کەسانەی ڕۆژنامەکە دەفرۆشن یان دابەشی دەکەن یان هەڵیدەواسن بەسیفەتی ئەنجامدەری بنەڕەتی بۆ دادگا بەرزدەکرێتەوە.

بەڵام، ئەگەر هاتوو زانرا ئەو کەسەی لە عێراقدا بڵاویکردۆتەوە کێیە، ئەو کەسانەی سەرەوە بەسیفەتی ئەنجامدەری بنەڕەتی سزانادرێن، چونکە ماددەی ناوبراو بۆ سزادانی ناوبراوان بەسیفەتی ئەنجامدەری بنەڕەتی مەرجی کردووە «نەزاندرێ ئەنجامدەری تاوانەکە کێیە». هەرچەندە ئەمە ڕێگا لەوە ناگرێت بەپێی بنەما گشتییەکان بەسیفەتی هاوبەشیکردن لە ئەنجامدانی تاوانەکە بۆ دادگا بەرزبکرێتەوە.

هەروەها لە ماددەی (٨٣)[٦٧٤]دا بەرپرسیارییەتیی تاوانکاری داوەتە پاڵ ئەو کەسانەی کە ئەو بەبەتانەی کە لە عێراق یان لە دەرەوەیدا بڵاودەکرێنەوە، وەردەگرن یان وەردەگێڕن یان لە پڕوپاگاندە و گێڕانەوەی سەرزاری کەسانی دیکە وەردەگرن.

بەم پێیە، ئەو کەسەی بابەتێک لەو بابەتە ڕۆژنامەگەرییانەی کە تاوانی ڕۆژنامەگەری

---

٦٧٣- بڕوانە دەقی ماددەی (١٩٦١)ای یاسای سزادانی میسری کە لە بڕگەی (٥-٢-٢-٢) خاڵی یەکەم، پەراوێزی (٦٦٠) لە تێزەدا ئاماژەمان پێی کردووە.

٦٧٤- ئەمەش دەقەکەیەتی: «لایعفي من المسؤولية الجزائية في جرائم النشر كون الكتابة او الرسم او طرق التعبير الاخرى نقلت او ترجمت عن نشرات صدرت في العراق او في الخارج او انها لم تزد عن ترديد اشاعات او روايات عن الغير».

لێدەکەوێتەوە، وەردەگیرێت یان وەردەگێڕێت یان لە پڕۆپاگاندە و گێڕانەوەی سەرزاری کەسانی دیکە وەردەگیرێت بەتەنجامدەری بنەڕەتی دادەنرێت. چونکە وەرگرتن و وەرگێڕان بەبلاوکردنەوەیەکی سەرلەنوێ دادەنرێت. لە ڕاستیدا، ئەم حوکمە وەکو حوکمی ماددە (۱۹۷)ی یاسای سزاداتی میسرییە[٦٧٥].

شایەنی ئاماژەبۆکردنە، هەرچەندە یاسای سزادانی عێراقی لە ئاست بەرپرسیارییەتیی خاوەن ئیمتیاز بێدەنگ بووە، بەلام لە یاسای چاپەمەنی ژمارە (٢٠٦)ی سالی ١٩٦٨ی هەموارکراودا لە برگە (أ)ی ماددەی (٢٩)دا بەرپرسیارییەتیی خاوەن ئیمتیازی دەستنیشان کردووە[٦٧٦].

لەم حوکمەدا بۆمان دەردەکەوێ، یاسادانەری عێراقی بەپێچەوانەی هەردوو یاسادانەری میسری و فەرەنسی خاوەنی ئیمتیازی لە تاوانەکانی ڕۆژنامەگەریدا بەئەنجامدەری بنەڕەتی داناوە و بۆ ئەم مەبەستەش پەیڕەوی تیۆری «بەرپرسیارییەتیی هاوبەش»ی کردووە.

لە کاتێکدا بەپێی یاسای میسری و فەرەنسی، خاوەنی ئیمتیاز تەنها لە قەرەبووکردنەوەی زیانلێکەوتووەکەدا بەرپرسە.

هەروەها ئەم حوکمەی یاسای عێراقی جیاوازی هەیە لەگەڵ یاسای لوبنانیدا، چونکە یاسای لوبنانی تەنها لەو حاڵەتەدا خاوەنی ئیمتیازی بەئەنجامدەری بنەڕەتی داناوە و بەرپرسیارییەتیی تاوانکاری خستۆتە ئەستۆ کە بەتەواوی دەستی لە ئەنجامدانی تاوانەکەدا هەبێت. ئەگینا ئەگەر هاتوو بەتەواوەتی لە ئەنجامدانی تاوانەکەدا دەستی نەبووبێت، بەرپرسیارێتییەکەی لەگەڵ بەڕێوەبەری بەرپرسی ڕۆژنامەکە و وتارنووسەکە تەنها بۆ قەرەبووکردنەوەی زیانلێکەوتووەکە هاوبەش دەبێت[٦٧٧].

بەڕای ئێمە، یاسادانەری عێراقی لەم حوکمەیدا دەرهەق بەخاوەن ئیمتیاز زۆر توند بووە، لەکاتێکدا، ئەو ڕۆڵەی کە خاوەنی ئیمتیاز لە دەرهێنانی ڕۆژنامەدا دەیبینێ،

---

٦٧٥- بڕوانە دەقی ماددەی (١٩٧)ی یاسای سزادانی میسری کە لە برگەی (٥-٢-٢-٢) خاڵی یەکەم، پەراوێزی (٦٦٢) لەم تێزەدا ئاماژەمان پێی کردووە.

٦٧٦- ئەمەش دەقەکەیەتی: «مالك المطبوع الدوري ورئيس تحريره وكاتب المقال مسؤولون عن الجرائم المعينة في هذا القانون وملزمون بالتكافل بدفع التعويض الذي يحكم به المحكمة».

٦٧٧- لەم بارەیەوە بڕوانە برگەی (٥-٢-٢-٢) خاڵی دووەم (حوکمەکانی بەرپرسیارییەتیی تاوانکاری لە یاسای لوبنانیدا لەم تێزەدا.

بەشێوەیەکی گشتی. جیاوازی هەیە لە ڕۆڵی سەرنووسەر و وتارنووس، چونکە عادەتەن بەسەرمایە لە دەرهێنانی ڕۆژنامەدا بەشداری دەکات و دوورە لە سەرپەرشتیکردن، تەنها هەندێجار نەبێت کە بەنووسین بەشداری دەکات یان ڕۆڵێکی بزۆەتیڤی لە ئەنجامدانی تاوانە ڕۆژنامەگەرییەکەدا دەبێت. بۆیە بەڕای ئێمە باشتروابوو، یاسادانەری عێراقی جیاوازی لەنێوان ئەو دوو حاڵەتەدا بکردایە بۆ دەستنیشانکردنی بەرپرسیاریەتیی تاوانکاری خاوەنی ئیمتیاز.

**پێنجەم: حوکمەکانی بەرپرسیاریەتیی تاوانکاری لە یاسای هەرێمی کوردستان**

یاسادانەری هەرێمی کوردستانی عێراق ماددەی چوارەم و ماددەی دەیەمی یاسای چاپەمەنیی ژمارە (١٠)ی ساڵی ١٩٩٣ی هەمووارکراوی بۆ بەرپرسیاریەتیی یاسایی تاوانەکانی ڕۆژنامەگەری تەرخانکردووە.

لە ماددەی چوارەمدا هاتووە: «خاوەنی ئیمتیاز و سەرنووسەری چاپکراوی دەوری بەهاوبەشی لەبەردەم یاسا و دادوەریدا لێی بەرپرسیارن».

هەروەها لە ماددەی دەیەمدا هاتووە: «خاوەنی ئیمتیاز یا سەرنووسەر و وتارنووس لە چاپکراوی دەوریدا و پێشکەشکەری چاپکراوی نادەوری لە حاڵەتی سەرپێچیکردنی حوکمەکانی ئەم یاسایەدا بەپێی یاسا ڕەچاوکراوەکان دەکەونەبەر لێپرسینەوەی یاساییەوە». لە ماددەی چوارەمدا حوکمی بەبەرپرسیاریەتیی خاوەنی ئیمتیاز و سەرنووسەری چاپکراوی دەوری بەهاوبەشی داوە، لەکاتێکدا لە ماددەی دەیەمدا، حوکمێکی پێچەوانەی ئەمەی داوە، ئەویش بەرپرسیاریەتی یەکێک لەو دووانەیە بەهاوبەشی لەگەڵ وتارنووسەکەدا.

بەڕای ئێمە، ئەم حوکمە، حوکمی ماددەی پێشووی بەشێوەیەکی زمنی پووچەڵ کردۆتەوە. بۆیە داوا لە یاسادانەری هەرێمی کوردستان دەکەین، ماددەی چوارەم هەڵبووەشێنێتەوە تاکو ئەم دژوارییەی نێوان ئەم دوو حوکمە نەمێنێ، هەرچەندە دادوەر بۆی هەیە لەڕێگای لێکدانەوەی فراوان (التفسیر الواسع)ەوە بەسەر ئەم خەوش(عیب)ەدا زاڵ بێت و بۆ حوکمدان تەنها خۆی بەدەقی ماددەی دەیەمەوە ببەستێتەوە. کەواتە یاسادانەری هەرێمی کوردستان لە تاوانەکانی ڕۆژنامەگەریدا، بێ لە دانەر خاوەنی ئیمتیاز یان سەرنووسەری ڕۆژنامەشی خەتابار کردووە و بەئەنجامدەری بنەڕەتی داناون.

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە یاسادانەری هەرێمی کوردستان، هەمان ڕەوتی یاسادانەری

میسری و عیراقی گرتۆتەبەر لە پەیڕەویکردنی تیۆری بەرپرسیاریەتی هاوبەش بۆ دانانی وتارنووس و خاوەنی ئیمتیاز یان سەرنووسەر بەئەنجامدەری بەتەوتی ئەو تاوانانەی کە لە ڕێگای ڕۆژنامەگەریەوە ئەنجام دەدرێن.

کەواتە، بەرپرسیاریەتیی خاوەنی ئیمتیاز یان سەرنووسەر لە تاوانەکانی ڕۆژنامەگەریدا پشت بەگریمانەیەکی یاسایی دەبەستێت، ئەویش گریمانەکردنی چاوپیاخشاندن و ئاگاداریی خاوەنی ئیمتیاز و سەرنووسەرە بەو بابەتانەی کە لە ڕۆژنامەکەیدا بلاوکراونەتەوە، هەروەها بەهەندوەرگرتنی ئەو بەرپرسیاریەتییەی کە لە ئاکامی بلاوکردنەوەکەدا دێتە ئاراوە، ئەگەر چاویشی بەبابەتەکاندا نەخشاندبێت[٦٧٨].

ئەمەو، خاوەنی ئیمتیاز یان سەرنووسەر، ناتوانن ئەو بەرپرسیاریەتییە ڕەتبکاتەوە، گوایا لەکاتی بلاوکردنەوەدا لەوێ نەبووە یان کاروبارەکانی نووسینی بەغەیری خۆی سپاردووە یان هەر لە بنەڕەتەوە چاوی بەوتارە بلاوکراوەکە نەکەوتووە یان ئەو دەرفەتەی نەبووە پیایدا بچێتەوە، هەرچەندە بەلگەش بۆ سەلماندنی ئەم پاساوانەی بهێنێتەوە.

کەواتە، یاسادانەری هەرێمی کوردستان، سەبارەت بەهەلەی خاوەنی ئیمتیاز یان سەرنووسەر لە ڕوودانی تاواندا، جیاوازی لە نێوان هەلەی بەمەبەست (خطأ عمدي) و هەلەی نامەبەست (خطأ غير عمدي) نەکردووە[٦٧٩].

بۆیە داوا لە یاسادانەری هەرێمی کوردستان دەکەین کە چاوێکی تر بەم حوکمەدا بخشێنێتەوە و جیاوازی بکات لە نێوان حالەتی ڕوودانی تاوانەکە لە ئاکامی هەلەی بەمەبەستی خاوەنی ئیمتیاز یان سەرنووسەر، واتە بوونی مەبەستی تاوانکاری لەلای هەندێک لەوانە و، لە نێوان حالەتی ڕوودانی تاوانەکە لە ئاکامی هەلەی نامەبەستدا، واتە ڕوودانی تاوانەکە لە ئاکامی کەمتەرخەمیی خاوەنی ئیمتیاز یان سەرنووسەردا. ئینجا بۆ هەرحالەتێک لەو حالەتانە، سزایەکی سەربەخۆ دابنێت.

---

٦٧٨- حسن الفكهاني و عبدالمنعم حسني: الموسوعة الذهبية للقواعد القانونية التي قررتها محكمة النقض المصرية، سەرچاوەی پێشوو، ل٦٨٤.

٦٧٩- تاوان بەگشتی، بەپێی ئەو هەلەیەی کە لە ئاکامیدا ڕوویداوە، دەکرێت بەتاوانەکانی بەمەبەست (جرائم العمدية) و تاوانەکانی نامەبەست (جرائم غير العمدية). تاوانەکانی بەمەبەست، ئەو تاوانانەن کە لە ئاکامی هەلەی بەمەبەستەوە ڕوو دەدەن، بەلام تاوانەکانی نامەبەست، ئەو تاوانانەن کە لە ئاکامی هەلەی نامەبەستەوە ڕوودەدەن. بۆ زانیاری زیاتر لەمبارەیەوە بڕوانە (د. محمد زكي ابوعامر): قانون العقوبات اللبناني – القسم العام، سەرچاوەی پێشوو، ل١٧٨ بەدواوە

ئیمە پێمان باشە، خاوەنی ئیمتیاز تەنها لە حالەتی هەڵەی بەمەبەستدا بەرپرسیاریەتیی تاوانکاری بکەوێتە ئەستۆ، بەڵام سەرنووسەر لە هەردوو حالەتدا بەمەرجێک سزایەکەی لە حالەتی هەڵەی بەمەبەستدا توندتربێت لە سزای حالەتی نامەبەستدا.

شایەنی ئاماژەبۆکردنە، هەڵوێستی دادگای هەرێمی کوردستان، لەبارەی دانانی بەرپرسیاریەتیی سەرنووسەر بەبەرپرسیارێتییەکی هاوبەش لەگەڵ وتار نووسدا و جیاوازی نەکردن لەنێوان هەڵەی بەمەبەست و هەڵەی نا مەبەستی سەرنووسەردا، گۆکە لەگەڵ هەڵوێستی یاسادانەری هەرێمی کوردستاندا.

دادگای کەتنی هەولێر لە رۆژی ٢٦/١١/٢٠٠٢دا، حوکمی ساڵێک زیندانی بەبێ جێبەجێکردن و غەرامەکردنی هەزار دیناری لەسەر هەریەک لە (ا.هـ) سەرنووسەری رۆژنامەی «هاوولاتی» و هونەرمەند (ب.س)دا.

شایەنی باسە، ئەم دادگایی کردنە، لەسەر داوای (ب.ا)ی نوێنەری حکوومەت و لە ئاکامی بڵاوکردنەوەی سکاڵای هونەرمەندی ناوبراو لە ژمارە (٥٩)ی رۆژنامەی ناوبراو کە ناراستەی ئەنجوومەنی وەزیرانی کردبوو سەبارەت بەکڕینی چەند تابلۆیەک کە ئەنجوومەنی وەزیران لە بری پاداشت بۆ هونەرمەندانی شێوەکاری عێراقیی دیاری کردبوو، کرا.

لەو سکاڵایەدا، هونەرمەندی ناوبراو، داوای چارەسەرکردنی نرخی ئەو تابلۆیانە دەکات کە (ب.ا) وەکو نوێنەری حکوومەت وەریگرتبوو، بەڵام پارەکەی نەداوەتە خاوەنەکانیان.

نوێنەری حکوومەت (ب.ا) ئەمەی بەتانە و تەشەر داناوە، بۆیە داوای دژی هەریەکە لە (ا.هـ) و(ب.س) بۆ دادگا بەرز کردەوە. ئەمەو، دادگا لە جەولەی یەکەمدا، بڕیاری بەئازادکردن (افراج)ی ناوبراوان دا. بەڵام دوای تەمییز کردنەوەی بڕیاری دادگا لەلایەن (ب.ا)ەوە، دووبارە ناوبراوان لەبەردەم دادگای کەتنی هەولێر دادگایی کرانەوە و ئەمجارەیان دادگای ناوبراو بڕیاریدا بەزیندانی کردنی سەر و ساڵێک بۆ هەریەک لە (ا.هـ) و (ب.س) بەبێ جێبەجێکردن و غەرامەیەکیش بەبڕی هەزار دینار بۆ هەر یەکێکیان[680].

بەڵام سەبارەت بەبەرپرسیاریەتیی تاوانکاری ئەو کەسەی کە رۆژنامەکە چاپ دەکات

---

٦٨٠- رۆژنامەی «هاوولاتی» ژمارە (١٠١)ی رۆژی دووشەمە ٢/١٢/٢٠٠٢، ل٥.

یان دەیفرۆشێ یان دابەشی دەکات یان هەڵی دەواسێت هەرچەندە، یاسای چاپەمەنیی هەرێمی کوردستان، باسی نەکردووە، لە حاڵەتێکدا ئەگەر هاتوو ڕۆژنامەکە سەرەتا لەدەرەوەی هەرێمی کوردستان بڵاوکرابێتەوە دوایی هێنابێتیان بۆ هەرێمی کوردستان، یانیش ئەنجامدەری تاوانەکە زانراو نەبێت. هەروەها بەپێچەوانەی یاسادانەری عێراقی و میسری، باسی بەرپرسیارییەتی ئەو کەسەی نەکردووە کە بابەتێک لەو بابەتە ڕۆژنامەگەرییانەی کە تاوانی ڕۆژنامەگەری لێ دەکەوێتەوە، لەسەر زاری کەسانی دیکە وەردەگرێت یان وەری دەگێڕێت، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە نابێ ئەو کەسانە بەرپرسیارییەتیی یاساییان بخرێتە ئەستۆ، بەڵکوو دەبێ بگەڕێینەوە بۆ بنەما گشتییەکانی بەرپرسیارییەتیی تاوانکاری لە یاسای سزادانی ژمارە (١١١)ی ساڵی ١٩٦٩ی هەموار کراو، لەم حاڵەتەشدا، تاوانی ئەو کەسانە، تاوانێکی ئاسایی دەبێ نەک تاوانی ڕۆژنامەگەری و بەرپرسیارێتییەکەشیان لەسەر بنەمای هەڵەی نامەبەست دەبێ کە لە ناکامی کەمتەرخەمیکردنی لە ئەرکێکی یاساییەوە دێتەدی.

هەروەها لە دووتوێی ئەم یاسایەدا بۆمان دەردەکەوێ کە یاسادانەری هەرێمی کوردستان تەنها بەرپرسیارییەتیی تاوانکاری تاوانەکانی ڕۆژنامەگەریی چاپکراوی ڕێکخستووە و ئەو بەرپرسیارێتییە تاوانکارییەش کە لە ناکامی تاوانەکانی ڕۆژنامەگەریی بینراو و بیستراو یاخود ئینتەرنێتەوە دێتەدی بۆ بنەما گشتییەکانی یاسای سزادانی بەجێ هێشتووە.

بۆیە داوا لە یاسادانەری هەرێمی کوردستان دەکەین، ئەو تاوانانەش ڕێک بخات کە لە ڕێگای ڕۆژنامەگەریی بینراو و بیستراو و ئینتەرنێتەوە ڕوودەدەن، بەومەرجە، سروشتی هەرکەناڵێک لەو کەناڵانەی ڕاگەیاندن و جۆری پەخشکردنەکەی (ئایا ڕاستەوخۆیە یان ناڕاستەوخۆ) لەبەرچاو بگرێت بۆ ئەم مەبەستە.

# کۆتایی

لە کۆتایی ئەم توێژینەوەیەدا، هیواداریـن ئامانجەکەیان پێکابێت کە بریتییە لە تیشک خستنە سەر ناوەڕۆکی یاسای چاپەمەنیی هەرێمی کوردستان و بەراوردکردنی لەگەڵ یاساکانی بەراوردا بەمەبەستی دەستنیشانکردنی لایەنە بەهێز و لاوازەکانی تاکو ڕێگا بۆ یاسادانەری کوردستان خۆشبێت بۆ دەوڵەمەندکردن و پتەوکردنی سیستمی یاسایی ئازادیی ڕۆژنامەگەری لە هەرێمی کوردستانی عێراقدا. ئەمەو، لە ئاکامی ئەم توێژینەوەیەدا گەیشتینە ئەم ئەنجام و ڕاسپاردانەی خوارەوە:

## ١- ئەنجام

- چەمکی ئازادی خۆی لە خۆیدا لە تیۆرێکەوە بۆ تیۆرێکی تر دەگۆڕێ. ئازادی لە لیبرالیدا جیاوازی هەیە لەگەڵ بیری سۆشیالدا، هەروەها ئازادی لە ئاینی ئیسلامدا سروشتێکی تایبەتی هەیە جیاوازە لە هەردوو تێڕوانینی سەرەوە. ئەم تێڕوانینە جیاوازەش ڕەنگدانەوەی دەبێت بەسەر ئازادیی ڕۆژنامەگەریدا.

- ئازادیی ڕۆژنامەگەری لە ئیسلامدا بەرپرسیارێتی لەگەڵدایە، چونکە «ئازادی» و «بەرپرسیارێتی» بەبۆچوونی ئاینی ئیسلام دوو چەمکی لەیەک جیانەکراوەن.

- ئازادیی ڕۆژنامەگەری یەکێکە لەو بابەتە گرنگانەی کە هەمیشە لای گەلانی دیموکراتیخواز و کۆمەڵگەی نێودەوڵەتییەوە جێگای بایەخ بووە، بۆیە بەڵگەنامە نیشتمانی و جیهانییەکانی مافی مرۆڤ و دەستووری زۆربەی وڵاتانی دنیا مافی ڕادەربڕینیان بەمافێکی بنەڕەتی لە مافەکانی مرۆڤ داناوە.

- دیموکراسییەت باشترین سیستەمە بۆ ڕێزگرتن لە مافەکانی مرۆڤ کە ئازادیی ڕۆژنامەگەری یەکێکە لەو مافانە، هەروەها ئازادیی ڕۆژنامەگەریش بەگیانی دیموکراسییەت دەژمێردرێت و باشترین پاڵپشتە بۆی و هۆکارێکی سەرەکیشە بۆ بەردەوام بوونی پەیوەندیی نێوان گەل و حوکم بەدەستان.

- لەو وڵاتە دیموکراتییانەی کە تیایاندا دەرفەت بەفرە حزبی دەدرێ، حزبەکان لە ڕێگای ڕۆژنامەگەرییەوە گوزارشت لە بیروڕای خۆیان دەکەن، بۆیە لەو وڵاتانەدا شتێکی ئاساییە کە دامەزرانی پارتە سیاسییەکان دامەزراتی ڕۆژنامەیان لێ بکەوێتەوە، ئەمەش خۆی لە خۆیدا وادەخوازێ کە ڕۆژنامەگەری و سیاسەت دوو جەمسەری بەرامبەریەک بن و لەم

هاوکێشەیەشدا ڕۆژنامەگەریی ئازاد چاودێریی دەسەڵاتی سیاسی دەکات و لەکاتی سنووربەزاندنی حوکمڕاناندا دەتوانێ هەوڵ بدا دەسەڵاتی سیاسی ڕابگرێ ئەگەر لە بەرژەوەندیی گشتی لایداو کەوتە خزمەتی کەسێک یان گرووپێکی تایبەت.

- لە ڕووی پراکتیکەوە، ئازادیی ڕۆژنامەگەری لە هەموو کۆمەڵگایەک و وڵاتێکی ئیسلامیدا وەکویەک پیادە ناکرێت، بەڵکوو بەپێی فەلسەفەی حوکمی ئەو وڵاتە دەگۆڕێت. بۆیە نەبوونی ئازادیی ڕۆژنامەگەری لە هەندێک دەوڵەت کە کار بەشەریعەتی ئیسلامی دەکەن، خەتاکەی لە ئایینی پیرۆزی ئیسلامدا نییە، بەڵکوو لەخودی سیستمە سیاسییەکاندایە.

- سیستمی ئاگاکاری لە سیستمی مۆڵەت وەرگرتنی پێشەکی باشترەو لەگەڵ گیانی سەردەم و ئەو پێشکەوتنە یەک لە دوایەکانەی جیهان کە لە هەزارەی سێیەمدا لە گشت بوارە جیاجیاکانی ژیان بەخۆیەوە بینیوە، بەتایبەتی لە بوارەکانی گواستنەوە و گەیاندنی زانیارییەکان و بەجیهانیکردنی ڕاگەیاندن لە میانی تۆڕی ئینتەرنێت و پرنسیپەکانی مافی مرۆڤ و دیموکراسییەت دەگونجێ.

- ئەو کەسەی کە ناتوانێ لەبەر هەر هۆیەک بێت، مۆڵەتی دەرکردنی ڕۆژنامە لە هەرێمی کوردستان وەربگرێت، دەتوانێ لەو وڵاتانەی کە لەجیاتی مۆڵەتی پێشینە کار بەسیستمی ئاگاکاری دەکەن، ڕۆژنامە دەربکات و ئینجا بیهێنێتەوە هەرێمی کوردستان، یاخود دووبارە لە کوردستان چاپی بکاتەوە. لەو حاڵەتەشدا یاسادانەری کوردستان ئەو ئامانجە ناپێکێ کە لە ماددە (٥)دا بۆی تێکۆشیوە.

- بڕینەوەی ئەو میرانەیەی کە لە نووسراوی وەزارەتی دارایی و ئابووریی هەرێمی کوردستان ژمارە (٦٧٩٥)ی ١٠/٨/١٩٩٨ دیارکراوە بۆ دەرهێنان و نوێکردنەوەی ڕۆژنامە و چاپکراوی دەوری، کۆسپە لەبەردەم کەسانی کەم دەرامەت بۆ دەرکردنی ڕۆژنامە و چاپەمەنی دەوریدا.

- بیرۆکەی پارمتەی دارایی پەیوەندیی هەیە بەئایدیۆلۆژیای بۆرژوازییەکان و مەبەستی سەرەکی لە دانانیدا بریتییە لە مۆنۆپۆلکردنی ڕۆژنامە و چاپکراوی دەوری لەلایەن چینی بۆرژوازییەوە و بێبەشکردنی چینی هەژارانە لێی، هەروەها ئەم سیستمە لەگەڵ پرنسیپەکانی مافی مرۆڤ و دیموکراسییەت کەمتر گونجاوە و ڕەنگە گرنگترین پرنسیپ لە پرنسیپەکانی مافی مرۆڤ بڕوخێنێ کە پرنسیپی یەکسانیی مرۆڤە لە زۆر ڕوودوە.

- لە ئاکامی زۆری و پەرتیی ئەو یاسایانەی کە کاری ڕۆژنامەگەری لە هەندێ وڵاتدا ڕێک دەخەن، گرفتێکی گەورە ڕووبەڕووی ڕۆژنامەنووس و ئەو کەسانە دەبێتەوە کە کاری ڕۆژنامەنووسی دەکەن و وادەکا کە ئاگاداری سنووری ئازادیی بیروڕادەربڕینەکەیان نەبن و نەزانن هەتا کوێیە.

- لەبەرئەوەی دەسەڵاتی ئیدارە بۆ گلدانەوە و دەستبەسەراگرتنی ڕۆژنامە دەسەڵاتێکی لاوەکییە و دەسەڵاتی دادگا لەم بارەیەوە دەسەڵاتێکی بنچینەیە، و لەبەر ئەوەی یاسای چاپەمەنی لە ماددە (١٢) برگەی (١)دا ئەم دەسەڵاتەی لە دادگا سەندۆتەوە، بۆیە ئیدارەش بۆی نییە ڕۆژنامە گلبداتەوە و دەستی بەسەرابگرێت.

- دەقنووسکردنی هەندێک پرنسیپی گشتی لە دەستووردا بەس نییە بۆ زامنکردنی ئازادیی ڕۆژنامەگەری، بەڵکوو دەبێ هەندێک گرێنتی تری وەک پاراستنی دادگەری و پاراستنی نادادگەری و پاراستنی تاوانکاری لەپاڵ ئەمە هەبن بۆ ئەوەی ببنە پاڵپشت بۆ ئەم پرنسیپانە و ئەو دەستدرێژییانەش ڕەت بکەنەوە کە لەلایەن یاسادانەرەوە یان لەلایەن ئیدارەوە دەکرێنە سەر ئازادیی ڕۆژنامەگەری.

- ئەو مافانەی ڕۆژنامەنووس کە لە دەقی ماددە (١٩)ی یاسای سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی کوردستان هاتووە مافی ناسەرەکین و یاسادانەری کوردستانی بەلایەنی مافە سەرەکییەکانی ڕۆژنامەنووسان نەچووە کە لە هەموویان گرنگتر مافی سەربەخۆبوون لە کار و پیشەکانیاندا و مافی دەستەبەرکردنی زانیاری و ئامار و هەواڵ لە دەزگا حکوومی و ناحکوومییەکانەوە، هەروەها مافی وەرگرتنەوەی وەڵامی گشت ئەو پرسیارانەی هەبێ کە ئاراستەی لایەنە پەیوەندیدارەکانیان دەکات بەمەبەستی ڕاپەڕاندنی کارەکەی، هەروەها مافی ئامادەبوونی گشت کۆنگرە و کۆبوونەوە گشتییەکانی هەبێت، هەروەها نابێ زۆری لە ڕۆژنامەنووس بکرێ سەرچاوەی زانیارییەکانی خۆی ئاشکرا بکات.

- زۆربەی دەقەکانی یاسای سزادانی ژمارە (١١١)ی ساڵی ١٩٦٩ و هەندێک یاسای تری ڕێکخەری کاری ڕۆژنامەنووسی لە هەرێمی کوردستانی عێراقدا تەمومژاوین و زیاتر لە مانایەک دەبەخشن، بۆیە ماناکانیان بەپێی ئارەزووی دەسەڵات دەگۆڕێت.

- یاسادانەری هەرێمی کوردستان، سەرەڕای ئەوەی هەندێک ئەرکی خستۆتە ئەستۆی ڕۆژنامەنووس لە ماددەی (٢٠)ی یاسای سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی کوردستان ژمارە

(٤)ی ساڵی ١٩٩٨و ماددەی (٩)ی یاسای چاپەمەنیی ژمارە (١٠)ی ساڵی ١٩٩٣ی هەموارکراودا، کەچی سزا تاوانکارییەکانییانی دەستنیشان نەکردووە، بۆیە دەبێ بگەڕێینەوە بۆ بنەما گشتییەکانی یاسای سزادانی ژمارە (١١١)ی ساڵی ١٩٦٩ی هەموارکراو و یاسای مافی دانەر ژمارە (٣)ی ساڵی ١٩٧١چەندین یاسای تر، کە یاسای بەرکارن لە هەرێمی کوردستانی عێراقدا. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە هەردوو یاسادانەری عێراقی و کوردستانی، لە دەقنووسکردنی تاوانەکانی ڕۆژنامەگەری، کاریان بەسیستمی یەکبوونی یاسا (وحدة التشريع) نەکردووە، ئەمەش وایکردووە، لە گەڕان بەدوای دەقە یاساسزاییەکاندا، دادگا ئەرکەکەی قورس بێت.

- تانەوتەشەری ڕێگاپێدراو لە بنەڕەتدا بەتاوان داندراوە و گشت ڕایەڵەکانیشی هەنە و یاسای سزادانیش سزای بۆ داناوە، بەڵام ئەگەر ڕوویدا، لەبەر هەندێک هۆ، لە هەندێک حاڵەتی دیاریکراودا، ئەنجامدەرەکەی سزا نادرێت، چونکە هەرکاتێک هۆیەک لە هۆیەکانی ڕێگاپێدانی تانەوتەشەرەکە و مەرجەکانی هەبوون، ئاکامێکی ڕاستەوخۆی بەسەر ڕێگاپێدانی ئەو تانەوتەشەرەوە دەبێت.

- توندوتیژیی دەستەواژەکانی ڕەخنە بێ ئەوەی پێویست بێت، هەروەها نەگونجانیان لەگەڵ ئامانجی ڕەخنەکە، گرنگترین گەرێتەیە بۆ سەلماندنی نیازخراپیی ڕەخنەگر و دانانی ڕەخنەکە بەتاوانی تانەوتەشەر.

## ٦-٢ ڕاسپاردە

- داوا لە یاسادانەری هەرێمی کوردستان دەکەین، کۆتایی بەسیستمی مۆڵەت بهێنێت و کار بەسیستمی ئاگاکاری ڕەها بکات، بۆئەم مەبەستەش یاسای چاپەمەنیی ژمارە (١٠)ی ساڵی ١٩٩٣ جارێکی تر هەموار بکاتەوە، بەچەشنێک لەگەڵ جیهانگیری و شۆڕشی زانیارییەکان و ئینتەرنێت و پێشکەوتنەکانی ئەم سەردەمە بگونجێت کە سنووری وڵاتانیان لەبەردەم شاڵاوی هۆزیدا تێک شکاندووە و تایبەتمەندێتییەکانی دابونەریت و ئادابی گشتیی کۆمەڵگاکانیشیان گۆڕیوە.

- یاسادانەری کوردستان لە پێناسەکردنی چاپکراوی دەوریدا سەرکەوتوو نەبووە، چونکە ئەو ماوەیەی دیارنەکردووە کە دەبێ چاپکراوی دەوری تیایدا دەربچێت، تاکو بەچاپکراوی دەوری ناوبنرێت، بەڵکوو لەجیاتی ئەوە ئیکتیفای بەدەستەواژەی (بەردەوام بەژمارەی زنجیرەیی و لە کاتێکی دیاریکراودا دەربچێت) کردووە، لەکاتێکدا هەندێک چاپکراو هەن

کەسانێک بەبەردەوامی و بەژمارەی زنجیرەیی دەری دەکەن بێ ئەوەی پێی بوترێ چاپکراوی دەوری، وەکو ئەو کتێبانەی کە بەزنجیرە دەردەچن. بۆیە پێشنیار دەکەین، یاسادانەری کوردستان چاوێکی تر بەم پێناسەیەدا بخشێنێتەوە و بەم شێوەیەی خوارەوە دووبارە دایبڕێژێتەوە: «چاپکراوی دەوری بەپێی ئەم یاسایە، هەموو ڕۆژنامەیەک یان گۆڤارێک یان بڵاوکراوەیەکی هەواڵ دەگرێتەوە کە بەرێکوپێکی و بەژمارەی زنجیرەیی و بەبڕی یەک ژمارە لە هەر سێ مانگ جارێک بەلانی کەمییەوە دەربچێت، دەگرێتەوە، بەمەرجێک نابێ ئەو چاپکراوەیە خەسڵەتێکی زانستی یان هونەریی یان تەکنەلۆژی یان پیشەیی ڕووت (بحت)ی هەبێت».

- دەقی ماددە (٣٠) بڕگەی (ب)ی یاسای چاپەمەنیی عێراقی کە مافی چاودێریکردنی ئەو بڕیارانەی لە دادگای کارگێری سەندۆتەوە کە بەپێی یاسای ناوبراو دەردەچن، ناکۆکە لەگەڵ دەقی ماددە (٨)ی جاڕی جیهانیی مافی مرۆڤ، و بڕگە (ب)ی ماددە (٦٣) دەستوور کە کەفالەتی مافی دادبینیی بۆ هەموو هاووڵاتییان کردووە. بۆیە دەقی ناوبراو بەدەقێکی نادەستووری دادەندرێت، هەر لەم ڕوانگەیەشەوە، داوا لە یاسادانەری عێراقی دەکەین کە ئەم دەقە هەڵبوەشێنێتەوە بۆ ئەوەی دادگای کارگێری ڕۆڵی خۆی لە پاراستن و کەفالەتکردنی ئازادیی ڕۆژنامەگەری لە دەستدرێژییەکانی ئیدارە وەکو پێویست ببینێ.

- پێشنیار دەکەین، یاسادانەری کوردستان یاسای سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی کوردستان ژمارە (٤)ی ساڵی ١٩٩٨ هەموار بکات و دان بەهەندێک مافی تری پێویست بۆ ڕۆژنامەنووسانی کوردستان بنێت، لەو مافانەش مافی سەربەخۆبوونیان لە کار و پیشەکانیاندا. هەروەها مافی تەماشاکردن و وەرگرتنی زانیاری و هەواڵەکان لە دەزگا حکومی و ناحکومییەکان لەگەڵ مافی ئامادەبوون لە کۆنگرە و کۆڕ و کۆبوونەوە گشتییەکان، بۆ ئەوەی ڕۆژنامەنووس لە چاودێریکردنی کاروبارەکانی حکومەت و ئەنجامدانی کارەکەی کاراتر بێت.

- راچاکە یاسادانەر خۆی لە ڕیزکردنی ئەو هۆکارانەی کە گوزارشتیان پێ دەکرێت هەروەها ئەو ڕێگایانەش کە ئاشکراییان (علانیة)ی پێ دێتەدی، دووربخاتەوە و تەنها مەرجی بوونی رایەڵی بەئاشکرایی (علانیة) دابنێت، بێ ئەوەی ئەو هۆکارانە دەستنیشان بکات کە بەهۆیانەوە بڵاوکردنەوەکە ئەنجام دەدرێت یان ئاشکرا دەکرێت. چونکە ئەمڕۆ لەسایەی تەکنەلۆژیای نوێوە، دنیا زوو زوو داهێنانی نوێ لە بواری گەیاندن و

ڕۆژنامەگەریدا بەخۆیەوە دەبینن، بەچەشنێک ڕێزکردنی ئەم وەسیلانە لە ڕووی پراکتیکەوە هیچ بایەخی نابێت.

- بەڕای ئێمە، ماددەی دەیەمی یاسای چاپەمەنیی کوردستان، حوکمی ماددەی چوارەمی بەشێوەیەکی زمنی پووچەڵ کردۆتەوە. بۆیە لە یاسادانەری هەرێمی کوردستان داوا دەکەین، ماددەی چوارەم هەڵبوەشێنێتەوە تاکو ئەم دژوارییەی نێوان ئەم دوو حوکمە نەمێنێ، هەرچەندە دادوەر بۆی هەیە لەڕێگای لێکدانەوەی فراوان (التفسیر الواسع)ەوە بەسەر ئەم کەم وکورتییەدا زاڵ بێت و بۆ حوکمدان تەنها خۆی بەدەقی ماددەی دەیەمەوە ببەستێتەوە.

- یاسادانەری هەرێمی کوردستان، سەبارەت بەهەڵەی خاوەنی ئیمتیاز یان سەرنووسەر لە ڕوودانی تاواندا، جیاوازی لە نێوان هەڵەی بەمەبەست (خطأ المقصود) و هەڵەی نامەبەست (خطأ غیر المقصود) نەکردووە، بۆیە داوای لێ دەکەین کە چاوێکی تر بەم حوکمەدا بخشێنێتەوە و جیاوازی بکات لەنێوان حاڵەتی ڕوودانی تاوانەکە لەناکامی هەڵەی بەمەبەستی خاوەنی ئیمتیاز یان سەرنووسەر، واتە بوونی مەبەستی تاوانکاری لەلای هەندێک لەوانە و، لە نێوان حاڵەتی ڕوودانی تاوانەکە لەناکامی هەڵەی نامەبەستدا، واتە ڕوودانی تاوانەکە لەناکامی کەمتەرخەمیی خاوەنی ئیمتیاز یان سەرنووسەردا. ئینجا بۆ هەرحاڵەتێک لەو حاڵەتانە، سزایەکی سەربەخۆ دابنێت. ئێمە پێمان باشە، خاوەنی ئیمتیاز تەنها لە حاڵەتی هەڵەی بەمەبەستدا بەرپرسیارییەتیی تاوانکاری بکەوێتە ئەستۆ، بەڵام سەرنووسەر لە هەردوو حاڵەتدا بەمەرجێک سزایەکەی لە حاڵەتی هەڵەی بەمەبەستدا توندتربێت لە سزای حاڵەتی نامەبەستدا.

- پێشنیار دەکەین، ئەو بنەما یاساییانەی کاری ڕۆژنامەگەری ڕێک دەخەن لەگەڵ تاوانەکانی ڕۆژنامەگەری و سزاکانیان لە کۆدێکدا دەقنووس بکرێن، بۆ ڕێگاگرتن لەبەردەم دژواربوونی بنەماکانیان لەگەڵ یەکتریدا، هەروەها بۆ جیاکردنەوەیان لە تاوانەکانی ناڕۆژنامەگەری و ساناکردنی ناسینیان.

- داوا لە یاسادانەری هەرێمی کوردستان دەکەین، لە پێناو ڕەخساندنی دەرفەتێکی زیاتر بۆ ڕۆژنامەنووسان و ئازادکردنی ڕۆژنامەگەری لەو کۆت و بەندانەی کە دەبنە ئاستەنگ لەبەردەمیدا، تاوانەکانی ڕۆژنامەگەری بەرتەسک بکاتەوە و لەجیاتی ئەوە جەخت لەسەر غەرامەی دارایی و قەرەبووی زیانلێکەوتوو بکاتەوە، بەچەشنێک ئەم بەرتەسکردنەوەیە ئەو تاوانانە نەگرێتەوە کە لە نێوان ڕۆژنامەگەری و هیتردا هاوبەشن.

وەکو تاوانەکانی جوێنپێدان و بوختانپێکردن و ئاشکراکردنی نهێنیی تایبەتی و تانەوتەشەر. چونکە هەر یەکێک لەم کردەوانە خۆی لە خۆیدا بەتاوان دادەندرێت، چونکە هێزی جوکمەکە لەو تاوانانەدا کە لە ڕێگای ڕۆژنامەگەرییەوە ڕوودەدەن بەهێزترە لەوانی تر.

- پێشنیار دەکەین، بەرپرسیارییەتیی خاوەنی ئیمتیاز و بەڕێوەبەری نووسین و بەڕێوەبەری چاپخانە، تەنها بەرپرسیارییەتییەکی شارستانی بێت، واتە لە حاڵەتی سەرپێچیکردنی ئەرکەکانی ناچار بکرێت بەقەرەبووکردنەوەی زیانلێکەوتووەکە.

- پێشنیار دەکەین بۆ دەرهێنانی ڕۆژنامە و گۆڤار لەجیاتی سیستمی مۆڵەتوەرگرتنی پێشەکی کار بەسیستمی ئاگاکاری بکرێت، چونکە ئەم سیستمە زیاتر لەوەی پێشوو لەگەڵ پرنسیپەکانی مافی مرۆڤ کە جاڕی جیهانیی مافی مرۆڤ و پەیمانی نێودەوڵەتیی مافە سیاسی و مەدەنییەکان دانی پێدانراون دەگونجێن. بەڵام بۆ دەرکردنی ڕۆژنامە و گۆڤاری ناوخۆ لە باروودۆخی نائاساییدا و ئەو گۆڤار و ڕۆژنامە بیانییانەش کە لەناو هەرێم دەردەکرێن، پێویستە پابەندی سیستمی مۆڵەت وەرگرتنی پێشەکی بکرێن، بەمەبەستی پاراستنی ئەمن و ئاسایش و نیزامی گشتی.

- پێشنیار دەکەین، بەڕێوەبەری چاپخانە ناچار بکرێت چەند دانەیەک لە هەر ڕۆژنامە و گۆڤار و بڵاوکراوەیەکی دەوری دوای چاپکردنی بۆ داواکاری گشتی و سەندیکای ڕۆژنامەنووسان و وەزارەتی ڕۆشنبیری و کتێبخانەی نیشتمانی و وەزارەتی ناوخۆ بنێرێت.

- یاسای چاپەمەنیی کوردستان چارەسەری پەخشی تەلەفزیۆنی و ئێستگەیی و ئینتەرنێتی نەکردووە، لەکاتێکدا ئەمانە بەپێی یاساکانی عێراقی لەلایەن حکوومەتەوە مۆنۆپۆل (احتکار) کراون و لە کوردستانیش بەرامبەریان بێدەنگییەک هەیە، تەنها ئەوانە نەبێ کە بەپێی یاسای حزبەکان هەر حزبێک بۆی هەیە هەیبێت. هەروەها ڕێکخستنی بەرپرسیارییەتیی تاوانکاری لە تاوانەکانی بڵاوکردنەوەدا بەپێی یاسای سزادانی ژمارە (١١١)ی ساڵی ١٩٦٩ی هەمواركراو کە یاسایەکی بەرکارە لە هەرێمی کوردستاندا تەنها ئەو بەرپرسیارییەتییە تاوانکارییەی گرتۆتە خۆ کە لە ڕێگای ڕۆژنامەگەریی چاپکراودا ڕوودەدەن، لە کاتێکدا دەستنیشانکردنی ئەو کەسانەی کە بەرپرسیارییەتەکەیان لە حاڵەتی ئەنجامدانی ئەو تاوانە لە ڕێگای کەناڵەکانی تری ڕاگەیاندنەوەی وەک ئێستگە و تەلەفزیۆن و سینەما و ئینتەرنێتەوە دەکەوێتە ئەستۆ بۆ

بنەما گشتییەکان (القواعد العامة) بەجێهێشتووە. بۆیە داوا لە یاسادانەری کوردستان دەکەین ڕۆژنامەگەریی بینراو و بیستراو و ئەو بەرپرسیارییەتییە ڕێکبخات کە لە ئاکامی ئەو تاوانانەوە دێتەدی کە لە ڕێگای ڕۆژنامەگەریی بینراو و بیستراودا ڕوودەدەن، بەومەرجە، سروشتی هەرکەناڵێک لەو کەناڵانەی ڕاگەیاندن و جۆری پەخشکردنەکەی (ئایا ڕاستەوخۆیە یان ناڕاستەوخۆ) لەبەرچاو بگیرێت بۆ ئەم مەبەستە.

- بەمەبەستی ئاسانکردنی ئەرکی دادگا لە گەڕان بەدوای دەقەیاساسزاییەکانی تاوانی ڕۆژنامەگەری و نەهێشتنی ناکۆکی لە نێوان ئەو دەقە یاساییانەدا، داوا لە یاسادانەری هەرێمی کوردستان دەکەین، لە دەقنووسکردنی ئەو دەقەیاساییانەدا کار بەسیستمی یەکبوونی یاسا (وحدة التشريع) بکات. جا یاسادانەری هەرێمی کوردستان بۆ ئەم مەبەستە، لە یاسای چاپەمەنیدا، بەشێکی نوێ لەژێر ناوونیشانی «ئەو سەرپێچی و کەتن و گەورەکەتنانەی کە لە ڕێگای ڕۆژنامەگەرییەوە یان هەر ڕێگایەکی تری بڵاوکردنەوەوە ڕوودەدەن» زیاد بکات و ئەو تاوانانەی تێدا کۆ بکاتەوە.

# ليستی سەرچاوەكان

## كتێبەكان:

بەزمانی عەرەبی

دوای قورئانی پیرۆز


- ابو اليزيد علي المتيت: الحقوق علي المصنفات الادبية والفنية والعلمية، منشورات منشأة المعارف بالاسكندرية، ١٩٦٧
- احمد أمين بك: شرح قانون عقوبات الاهلي؛ ط٣، ج١ ، منشورات الدار العربية للموسوعات، بيروت، لبنان، ١٩٨٢
- د. ابراهيم ابو الليل و د. محمد الالفي: المدخل الي نظرية القانون و نظرية الحق، منشورات جامعة الكويت، نطابع مقهوي، الكويت، ١٩٨٩
- د.احمد الاشهب: المسؤولية الجنائية في الشريعة الاسلامية والقوانين الوضعية، منشورات جمعية الدعوة الاسلامية العالمية، ط١، بنغازي، ١٩٩٤
- أزهار عبدالكريم عبدالوهاب: الحقوق والحريات العامة في ثل الدساتير العراقية، رسالة ماجستير، كلية القانون، جامعة بغداد، ١٩٨٣
- د. احمد سويلم العمري: مجال الرأي العام و الاعلام؛ ط١ ، منشورات الهيئة المصرية العامة للكتاب، القاهرة، ١٩٧٥
- د. ابراهيم الداقوقي: قانون الاعلام، ط١، منشورات جامعة بغداد، مطبعة وزارة الاوقاف والشؤون الدينية، بغداد، ١٩٨٦
- اديب مروة: الصحافة العربية نشأتها وتطورها؛ ط١، منشورات دار مكتبة الحياة، بيروت، لبنان، ١٩٦١
- اوستن راني: قنوات السلطة او تأثير التلفزيون في السياسة الامريكية، ترجمة مرسي جعفر، ط١، منشورات دار الشؤون الثقافية العامة، بغداد، العراق، ١٩٨٦
- احمد عبدالكريم: الصحافة الايرانية، منشورات وزارة الاعلام العراقية، مديرية الاعلام العامة، دار الحرية للطباعة، مطبعة الحكمة، بغداد، ١٩٧٣
- احمد فوزي: اشهر محاكمات الصحفية في العراق، ط١، مطبعة الانتصار، بغداد، ١٩٨٥
- أ. د. تودوروف: تأريخ الصحافة العالمية، ترجمة د. اديب خضور، ط١، دمشق، ١٩٩٠
- د. احمد بدر: الاعلام الدولي، دار غريب للطباعة، القاهرة، ١٩٧٧.

- د. ابراهيم امام: دراسات في فن الصحفي، منشورات مكتبة الانجلو المصرية، القاهرة، ١٩٧٩.
- د. احسان حميد المفرجي واخرون: النظرية العامة في القانون الدستوري والنظام الدستوري في العراق، دار الحكمة، بغداد
- ابراهيم المشاهدي: المبادي والقانونية في قضاء محكمة التمييز، القسم الجنائي، مطبعة الجاحث، بغداد، ١٩٩٠
- اندرية هوريو: القانون الدستوري والمؤسسات السياسية، ترجمة علي مقلد واخرون، منشورات دار الاهلية للنشر والتوزيع، ج١، بيروت، لبنان، ١٩٧٧
- د. بسيوني ابراهيم حمادة: دور وسائل الاتصال في صنع القرارات في الوطن العربي، ط١، منشورات مركز دراسات الوحدة العربية، بيروت لبنان، ١٩٩٣
- توماس بيري: الصحافة اليوم، ترجمة مروان الجابري، ط١، منشورات مؤسسة فرنكلين للطباعة والنشر، بيروت - نيويورك، نطابع مؤسسة أ. بعران و شركائة، بيروت - لبنان، ١٩٦٤
- د. توفيق حسن فرج و د. محمد يحى مطر: الاصول العامة للقانون، الدار الجامعية للطباعة والنشر، بيروت، ١٩٨٩
- جيهان احمد رشتي: نظم الاتصال - الاعلام في الدول النامية، ط١، منشورات دار الفكر العربي، القاهرة، بلا سنة طبع.
- جبار جباري: تأريخ الصحافة الكردية، ط١، منشورات مديرية الثقافة الكردية العامة، مطبعة الامة، بغداد، ١٩٧٥
- د. جيهان المكاوي: حرية الفرد وحرية الصحافة، ط١، منشورات الهيئة المصرية للكتاب، ١٩٨١
- جون. ار. بيتنر: مقدمة في الاتصال الجماهيري، ترجمة مركز الكتب الاردني، ١٩٩٠
- جان ستوتزل والان جيرار: استطلاع الرأي العام، ترجمة عيسى عصفور، ط١، منشورات عويدات، بيروت، لبنان، ١٩٧٥
- جبار صابر طه: اقامة المسؤولية المدنية عن العمل غير المشروع علي عنصر الضرر، منشورات جامعة صلاح الدين، اربيل، ١٩٨٤.
- جوتيار محمد رشيد صديق: الحماية الدولية للصحفيين في مناطق النزاعات المسلحة، رسالة قدمت الي جامعة بغداد-كلية القانون، عام ١٩٩٩، لنيل شهادة الماجستير في القانون الدولي.
- حسن الفكهاني و عبدالمنعم الحسيني: الموسوعة الذهبية للقواعد القانونية التي قررتها محكمة النقض المصرية، ط١، ج٦، منشورات الدار العربية للموسوعات، القاهرة، ١٩٨١
- د. حسين عبدالقادر: الرأي العام والعلاقات، بلاسنة نشر
- حامد محمد علي: حول الاعلام والاعلام الاسلامي، ط١، منشورات مكتب الاعلام لاتحاد الاسلامي في كوردستان، مطبعة الثقافة، اربيل، ١٩٩٨

- د. حميدة سميسم: نظرية الرأي العام، مدخل، ط١، منشورات دار الشؤون الثقافية العامة، بغداد، ١٩٩٢
- حسن محمد طوالبة: نحو تخطيط موحد للاعلام العربي، ط٢، منشورات مركز التوثيق الاعلامي للدول الخليج العربي، بغداد، ١٩٨٣
- د.حسين خلف و سلطان عبدالقادر الشاوي: المبادىء العامة في قانون العقوبات، مطبعة الرسالة، الكويت، ١٩٨٢
- د. حمدي ياسين عكاشة: القرار الاداري في قضاء مجلس الدولة، منشأة المعارف بالاسكندرية، ١٩٨٧
- خالد رشيد الشيخلي: الاعلام العربي واقعه و ابعاده و مستقبله، ط١، دار الحرية للطباعة، بغداد، ١٩٨١
- د. خليل صابات: الصحافة رسالة واستعداد وفن وعلم، منشورات دار المعارف، ط٢، مصر، بلا سنة نشر
: وسائل الاعلام نشأتها و تطورها، منشورات مكتبة الانجلو المصرية، القاهرة، ١٩٧٩
- د. خليل صابات ود. سامي عزيز و يونان لبيب رزق: حرية الصحافة في مصر، منشورات مكتبة الوعي العربي، مطبعة مصر الكبرى، القاهرة، ١٩٧٣
- دوريس ايه جريبر: سلطة وسائل الاعلام في السياسة، ترجمة د. اسعد ابوليدة، ط١، منشورات دار البشير للنشر والتوزيع، الاردن، عمان، ١٩٩٧
- رودني أ. سمولا: حرية التعبير في مجتمع مفتوح، ترجمة كمال عبدالرؤوف، ط١، منشورات الجمعية المصرية لنشر المعرفة والثقافة العالمية، القاهرة، ١٩٩٥
- د.رياض شمس: حرية الرأي وجرائم الصحافة والنشر، ج١، مطبعة دار الكتب المصرية، القاهرة، ١٩٤٧
- د. رمضان ابو السعود و د. همام محمد محمود: المدخل الي القانون، دار المطبوعات الجامعية، اسكندرية، ١٩٩٧
- رفائيل بطي: صحافة العراق، اعداد سامي رفائيل بطي، ط١، ج١، شركة مطبعة الأديب البغدادية المحدودة، بغداد، ١٩٨٥
- د. زيدان عبدالباقي: وسائل و اساليب الاتصال، ط٢، منشورات مكتبة النهضة المصرية، القاهرة، دار غريب للطباعة، ١٩٧٩
- د. سعدون العامري: تعويض الضرر في المسؤولية التقصيرية، منشورات مركز البحوث القانونية التابعة لوزارة العدل، بغداد، ١٩٨١
- د. سامي جمال الدين: الرقابة على اعمال الادارة، منشورات منشأة المعارف بالاسكندرية، ط١، ١٩٨٢

- سمير خيري توفيق: مبدأ سيادة القانون، دار الحرية للطباعة، بغداد
- سعد الدين خضر: الصحافة والعصر، ط١، دائرة الشؤون الثقافية والنشر، العراق، بغداد، ١٩٨٦؛ الرأي العام وقوى التحريك، ط١، مطبعة الجمهورية، الموصل، ١٩٦٨
- سامي ذبيان: مدخل نظري وعملي الى الصحافة اليومية والاعلام، ط١، منشورات دار المسيرة، بيروت، بلا سنة طبع
- د. سلوى ابو سعدة: الصحافة في الاتحاد السوفيتي، ط١، منشورات دار الموقف العربي للصحافة والنشر والتوزيع، مطبعة الفجر، القاهرة، بلا سنة طبع
- سمير صبحي: كشكول الصحافة، ط١، منشورات الهيئة العامة للكتاب، القاهرة، ١٩٩٢
- سجاد الغازي: مراحل تطور الصحافة العراقية، المؤسسة العامة للصحافة والطباعة، بغداد، ١٩٦٨
- سردار ياسين حمدامين: استقلال السلطة القضائية بين النظرية والتطبيق، رسالة ماجستير، جامعة صلاح الدين، ٢٠٠١.
- د. شريف سيد كامل: جرائم الصحافة في القانون المصري، دار النهضة العربية، ط١، القاهرة، ١٩٩٤
- شريف كامل: الجرائم الصحفية، ج٢، شركة دار الاشعاع للطباعة، القاهرة، ١٩٨٩
- صباح ياسين: الاعلام وافاق التجربة الثورية، منشورات وزارة الثقافة والاعلام العراقية، ط١، دار الحرية للطباعة، بغداد، ١٩٨١
- د. صالح ابو اصبع: الاتصال و الاعلام في المجتمعات المعاصرة، ط٣، منشورات دار ارام للدراسات والنشر والتوزيع، عمان، الاردن، ١٩٩٩
- د. صلاح عزيز ومحسن اديب: الدليل العلمي للصحفيين، منشورات منظمة ASK، السليمانية، ٢٠٠٢
- د. صبحي المحمصاني: اركان حقوق الانسان، ط١، دارالعلم للملايين، بيروت - لبنان، ١٩٧٩
- د. ضاري خليل محمود: الاجتهاد وحقوق الانسان في الاسلام، ط١، الموسوعة الصغيرة تصدر عن دار الشؤون الثقافية العامة، العراق، بغداد، ١٩٩٦
- د. طارق احمد فتحي سرور: الحماية الجنائية لاسرار الافراد في مواجهة النشر، منشورات دار النهضة العربية، القاهرة، ١٩٩١
- طلعت همام: مائة سؤال عن التحرير الصحفي، ج١، منشورات دار الفرقان للنشر والتوزيع، جمعية عمال المطابع التعاونية، عمان، ١٩٨٤؛ مائة سؤال عن الصحافة، ج٢، منشورات دار الفرقان للنشر والتوزيع، عمان، ١٩٨٨
- عبد الجبار داود البصري: المؤلف والقانون، ط١، منشورات وزارة الثقافة والاعلام العراقية، دائرة الشؤون الثقافية والنشر، دار الحرية للطباعة، ١٩٨٣

- د. عدنان ابو فخر: الصحافة السورية بين النظرية والتطبيق، ط١، منشورات دار الكاتب العربي، دمشق، ١٩٨٥
- عدنان عبدالمنعم ابو السعد: تطور واساليب تحريره في الصحافة العراقية، ط١، منشورات دائرة الشؤون الثقافية والنشر، دار الحرية للطباعة، بغداد، ١٩٨٣
- عزيز السيد جاسم: مبادئ و الصحافة في عالم المتغيرات، ط١، منشورات دار الفاق العربية، بغداد، ١٩٨٥
- عبدالباقي البكري و زهير البشير: المدخل لدراسة القانون، منشورات بيت الحكمة، بغداد، بلا سنة النشر.
- عبدالرحمن احمد حسين المختار: حرية الصحافة و تنظيمها الدستوري والقانوني في اليمن (دراسة مقارنة)، كلية القانون، جامعة بغداد، ٢٠٠٢
- علي محمد محمود ابو عال: مدى سلطة القاضي في الرقابة على دستورية القوانين بطريق الدفع الفرعي (دراسة مقارنة)، رسالة ماجستير، كلية القانون، جامعة بغداد، ١٩٩٦
- د. عصمت عبدالمجيد بكر و د. صبري حمد خاطر: الحماية القانونية للملكية الفكرية، ط١، منشورات بيت الحكمة، بغداد، ٢٠٠١
- د. علي حسين الجابري: الانسان والواجب اشكالية فلسفية، ط١، الموسوعة الصغيرة تصدر عن دار الشؤون الثقافية العامة، العراق، بغداد، ١٩٩٨
- د. عبداللطيف حمزة: الاعلام في صدر الاسلام، ط٢، منشورات دار الفكر العربي، القاهرة، ١٩٧٨

: الاعلام له تأريخه ومذاهبه، ط١، منشورات دار الفكر العربي، القاهرة، بلا سنة الطبع.

- د. عزالدين مصطفى رسول: حول الصحافة الكردية، ط١، مطبعة دار الجاحظ، بغداد، ١٩٧٣
- د. عدنان ابو فخر: الصحافة السورية بين النظرية والتطبيق، ط١، منشورات دار الكاتب العربي، دمشق، ١٩٨٥
- د. عبدالحميد الشواربي: جرائم الصحافة والنشر، منشأة المعارف بالاسكندرية، ط٣، ١٩٧٧.

: جريمة القذف والسب في ضوء القضاء و الفقه، منشورات دار المطبوعات الجديدة بالاسكندرية، ١٩٨٥.

: جرائم الصحافة والنشر، ط١، منشورات منشأة المعارف بالاسكندرية، ١٩٨٦

- عبدالقادر بدرالدين: موجز عن مسيرة الصحافة الكردية في الجزء الغربي، سوريا، ط٢، منشورات رابطة كاوا للثقافة الكردية، اربيل، ٢٠٠٠
- د. عبدالله البستاني: حرية الصحافة في العراق، ط١، منشورات جمعية بيوت الامة، مطبعة الرابطة، بغداد، ١٩٥٦

- المحامي عادل بطرس: قانون الاعلام، ط١، ج١، لبنان، بيروت، نطابع فغالي، ١٩٩١؛ قانون الاعلام، ط١، ج٢، لبنان، بيروت، نطابع فغالي، ١٩٩٣؛ قانون الاعلام، ط١، ج٣، لبنان، بيروت، نطابع فغالي، ١٩٩٥
- د. عبدالحسين شعبان، ثقافة حقوق الانسان، ط١، منشورات رابطة كاوا للثقافة الكردية، مطبعة اوفسيت هولير، ٢٠٠١
- عبدالحسين شعبان: الاسلام وحقوق الانسان، ط٣، منشورات مؤسسة الموكرياني للطباعة والنشر، مطبعة وزارة التربية، اربيل، ٢٠٠١
- علي محمد ابراهيم الكرباسي: موسوعة التشريعات العقارية، ط١، ج٣، مطبعة بغداد، ١٩٨٦
- عبدالباقي محمود سوادي: مسؤلية المحامي المدنية عن اخطائه المهنية، دار الحرية للطباعة والنشر، بغداد، ١٩٧٩.
- د. عصام عبدالوهاب البرزنجي: مجلس شورى الدولة و ميلاد القضاء الاداري العراقي، مجلة العلوم القانونية، المجلد التاسع، العدد (١-٢)، بغداد، ١٩٩١
- د. علي سبتي محمد: وسائل حماية المشروعية.
- غوران هدبرو: الاتصال والتغير الاجتماعي في الدول النامية، ط١، منشورات دار الشؤون الثقافية العامة، العراق، بغداد، ١٩٩١
- د. غازي حسن صباريني: الوجيز في حقوق الانسان و حرياته الاساسية، منشورات مكتبة دار الثقافة للنشر والتوزيع، ط٢، عمان، الاردن، ١٩٩٧
- د. فاروق ابو زيد: الصحافة العربية المهاجرة، ط١، منشورات مكتبة مدبولي، القاهرة، ١٩٨٥
- فائق بكي: الصحافة العراقية.. ميلادها و تطورها، بغداد، ١٩٦٧
- د. فاروق احمد خماس: الرقابة على اعمال الادارة، منشورات كلية القانون والسياسة، جامعة الموصل، ١٩٨٨
- د. فخري عبدالرزاق الحديثي: شرح قانون العقوبات، القسم الخاص، ط١، مطبعة الزمان، بغداد، ١٩٩٦؛ شرح قانون العقوبات، القسم العام، مطبعة اوفسيت الزمان، بغداد، ١٩٩٢
- ف. فريزر بوند: مدخل الى الصحافة، ترجمة راجي صهيون، ط١، منشورات مؤسسة فرنكلين للطباعة والنشر، بيروت، نطابع مؤسسة أ. بدران وشركائه، بيروت، لبنان، ١٩٦٤
- فاتح سميع عزام: الحقوق المدنية والسياسية في الدساتير العربية، مجلة (المستقبل العربي) يصدرها (مركز دراسات الوحدة العربية)، العدد (٢٧٧)، السنة الرابعة والعشرون، اذار - مايس ٢٠٠٢
- فيليب غايار: تقنية الصحافة، ترجمة فادي الحسيني، ط١، منشورات عويدات، بيروت- لبنان، مطبعة فن الطباعة، بيروت، ١٩٧٣

- ف. فريزر. بوند: مدخل الى الصحافة، ترجمة راجي صهيون، ط١، منشورات مؤسسة فرانكلين للطباعة والنشر، بيروت، نطابع مؤسسة أ. بدران وشركاته، بيروت - لبنان، ١٩٦٤
- د. قيس الياسري و د. سؤدد القادري و يونس الشكرجي: الفنون الصحفية، ط١، منشورات كلية الاداب، جامعة بغداد، دار الحكمة للطباعة، بغداد، ١٩٩١
- قدري قلعجي: أشهر المحاكمات في التأريخ، ط١/، شركة المطبوعات للتوزيع والنشر، بيروت، لبنان، ١٩٩٦.
- كامل الشرقي: حول مفهوم حرية الصحافة، ط١، منشورات اتحاد الصحفيين العرب، بغداد، ١٩٧٢
- د.كاظم المقدادي: البحث عن حرية التعبير، ط١، منشورات العالم العربي في باريس بالتعاون مع مؤسسة رايب الاحوال في بيروت، ١٩٨٤
- كمال سعدي مصطفى: حق الملكية الادبية والفنية في القانون العراقي والمقارن، رسالة ماجستير في القانون، قدمت الى كلية القانون والسياسة - جامعة صلاح الدين-اربيل، عام ١٩٩٩
: السلطة الرابعة، ترجمة بهاء الدين جلال، ط١، مطبعة وزارة الثقافة - اربيل، ٢٠٠٩
- لطيفة حميد محمد: جرائم النشر في التشريع العراقي، رسالة مقدمة الى كلية القانون جامعة بغداد كجزء من متطلبات نيل شهادة الدكتوراه في القانون الجنائي لعام ١٩٩٩.
- د. محمد زكي ابو عامر: قانون العقوبات اللبناني - القسم العام، منشورات الدار الجامعية للطباعة والنشر، بيروت، ١٩٨١.
- د. مصطفى ابراهيم الزلمي: والاخرون: حقوق الانسان في الشريعة الاسلامية والقانون الدولي، منشورات بيت الحكمة، بغداد، مطبعة الاديب البغدادية، ١٩٩٨.
: موانع المسؤولية الجنائية في الشريعة الاسلامية والتشريعات الجزائية العربية، ط١، منشورات الدار الجامعية للطباعة والنشر والترجمة، بغداد، ٢٠٠٢
: المسؤلية الجنائية في الشريعة الاسلامية - دراسة مقارنة بالقانون، ط١، ج١، مطبعة اسعد، بغداد، ١٩٨٢.
- منذر الشاوي: مذاهب القانون، دار الحكمة، بغداد، ١٩٩٠
- محمد الطيب عبداللطيف: نظام الترخيص والاخطار في القانون المصري، القاهرة، مطبعة المعارف، ١٩٥٧
- ميثم حنظل شريف: التنظيم الدستوري والقانوني لحرية الصحافة في العراق، رسالة مقدمة الى كلية القانون جامعة بغداد كجزء من متطلبات نيل شهادة الماجستير في القانون لعام ١٩٩٩ (النسخة المعدة للمناقشة).
- د.مصطفى العوجي: القانون الجنائي العام، المسؤولية الجزائية، ج٢، مؤسسة نوفل، بيروت، لبنان

